# صحيح البخاري

## بە کوردی

وەرگێڕاوی هەموو فەرموودە صەحیحەکانی ئیمامی بوخارییە کە ژمارەیان (٧٥٦٣) فەرموودەیە

**بەرگی نۆیەم**


نوسینی
أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري

وەرگێڕانی
محمد ملا صالح بامۆکی




صحيح البخاري

# صحيح البخاري

## بەکوردی

**بەرگی نۆیەم**

پەڕاوەکانی.. ئادابەکان، مۆڵەت خواستن ، نزا و پاڕانەوە ، وتە دڵنەرمکارەکان، چارەنووس ، سوێن و نەزرکردن ، کەفارەت ، میرات ، سزای تاوانەکان


نوسینی

**أبو عبدالله محمد بن اسماعیل البخاري**

وەرگێڕانی

**محمد ملا صالح بامۆکی**



# ( صحيح البخاري ) به كوردی


بەرگی نۆیەم

نووسینی..أبو عبدالله محمد بن اسماعيل البخاری

وەرگێڕانی.. محمد ملا صالح بامۆكی

چاپی یەكەم ٢٠٢٣

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

دیزاین .. ئەحمەد

لە بڵاوكراوەكانی كتێبخانەی تیشك





07719899402

07501122110

## ٢٠- بابُ قتْلِ الْوَلَدِ خَشْيَةَ أنْ يأْكُلَ مَعَهُ

٦٠٠١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهْوَ خَلَقَكَ». قال: ثم أيّ؟ قَالَ: «أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَأْكُلَ مَعَكَ». قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ». وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَصْدِيقَ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ﴿٦٨﴾﴾ الآية، الفرقان[1].

## ٢٠- باسی كوشتنی منداڵ (لە لایەن باوكیەوە) لە ترسی ئەوەی نان بخوات لەگەڵیدا [2]

**٦٠٠١-عەبدوڵڵا[3] ﷺ دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ:كام تاوانە گەورەترە؟ فەرمووی: ((ئەوەی كە هاوشێوە بۆ خوا دانێیت، كە ئەو (خوا) تۆی دروست كردوە)) وتی: پاشان چی تر (گەورەیە)؟ فەرمووی: ((ئەوەی كە منداڵەكەت بكوژیت لە ترسی ئەوەی كە لەگەڵتدا خواردن بخوات))، وتی: پاشان چی تر (گەورەیە)؟ فەرمووی: ((ئەوەی كە زینا بكەیت لەگەڵ هاوسەر و حەلاڵی دراوسێكەتدا)).**

**(عەبدوڵڵا وتی:) وە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وەك پشتڕاست كردنەوە بۆ فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ (وە (بەندە تایبەتەكانی خوای میهرەبان) كەسانێكن هیچ پەرستراوێك لەگەڵ خوادا ناپەرستن)، تا كۆتای ئایەتەكە.**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٧٧.

(٢) واتە: چ تاوانێک لەوە گەورەترە.

(٣) ئەم فەرمووده دوو ڕێگەی هەیە کە پێی گێڕدراوەتەوە.

## ٢١- بَابُ وَضْعِ الصَّبِيِّ فِي الحِجْرِ

٦٠٠٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَضَعَ صَبِيًّا فِي حِجْرِهِ يُحَنِّكُهُ، فَبَالَ عَلَيْهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ[1].

## ٢١- باسی دانانی منداڵ لە کۆشدا

**٦٠٠٢- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ منداڵێکی کوڕی خستە کۆشیەوە شیرینی دەهێنا بە مەڵاشویدا، جا منداڵەکە میزی پیاکرد، پێغەمبەریش ﷺ داوای ئاوی کرد و کردی بەشوێنەکەیدا.**

## ٢٢- بَابُ وَضْعِ الصَّبِيِّ عَلَى الفَخِذِ

٦٠٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَارِمٌ، حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا تَمِيمَةَ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ يُحَدِّثُهُ أَبُو عُثْمَانَ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵄: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْخُذُنِي فَيُقْعِدُنِي عَلَى فَخِذِهِ، وَيُقْعِدُ الْحَسَنَ عَلَى فَخِذِهِ الأُخْرَى، ثُمَّ يَضُمُّهُمَا ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ ارْحَمْهُمَا فَإِنِّي أَرْحَمُهُمَا».
وَعَنْ عَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ. قَالَ التَّيْمِيُّ: فَوَقَعَ فِي قَلْبِي مِنْهُ شَيْءٌ، قُلْتُ: حَدَّثْتُ بِهِ كَذَا وَكَذَا، فَلَمْ أَسْمَعْهُ مِنْ أَبِي عُثْمَانَ، فَنَظَرْتُ فَوَجَدْتُهُ عِنْدِي مَكْتُوبًا فِيمَا سَمِعْتُ[2].

## ٢٢- باسی دانانی منداڵ لەسەر ڕان

**٦٠٠٣- ئوسامەی کوڕی زەید ﵄ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ منی دەبرد لەسەر ڕانێکی دای دەنیشاندم، حەسەنیشی لەسەر ڕانەکەی تری دادەنیشاند، پاشان**

(١) بڕوانە: ٢٢٢.
(٢) بڕوانە: ٣٧٣٥.

هەردووكیانی دەنوساند بەخۆیەوە و پاشان دەیفەرموو: ((خوایە بۆ هەردووكیان بە سۆزبە، چونكە بە ڕاستی من بۆ هەردووكیان بەسۆزم)).

عەلی دەڵێ: یەحیا بۆی گێڕاینەوە وتی: سولەیمان بۆی گێڕاینەوە لە ئەبی عوسمانەوە وتی: تەیمی دەڵێ: جا دەربارەی (ئەوەی ئەبو تەمیمە بۆی گێڕامەوە) شتێك كەوتە دڵمەوە وتم: ئەوەندە و ئەوەندە جار من ئەو فەرموودەیەم گێڕاوەتەوە (لە ئەبی عوسمانەوە)، كەچی لە ئەبی عوسمانم نەبیستووە، ئینجا سەیرم كرد و دۆزیمەوە بەنووسراوی لامە لەو فەرموودانەیە كە بیستوومە.

## ٢٣- بابٌ: حُسْنُ العَهْدِ مِنَ الإِيمَانِ

٦٠٠٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ -وَلَقَدْ هَلَكَتْ قَبْلَ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي بِثَلَاثِ سِنِينَ- لِمَا كُنْتُ أَسْمَعُهُ يَذْكُرُهَا، وَلَقَدْ أَمَرَهُ رَبُّهُ أَنْ يُبَشِّرَهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ، وَإِنْ كَانَ لَيَذْبَحُ الشَّاةَ ثُمَّ يُهْدِي فِي خُلَّتِهَا مِنْهَا[1].

## ٢٣- باسێک: ئەمەکدار و بەسەر کردنەوە لە (تەواوی) باوەڕە

٦٠٠٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: غیرەم لە هیچ ژنێك نەكردوە ئەوەندەی غیرەم لە خەدیجە ﵂ دەكرد، بەڕاستی بە سێ ساڵ پێش ئەوەی (پێغەمبەر ﷺ) من مارە بكات مردووە، (غیرەكەشم لەبەر ئەوەبوو) كە لە پێغەمبەرم ﷺ دەبیست باسی دەكرد، وە بێگومان پەروەردگاری فەرمانی پێكردبوو كە مژدەی پێبدات بە كۆشكێك لە مرواری ناوپۆش لە بەهەشتدا، جاری وابوو مەڕێكی سەر دەبڕی، پاشان لە گۆشتەكەی دیاری دەنارد بۆ دۆست و خۆشەویستی خەدیجە.

---

(١) بڕوانە: ٣٨١٦.

## ٢٤- بابُ فَضْلِ مَنْ يَعُولُ يَتِيمًا

٦٠٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا». وَقَالَ بِإِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى[1].

## ٢٤- باسی فەزڵ و گەورەیی ئەو كەسەی سەرپەرشتی و خزمەتی هەتیوێک دەكات

**٦٠٠٥-سەهلی كوڕی سەعد ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە فەرمووی: ((من و سەرپەرشتیاری هەتیو لە بەهەشتدا ئاوەهاین))، بە پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەڕاستی ئاماژەی كرد.**

## ٢٥- بابُ السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ والمسكين

٦٠٠٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ كَالَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ».

## ٢٥- باسی گەورەیی مشورخۆری بۆ بێوەژن و هەژار

**٦٠٠٦- صەفوانی كوڕی سولەیم دەیباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ كە فەرمووی: ((مشور خۆری بێوەژن و هەژار وەكو خەباتكێڕە لە ڕێی خوا، یان وەكو ئەو كەسە وایە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت و شەویش شەونوێژ دەكات)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٣٠٤.

٦٠٠٦م- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ، عَنْ أَبِي الْغَيْثِ - مَوْلَى ابْنِ مُطِيعٍ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[1].

**٦٠٠٦م- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئیسماعیل بۆی گێڕاینەوە وتی: مالیك بۆی گێڕامەوە لە سەوری کوڕی زەیدی دیلییەوە لە ئەبولغەیسی ئازادکراوی ئیبنو موتیعەوە لە ئەبی هوڕەیرەوە ﷺ ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە.**

## ٢٦- بابُ السَّاعِي عَلَى المِسْكِينِ

٦٠٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي الْغَيْثِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ -وَأَحْسِبُهُ قَالَ، يَشُكُّ القَعْنَبِيُّ:- كَالْقَائِمِ لاَ يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لاَ يُفْطِرُ»[2].

## ٢٦- باسی گەورەیی مشورخۆری بۆ هەژاران

**٦٠٠٧-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مشوخۆری بێوەژن و هەژار وەکو خەباتگێڕە لە ڕێی خوادا)) - وابزانم (مالیك) وتی: قەعنەبی گومان دەبات- :[3]((وەکو شەونوێژ کاری بەردەوام و ڕۆژووەوانی هەمیشەیی وایە)).**

## ٢٧- بابُ رَحْمَةِ النَّاسِ وَالْبَهَائِمِ

٦٠٠٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَبِي سُلَيْمَانَ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ قَالَ: أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ وَنَحْنُ شَبَبَةٌ مُتَقَارِبُونَ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، فَظَنَّ

---

(١) بڕوانە: ٥٣٥٣.

(٢) بڕوانە: ٥٣٥٣.

(٣) لە نێوان (وەك خەباتگێڕە لە ڕێی خوادا) لەگەڵ (وەکو شەو نوێژکاری بەردەوام و ڕۆژووەوانی هەمیشەیی وایە).

أَنَّا اشْتَقْنَا أَهْلَنَا، وَسَأَلَنَا عَمَّنْ تَرَكْنَا فِي أَهْلِنَا، فَأَخْبَرْنَاهُ -وَكَانَ رَفِيقًا رَحِيمًا- فَقَالَ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ وَمُرُوهُمْ، وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، وَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»(١).

## ٢٧- باسی بەزەیی هاتنەوە بەخەڵک و گیاندارانـدا

**٦٠٠٨- ئەبو سولەیمان کەمالیکی کوڕی حووەیریسە ﷺ دەڵێ: ئێمە چەند گەنجێکی هاو تەمەن بووین ڕۆشتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئینجا بیست شەو و ڕۆژ لە خزمەتیدا ماینەوە، ئەنجا کە زانی ئێمە ئارەزووی خاو خێزانمان دەکەین، وە پرسیاری لێ کردین کە هاتووین لە دوا خۆمان کێمان بەجێهێشتووە، ئێمەش عەرزمان کرد -وە پێغەمبەر ﷺ بەبەزەیی و میهرەبان بوو- بۆیە فەرمووی: ((بگەڕێنەوە بۆ لای خاو خێزانتان و شارەزایان بکەن و فەرمانیان پێ بدەن (بەوەی پێویستە)، وە نوێژبکەن بەو شێوەی من دەبینن نوێژ دەکەم، ئەنجا کە نوێژ بوو با یەکێکتان بانگتان بۆ بدات، پاشان ئەوەتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات)).**

٦٠٠٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ سُمَى -مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ- عَنْ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ العَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ بِي. فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، فَسَقَى الكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْرًا؟ فَقَالَ: «فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ»(٢).

(١) بڕوانە: ٦٢٨.

(٢) بڕوانە: ١٧٣.

**٦٠٠٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە کاتێکدا پیاوێك بەڕێگادا دەڕۆشت تینویەتی زۆری بۆهێنا بوو، جا بیرێکی بینی دابەزیە ناویەوە و ئاوی خواردەوە، پاشان هاتە دەرەوە بینی سەگێك زمانی دەرهێناوە و هەناسە بڕکێیەتی لە تینوانا خۆڵ دەخوات، پیاوەکە وتی: بێگومان ئەم سەگە لە تینویەتیدا گەشتوە شێوەی ئەو حاڵەی بە من گەشتبوو، بۆیە دابەزیە ناو بیرەکە و پێلاوەکەی پڕکرد لە ئاو، پاشان بە دەمی گرتی و (لە بیرەکە هاتە سەرەوە و) سەگەکەی ئاودا، بەو هۆیەوە خودا سوپاسی کرد و لێی خۆشبوو))، هاوەڵان وتیان: بەڕاستی ئێمە (لە چاکەکردن) لەگەڵ ئاژەڵ و بێ زماندا پاداشتمان هەیە؟ فەرمووی: ((لە هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕ و زیندوودا پاداشت هەیە)).**

٦٠١٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي صَلاَةٍ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ وَهْوَ فِي الصَّلاَةِ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا، وَلاَ تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا. فَلَمَّا سَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ لِلأَعْرَابِيِّ: «لَقَدْ حَجَّرْتَ وَاسِعًا». يُرِيدُ رَحْمَةَ اللَّهِ.

**٦٠١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژێکدا هەستا ئێمەش لەگەڵیدا هەستاین، ئینجا عەرەبێکی دەشتەکی لە نوێژەکەدا بوو وتی: خوایە ڕەحم بە من و موحەممەد بکەیت، وە لەگەڵماندا ڕەحم بەکەسی تر نەکەیت، جا کە پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە بە عەرەبە دەشتەکیەکەی فەرموو: ((بەڕاستی فراوانەکەت تەسك کردەوە))، مەبەستی بەزەیی و ڕەحمەتی خوابوو**

.٦٠١١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَرَى الْمُؤْمِنِينَ فِي تَرَاحُمِهِمْ وَتَوَادِّهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى عُضْوًا تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى.

**٦٠١١-نوعمانی كوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((باوەڕداران دەبینی لە بەزەیی هاتنەوە بەیەكتریدا، و خۆشویستنی یەكتری و هاوسۆزی بۆ یەكتریدا وەك لاشەیەك وان، ئەگەر ئەندامێكی ئازارێكی هەبێ ئەوا ئەندامەكانی تری دەناڵێنێ لە بێخەوی و تادا)).**

٦٠١٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ غَرَسَ غَرْسًا فَأَكَلَ مِنْهُ إِنْسَانٌ أَوْ دَابَّةٌ إِلاَّ كَانَ لَهُ صَدَقَةٌ»[١].

**٦٠١٢-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((هەر مسوڵمانێك درەختێك بنێژێ، جا مروڤ لێی بخوات یان گیاندار، ئەوە خێرە و چاكەیە بۆ ئەو كەسە)).**

٦٠١٣- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ»[٢].

**٦٠١٣-جەریری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((هەر كەس بەزەیی بەخەڵكدا نەیەتەوە، خواش بەزەیی بەودا نایەتەوە[٣])).**

## ٢٨- بابُ الْوَصَاةِ بِالْجَارِ

وقوله ﷻ: ﴿ وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔاۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴾ إِلَى قَوْلِهِ:

﴿ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ﴾ النساء.

---

(١) بڕوانە: ٢٣٢٠.

(٢) بڕوانە: ٧٣٧٦.

(٣) یان: هەركەس ڕەحم نەكات (بە خەڵك) ڕەحمی پێ ناكرێ (لە لایەن خواوە).

٦٠١٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا زَالَ يُوصِينِي جِبْرِيلُ بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ».

## ٢٨- باسی ئامۆژگاری بەچاكەكردن لەگەڵ دراوسێدا

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا خوا ﷻ: (بەس خوا بپەرستن و هیچ شتێك مەكەن بە هاوبەشی، هەروەها لەگەڵ دایك و باوكتاندا چاك بن)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (خۆبەزل زان و شانازی كەر). ٦٠١٤- عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بەردەوام جیبریل ﵇ ئامۆژگاری دەكردم بەچاكە كردن لەگەڵ دراوسێدا، هەتا وام دەزانی (كاتی مردن) میراتی لێ دەبات)).**

٦٠١٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ».

**٦٠١٥- عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەردەوام جیبریل ﵇ ئامۆژگاری دەكردم بەچاكە كردن لەگەڵ دراوسێدا، هەتا وام دەزانی (كاتی مردن) میراتی لێ دەبات)).**

## ٢٩- بَابُ إِثْمِ مَنْ لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ

﴿يُوبِقْهُنَّ ﴿٣٤﴾﴾ الشورى: يُهْلِكْهُنَّ. ﴿مَوْبِقًا ﴿٥٢﴾﴾ الكهف: مَهْلِكًا

٦٠١٦- حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ». قِيلَ: وَمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الَّذِي لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَايِقَهُ». تَابَعَهُ شَبَابَةُ وَأَسَدُ بْنُ مُوسَى.

وَقَالَ حُمَيْدُ بْنُ الأَسْوَدِ وَعُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ وَأَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ وَشُعَيْبُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

## ٢٩- باسی گوناهی ئەو كەسەی كە دراوسێكەی لە خراپە و زیانی ئەو پارێزراو نەبێت

**﴿ يُوبِقْهُنَّ ﴿٣٤﴾ ﴾: لەناویان دەبات. ﴿ مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ ﴾: لەناوچوون یان جێگای لەناوچوون.**

**٦٠١٦- ئەبو شورەیح دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((وەڵلاهی باوەڕدار نییە، وەڵلاهی باوەڕدار نییە، وەڵلاهی باوەڕدار نییە))، عەرزی كرا كێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((ئەو كەسەی دراوسێكەی لە زیانی ئەو پارێزراو نەبێ)).**

**-شەبابە و ئەسەدی كوڕی مووسا ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی عاصیمی كوڕی عەلی دەكەن.**

**- حومەیدی كوڕی ئەسوەد و عوسمانی كوڕی عومەر و ئەبو بەكری كوڕی عەبباس و شوعەیبی كوڕی ئیسحاق گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو ئەبی زیئبەوە ئەویش لە مەقبورییەوە لە ئەبی هوڕەیرەوە ﷺ[1].**

## ٣٠- بابٌ: لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا

٦٠١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ -هُوَ الْمَقْبُرِيُّ- عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ، لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ»[2].

(١) شێوەی ڕێگاكەی بوخاری وا دەخوازێ هەردوو ڕێگاكەی پێ صەحیحە.
(٢) بڕوانە: ٢٥٦٦.

## ٣٠- باسێک: هیچ دراوسێیەک خەڵاتی دراوسێکەی بەکەم نەزانێت

**٦٠١٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ((ئەی ئافرەتانی مسوڵمان هیچ دراوسێیەك خەڵاتی دراوسێکەی بەکەمی نەزانێت، با سمی مەڕێکیش بێت)).**

## ٣١- بابٌ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ

٦٠١٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»[1].

## ٣١- باسێک: هەر کەس باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی ئەوە با ئازاری دراوسێکەی نەدات

**٦٠١٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێك باوەڕی هەیە بە خوا و بەڕۆژی دوایی بائازاری دراوسێکەی نەدات، وە هەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی با ڕێزی میوانەکەی بگرێ، وە هەر کەسێك باوەڕی هەیە بە خوا و بەڕۆژی دوایی، با چاکە بڵێ یان بێدەنگ بێ)).**

٦٠١٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْعَدَوِيِّ قَالَ: سَمِعَتْ أُذُنَايَ وَأَبْصَرَتْ عَيْنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ كَانَ

---

(١) بڕوانە: ٥١٨٥.

يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جَائِزَتَهُ». قَالَ: وَمَا جَائِزَتُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا كَانَ وَرَاءَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ عَلَيْهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»[١].

**٦٠١٩-ئەبو شورەیحی عەدەوی ﷺ دەڵێ: بەهەردوو گوێم بیستم و بەهەردوو چاوم بینیم كاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمایشی فەرموو، فەرمووی: ((هەر كەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی، باڕێزی دراوسێكەی بگرێت، هەر كەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی، باڕێزی میوانەكەی بگرێ بەبەخشینەكەی)) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشینەكەی چییە؟ فەرمووی: (بەخشینەكە) ((شەو و ڕۆژێكە، میوانداریش سێ (شەو) ڕۆژە، جا ئەوەی پاش ئەوە بێت ئەو خێر و چاكەیە پێی دەكرێت، وە هەر كەسێك باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بكات یان بێدەنگ بێت)).**

## ٣٢- بَابُ حَقِّ الْجِوَارِ فِي قُرْبِ الأَبْوَابِ

٦٠٢٠- حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو عِمْرَانَ قَالَ: سَمِعْتُ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي جَارَيْنِ فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: «إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابًا»[٢].

## ٣٢- باسی مافی دراوسێ دەربارەی نزیكی دەرگاكان

**٦٠٢٠- عائیشە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دوو دراوسێم هەیە، دەی دیاری بۆكامیان بەرم؟ فەرمووی: ((بۆئەوەیان (بەرە) دەرگاكەی لێتەوە نزیكترە)).**

---

(١) بروانە: ٦١٣٥، ٦٤٧٦.

(٢) بروانە: ٢٢٥٩.

## ٣٣- بابٌ: كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ

٦٠٢١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَيَّاشٍ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ».

## ٣٣- باسێک: هەموو چاکە کردنێک خێرە

**٦٠٢١- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەموو چاکە کردنێك خێرە)).**

٦٠٢٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ». قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: «فَيَعْمَلُ بِيَدَيْهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ». قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ؟ أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «فَيُعِينُ ذَا الْحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ». قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «فَيَأْمُرُ بِالْخَيْرِ». أَوْ قَالَ: «بِالْمَعْرُوفِ». قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «فَيُمْسِكُ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهُ لَهُ صَدَقَةٌ»[1].

**٦٠٢٢- سەعیدی کوڕی ئەبی بوردەی کوڕی ئەبو مووسای ئەشعەری دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە و لە باپیریەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەموو مسوڵمانێك لەسەریەتی خێرێك بکات))، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر کەسێك نەیبوو؟ فەرمووی: ((بەدەست و بازووی کار بکات سوود بەخۆی بگەیەنێت و بیشیکات بەخێر))، عەرزیان کرد ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ یان نەیکرد؟ فەرمووی: ((یارمەتی کەسێك بدات هانای بۆهێنا بۆ پێویستیەکی))، عەرزیان کرد ئەی ئەگەر ئەوەشی نەکرد؟ فەرمووی: ((با خۆی لە خراپە بگێڕێتەوە و نەیکات، ئەوە بێگومان بەچاکە دەنووسرێ بۆی)).**

---

(١) بروانە: ١٤٤٥.

## ٣٤- بابُ طِيبِ الكَلَامِ

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ".

٦٠٢٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ خَيْثَمَةَ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ النَّارَ، فَتَعَوَّذَ مِنْهَا وَأَشَاحَ بِوَجْهِهِ، ثُمَّ ذَكَرَ النَّارَ، فَتَعَوَّذَ مِنْهَا وَأَشَاحَ بِوَجْهِهِ -قَالَ شُعْبَةُ: أَمَّا مَرَّتَيْنِ فَلاَ أَشُكُّ- ثُمَّ قَالَ: «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[1].

## ٣٤- باسی قسەی جوان و چاک کردن

**-ئەبو هورەیرە ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: ((وتەی جوان وچاك خێر و باشەیە)).**

**٦٠٢٣-عەدیی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ باسی دۆزوخی کرد و پەنای بەخوا گرت لێی و ڕووی وەرچەرخان، پاشان (جارێکی تر) باسی دۆزەخی کرد و پەنای گرت بە خوا لێی و ڕووی وەرچەرخان-شوعبە دەڵێ: جا دووجار فەرموویەتی گومانم نییە-له پاشان فەرمووی: ((خۆتان له دۆزەخ بپارێزن با بەلەته خورمایەکیش بێت، جا ئەگەر کەسێك ئەوەشی نەبوو بەوتەیەکی جوان (خۆی بپارێزێت ) )).**

## ٣٥- بابُ الرِّفْقِ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ

٦٠٢٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ رَهْطٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكُمْ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَفَهِمْتُهَا فَقُلْتُ: وَعَلَيْكُمُ السَّامُ

---

(١) بڕوانە: ١٤١٣.

وَاللَّعْنَةَ. قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ قُلْتُ وَعَلَيْكُمْ»[١].

## ٣٥- باسی (گەورەیی) لەسەر خۆیی و نەرم و نیانی لە گشت کارەکاندا

**٦٠٢٤-عوروەی کوڕی زوبەیر گێڕایەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: کۆمەڵێ جولەکە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: مردن بۆ ئێوە بێت، عائیشەش ﵂ وتی: لە وتەکەیان تێگەشتم، منیش وتم: مردن و نەفرین با بۆ خۆتان بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عائیشە لەسەر خۆبە، بێگومان خوا لەسەرخۆیی لە هەموو کارەکاندا پێ خۆشە))، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا گوێت لێ بوو چیان ووت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان منیش وتم: لەسەر خۆتان بێ)).**

٦٠٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَالَ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَامُوا إِلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لا تُزْرِمُوهُ». ثُمَّ دَعَا بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَصُبَّ عَلَيْهِ[٢].

**٦٠٢٥-ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە کە عەرەبێکی دەشتەکی لە مزگەوتدا میزی کرد، خەڵکەکەش هەستان بۆی (لێی بدەن)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((میزکردنەکەی پێ مەبڕن))، لە پاشان داوای دۆڵچەیەك ئاوی کرد و کرا بەسەر شوێنەکەیدا.**

(١) بڕوانە: ٢٩٣٥.
(٢) بڕوانە: ٢٢١.

## ٣٦- بابُ تَعَاوُنِ الْمُؤْمِنِينَ بَعْضِهِمْ بَعْضًا

٦٠٢٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَدِّي أَبُو بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ، يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا». ثُمَّ شَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ[1].

## ٣٦- باسی فەزڵی هاوکاری و یارمەتی دانی باوەڕداران بۆ یەکتری

**٦٠٢٦- ئەبو مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمووی: ((باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەك خانوویەکی قایيم وایە، هەندێکی هەندێکی تری بەیەکەوە دەبەستێت))، ئەنجا پەنجەکانی کرد بەناو یەکتریدا.**

٦٠٢٧ - وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ جَالِسًا إِذْ جَاءَ رَجُلٌ يَسْأَلُ أَوْ طَالِبُ حَاجَةٍ، أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا، وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا شَاءَ»[2].

**٦٠٢٧- پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، لە پڕ پیاوێك هات داوای هاوکاری کرد، یا داوای پێویستیەکی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تکای بۆ بکەن تا پاداشت بدرێنەوە، خواش هەر بڕیارێکی بوێ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی دەیدات)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٨١.

(٢) بڕوانە: ١٤٣٢.

**٣٧- بابُ قَوْلِ اللَّهِ** ﷻ: ﴿مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنۡهَاۖ وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٌ مِّنۡهَاۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾﴾ **النساء**

﴿كِفۡلٌ ﴿٨٥﴾﴾ النساء: نَصِيبٌ. قَالَ أَبُو مُوسَى: ﴿كِفۡلَيۡنِ ﴿٢٨﴾﴾ الحديد: أَجْرَيْنِ بِالْحَبَشِيَّةِ.

٦٠٢٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلَاءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدٍ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا أَتَاهُ السَّائِلُ أَوْ صَاحِبُ الْحَاجَةِ قَالَ: «اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا، وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ مَا شَاءَ»(١).

## ٣٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (هەر کەسێک تکایەکی چاکە بکات بەشێکی لە (پاداشتی) ئەو چاکەیەی بۆ هەیە،وە هەر کەسێک تکایەکی خراپە بکات، ئەویش بەشێکی دەبێت لە (سزای) ئەو خراپەیە، وە خوا هەمیشە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە)(٢)

**﴿كِفۡلٌ ﴿٨٥﴾﴾ واتە: بەش. ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿كِفۡلَيۡنِ ﴿٢٨﴾﴾: بەزمانی حەبەشی واتە: دوو پاداشت.**

**٦٠٢٨-ئەبو بوردە لە ئەبو مووساوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە:کاتێ سواڵکەرێ یان خاوەن پێویستیەك بهاتایە بۆ خزمەتی دەیفەرموو: ((تکای بۆ بکەن با پاداشت بدرێنەوە، خواش هەر بڕیارێکی بوێ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی دەیدات)).**

(١) بڕوانە: ١٤٣٢.

(٢) بەتوانایە واتە: چاودێرە.

## ٣٨- بَابٌ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فَاحِشًا وَلاَ مُتَفَحِّشًا

٦٠٢٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ، سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ، سَمِعْتُ مَسْرُوقًا قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو.حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو حِينَ قَدِمَ مَعَ مُعَاوِيَةَ إِلَى الْكُوفَةِ، فَذَكَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: لَمْ يَكُنْ فَاحِشًا وَلاَ مُتَفَحِّشًا، وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَخْيَرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ خُلُقًا»[1].

## ٣٨- باسێک:پێغەمبەرﷺ نەڕەوشت ناشرینی زمان پیس بوو نە لە خۆشی دەوەشاندەوە ڕەوشت ناشرین و زمان پیس بێت

**٦٠٢٩-مەسرووق دەڵێ: چووین بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ کاتێ لەگەڵ موعاویەدا ﷺ هاتبوو بۆکوفە، ئینجا باسی پێغەمبەری ﷺ کرد و وتی: پێغەمبەر ﷺ نە ڕەوشت ناشرینی زمان پیس بوو نە لە خۆشی دەوەشاندەوە، وە وتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان چاکترینتان ئەوانەتانن ڕەوشتی جوانتر بێت)).**

٦٠٣٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ يَهُودَ أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكُمْ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: عَلَيْكُمْ، وَلَعَنَكُمُ اللَّهُ، وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ. قَالَ: «مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ، وَإِيَّاكِ وَالْعُنْفَ وَالْفُحْشَ». قَالَتْ: أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: «أَوَلَمْ تَسْمَعِي مَا قُلْتُ؟ رَدَدْتُ عَلَيْهِمْ، فَيُسْتَجَابُ لِي فِيهِمْ، وَلاَ يُسْتَجَابُ لَهُمْ فِيَّ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٥٥٩.

(٢) بڕوانە: ٢٩٣٥.

**٦٠٣٠-عەبدوڵڵای كوڕی مولەیكە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە كە جولەكەكان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتیان: مردن بۆ ئێوە، عائیشەش ﵂ وتی: (مردن) بۆ خۆتان و نەفرینی خوا و غەزبی خواتان لەسەر بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە هێواش و لەسەر خۆبە، توند و زبر و ڕەوشت و زمان پیس مەبە))، عائیشە وتی: ئایا گوێت لێنەبوو چییان وت؟ فەرمووی: ((ئەی تۆش گوێت لێ نە بوو من چیم وت؟ وەڵامم دانەوە، ئینجا دووعاكەی من دەربارەیان قبووڵ دەكرێت، بەڵام دوعاكەی ئەوان دەربارەی من قبوڵ ناكرێت)).**

٦٠٣١- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو يَحْيَى -هُوَ فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ- عَنْ هِلاَلِ بْنِ أُسَامَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ سَبَّابًا وَلاَ فَحَّاشًا وَلاَ لَعَّانًا، كَانَ يَقُولُ لأَحَدِنَا عِنْدَ الْمَعْتَبَةِ «مَا لَهُ تَرِبَ جَبِينُهُ»[(١)].

**٦٠٣١-ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نە جنێو فرۆش بووە نە ڕەوشت ناشرینی زمان پیس بووە، نەنەفرین كەر بووە، لە كاتی سەرزەنشتدا بەكەسێكمانی دەفەرموو: ((ئەوە چییەتی بەسەردا بدات بە زەوییدا)).**

٦٠٣٢- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَوَاءٍ، حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ الْقَاسِمِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَجُلاً اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا رَآهُ قَالَ: «بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ، وَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ». فَلَمَّا جَلَسَ تَطَلَّقَ النَّبِيُّ ﷺ فِي وَجْهِهِ وَانْبَسَطَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا انْطَلَقَ الرَّجُلُ قَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، حِينَ رَأَيْتَ الرَّجُلَ قُلْتَ لَهُ كَذَا وَكَذَا، ثُمَّ تَطَلَّقْتَ فِي وَجْهِهِ وَانْبَسَطْتَ إِلَيْهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ، مَتَى عَهِدْتِنِي فَحَّاشًا؟ إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ شَرِّهِ»[(٢)].

(١) بڕوانە: ٦٠٤٦.
(٢) بڕوانە: ٦٠٥٤، ٦١٣١.

٦٠٣٢- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ خواست بێتە خزمەتی، ئینجا کە بینی فەرمووی: ((ئای چەن کەسێکی خراپی هۆزەکەیەتی، وە ئای چەن کوڕێکی خراپی هۆزەکەیەتی))، ئینجا کە دانیشت پێغەمبەر ﷺ ڕووی خۆشی دایە و قسەی خۆشی لەگەڵ کرد، ئینجا کە پیاوەکە ڕۆشت عائیشە بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ پیاوەکەت بینی ئەوە و ئەومت پێ وت، پاشان ڕووت خۆش بوو لەگەڵی و قسەت لەگەڵ کرد بەجوانی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە کەی منت دیوە ڕەوشت و زمان ناشرین بم؟ بەڕاستی خراپترین کەس لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە خەڵکی لەبەر خۆپاراستن لە شەڕ و خراپەی وازی لێ بێنن)).

## ٣٩- بابُ حُسْنِ الخُلُقِ وَالسَّخَاءِ، وَمَا يُكْرَهُ مِنَ الْبُخْلِ

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَأَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ. وَقَالَ أَبُو ذَرٍّ لَمَّا بَلَغَهُ مَبْعَثُ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ لأَخِيهِ: ارْكَبْ إِلَى هذا الوَادِي، فَاسمَعْ مِنْ قَوْلِهِ. فَرَجَعَ فَقَالَ: رَأَيْتُهُ يَأْمُرُ بِمَكَارِمِ الأَخْلَاقِ[1].

## ٣٩- باسی (گەورەیی) ڕەوشتی جوان و بەخشندەیی و ئەوەی کە ناپەسەندە لە ڕژدەیی و ڕەزیلی

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە بەخشندەترین کەس بوو بەڵام لە ڕەمەزاندا، لە هەموو کات زیاتر بەخشندەتر بوو.

-ئەبو زەڕ ﷺ کاتێ هەواڵی ناردنی پێغەمبەری ﷺ پێ گەیشت وتی بەبراکەی[1]: سواربە بڕۆ بۆ ئەو شیوەی مەککە و گوێ بگرە لە وتەکانی (ئەو پێغەمبەرە)، ئەویش گەڕایەوە وتی: بینیم فەرمان دەکات بە ئاکار و ڕەوشتە جوانەکان.

(١) بڕوانە: ٣٥٢٢.

٦٠٣٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ -هُوَ ابْنُ زَيْدٍ- عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ، وَأَجْوَدَ النَّاسِ، وَأَشْجَعَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَانْطَلَقَ النَّاسُ قِبَلَ الصَّوْتِ، فَاسْتَقْبَلَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ سَبَقَ النَّاسَ إِلَى الصَّوْتِ وَهْوَ يَقُولُ: «لَنْ تُرَاعُوا، لَنْ تُرَاعُوا». وَهْوَ على فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ مَا عَلَيْهِ سَرْجٌ، فِي عُنُقِهِ سَيْفٌ، فَقَالَ: «لَقَدْ وَجَدْتُهُ بَحْرًا». أَوْ: «إِنَّهُ لَبَحْرٌ»[٢].

**٦٠٣٣- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جوانترین کەس بوو، بەخشندەترین کەس بوو، وە ئازاترین کەس بوو، بێگومان شەوێك خەڵکی مەدینە ترسان، ئەنجا خەڵکی ڕوو بە دەنگ و باسەکە دەرچوون، پێغەمبەریش ﷺ بەرەو ڕوویان هات، کە بێگومان پێش خەڵکەکە کەوتبوو لە بەدەمەوە چوونی دەنگ و باسەکەدا، وە دەیفەرموو: ((مەترسن، مەترسن))، کە بەسواری ئەسپێکی ئەبو تەڵحەوە بوو ئەسپەکە زین نەکرابوو و شمشێرێکیشی لە ملدا بوو، جافەرمووی: ((وەڵڵاهی وامزانی دەریایە)) یان((دەڵێی دەریایە)).**

٦٠٣٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا ﷺ يَقُولُ: مَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شَيْءٍ قَطُّ فَقَالَ: لاَ.

**٦٠٣٤-ئیبنو لمونکەدیر دەڵێ: لە جابیرم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز پرسیاری هیچ شتێکی لێ نەکراوە وتبێتی: نەخێر.**

٦٠٣٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي شَقِيقٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو يُحَدِّثُنَا، إِذْ قَالَ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاحِشًا وَلاَ مُتَفَحِّشًا، وَإِنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاَقًا»[٣].

---

(١) کە ناوی ئەنیس بوو.بڕوانە: إرشاد الساري:٥٦/١٣.

(٢) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٣) بڕوانە: ٣٥٥٩.

**٦٠٣٥- مەسروق دەڵێ: ئێمە لای عەبدوڵلای كوڕی عەمر ﵄ دانیشتبووین فەرموودەی بۆ دەگێڕاینەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوشت ناشیرینی زمان پیس نەبوو، ڕەوشت ناشیرینی و زمان پیسیشی لەخۆی نەدەوەشاندەوە، وە هەمیشە دەیفەرموو: ((بێگومان چاكترینتان ئەوانەتانن ڕەوشتان جوانترە)).**

٦٠٣٦- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِبُرْدَةٍ فَقَالَ سَهْلٌ لِلْقَوْمِ: أَتَدْرُونَ مَا الْبُرْدَةُ؟ فَقَالَ الْقَوْمُ: هِيَ شَمْلَةٌ. فَقَالَ سَهْلٌ: هِيَ شَمْلَةٌ مَنْسُوجَةٌ فِيهَا حَاشِيَتُهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَكْسُوكَ هَذِهِ. فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ ﷺ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، فَلَبِسَهَا، فَرَآهَا عَلَيْهِ رَجُلٌ مِنَ الصَّحَابَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا أَحْسَنَ هَذِهِ! فَاكْسُنِيهَا. فَقَالَ: «نَعَمْ». فَلَمَّا قَامَ النَّبِيُّ ﷺ لاَمَهُ أَصْحَابُهُ قَالُوا: مَا أَحْسَنْتَ حِينَ رَأَيْتَ النَّبِيَّ ﷺ أَخَذَهَا مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، ثُمَّ سَأَلْتَهُ إِيَّاهَا، وَقَدْ عَرَفْتَ أَنَّهُ لاَ يُسْأَلُ شَيْئًا فَيَمْنَعَهُ. فَقَالَ: رَجَوْتُ بَرَكَتَهَا حِينَ لَبِسَهَا النَّبِيُّ ﷺ لَعَلِّي أُكَفَّنُ فِيهَا[1].

**٦٠٣٦- ئەبو غەسسان دەڵێ: ئەبو حازیم بۆی گێڕامەوە لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﵁ وتی: ئافرەتێك بالاپۆشێكی شاڵی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، سەهل ووتی بە خەڵكەكە: دەزانن بالاپۆش چییە؟ خەڵكەكەش وتیان: بەڵێ دەزانین عابایەكە قەراغەكانی چنراوە، ئافرەتەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم عابایەت دەدەمێ لەبەری بكەیت، پێغەمبەریش ﷺ پێویستی پێی بوو لێی وەرگرت، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ ئەو عابایەی پۆشیبوو، پیاوێك لە هاوەڵان بینی لەبەریدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئای چەند عابایەكی جوانە بیدە بەمن بیپۆشم. فەرمووی: ((بەڵێ باشە))، ئەنجا كە پێغەمبەر ﷺ هەستا هاورێكانی سەرزەنشتیان كرد و وتیان: كارێكی باشت نەكرد كەبینیت پێغەمبەر ﷺ بۆیە وەریگرت پێویستی پێی بوو، پاشان تۆ داوای**

(١) بروانە: ١٢٧٧.

عاباکەت لێ کرد، بێگومان دەتزانی پێغەمبەر ﷺ داوای هەر شتێکی لێ بکرێت ڕەدی ناکاتەوە، پیاوەکەش وتی: بەهیوای فەڕ و بەرەکەتی عاباکە بووم کە پێغەمبەر ﷺ لەبەری کردبوو، بەڵکو پێیەوە کفن بکرێم.

٦٠٣٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ وَيَنْقُصُ العَمَلُ، وَيُلْقَى الشُّحُّ وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ». قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ الْقَتْلُ»[1].

٦٠٣٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کات نزیك دەبێتەوە کردەوە (یان زانست) کەم دەبێتەوە، ڕژدەیی دەخرێتە نێوان خەڵکەوە هەرەج زۆر دەبێت))، عەرزیان کرد هەرەج چییە؟ فەرمووی: ((کوشتنە کوشتن)).

٦٠٣٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، سَمِعَ سَلاَّمَ بْنَ مِسْكِينٍ قَالَ: سَمِعْتُ ثَابِتًا يَقُولُ: حَدَّثَنَا أَنَسٌ ﷺ قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا قَالَ لِي: أُفٍّ. وَلاَ: لِمَ صَنَعْتَ؟ وَلاَ: أَلاَّ صَنَعْتَ؟[2].

٦٠٣٨-ئەنەس ﷺ دەڵێ: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ کرد، بەڵام جارێ پێی نەوتم: ئۆف، وە نەیوتوە: بۆ وات کرد؟ وە نەیوتوە: بۆ وات نەکرد؟)).

## ٤٠- بابٌ: كَيْفَ يَكُونُ الرَّجُلُ فِي أَهْلِهِ؟

٦٠٣٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْنَعُ فِي أَهْلِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ[1].

---

(١) بڕوانە: ٨٥.

(٢) بڕوانە: ٢٧٦٨.

## ٤٠- باسێک: پیاو دەبێ حاڵی چۆن بێت لە ناو ماڵ و منداڵی خۆیدا؟

٦٠٣٩- ئەسوەد دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﵂ کرد پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی خۆیدا چ شتێکی دەکرد؟ عائیشەش وتی: پێغەمبەر ﷺ هەردەم لە خزمەتی کارەکانی خاو خێزانیدا بوو، بەڵام کە نوێژ دەبوو هەڵدەسا بۆ نوێژەکەی.

## ٤١- بَابُ المِقَةِ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى

٦٠٤٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا، فَأَحِبَّهُ. فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا، فَأَحِبُّوهُ. فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي أَهْلِ الأَرْضِ»[٢].

## ٤١- باسی خۆش ویستن لە خوای بەرز و بڵندەوە

٦٠٤٠- ئەبو هورەیرە[٣] ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆش ویست جیبریل ﵇ بانگ دەکات (و پێی دەفەرموێ): بێگومان خوا فلان کەسی خۆش دەوێ تۆش خۆشت بوێ، جیبریلیش ﵇ خۆشی دەوێ، ئەنجا جیبریل بە ناو خەڵکی ئاسماندا جاڕ دەدات، بێگومان خوا فلان کەسی خۆش دەوێ، کەواتە ئێوەش خۆشتان بوێ، ئەوسا خەڵکی ئاسمانیش خۆشیان دەوێ، پاشان لە (ناوی خەڵك) سەر زەوییدا قبوڵ و پەسەند دەکرێت (و خۆشەویست دەبێت) )).

---

(١) بڕوانە: ٦٧٦.

(٢) بڕوانە: ٣٢٠٩.

(٣) ئەم فەرموودە دوو ڕێگە و سەنەدی هەیە پێی گێڕدراوەتەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﵁.

## ٤٢- بابُ الحُبِّ فِي اللهِ

٦٠٤١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَجِدُ أَحَدٌ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ حَتَّى يُحِبَّ الْمَرْءَ، لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَحَتَّى أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ، وَحَتَّى يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا»[1].

## ٤٢- باسی خۆش ویستن لەبەر خوا

**٦٠٤١- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((هیچ كەسێك شیرینی باوەڕ هەست پێ ناكات، هەتا (نەگاتە ئەوەی) كەسێكی خۆش بوێ تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێ، وە هەتا ئەگەر فڕێ بدرێتە ناو ئاگر لای خۆشتر بێ لەوەی كە بگەڕێتەوە بۆ بێ باوەڕی، پاش ئەوەی خوا ڕزگاری كردوە (لێی)، وە هەتا خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ لای خۆشەویستر بێت لە غەیر خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ)).**

## ٤٣- بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ﴾ إلى قوله: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١﴾ الحجرات

٦٠٤٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَضْحَكَ الرَّجُلُ مِمَّا يَخْرُجُ مِنَ الأَنْفُسِ، وَقَالَ: «بِمَ يَضْرِبُ أَحَدُكُمُ امْرَأَتَهُ ضَرْبَ الْفَحْلِ أَو العَبدِ، ثُمَّ لَعَلَّهُ يُعَانِقُهَا». وَقَالَ الثَّوْرِيُّ وَوُهَيْبٌ وَأَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنْ هِشَامٍ: «جَلْدَ الْعَبْدِ»[2].

(١) بڕوانە: ١٦.
(٢) بڕوانە: ٣٣٧٧.

## ٤٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با هیچ کۆمەڵە پیاوێکتان گاڵتە نەکەن بە کۆمەڵێکی تریان، ڕەنگە گاڵتە پێکراوەکان لە گاڵتە کەرەکان باشتر بن (لای خوا)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە (ئەوە ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن))

**٦٠٤٢-هیشام له باوكیەوه دەگێڕێتەوه له عەبدوڵلای كوڕی زەمعەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كرد لەوەی كەسێك پێ بكەنێت بەوەی له مرۆڤەكان دەردەچێ[1]، وە فەرمووی: لەبەر چی كەسێكتان وەك لێدانی گا یان كۆیله دەدات له ژنەكەی، دواتر لەوانەیە دەست بكاتە ملی (و لەگەڵی بخەوێ).**

**-سەوری و ووهەیب و ئەبو موعاویە له هیشامەوه گێڕایانەتەوه بەم شێوەیە (وەك لێدانی كۆیله[2])**

.٦٠٤٣- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، أَخْبَرَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ بِمِنًى: «أَتَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «فَإِنَّ هَذَا يَوْمٌ حَرَامٌ، أَفَتَدْرُونَ أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «بَلَدٌ حَرَامٌ، أَتَدْرُونَ أَيُّ شَهْرٍ هَذَا؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «شَهْرٌ حَرَامٌ». قَالَ: «فَإِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا»[3].

---

(١) لەتڕ و ترس.

(٢) واته: له ڕێگەی ئەم چەند كەسەوه فەرمووده‌كه له جیاتی (لێدانی گا) به (لێدانی كۆیله) گێڕدراوەتەوه.

(٣) بڕوانە: ١٧٤٢.

**٦٠٤٣- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مینا فەرمووی: ((ئایا دەزانن ئەمە چ ڕۆژێکە؟)) وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ((بێگومان ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی ڕێزدارە و تاوان تێیدا حەرامە، ئەی ئایا دەزانن ئەم شارە چ شارێکە؟)) وتیان: خوا پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ((شارێکی ڕێزداری تاوان تیا حەرام کراوە، ئایا دەزانن ئەم مانگە چ مانگێکە؟)) وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ((مانگێکی ڕێزدارە تاوان تیادا حەرام کراوە)) فەرمووی: ((جا بەڕاستی خوا خوێنتان و سامانتان و ناموستانی لە یەکتر حەرام کردوە، وەك حەرامیەتی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتاندا لەم شارەتاندا)).**

## ٤٤- بَابُ مَا يُنْهَى مِنَ السِّبَابِ وَاللَّعْنِ

٦٠٤٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ يُحَدِّثُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ». تَابَعَهُ غُنْدَرٌ، عَنْ شُعْبَةَ[1].

## ٤٤- باسی ئەوەی ڕێگری لێ کراوە لە جنێودان[2] و نەفرین کردن

**٦٠٤٤- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((جنێودان بە مسوڵمان دەرچوونە لە دینداری ڕاستەقینە، وە جەنگ کردنیش لە دژی کوفر و بێ باوەڕییە)).**

**-غوندەر لە شوعبەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سولەیمانی کوڕی حەربی کردوە.**

---

(١) بڕوانە: ٤٨.

(٢) سباب: دەکرێت بە جنێو دان بەیەکتریش مانا بکرێت، چونکە لە بابی تەفاعولەکە بۆ هاوبەشی بەکاردێت.

٦٠٤٥- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنِ الْحُسَيْنِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ يَعْمَرَ، أَنَّ أَبَا الأَسْوَدِ الدِّيلِيَّ حَدَّثَهُ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفُسُوقِ، وَلاَ يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ، إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ»[1].

**٦٠٤٥-ئەبو ئەسوەدی دیلیی لە ئەبی زەڕەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((هیچ کەسێك کەسێك تۆمەتبار ناکات بە دەرچوون لە دین یا تۆمەتی کوفری ناداتە پاڵ، ئیللا ئەو تۆمەتە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە ئەگەر هاوڕێکەی بەو جۆرە نەبێت[2]))**

.٦٠٤٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا هِلاَلُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاحِشًا وَلاَ لَعَّانًا وَلاَ سَبَّابًا، كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْمَعْتَبَةِ: «مَا لَهُ، تَرِبَ جَبِينُهُ»[3].

**٦٠٤٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەڕەوشت ناشرینی زمان پیس بووە، نە نەفرین کەر بووە، نە جنێو فرۆش بووە، لەکاتی سەرزەنشت دا دەیفەرموو: ((ئەوە چییەتی، بەناو چاوانیدا بدات بە زەوییدا[4])).**

٦٠٤٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، أَنَّ ثَابِتَ بْنَ الضَّحَّاكِ -وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ- حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى مِلَّةٍ غَيْرِ الإِسْلاَمِ فَهْوَ كَمَا قَالَ، وَلَيْسَ عَلَى ابْنِ آدَمَ

---

(١) بروانە: ٣٥٠٨.

(٢) بەرامبەرەکەی ئەو تۆمەتەی بۆی کراوە ڕاست نەبێت و تیایا نەبێت.

(٣) بروانە: ٦٠٣١.

(٤) یان ناوچاوانی خۆڵاوی بێت.

نَذْرٌ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ فِي الدُّنْيَا عُذِّبَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ لَعَنَ مُؤْمِنًا فَهْوَ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ قَذَفَ مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهْوَ كَقَتْلِهِ»[١].

**٦٠٤٧- ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە کە سابیتی کوڕی زەححاك-کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی (پەیماندەری) ژێر درەختەکە[٢] - بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك سوێند بخوات بەئاینێك جگەلە ئیسلام ئەوە بەو جۆرەیە کە وتوویەتی[٣]، وە هیچ کەسێك بەجێ هێنانی نەزری لەسەر نییە لەشتێکدا کە ئەو خاوەنی نییە، هەر کەسێکیش لە دونیادا بەشتێك خۆی بکوژێت لە قیامەتدا بەهەمان شت سزا دەدرێت، هەر کەسێکیش نەفرین لە باوەڕدارێ بکات ئەوە وەك کوشتنی وایە، هەر کەسێکیش باوەڕدارێك تۆمەتبار بکات بەبێ باوەڕی، ئەوە وەك کوشتنی وایە)).**

٦٠٤٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ صُرَدٍ -رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَغَضِبَ أَحَدُهُمَا، فَاشْتَدَّ غَضَبُهُ حَتَّى انْتَفَخَ وَجْهُهُ وَتَغَيَّرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ عَنْهُ الَّذِي يَجِدُ». فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ الرَّجُلُ فَأَخْبَرَهُ بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ: تَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ. فَقَالَ: أَتُرَى بِي بَأْسٌ؟ أَمَجْنُونٌ أَنَا؟ اذْهَبْ[٤].

**٦٠٤٨-عەدیی کوڕی سابیت دەڵێ: لە سولەیمانی کوڕی سورەدم ﷺ بیست-کە پیاوێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وتی: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ جنێویان دا بەیەکتری، ئینجا یەکێکیان تووڕە بوو بە تووڕەبونێکی زۆر هەتا دەم و چاوی ئاوساو**

---

(١) بڕوانە: ١٣٦٣.

(٢) کەبە (الشجرە الرضوان) ناسراو بوو، پێغەمبەر ﷺ لە ژێریدا پەیمانی لە هاوەڵان وەرگرت.

(٣) واتە: ئەو کەسە وتەکەی خۆی بەسەریدا دەچەسپێ ئەگەر وتەکەی ڕاست نەبوو، وە ئەگەر ڕاستی کرد ئەوە بەسەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ سەر ئاینی ئیسلام.

(٤) بڕوانە: ٣٢٨٢.

و ڕەنگی تێك چوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی من وتەیەك دەزانم ئەگەر ئەو كەسە بیڵێ بێگومان ئەو توڕەییەی هەیەتی نامێنێت و دەڕوا))، پیاوێكیش ڕۆشت بۆ لای و فەرموودەكەی پێغەمبەری ﷺ پێ وت، فەرمووی: پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتانی دەركراو لە ڕەحمەتی خوا،كابرا وتی: تۆ وا گومان دەبەیت من شتێكم بێت؟ بۆ من شێتم[1]؟ بڕۆ (بەلای ئیش و كارتەوە).

٦٠٤٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: حَدَّثَنِي عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُخْبِرَ النَّاسَ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَتَلَاحَى رَجُلَانِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خَرَجْتُ لأُخْبِرَكُمْ، فَتَلَاحَى فُلَانٌ وَفُلَانٌ، وَإِنَّهَا رُفِعَتْ، وَعَسَى أَنْ يَكُونَ خَيْرًا لَكُمْ، فَالْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالْخَامِسَةِ»[2].

٦٠٤٩- عوبادەی كوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ هاتە دەرەوە، بۆ ئەوەی شەوی قەدر بە مسوڵمانان ڕاگەیەنێ، لەو كاتەدا دوو پیاوی مسوڵمان هەرا و كێشەیان بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((من هاتمە دەرەوە تا پێتان بڵێم شەوی قەدر چ شەوێكە، بەڵام فلان كەس و فلان كەس بوو بە هەرا و كێشەیان بەهۆیەوە لەبیرم برایەوە، بەڵكو لەبیر برانەوەكەم چاكتر بێت بۆتان، ئێوە لە شەوی بیست و حەوت و بیست و نۆ و بیست و پێنجی ڕەمەزاندا بگەڕێن بۆ شەوی قەدر)).

٦٠٥٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنِ المَعْرُورِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلَيْهِ بُرْدًا[3] وَعَلَى غُلَامِهِ بُرْدًا فَقُلْتُ: لَوْ أَخَذْتَ هَذَا فَلَبِسْتَهُ كَانَتْ حُلَّةً، وَأَعْطَيْتَهُ

---

(١) وایزانی ئەو دوعایە بۆ شێتە.

(٢) بڕوانە: ٤٩.

(٣) بُرْد: بەرگ و پۆشاكی خەتخەتە، سەر بەرگێكە لە خوری ڕەشە لە خۆوە دەپێچرێت (ئەلمونجید بەكوردی :١٤٣/١).

ثَوْبًا آخَرَ. فَقَالَ: كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ كَلاَمٌ، وَكَانَتْ أُمُّهُ أَعْجَمِيَّةً، فَنِلْتُ مِنْهَا، فَذَكَرَنِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لِي: «أَسَابَبْتَ فُلاَنًا؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «أَفَنِلْتَ مِنْ أُمِّهِ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ». قُلْتُ: عَلَى حِينِ سَاعَتِي هَذِهِ مِنْ كِبَرِ السِّنِّ! قَالَ: «نَعَمْ، هُمْ إِخْوَانُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ جَعَلَ اللَّهُ أَخَاهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ يُكَلِّفُهُ مِنَ الْعَمَلِ مَا يَغْلِبُهُ، فَإِنْ كَلَّفَهُ مَا يَغْلِبُهُ فَلْيُعِنْهُ عَلَيْهِ»[1].

**٦٠٥٠-مەعرور لە ئەبی زەڕەوە ﷺ دەگێڕێتەوە مەعرور دەڵێ: ئەبو زەڕم بینی پۆشاکێکی بەنرخی لەبەردابوو، غوڵامەکەشی پۆشاکێکی بەنرخی لەبەر دابوو، منیش پێم وت: ئەگەر ئەو پۆشاکەی ئەوت لێ وەرگرتایە و لەبەرت کردایە (بەسەر کراسەکەی خۆتدا) دەبوویە دوو پۆشاك، پۆشاکێکی (ئاسایی) ترت بدایە بە ئەو، ئەبو زەڕ ﷺ وتی: لە نێوان من و پیاوێکدا (بیلال ﷺ ) قسە (پێ وتنێك) ڕوویدا و دایکی غەیرە عەرەب بوو، جنێوم بەدایکیدا، ئەویش لای پێغەمبەر ﷺ سکالای لێ کرد، ئەویش فەرمووی پێم: ((ئایا جنێوت داوە بە فلاّنە کەس؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((ئایا قسەت بەدایکی وت؟)) وتم: بەڵێ،فەرمووی: ((بەڕاستی تۆ کەسێکی ڕەوشتی نەفامیت تێدایە))، وتم: لەم کات و ساتەمدا بەم تەمەنی پیرییەمەوە ! فەرمووی: ((بەڵێ، ئەوان برای ئێوەن، خوا خستونیەتە ژێر دەستی ئێوەوە، جا هەر کەسێك خوا براکەی خستە ژێر دەستی با لەوەی خۆی دەیخوات دەرخواردی ئەویش بدات، وە لەوەی خۆی دەیپۆشێ پۆشاکێکیش بۆ ئەو بکات، وە کارێکی لێ داوا نەکات کە لەتوانایدا نییە، وە ئەگەر کارێکی پێ سپارد لە توانایدا نەبوو با یارمەتی بدات بۆ ئەنجامدانی کارەکە)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٠.

## ٤٥- بابُ مَا يَجُوزُ مِنْ ذِكْرِ النَّاسِ نَحْوَ قَوْلِهِمُ: الطَّوِيلُ وَالْقَصِيرُ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "مَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ؟ ". وَمَا لَا يُرَادُ بِهِ شَيْنُ الرَّجُلِ.

٦٠٥١- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى خَشَبَةٍ فِي مُقَدَّمِ الْمَسْجِدِ، وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا، وَفِي الْقَوْمِ يَوْمَئِذٍ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ فَقَالُوا: قَصُرَتِ الصَّلَاةُ. وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُوهُ ذَا الْيَدَيْنِ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَنَسِيتَ أَمْ قَصُرَتْ؟. فَقَالَ: «لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تَقْصُرْ». قَالُوا: بَلْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «صَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ». فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ، ثُمَّ وَضَعَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ[1].

## ٤٥- باسی ئەوەی کە دروستە لە باسی خەڵک وەک بڵێ:درێژ و کورت [2]

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست درێژەکە چی دەڵێ؟ وە باسی (خەڵك بەشتێ) کە مەبەست پێی ناشرین کردنی کەسەکە نەبێت.**

**٦٠٥١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین دوو ڕکاتی کرد و پاشان سەلامی دایەوە، لە پاشان هەستا و ڕۆشت بۆ لای ئەو تەختەی لە پێشەوەی مزگەوتدا بوو، هەردوو دەستی خستە سەری، لەو ڕۆژەدا ئەبو بەکر و عومەر ﷺ لە ناو خەڵکەکەدا بوون، بەڵام نەیان وێرا قسەی لەگەڵ بکەن، وە ئەوانەی بە پەلە بوون چونەدەرەوە و وتیان: نوێژ کورت**

---

(١) بڕوانە: ٤٨٢.

(٢) واتە: باڵای درێژە یا کورتە حەرام نییە و دروستە.

بۆتەوە؟ وە لە ناو خەڵکەکەدا پیاوێکی تیا بوو پێغەمبەر ﷺ بەدەست درێژ بانگی دەکرد، جا ئەو پیاوە وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ:ئایا لەبیرت چوو (دوورکاتت نەکرد)، یان نوێژ کورت بۆتەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لە بیرم نەچووە و کورتیش نەبۆتەوە)) خەڵکەکە وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (دوو ڕکاتت) لە بیر چوو، فەرموو: ((دەست درێژەکە ڕاستی وت))، ئینجا هەستا و دوو ڕکات نوێژی کرد و پاشان سەلامی دایەوە، لە پاشان ئەڵڵاهو ئەکبەری کرد و سوژدەی برد وەکو سوژدەکانی تری یان درێژتر، پاشان سەری بەرز کردەوە لە سوژدە و ئەڵڵاهو ئەکبەری کرد، پاشان سوژدەی بردەوە وەکو سوژدەکانی تری یان درێژتر، پاشان سەری بەرز کردەوە لە سوژدە و ئەڵڵاهوئەکبەری کرد.

## ٤٦- بابُ الغِيبَةِ، وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ الحجرات

٦٠٥٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: سَمِعْتُ مُجَاهِدًا يُحَدِّثُ عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى قَبْرَيْنِ فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا هَذَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ، وَأَمَّا هَذَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ». ثُمَّ دَعَا بِعَسِيبٍ رَطْبٍ، فَشَقَّهُ بِاثْنَيْنِ، فَغَرَسَ عَلَى هَذَا وَاحِدًا وَعَلَى هَذَا وَاحِدًا، ثُمَّ قَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢١٦.

## ٤٦- باسی (حەرامیەتی) غەیبەت کردن، وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لە پاشملە بە خراپە باسی یەک مەکەن،ئایا کام لە ئێوە پێی خۆشە گۆشتی برا (ئاینی یەکەی) بخوات؟ بەمردوویی،بێگومان قێزتان لێی دەبێتەوە و پێتان ناخۆشە، وە لە خوا بترسن بێگومان خوا تەوبە گیراکەری بەبەزەییە)

٦٠٥٢- عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای دوو گۆڕدا و فەرمووی: ((بێگومان ئەم دوو (مردووە) سزا دەدرێن، وە لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن، جا ئەمەیان خۆی نەدەپاراست لە (پرژی) میزەکەی، ئەوەشیان دووزمانی دەکرد لە نێوان خەڵکیدا))، پاشان داوای پەلی دار خورمایەکی تەڕی کرد و کردی بەدوو لەتەوە، لەسەر ئەم گۆڕەیان دانەیەکیانی ناشت، وە لەسەر ئەوەشیان دانەیەکیانی ناشت، پاشان فەرمووی: ((بەڵکو سزایان لێ سووك بکرێ مادام ووشك نەبن)).

## ٤٧- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «خَيْرُ دُورِ الأَنْصَارِ»

٦٠٥٣- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خَيْرُ دُورِ الأَنْصَارِ بَنُو النَّجَّارِ»[1].

## ٤٧- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((چاکترین ماڵی ئەنصارییەکان))

٦٠٥٣-ئەبو ئوسەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((چاکترینی ماڵی ئەنصارییەکان بەنو نەججارن)).

(١) بروانە: ٣٧٨٩.

## ٤٨- بَابُ مَا يَجُوزُ مِنِ اغْتِيَابِ أَهْلِ الْفَسَادِ وَالرِّيَبِ

٦٠٥٤- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، سَمِعْتُ ابْنَ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ أَخْبَرَتْهُ قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «ائْذَنُوا لَهُ، بِئْسَ أَخُو العَشِيرَةِ أَوِ ابْنُ العَشِيرَةِ». فَلَمَّا دَخَلَ أَلاَنَ لَهُ الْكَلاَمَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ الَّذِي قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الكَلاَمَ! قَالَ: «أَيْ عَائِشَةُ، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ -أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ- اتِّقَاءَ فُحْشِهِ»[1].

## ٤٨- باسی ئەوەی دروستە لە غەیبەت کردنی خەڵکی خراپ و گوماناوی

**٦٠٥٤- عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێ عائیشە ﵂ بۆی گێڕاینەوە و وتی: پیاوێك مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواست بێتە خزمەتی، ئەویش فەرمووی: ((مۆڵەتی بدەن ئای چەن برایەکی خراپی هۆزەکەیەتی، یان ئای چەن کوڕێکی خراپی هۆزەکەیەتی))، ئینجا کە هاتە ژوورەوە پێغەمبەر ﷺ قسەی خۆشی لەگەڵ کرد، (عائیشە دەڵێ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر ئەوەت فەرموو کە فەرمووت، پاشان بەنەرم و نیان قسەت لەگەڵ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە بەڕاستی خراپترین کەس ئەو کەسەیە خەڵکی وازی لێ بێنن- یان خەڵکی دوورکەونەوە لێی- لەبەر خۆپاراستن لە شەڕ و خراپەی)).**

## ٤٩- بَابٌ: النَّمِيمَةُ مِنَ الكَبَائِرِ

٦٠٥٥- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ بَعْضِ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ، فَسَمِعَ صَوْتَ

(١) بڕوانە: ٦٠٣٢.

إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا فَقَالَ: «يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرَةٍ، وَإِنَّهُ لَكَبِيرٌ، كَانَ أَحَدُهُمَا لاَ يَسْتَتِرُ مِنَ الْبَوْلِ، وَكَانَ الآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ». ثُمَّ دَعَا بِجَرِيدَةٍ فَكَسَرَهَا بِكِسْرَتَيْنِ أَوْ ثِنْتَيْنِ، فَجَعَلَ كِسْرَةً فِي قَبْرِ هَذَا، وَكِسْرَةً فِي قَبْرِ هَذَا، فَقَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا»[1].

## ٤٩- باسێک: دوو زمانی کردن [2] لە تاوانە گەورەکانە

**٦٠٥٥- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە باخێك لە باخەکانی مەدینە هاتە دەرەوە گوێی لە دەنگی دوو کەس بوو لەگۆڕەکانیاندا سزا دەدران، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەم دوانە سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن، بێگومان گوناهێکی گەورەشە، یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە پرژی میزەکەی، ئەوەی تریان لە نێوان خەڵکدا دوو زمانی دەکرد))، پاشان داوای پەلێکی دار خورمای کرد، (هێنایان) کردی بەدوو لەتەوە یان کردی بە دووان، ئینجا لەسەر ئەم گۆڕەیان لەتێکیانی دانا (ناشتی)، لەتەکەی تریانی لەسەر گۆڕەکەی تر دانا (ناشتی)، فەرمووی: ((بەڵکو لە سزاکەیان سووك بکەن مادام وشك نەبن)).**

## ٥٠- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ النَّمِيمَةِ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ ﴾ القلم، ﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ﴾ الهمزة. يَهْمِزُ وَيَلْمِزُ: يَعِيبُ، واحد.

(١) بڕوانە: ٢١٦.

(٢) قسە هێنان و بردنیشی پێ دەوترێت.

٦٠٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ رَجُلاً يَرْفَعُ الْحَدِيثَ إِلَى عُثْمَانَ. فَقَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ».

## ٥٠- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە دووزمانی کردن

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (پیتك گری ئامۆشکەر بۆ قسە هێنان و بردن).**

**سزا و لە ناوچوون بۆ هەموو نەنگ گرێکی بەدگۆ[1]) (يَهْمِزُ) و (يَلْمِزُ) عەیب دەگرێ، بەیەك مانا دێن.٦٠٥٦-هەممام دەڵێ: ئێمە لەگەڵ حوزەیفەدا ﷺ بووین، جا پێی وترا: پیاوێك قسە (ی خەڵك) دەبات بۆعوسمان ﷺ [2] وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((دووزمان ناچێتە بەهەشتەوە)).**

## ٥١- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾﴾ الحج

٦٠٥٧- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ [عَنْ أَبِيهِ] عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ وَالْجَهْلَ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ». قَالَ أَحْمَدُ: أَفْهَمَنِي رَجُلٌ إِسْنَادَهُ[3].

## ٥١- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە خۆتان بپارێزن لە قسەی درۆ و ناڕەوا)

**٦٠٥٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس واز لە درۆ و کارکردن بە درۆ و بێ ئاگایی و نەفامی نەهێنێ، ئەوە خوا هیچ**

---

(١) واتە: عەیب گرێکی تانەدەر.

(٢) واتە:دووزمانی دەکات قسە دەهێنێ و دەبات.

(٣) بڕوانە: ١٩٠٣.

پێویستێکی بەوە نییە کە ئەو کەسە واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێت)).

ئەحمەد وتی: پیاوێك لە ڕشتەی ئەم فەرموودەیە تێی گەیاندم و دڵنیا بووم.

## ٥٢- بابُ مَا قِيلَ فِي ذِي الْوَجْهَيْنِ

٦٠٥٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَجِدُ مِنْ شَرِّ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللَّهِ ذَا الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلاَءِ بِوَجْهٍ»[1].

## ٥٢- باسی ئەوەی وتراوە دەربارەی کەسی دوو ڕوو

٦٠٥٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینی خراپترین کەس لای خوا کەسی دووڕووە، ئەو کەسەی دێت بۆ لای ئا ئەوانە بەڕوویەکەوە، دەشڕوات بۆ لای ئا ئەوانەی تر بەڕوویەکی ترەوە)).

## ٥٣- بابُ مَنْ أَخْبَرَ صَاحِبَهُ بِمَا يُقَالُ فِيهِ

٦٠٥٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قِسْمَةً، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: وَاللَّهِ مَا أَرَادَ مُحَمَّدٌ بِهَذَا وَجْهَ اللَّهِ. فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَتَمَعَّرَ وَجْهُهُ وَقَالَ: «رَحِمَ اللَّهُ مُوسَى، لَقَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٤٩٤.

(٢) بڕوانە: ٣١٥٠.

## ٥٣- باسی ئەو کەسەی هاوڕێکەی ئاگادار دەکاتەوە بەوەی پێی دەوترێت [1]

**٦٠٥٩- ئەبو وائیل لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە وتی: پێغەمبەر ﷺ دەستكەوتێكی دابەش كرد، پیاوێكی ئەنصاریش وتی: سوێند بەخوا موحەممەد بەم دابەشكردنە مەبەستی ڕەزامەندی خوای نەبووە، (عەبدوڵڵا دەڵێ): منیش ڕۆشتمەوە خزمەتی پێغەمبەر و ﷺ قسەكەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش ڕووخساری تێكچوو سوور بوویەوە و فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوا لە مووسا بێت ﷺ كە بێگومان لەمە زیاتر ئازاردرا بەڵام ئارامی گرت)).**

## ٥٤- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ التَّمَادُحِ

٦٠٦٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّاءَ، حَدَّثَنَا بُرَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يُثْنِي عَلَى رَجُلٍ وَيُطْرِيهِ فِي الْمِدْحَةِ، فَقَالَ: «أَهْلَكْتُمْ -أَوْ قَطَعْتُمْ- ظَهْرَ الرَّجُلِ»[2].

## ٥٤- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە ستایشو پیاهەڵدانی یەكتری [3]

**٦٠٦٠- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێك ستایشی پیاوێكی دەكرد و لە ستایشكردنیدا ڕۆدەچوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پیاوەكەتان لە ناو برد، یان پشتی كابراتان شكاند)).**

---

(١) مەبەستی ئامۆژگاری كردنیەتی.

(٢) بڕوانە: ٢٦٦٣.

(٣) زیادەڕۆیی كردن تیایدا.

٦٠٦١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَجُلاً ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَأَثْنَى عَلَيْهِ رَجُلٌ خَيْرًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَيْحَكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ -يَقُولُهُ مِرَارًا- إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ كَذَا وَكَذَا. إِنْ كَانَ يُرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ، وَحَسِيبُهُ اللَّهُ، وَلاَ يُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا»[1]. قَالَ وُهَيْبٌ، عَنْ خَالِدٍ: «وَيْلَكَ».

**٦٠٦١- عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە ﷺ لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسکرا، پیاوێك بە چاکە ستایشی کرد پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ماڵ وێران ملی هاوڕێکەت پەڕاند)) -چەند جار دووبارەی دەکردەوە- پاشان فەرمووی: ((هەرکام ئێوە ناچار بوو ستایشی براکەی بکات ئەوە با بڵێت: وا گومان دەبەم ئاوا و ئاوا بێت، ئەگەر گومان دەبرا کە ئەو کەسە بەوشێوەیە، خوا خۆی پرسینەوەی لەگەڵ دەکات، با بەسەر خوادا پاکانە بۆکەس ناکات)).**

**-وهیب ئەم فەرموودەی لە خالیدەوە گێڕاوەتەوە بەم شێوە((وَيْلَكَ[2])).**

## ٥٥- بَابُ مَنْ أَثْنَى عَلَى أَخِيهِ بِمَا يَعْلَمُ

وَقَالَ سَعْدٌ: مَا سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ لأَحَدٍ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ إِلَّا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ[3].

## ٥٥- باسی کەسێک ستایشی برا مسوڵمانەکەی بکات بەوەی دەیزانێت (لە چاکە دەربارەی)

**سەعد ﷺ دەڵێ: نەم بیستووە پێغەمبەر ﷺ بەکەسێك کەبەسەر زەوییدا بڕوات (و زیندوو بێت) بڵێ: ئەو کەسە بەهەشتییە، جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ**

(١) بڕوانە: ٢٦٦٢.

(٢) لەبری (ويحك). (ويلك) گێڕاوەتەوە، هەمان مانای هەیە بەڵام وشەکان جیاوازن.

(٣) بڕوانە: ٣٨١٢.

٦٠٦٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ ذَكَرَ فِي الإِزَارِ مَا ذَكَرَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ إِزَارِي يَسْقُطُ مِنْ أَحَدِ شِقَّيْهِ. قَالَ: «إِنَّكَ لَسْتَ مِنْهُمْ»[1].

**٦٠٦٢-سالیم له باوکیەوه ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ئەوەی فەرمووی دەربارەی پۆشاک (ڕاکشان و خشاندنی بەزەویدا) و باسی کرد، ئەبو بەکر ﵁ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکەکەی من لە لایەکیەوە دەکەوێتە سەر زەوی؟ فەرمووی: ((بێگومان تۆ لەو کەسانە نیت[2])).**

## ٥٦- بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ النحل. وَقَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ﴿٢٣﴾﴾ يونس. وَقَوْلِهِ ﴿ثُمَّ بُغِىَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ﴿٦٠﴾﴾ الحج، وَتَرْكِ إِثَارَةِ الشَّرِّ عَلَى مُسْلِمٍ أَوْ كَافِرٍ

٦٠٦٣- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَكَثَ النَّبِيُّ ﷺ كَذَا وَكَذَا يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَأْتِي أَهْلَهُ وَلاَ يَأْتِي، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقَالَ لِي ذَاتَ يَوْمٍ: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِي أَمْرٍ اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ، أَتَانِي رَجُلاَنِ، فَجَلَسَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رِجْلَيَّ وَالآخَرُ عِنْدَ رَأْسِي، فَقَالَ الَّذِي عِنْدَ رِجْلَيَّ لِلَّذِى عِنْدَ رَأْسِي: مَا بَالُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ -يَعْنِي: مَسْحُورًا- قَالَ: وَمَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ أَعْصَمَ. قَالَ: وَفِيمَ؟ قَالَ: فِي جُفِّ طَلْعَةٍ ذَكَرٍ فِي مُشْطٍ وَمُشَاقَةٍ، تَحْتَ رَعُوفَةٍ فِي بِئْرِ ذَرْوَانَ». فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «هَذِهِ الْبِئْرُ الَّتِي أُرِيتُهَا كَأَنَّ رُءُوسَ نَخْلِهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ، وَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الحِنَّاءِ».

---

(١) بڕوانه: ٣٦٦٥.

(٢) بۆ فیز و دەعیە ئەو کارە بکەیت و ئەو هەڕەشە تۆ ناگرێتەوە.

فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَأُخْرِجَ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَهَلاَّ -تَعْنِي- تَنَشَّرْتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمَّا اللهُ فَقَدْ شَفَانِي، وَأَمَّا أَنَا فَأَكْرَهُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا». قَالَتْ: وَلَبِيدُ بْنُ أَعْصَمَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ حَلِيفٌ لِيَهُودَ[1].

## ٥٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بەدادگەری و بەچاکە و بەبەخشین بەخزم و خوێش، وە (خوا) بەرگری دەکات لە داوێن پیسی و خراپە و دەست درێژی، ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی پەند وەرگرن و بیر بکەنەوە). وە خوای بەرز و بڵند دەفەرمووی: (لە ڕاستیدا ستەم و ناحەقی یەکانتان زیانی هەر بۆخۆتانە)، وە ئەم فەرمایشتە: (لە دوای ئەوە دەست درێژی بکرێتە سەر ئەوە بێگومان خوا یارمەتی دەدات [2]، وە باسی وازهێنان لە بەرپاکردنی شەڕ و خراپە لە دژی مسوڵمانێک یا بێباوەڕێک.

**٦٠٦٣- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندەدە و ئەوەندە ماوە مایەوە وایدەزانی دەچێتە لای ژنەکانی و نەشچوو بویە لایان. عائیشە ﷺ دەڵێ: جا ڕۆژێکیان پێی وتم: ((ئەی عائیشە بەڕاستی خوا وەڵامی دامەوە دەربارەی ئەوکارەی داوام لێ کردبوو، دوو پیاو [3] هاتن بۆ لام، جا یەکێکیان لای سەرمدا دانیشت، ئەوی کەشیان لای پێیەکانم دانیشت، ئینجا ئەوەی کەلای پێیەکانمدا بوو وتی بەوەیان لای سەرمدا بوو، ئەم پیاوە چییەتی؟ وتی: جادووی لێکراوە- واتە سیحری لێ کراوە - وتی: کێ جادووی لێ کردوە؟ وتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم وتی: جادووەکە لە چیدایە؟ وتی: لە کیفی**

---

(١) بڕوانە: ٣١٧٥.

(٢) سەری دەخات و سەرکەوتووی دەکات.

(٣) دوو فریشتە هاتنە خزمەتی.

توێكڵی خورمای نێر دایە، لە شانە و ڕیشاڵی كەتاندا لە كاتی داهێنانیدا بەشانەكەوە هاتووە، وتی: لە كوێدایە؟ لە ژێر بەردێك دایە لە بیری زەرواندا))، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت و فەرمووی: ((ئەم بیرە بوو نیشانم درا، لقی دار خورماكانی (كەبەدەوریدا بوون) وەكو سەری شەیتانەكان بوون، ئاوەكەشی وەك ئاوێك وایە خەنەی تێكرابێ))، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد و جادووەكە (لە بیرەكە) دەرهێنرا، عائیشە دەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی دوعات نەكرد بۆ چارەسەری جادووەكە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سا بەخوا بەدڵنیاییەوە خوا شیفای دام، وە من پێم ناخۆشە خراپەیەك دەربارەی هیچ كەسێك بوروژێنم))، عائیشە دەڵێ: لەبیدی كوڕی ئەعصەم پیاوێكە لە بەنی زورەیق و هاوپەیمانی جولەكەیە.

## ٥٧- بَابُ مَا يُنْهَى عَنِ التَّدَابُرِ وَالتَّحَاسُدِ، وَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥﴾ الفلق.

٦٠٦٤- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَانًا»[١].

## ٥٧- باسی ئەوەی ڕێگری لێ كراوە لە پشت لە یەكتری كردن و حەسودی و ئیرەیی بەیەكتری بردن وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە[٢] لە زیانی بەخیل و حەسوود كاتێك كە حەسوودی ببات)

٦٠٦٤-ئەبو هورەیرە ﷛ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((لە گومانی خراپ دوور بكەونەوە، چونكە دڵنیابن گومانی خراپ درۆترین ئەو

(١) بڕوانە: ٥١٤٣.
(٢) وە پەنا دەگرم بەخوا.

**قسەیەیە بەشوێن عەیب و نەنگی خەڵکدا مەگەڕێن[1] و جاسوسی مەکەن و ئیرەیی بەیەکتری مەبەن و پشت لەیەکتری مەکەن و یەکتری مەبوغزێنن، وە (ڕقتان لە یەکتری نەبێت و) بەندەی خوابن و برای یەکتربن)).**

٦٠٦٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ»[2].

**٦٠٦٥-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یەکتری مەبوغزێنن و حەسودی بەیەکتری مەبەن و پشت لەیەکتری مەکەن و بەندەی خوا و برای یەك بن، دروست نییە بۆمسوڵمان کە لە سێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لە براکەی وەرگرێ قسەی لەگەڵ نەکات)).**

## ٥٨- بابٌ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا ﴿١٢﴾﴾ الحجرات

٦٠٦٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا»[3].

---

(١) ولاتحسسوا ولاتجسسوا: ئەم دوو فیعلە زانایان دەڵێن یەک مانایان هەیە کەنووسیومانە، قسەی تریش هەیە لە مانایاندا دەڵێن: یەکەمیان گوێگرتنە لە قسەی خەڵک دووەمیان گەڕانە بە شوێن عەیب و عاری خەڵکدا، یان یەکەمیان زانینی هەواڵێک یان شتێکە بەهۆیەک لە هەستەوەرەکان چاو گوێ. بەڵام دووەمیان زانینی هەواڵێک بەزۆر وریای نهێنی بێت، جاسوسیش لەوەوە هاتووە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٨٥/١٣.

(٢) بڕوانە: ٦٠٧٦.

(٣) بڕوانە: ٥١٤٣.

# ٥٨- باسێک: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان لە زۆرێک لە گومانەکان بپارێزن، چونکە بەڕاستی هەندێک لە گومانەکان تاوانن، وە سیخوڕی مەکەن[١])

٦٠٦٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خۆتان بپارێزن لە گومانی خراپ، چونکە بەڕاستی بەدگومانی درۆترین وتە و قسەیە، بەشوێن عەیب و نەنگی خەڵکدا مەگەڕێن[٢] و سیخوڕی مەکەن زەمکاری مەکەن (لە مامەڵەدا) بەنیازی فێڵ و ئیرەیی بەیەکتری مەبەن و یەکتری مەبوغزێنن و (ڕقتان لە یەکتری نەبێت و) پشت لەیەکتری مەکەن، وە بەندەی خوا بن و برای یەکتربن))

## ٥٩- بَابُ مَا يَكُونُ مِنَ الظَّنِّ

٦٠٦٧- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا أَظُنُّ فُلَانًا وَفُلَانًا يَعْرِفَانِ مِنْ دِينِنَا شَيْئًا». قَالَ اللَّيْثُ: كَانَا رَجُلَيْنِ مِنَ الْمُنَافِقِينَ[٣].

## ٥٩- باسی ئەوەی دروستە[٤] لەگومان بردن

٦٠٦٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((گومان نابەم کە فلانە کەس و فلانە کەس هیچ شتێك لەم ئاینی ئێمە بزانن)). لەیس دەڵێ: ئەو دوو کەسە دوو پیاوی دووڕوو و ناپاك بوون.

---

(١) بەدوای ناتەواوی یەکتریدا مەگەڕێن.

(٢) ولاتحسسوا ولاتجسسوا: ئەم دوو فیعلە زانایان دەڵێن یەک مانایان هەیە کە نوسیومانە قسەی کەش هەیە لە مانایاندا: دەڵێن: یەکەمیان گوێگرتنە لە قسەی خەڵک دووەمیان گەڕانە بە شوێن عەیب و عاری خەڵکدا یان یەکەمیان زانیتی هەواڵێک یان شتێکە بەهۆیەک لە هەستەوەرەکانە چاو گوێ......بەڵام دووەمیان زانینی هەواڵێک بەزۆر وریای نهێنی بێت، جاسوسیش لەوەوە هاتووە.

(٣) بڕوانە: ٦٠٦٨.

(٤) لە هەندێ گێڕانەوەدا نوسراوە (ئەوەی دەبێت لە گومان بردن).

٦٠٦٨- حَدَّثَنَا ابْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بِهَذَا. وَقَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا وَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، مَا أَظُنُّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا يَعْرِفَانِ دِينَنَا الَّذِي نَحْنُ عَلَيْهِ»[1].

**٦٠٦٨- ئیبنو بوکەیر بۆی گێڕاینەوە وتی: لەیس ئەم فەرموودەی: (پێشووی) بۆی گێڕاینەوە (ئەمەیشی تیا بوو) عائیشە ﵂ وتی: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هات بۆلام و فەرمووی: ((ئەی عائیشە، گومان نابەم فلانە کەس و فلانە کەس هیچ بزانن لەم ئاینەی ئێمەی لەسەرین)).**

## ٦٠- بابُ سَتْرِ الْمُؤْمِنِ عَلَى نَفْسِهِ

٦٠٦٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ أَخِي ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلاَّ الْمُجَاهِرِينَ، وَإِنَّ مِنَ الْمَجَانَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً، ثُمَّ يُصْبِحَ وَقَدْ سَتَرَهُ اللَّهُ، فَيَقُولَ: يَا فُلاَنُ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا، وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللَّهِ عَنْهُ».

## ٦٠- باسی مسوڵمان (گوناه و عەیبی) خۆی بپۆشێت

**٦٠٦٩-ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ:لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەموو ئوممەتی من بەخشراون[2]، جگە لە ئاشکراکەران (ی تاوانە نهێنیەکان)، وە بێگومان ئاشکرا کردن ئەوەیە کەسێك بەشەو کارێك (گوناهێك) بکات، پاشان ڕۆژ دەکاتەوە خوا پۆشیویەتی، ئینجا دەڵێ: فلانە کەس ئەم شەو ئەوە و ئەوەم کرد، بێگومان پەروەردگاری شەو بۆی پۆشیوە، کەچی ڕۆژی لێ دەبێتەوە پۆشینەکەی خوا ئاشکرا دەکات)).**

(١) بڕوانە: ٦٠٦٧.

(٢) عەفو کراون و خوا بوراوە لێیان.

٦٠٧٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ: كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي النَّجْوَى؟ قَالَ: «يَدْنُو أَحَدُكُمْ مِنْ رَبِّهِ حَتَّى يَضَعَ كَنَفَهُ عَلَيْهِ فَيَقُولُ: عَمِلْتَ كَذَا وَكَذَا. فَيَقُولُ: نَعَمْ. وَيَقُولُ: عَمِلْتَ كَذَا وَكَذَا. فَيَقُولُ: نَعَمْ. فَيُقَرِّرُهُ ثُمَّ يَقُولُ: إِنِّي سَتَرْتُ عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، فَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ»[1].

**٦٠٧٠-صەفوانی کوڕی موحریز دەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسیاری لە ئیبنو عومەر ﷺ کرد وتی: چۆنت بیستووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی چپە (ی خوا لە گەڵ بەندەکانی) چی دەفەرموو؟ (وتی) فەرمووی: ((کەسێکتان لە پەروەردگاری نزیك دەبێتەوە باڵی خۆی لەسەری دادەنێت، دایدەپۆشێت، ئینجا دەفەرمووێ پێی: ئەوە و ئەوەت کرد؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، وە دەفەرمووێ: ئەوە و ئەوەشت کرد؟ دەڵێ: بەڵێ تا دانی دەنێت بەتاوانەکانیدا، پاشان دەفەرمووێ: بێگومان لە دونیادا بۆم پۆشیت بۆیە ئەمڕۆش من لەو تاوانانەت خۆش دەبم)).**

## ٦١- بَابُ الْكِبْرِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ ثَانِيَ عِطْفِهِ ۝٩ ﴾ الحج. مُسْتَكْبِرٌ فِي نَفْسِهِ، عِطْفُهُ: رَقَبَتُهُ.

٦٠٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مَعْبَدُ بْنُ خَالِدٍ الْقَيْسِيُّ، عَنْ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ الْخُزَاعِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَاعِفٍ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ، أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ»[2].

## ٦١- باسی خۆبەزل زانین

**-موجاهید دەڵێ: ﴿ ثَانِيَ عِطْفِهِ ۝٩ ﴾: لە ناخی خۆیدا خۆی بە گەورە زانی، (عِطْفُهُ) گەردنی.**

(١) بڕوانە: ٢٤٤١.

(٢) بڕوانە: ٤٩١٨.

**٦٠٧١- حاریسەی كوڕی وەهبی خوزاعی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئایا هەواڵتان پێبدەم كێ بەهەشتییە؟ هەموو لاوازێكی خۆ بەكەم زان[1]، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات بۆی دێنێتە جێ (سوێندەكەی ناخات)، ئایا هەواڵتان پێبدەم كێ دۆزەخییە؟ هەموو دڵ ڕەقێكی كەللە شەقی قەڵەوی بەفیزی خۆ بەزل زانێك)).**

٦٠٧٢- وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عِيسَى: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ: كَانَتِ الأَمَةُ مِنْ إِمَاءِ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَتَأْخُذُ بِيَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَنْطَلِقُ بِهِ حَيْثُ شَاءَتْ.

**٦٠٧٢-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كەنیزەكێك لە كەنیزەكەكانی خەڵكی مەدینە دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ دەگرت و دەیبرد بۆ هەر كوێ بیویستایە[2].**

## ٦٢- بابُ الهِجْرَةِ

وَقَوْلِ النبيّ ﷺ: "لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ".

٦٠٧٣- ٦٠٧٤- ٦٠٧٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَوْفُ بْنُ مَالِكِ بْنِ الطُّفَيْلِ -هُوَ ابْنُ الْحَارِثِ وَهْوَ ابْنُ أَخِي عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ لأُمِّهَا- أَنَّ عَائِشَةَ حُدِّثَتْ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ قَالَ فِي بَيْعٍ أَوْ عَطَاءٍ أَعْطَتْهُ عَائِشَةُ: وَاللَّهِ لَتَنْتَهِيَنَّ عَائِشَةُ، أَوْ لأَحْجُرَنَّ عَلَيْهَا. فَقَالَتْ: أَهُوَ قَالَ هَذَا؟ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَتْ: هُوَ لِلَّهِ عَلَيَّ نَذْرٌ أَنْ لاَ أُكَلِّمَ ابْنَ الزُّبَيْرِ أَبَدًا. فَاسْتَشْفَعَ ابْنُ الزُّبَيْرِ إِلَيْهَا حِينَ طَالَتِ الْهِجْرَةُ، فَقَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ لاَ أُشَفِّعُ فِيهِ أَبَدًا،

---

(١) (مُتَضَاعِف) بەم جۆرەش مانا كراوە: خەڵك بە لاواز و كەم و بێرێز سەیری بكەن.

(٢) سەرنج: مەبەست ئەوەیە كە كەمترین كەس لە كۆمەڵگای مەدینە ئەگەر ئیشی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بوایە، تەنانەت ئەگەر لە دەرەوەی مەدینەش بوایە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر تەوازوعی خۆی لەگەڵی دەچوو.

وَلاَ أَتَحَنَّثُ إِلَى نَذْرِي. فَلَمَّا طَالَ ذَلِكَ عَلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ كَلَّمَ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الأَسْوَدِ بْنِ عَبْدِ يَغُوثَ -وَهُمَا مِنْ بَنِي زُهْرَةَ- وَقَالَ لَهُمَا: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ لَمَّا أَدْخَلْتُمَانِي عَلَى عَائِشَةَ، فَإِنَّهَا لاَ يَحِلُّ لَهَا أَنْ تَنْذُرَ قَطِيعَتِي. فَأَقْبَلَ بِهِ الْمِسْوَرُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ مُشْتَمِلَيْنِ بِأَرْدِيَتِهِمَا حَتَّى اسْتَأْذَنَا عَلَى عَائِشَةَ فَقَالاَ: السَّلاَمُ عَلَيْكِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، أَنَدْخُلُ؟ قَالَتْ عَائِشَةُ: ادْخُلُوا! قَالُوا: كُلُّنَا؟ قَالَتْ: نَعَمِ، ادْخُلُوا كُلُّكُمْ. وَلاَ تَعْلَمُ أَنَّ مَعَهُمَا ابْنَ الزُّبَيْرِ، فَلَمَّا دَخَلُوا دَخَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ الْحِجَابَ، فَاعْتَنَقَ عَائِشَةَ، وَطَفِقَ يُنَاشِدُهَا وَيَبْكِي، وَطَفِقَ الْمِسْوَرُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ يُنَاشِدَانِهَا إِلاَّ مَا كَلَّمَتْهُ وَقَبِلَتْ مِنْهُ، وَيَقُولاَنِ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَمَّا قَدْ عَلِمْتِ مِنَ الْهِجْرَةِ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ. فَلَمَّا أَكْثَرُوا عَلَى عَائِشَةَ مِنَ التَّذْكِرَةِ وَالتَّحْرِيجِ طَفِقَتْ تُذَكِّرُهُمَا نَذْرَهَا وَتَبْكِي وَتَقُولُ: إِنِّي نَذَرْتُ، وَالنَّذْرُ شَدِيدٌ. فَلَمْ يَزَالاَ بِهَا حَتَّى كَلَّمَتِ ابْنَ الزُّبَيْرِ، وَأَعْتَقَتْ فِي نَذْرِهَا ذَلِكَ أَرْبَعِينَ رَقَبَةً. وَكَانَتْ تَذْكُرُ نَذْرَهَا بَعْدَ ذَلِكَ فَتَبْكِي، حَتَّى تَبُلَّ دُمُوعُهَا خِمَارَهَا[1].

## ٦٢- باسی قسه نەكردن لەگەڵ مسوڵماندا (و دەنگ لێ وەرگرتنی)

**-وە باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ((دروست نییە بۆ كەسێكی مسوڵمان لە سێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لە برا مسوڵمانەكەی وەرگرێت)).**

**٦٠٧٣- ٦٠٧٤- ٦٠٧٥- زوهری دەڵێ: عەوفی كوڕی مالیكی كوڕی توفەیل -كە كوڕی حاریسی كوڕی برای عائیشەی ؓ خێزانی پێغەمبەرە ﷺ لە دایكییەوە- دەگێڕێتەوە كە عائیشە ؓ بۆی گێڕدرایەوە كە عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر ؓ دەربارەی فرۆشتنێك یان بەخشینێك عائیشە بەخشیبووی وتوویەتی، سوێند بەخوا دەبێت عائیشە وازبێنێت (لە فرۆشتنی موڵكەكەی)، یان ناهێڵم كڕین و**

(١) بڕوانە: ٣٥٠٣.

فرۆشتن بكات، عائیشەش وتی: ئایا ئەو ئەو قسەی كردوە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: بۆ خوا نەزربێت كە هەرگیز قسە لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیردا نەكەم، ئینجا عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر كە قسە نەكردنی عائیشە لەگەڵی درێژەی كێشا، (زۆرێك لە كۆچەرانی) كردە تكاكار لای عائیشە، بەڵام عائیشە ﵂ وتی: نا سوێند بەخوا هەرگیز دەربارەی ئەو تكای كەس قبوڵ ناكەم و نەزرەكەم ناشكێنم، جاكە ئەو حاڵەتە درێژەی كێشا لەسەر ئیبنو زوبەیر، قسەی لەگەڵ میسوەری كوڕی مەخرەمە و عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەسوەدی كوڕی عەبدیە غوس كرد-كە هەردووكیان لە بەنی زوهرە بوون-وە بە هەردووكیانی وت: سوێندتان ئەیەم بەخوا ئیللا هەردووكتان بمبەنە لای عائیشە، چونكە بەڕاستی دروست نییە بۆ عائیشە كە نەزر بكات قسەم لەگەڵ نەكات، جا میسوەر و عەبدوڕەحمان بردیان و هەردووكیان بەعەباكەیان دایان پۆشی، (ڕۆشتن) تاداوای مۆڵەتیان لە عائیشە كرد و هەردووكیان وتیان: سەلام و ڕەحم و بەرەكەتی خوات لێ بێ ئایا بێینە ژوورەوە؟ عائیشەش وتی: بێنە ژورەوە، وتیان: هەمووومان؟ وتی: بەڵێ، هەمووتان وەرنە ژوورەوە، وە عائیشە نەیزانی عەبدوڵڵای كوڕی زوبێریان لەگەڵ دایە؟ جا كە چوونە ژوورەوە ئیبنو زوبەیر لە پەردەكەوە چووە ژوورەوە و باوەشی كرد بە عائیشەدا و دەستی كرد بەپاڕانەوە لێی و دەگریا، میسوەر و عەبدوڕەحمانیش لێی دەپاڕانەوە كە قسەی لەگەڵدا بكات و عوزری قەبوڵ بكات، وە هەردووكیان دەیان وت: بێگومان پێغەمبەر ﷺ وەك ئاگاداریت دەنگ دابڕانی لە مسوڵمانان قەدەغە كردوە فەرموویەتی: ((دروست نییە بۆ هیچ مسوڵمانێك كە زیاتر لە سێ ڕۆژ دەنگ وەرگرێت لە برا (مسوڵمانە) كەی))، جا كەزۆر باسی فەزڵی پەیوەندی خزمایەتیان بۆ كردوە باسی كەوتنە نارەحەتی گوناهیان بیر خستەوە، عائیشەش نەزرەكەی بیر هەردووكیان دەهێنایەوە و دەگریا و دەیوت: من نەزرم كردوە (قسەی لەگەڵ نەكەم).

**نەزرکردنیش سەختە، ئیتر بەردەوام هەوڵیان لەگەڵی دەدا هەتا قسەی لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا کرد، وە دەربارەی بریتی ئەو نەزرەی چل کۆیلەی ئازاد کرد، وە هەمیشە دوای ئەوەش بیری لە نەزرەکەی دەکردەوە و دەگریا، هەتا فرمێسکەکانی سەرپۆشەکەی تەڕ دەکرد.**

٦٠٧٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ»[١]

**.٦٠٧٦- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((یەکتری مەبوغزێنن و، حەسودی بەیەکتری مەبەن و، پشت لە یەکتری مەکەن و، بەندەی خوا و برای یەك بن، دروست نییە بۆ مسوڵمان کە لە سێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لە براکەی وەرگرێ و قسەی لەگەڵ نەکات)).**

٦٠٧٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ»[٢].

**٦٠٧٧-ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دروست نییە بۆ هیچ کەسێك لە سێ شەو زیاتر قسە لەگەڵ براکەیدا نەکات، کە بەیەکتری دەگەن ئەوسا ئەمەیان ڕوو وەرگێڕێ و ئەویان ڕوو وەرگێڕێ، چاکترینیان ئەو کەسەیە لە پێشدا سەلام بکات (لەوی کەیان) )).**

(١) بڕوانە: ٦٠٦٥.

(٢) بڕوانە: ٦٢٣٧.

## ٦٣- بَابُ مَا يَجُوزُ مِنَ الْهِجْرَانِ لِمَنْ عَصَى

وَقَالَ كَعْبٌ حِينَ تَخَلَّفَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: وَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلاَمِنَا. وَذَكَرَ خَمْسِينَ لَيْلَةً.

٦٠٧٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لأَعْرِفُ غَضَبَكِ وَرِضَاكِ». قَالَتْ: قُلْتُ: وَكَيْفَ تَعْرِفُ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «إِنَّكِ إِذَا كُنْتِ رَاضِيَةً قُلْتِ: بَلَى وَرَبِّ مُحَمَّدٍ. وَإِذَا كُنْتِ سَاخِطَةً قُلْتِ: لاَ وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ». قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ، لَسْتُ أُهَاجِرُ إِلاَّ اسْمَكَ[1].

## ٦٣- باسی ئەوەی کە دروستە قسە نەکردن لەگەڵ کەسێکدا تاوان بکات[2]

**کەعب ﵁ کاتێ لە پێغەمبەر ﷺ بەجێما[3]، وە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لە مسوڵمانان کرد لە قسەکردن لەگەڵماندا، وە وتی: پەنجا شەو (قسەیان لەگەڵ نەکردین).**

**٦٠٧٨- هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من دەزانم تۆ کەی لێم ڕازیت وکەی لێم توڕەییت؟)) عائیشە ﵂ وتی: چۆن ئەوە ئەزانیت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (( (بەوە دەزانم) کاتێ لێم ڕازی بیت ئەوە دەڵێیت: بەڵێ بە پەروەردگاری موحەممەد، وە کاتێ لێم توڕە دەبیت دەڵێیت: نا بە پەروەردگاری ئیبراهیم ﵇)) عائیشەش ﵂ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وایە بەس ناوت ناهێنم.**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٢٨.

(٢) بۆ ئەوەی واز بێنێ لە تاوانەکەی.

(٣) لە غەزای تەبووک.

## ٦٤- بَابٌ: هَلْ يَزُورُ صَاحِبَهُ كُلَّ يَوْمٍ، أَوْ بُكْرَةً وَعَشِيًّا؟

٦٠٧٩- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَمْ أَعْقِلْ أَبَوَيَّ إِلاَّ وَهُمَا يَدِينَانِ الدِّينَ، وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْهِمَا يَوْمٌ إِلاَّ يَأْتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ طَرَفَيِ النَّهَارِ بُكْرَةً وَعَشِيَّةً، فَبَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ قَالَ قَائِلٌ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَأْتِينَا فِيهَا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا جَاءَ بِهِ فِي هَذِهِ السَّاعَةِ إِلاَّ أَمْرٌ. قَالَ: «إِنِّي قَدْ أُذِنَ لِي بِالْخُرُوجِ»[1].

## ٦٤- باسێک:ئایا مرۆڤ هەموو ڕۆژ سەردانی هاوڕێکەی بکات یان سەر لە بەیانی و سەر لە ئێواران (سەردانی بکات)

**٦٠٧٩-عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: من فامم نەکردبوو هەر باوك و دایکم بەباوەڕدار بەئاینی ئیسلام دیووە، هیچ ڕۆژێك بەسەرماندا تێنەپەڕیوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم سەر و ئەو سەری ڕۆژەوە بەیانی و ئێوارە سەرمان لێ نەدات، جا لە کاتێکدا ئێمە لە گەرمای نیوەڕۆ لە ماڵی ئەبو بەکر ﵁ دانیشتبووین، کەسێك وتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە کاتێکدا بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەهات بۆ ماڵمان، ئەبو بەکر وتی: ئالەم کاتەدا کارێکی هەیە هاتووە (بۆکارێکی گرنگ هاتووە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من مۆڵەت دراوم بەدەرچوون (لە مەککە و کۆچ کردن) )).**

(١) بڕوانە: ٤٧٦.

## ٦٥- بابُ الزِّيَارَةِ، وَمَنْ زَارَ قَوْمًا فَطَعِمَ عِنْدَهُمْ

وَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَكَلَ عِنْدَهُ.

٦٠٨٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ زَارَ أَهْلَ بَيْتٍ فِي الأَنْصَارِ فَطَعِمَ عِنْدَهُمْ طَعَامًا، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ أَمَرَ بِمَكَانٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَنُضِحَ لَهُ على بِسَاطٍ، فَصَلَّى عَلَيْهِ وَدَعَا لَهُمْ[1].

## ٦٥- باسی سەردانی کردن، وە کەسێک سەردانی کەسانێک بکات و لە لایان نان بخوات

**-سەلمان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ سەردانی ئەبو دەرداى ﷺ کردو لە ماڵیان نانی خوارد.**

**٦٠٨٠-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ماڵێکی ئەنصاری کرد و لە ماڵیان نانێکی خوارد، ئینجا کاتێ ویستی دەرچێت و بڕوا، فەرمانی کرد لە شوێنێکی ماڵەکەدا (حەسیرێکیان ڕاخست و) ئاویان بۆلێ بڕژاند و نوێژی لەسەر کرد و دوعای بۆ کردن.**

## ٦٦- بابُ مَنْ تَجَمَّلَ لِلْوُفُودِ

٦٠٨١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: قَالَ لِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: مَا الإِسْتَبْرَقُ؟ قُلْتُ: مَا غَلُظَ مِنَ الدِّيبَاجِ وَخَشُنَ مِنْهُ. قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ يَقُولُ: رَأَى عُمَرُ عَلَى رَجُلٍ حُلَّةً مِنْ إِسْتَبْرَقٍ، فَأَتَى بِهَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اشْتَرِ هَذِهِ فَالْبَسْهَا لِوَفْدِ النَّاسِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ. فَقَالَ: «إِنَّمَا

(١) بروانە: ٦٧٠.

يَلْبَسُ الْحَرِيرَ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ». فَمَضَى فِي ذَلِكَ مَا مَضَى، ثُمَّ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ إِلَيْهِ بِحُلَّةٍ، فَأَتَى بِهَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: بَعَثْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ وَقَدْ قُلْتَ فِي مِثْلِهَا مَا قُلْتَ! قَالَ: «إِنَّمَا بَعَثْتُ إِلَيْكَ لِتُصِيبَ بِهَا مَالاً». فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَكْرَهُ الْعَلَمَ فِي الثَّوْبِ لِهَذَا الْحَدِيثِ[1].

## ٦٦- باسی کەسێک جلوبەرگی جوان لەبەر بکات و خۆی جوان بکات بۆ پێشوازی وەفد و نوێنەرەکان

**٦٠٨١-یەحیای کوڕی ئەبی ئیسحاق وتی: سالیمی کوڕی عەبدوڵلا پێی وتم: (الإِسْتَبْرَقُ) چییە؟ وتم: دیباجی ئەستور و زبرە، وە وتی: لە عەبدوڵڵام بیست وتی: عومەر ﷺ پۆشاکێکی ئیستەبرەقی[2] بینی لەبەری پیاوێکدا، ئینجا عومەر هێنای بۆ پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پۆشاکە بکڕە و لەبەری بکە بۆ کاتی پێشوازی خەڵك کە دێن بۆ خزمەتت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان کەسێك ئاوریشم لەبەر دەکات کە (لە قیامەتدا) بەشی نەبێت))، جا پاش ئەوە ماوەیەکی بەسەردا چوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی (ئاوریشمی) نارد بۆ عومەر، عومەریش هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەم پۆشاکەت ناردووە بۆ من لە هەمان کاتدا جەنابت ئەوەت فەرموو دەربارەی هاوشێوەی ئەمە کە فەرمووت؟ فەرمووی: ((بێگومان بۆیە ناردوومە بۆت (بیفرۆشیت) پارەیەکت پێی دەست کەوێت))، جا ئیبنو عومەر حەزی لە خەت و نەخشی ئاوریشم نەبوو بەپۆشاکدا، لەبەر ئەم فەرموودەیە.**

(١) بڕوانە: ٨٨٦.

(٢) ئاوریشمی ئەستوری زبرە.

# ٦٧- بَابُ الإِخَاءِ وَالْحِلْفِ

وَقَالَ أَبُو جُحَيْفَةَ ﷺ : آخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ سَلْمَانَ وَأَبِي الدَّرْدَاءِ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: لَمَّا قَدِمْنَا المَدِينَةَ آخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ.

٦٠٨٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ عَلَيْنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، فَآخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُ وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[1].

## ٦٧- باسی برایەتی و هاوپەیمانی

**-ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان سەلمان و ئەبی دەردائەوە ﷺ.**

**-وە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ وتی: کاتێ هاتین بۆ مەدینە پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان من و سەعدی کوڕی ڕەبیعەوە ﷺ .**

**٦٠٨٢-ئەنەس ﷺ وتی: کاتێ عەبدوڕەحمان هات بۆ لامان، پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان ئەو و سەعدی کوڕی ڕەبیعەوە و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بە عەبدوڕەحمان): ((خواردنی زەماوەند دروست بکە با بە مەڕێکیش بێت))**

٦٠٨٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّاءَ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ قَالَ: قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَبَلَغَكَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ»؟. فَقَالَ: قَدْ حَالَفَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ قُرَيْشٍ وَالأَنْصَارِ فِي دَارِي[2].

**٦٠٨٣- عاصیم دەڵێ: بەئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ وت: ئایا پێت گەشتووە؟ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ جۆرە پەیمانبەستنێك لە ئیسلامدا نییە))**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٤٩.

(٢) بڕوانە: ٢٢٩٤.

ئەنەسیش وتی: پێغەمبەر ﷺ لە نێوان قورەیش و ئەنصاریەکاندا پەیمانی بەست لە ماڵی مندا.

## ٦٨- بابُ التَّبَسُّمِ وَالضَّحِكِ

وَقَالَتْ فَاطِمَةُ ؓ: أَسَرَّ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَضَحِكْتُ.

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ ؓ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى[1].

٦٠٨٤- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ؓ أَنَّ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيَّ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَبَتَّ طَلَاقَهَا، فَتَزَوَّجَهَا بَعْدَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الزَّبِيرِ، فَجَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا كَانَتْ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَهَا آخِرَ ثَلَاثِ تَطْلِيقَاتٍ، فَتَزَوَّجَهَا بَعْدَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الزَّبِيرِ، وَإِنَّهُ وَاللَّهِ مَا مَعَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلاَّ مِثْلُ هَذِهِ الْهُدْبَةِ -لِهُدْبَةٍ أَخَذَتْهَا مِنْ جِلْبَابِهَا- قَالَ: وَأَبُو بَكْرٍ جَالِسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَابْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ جَالِسٌ بِبَابِ الْحُجْرَةِ لِيُؤْذَنَ لَهُ، فَطَفِقَ خَالِدٌ يُنَادِي أَبَا بَكْرٍ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلاَ تَزْجُرُ هَذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. وَمَا يَزِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى التَّبَسُّمِ، ثُمَّ قَالَ: «لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ، لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ»[2].

## ٦٨- باسی زەردەخەنە و پێکەنین (دروستە)

-فاتیمە ؓ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سرتەیەکی بۆ کردم منیش پێکەنیم.

-عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ؓ دەڵێ: بێگومان هەر خوا ﷻ بەندەکان دەخاتە پێکەنین و گریان.

(١) بڕوانە: ١٢٨٨.

(٢) بڕوانە: ٢٦٣٩.

**٦٠٨٤- عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ڕیفاعەی قورەزی ژنەكەی تەڵاقی یەكجاریدا، ئینجا دوای ڕیفاعە عەبدوڕەحمانی كوڕی زوبەیر مارەی كرد، ژنەكە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ژنی ڕیفاعە بووم تەڵاقی سێ یەمینی دام، ئینجا لە پاش ئەو عەبدوڕەحمانی كوڕی زوبەیر مارەی كردم، بەراستی و سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەكەری ئەو (عەبدورەحمان) وەك ئەم ڕیشووە وایە- ڕیشوویەكی گرت بەدەستی لە سەرپۆشەكەی - دەڵێ: ئەبو بەكر لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبوو، خالیدی كوڕی سەعیدی كوڕی عاسیش لەبەر دەرگای ژوورەكەدا دانیشتبوو، تا مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پێ بدرێ، ئینجا خالید دەستی كرد بە بانگ كردنی ئەبو بەكر دەیوت: ئەی ئەبو بەكر ئەوە ڕێگری لەو ژنە ناكەیت لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەی بەئاشكرا دەیڵێ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ لە زەردەخەنە زیاتر هیچی نەفەرموو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (بەژنەكە): ((وادیارە دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای ڕیفاعە، نابێ هەتا ئەو (عەبدورەحمان) شیرینی و لەزەتی تۆ نەچەژێ و تۆش شیرینی و لەزەتی ئەو نەچەژیت)).**

**٦٠٨٥-** حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الحَمِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَعِنْدَهُ نِسْوَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ يَسْأَلْنَهُ وَيَسْتَكْثِرْنَهُ، عَالِيَةً أَصْوَاتُهُنَّ عَلَى صَوْتِهِ، فَلَمَّا اسْتَأْذَنَ عُمَرُ تَبَادَرْنَ الْحِجَابَ، فَأَذِنَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَدَخَلَ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَضْحَكُ، فَقَالَ: أَضْحَكَ اللهُ سِنَّكَ يَا رَسُولَ اللهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي. فَقَالَ: «عَجِبْتُ مِنْ هَؤُلَاءِ اللاَّتِي كُنَّ عِنْدِي، لَمَّا سَمِعْنَ صَوْتَكَ تَبَادَرْنَ الْحِجَابَ». فَقَالَ: أَنْتَ أَحَقُّ أَنْ يَهَبْنَ يَا رَسُولَ اللهِ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِنَّ فَقَالَ: يَا عَدُوَّاتِ أَنْفُسِهِنَّ، أَتَهَبْنَنِي وَلَمْ تَهَبْنَ رَسُولَ اللهِ ﷺ؟! فَقُلْنَ: إِنَّكَ أَفَظُّ

وَأَغْلَظُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيهٍ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ سَالِكًا فَجًّا إِلاَّ سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ»[1].

**٦٠٨٥- موحەممەدی کوڕی سەعدی لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ خواست، لەو کاتەدا چەند ئافرەتێکی قورەیشی (هاوسەرەکانی) لە خزمەتیدا بوون، داوای کاتی زیاتریان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ کە پێیان بدات، دەنگیشیان بەرز ببۆوە بەسەر دەنگیدا، جا کە عومەر ﷺ داوای مۆڵەتی خواست، گورج هەستان و چوونە پشت پەردەوە، ئەنجا پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتی عومەری دا ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێدەکەنی، عومەریش ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا دڵخۆشت کات و پێکەنین بخاتە سەر لێو و ددانەکانت [2]، ئەی پێغەمبەری خوا بەدایك و باوکەوە بەقوربانت بم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سەرم سوڕما لە ئائەم ئافرەتانەی لای مندا بوون، کاتێ گوێیان لە دەنگی تۆ بوو بە پەلە چوونە پشت پەردەکەوە))، عومەریش ﷺ وتی: جەنابت شیاوتری ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەلێت بترسن، پاشان ڕووی کردە ئافرەتەکان و وتی: چەند دوژمنی خۆیانن، ئایا لە من دەترسن و لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناترس؟ ئافرەتەکان وتیان: بەڵێ [3] بێگومان تۆ ڕەق و زبرتری لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((قسەی خۆت بکە، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە هەرگیز شەیتان بەتۆ (عومەر) نەگەشتۆوە بەرێگایەکدا ڕۆشتبێت، مەگەر شەیتان بە ڕێگایەکی تردا غەیری ڕێگاکەی تۆدا ڕۆشتووە)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٩٤.

(٢) دەتوانیت بەم جۆرەش مانای کەیت: خوا پێکەنین و زەردەخەنە بخاتە سەر لێوەکانت.

(٣) لە تۆ دەترسین نەک پێغەمبەر ﷺ.

٦٠٨٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي الْعَبَّاسِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: لَمَّا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالطَّائِفِ قَالَ: «إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ». فَقَالَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: لاَ نَبْرَحُ أَوْ نَفْتَحَهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَاغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ». قَالَ: فَغَدَوْا فَقَاتَلُوهُمْ قِتَالاً شَدِيدًا، وَكَثُرَ فِيهِمُ الْجِرَاحَاتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ». قَالَ: فَسَكَتُوا، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ.
قَالَ الْحُمَيْدِيُّ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ كُلَّهُ بِالْخَبَرِ[1].

**٦٠٨٦- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ وتی: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە تائیف بوو (گەمارۆیدا و هیچی لێ نەکردن). فەرمووی: ((بەویستی خوا ئێمە سبەینێ دەگەڕێنەوە))، جاکەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: یا ناڕۆین یا ئازادی دەکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دەی ئێستا بڕۆن بۆ جەنگ کردن))، دەڵێ: جا ڕۆشتن و جەنگێکی سەختیان لە دژیان کرد و (لە قەڵاکەیانەوە تیربارانی مسوڵمانانیان کرد) زۆریان بریندار بوون، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەویستی خوا سبەینێ دەگەڕێنەوە))، ئەوسا هەموویان بێدەنگ بوون پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی. حومەیدی وتی: سوفیان هەموو فەرموودەکەی بۆ گێڕاینەوە.**

٦٠٨٧-حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، أَخْبَرَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: هَلَكْتُ، وَقَعْتُ عَلَى أَهْلِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ: «أَعْتِقْ رَقَبَةً». قَالَ: لَيْسَ لِي. قَالَ: «فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ». قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ. قَالَ: «فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا». قَالَ: لاَ أَجِدُ. فَأُتِيَ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ -قَالَ إِبْرَاهِيمُ: الْعَرَقُ: الْمِكْتَلُ- فَقَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ؟ تَصَدَّقْ بِهَا». قَالَ: عَلَى أَفْقَرَ مِنِّي؟! وَاللَّهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنَّا. فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، قَالَ: «فَأَنْتُمْ إِذًا»[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٣٢٥.
(٢) بڕوانە: ١٩٣٦.

**٦٠٨٧- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: تیا چووم لە ڕەمەزاندا لەگەڵ ژنەكەم دروست بووم، فەرمووی: ((كۆیلەیەك ئازاد بكە))، وتی: كۆیلەم نییە، فەرمووی: ((دەی دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بە))، وتی: ناتوانم، فەرمووی: ((دەی خواردنی شەست هەژار بدە))، وتی: نیمە، ئینجا سەبەتەیەك هێنرا (بۆ پێغەمبەر ﷺ) خورمای تیا بوو-ئیبراهیم دەڵێ: (الْعَرَقُ) واتە: زەمیلە- ئینجا فەرمووی: ((كوا پرسیاركەرەكە؟ ئەمە بكە بەخێر))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیدەم بە هەژارتر لە خۆم؟ دەی سوێند بە خوا لە نێوان ئەو دوو بەردەلانە ڕەشەی مەدینەداماڵێكی تێدا نییە لە ئێمە هەژارتر بێت. پێغەمبەریش ﷺ پێكەنی هەتا ددانەكانی پێشەوەی دەركەوتن و فەرمووی: ((كەواتە ئێوە (شیاوترن) )).**

٦٠٨٨-حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأُوَيْسِيُّ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَبَذَ بِرِدَائِهِ جَبْذَةً شَدِيدَةً -قَالَ أَنَسٌ: فَنَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عَاتِقِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ أَثَّرَتْ بِهَا حَاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَبْذَتِهِ- ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي عِنْدَكَ. فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ فَضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ(١).

**٦٠٨٨- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دەڕۆشتم بەڕێدا، شاڵێكی نەجرانی قەراغ ئەستووری بەسەر شانەوە بوو، جا عەرەبییەكی دەشتەكی پێی گەیشت یەخەی پۆشاكەكەی گرت بەتوندی ڕایكێشا، ئەنەس دەڵێ: سەیری لاملی پێغەمبەرم ﷺ كرد - لەبەر توندی ڕاكێشانی قەراغی پۆشاكەكەی لاملی دابڕی و سوور بووبوویەوە -، پاشان وتی: ئەی**

(١) بڕوانە: ٣١٤٩.

**موحەممەد لەو ماڵەی خوا کە لای تۆیە فەرمان بدە بەشم بدەن، پێغەمبەریش ﷺ لای کردەوە بەلایدا و پێکەنی، پاشان فەرمانی بۆدا بەشی بدەن.**

٦٠٨٩-حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: مَا حَجَبَنِي النَّبِيُّ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلاَ رَآنِي إِلاَّ تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي[1].

**٦٠٨٩- قەیس لە جەریرەوە ﷺ دەڵێ: لەو کاتەوەی مسوڵمان بووم پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ نەکردووم بچمە خزمەتی، وە هەر کات منی دیبێ لە ڕوومدا زەردەخەنەی کردوە.**

٦٠٩٠ - وَلَقَدْ شَكَوْتُ إِلَيْهِ أَنِّي لاَ أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ، فَضَرَبَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي وَقَالَ: «اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا»[2].

**٦٠٩٠- (جەریر وتی:) بێگومان سکاڵام لە خزمەتیدا کرد کە من بەسەر ئەسپەوە خۆم ناگرم، پێغەمبەریش ﷺ بەدەستی کێشای بەسنگمدا و فەرمووی: ((خودایە دامەزراو و ڕاگری کە (بەسواری ئەسپەوە) و بیکەرە هیدایەت دەری هیدایەت دراو)).**

٦٠٩١-حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحِي مِنَ الْحَقِّ، هَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ غُسْلٌ إِذَا احْتَلَمَتْ؟ قَالَ: «نَعَمْ إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ». فَضَحِكَتْ أُمُّ سَلَمَةَ فَقَالَتْ: أَتَحْتَلِمُ الْمَرْأَةُ؟! فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَبِمَ شَبَهُ الْوَلَدِ؟»[3].

---

(١) بروانە: ٣٠٣٥.

(٢) بروانە: ٣٠٢٠.

(٣) بروانە: ١٣٠.

**٦٠٩١- زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە لە ئوممو سەلەمەوە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە ئوممو سولەیم ﵂ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! خوای گەورە لە بەرامبەر ڕاستیدا شەرم ناکات، ئایا ئەگەر ئافرەت شەیتانی بوو خۆشۆردنی لەسەرە؟ ئەویش فەرمووی: ((بەڵێ ئەگەر ئاو و شەهوەتی بینی (بە پۆشاکەکەیەوە) ))، جائوممو سەلەمە پێکەنی وتی: ئافرەتیش شەیتانی دەبێ لە خەویدا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ (ئەگەر ئاوی نەیەتەوە) ئەی لێچوونی منداڵ بە چییە؟)).**

٦٠٩٢-حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنَا عَمْرٌو، أَنَّ أَبَا النَّضْرِ حَدَّثَهُ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مُسْتَجْمِعًا قَطُّ ضَاحِكًا حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ، إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ[1].

**٦٠٩٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە (بەجۆرێ) پێبکەنێ تا ناودەم و مەلاشووی ببینم، بەڵکو هەمیشە زەردەخەنەی دەکرد.**

٦٠٩٣-حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَحْبُوبٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ.
وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﵁ أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهْوَ يَخْطُبُ بِالْمَدِينَةِ فَقَالَ: قَحَطَ المَطَرُ فَاسْتَسْقِ رَبَّكَ، فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ وَمَا نَرَى مِنْ سَحَابٍ، فَاسْتَسْقَى، فَنَشَأَ السَّحَابُ بَعْضُهُ إِلَى بَعْضٍ، ثُمَّ مُطِرُوا حَتَّى سَالَتْ مَثَاعِبُ الْمَدِينَةِ، فَمَا زَالَتْ إِلَى الْجُمُعَةِ الْمُقْبِلَةِ مَا تُقْلِعُ، ثُمَّ قَامَ ذَلِكَ الرَّجُلُ أَوْ غَيْرُهُ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ فَقَالَ: غَرِقْنَا، فَادْعُ رَبَّكَ يَحْبِسْهَا عَنَّا. فَضَحِكَ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا». مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا،فَجَعَلَ السَّحَابُ يَتَصَدَّعُ عَنِ الْمَدِينَةِ يَمِينًا وَشِمَالاً، يُمْطَرُ مَا حَوَالَيْنَا، وَلاَ يُمْطِرُ مِنْهَا شَيْءٌ، يُرِيهِمُ اللَّهُ كَرَامَةَ نَبِيِّهِ ﷺ وَإِجَابَةَ دَعْوَتِهِ[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٨٢٨.
(٢) بڕوانە: ٩٣٢.

٦٠٩٣-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا لە مەدینە وتاری دەدا، وتی: وشکەساڵی و بێ بارانیە داوا بکە لەپەروەردگارت باران ببارێنێ، پێغەمبەر ﷺ سەیری ئاسمانی کرد، وە ئێمە هیچ پەڵە هەورێکمان نەبینی بەئاسمانەوە، ئەویش دوعای کرد و پەڵە هەورەکان چوونە پاڵ یەکتری کۆبوونەوە، پاشان بارانیان بۆ باری هەتا لافاو بە جۆگاکانی مەدینەدا هەڵسا، باران بارین بەردەوام بوو، تاهەینی داهاتوو خۆشی نەدەکرد، پاشان ئەو پیاوە یان کەسێکی تر هەستا لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، وتی: بووین بە ژێر ئاوەوە (ئەی پێغەمبەری خوا)، داوا لە پەروەردگارت بکە باران بارین بوەستێنێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و فەرمووی: ((خوایە ئەم بارانە لە دەور و بەرماندا ببارێنە و بەسەرماندا مەیبارێنە))، دوو جار یاسێ جار فەرمووی، ئەنەس دەڵێ: جا هەورەکە بەلای ڕاست و چەپدا بڵاوبوویەوە لەدەور و بەری مەدینە، بەڵام لە مەدینە باران نەدەباری، خوا ڕێزی پێغەمبەرەکەی و گیرابوونی دوعا و پاڕانەوەکەی نیشان دەدان.

## ٦٩-بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾التوبة. وَمَا يُنْهَى عَنِ الْكَذِبِ

٦٠٩٤-حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يَكُونَ صِدِّيقًا، وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا».

## ٦٩- باسى ئەم فەرمايشتەى خواﷻ:(ئەى ئەوانەى بڕواتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە تۆڵەى خوا وە لەگەڵ ڕاستگۆياندا بن[1])، وەباسى ئەوى ڕێگرى لێكراوە لە درۆ

**٦٠٩٤- عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموويەتى: ((بێگومان ڕاستى ڕێنمونى (ئادەميزاد) دەکات بۆ چاکە، وە بێگومان چاکەش ڕێنمونى دەکات بۆ بەهەشت، وە بێگومان کەسێك هەر ڕاست دەکات تا لاى خوا بەزۆر ڕاستگۆ دەنوسرێت، وە بێگومان درۆ ڕێنمونى (ئادەميزاد) دەکات بۆ خراپە، وە بەڕاستى خراپەش ڕێنمونى دەکات بۆ ئاگرى دۆزەخ، وە بێگومان کەسێك هەر درۆ دەکات، تا لاى خوا بەزۆر درۆزن دەنوسرێت)).**

٦٠٩٥-حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِي سُهَيْلٍ نَافِعِ بْنِ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ»[2].

**٦٠٩٥- ئەبو هورەيرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى: ((نيشانەکانى ناپاك و دووڕوو سيانن، هەر کات قسەى کرد درۆ دەکات، هەر بەڵێنێکى دا نايباتە سەر، وە ئەگەر شتێکى پێ سپێردرا خيانەتى لێ دەکات)).**

٦٠٩٦-حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «رَأَيْتُ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي قَالاَ: الَّذِي رَأَيْتَهُ يُشَقُّ شِدْقُهُ فَكَذَّابٌ، يَكْذِبُ بِالْكَذْبَةِ تُحْمَلُ عَنْهُ حَتَّى تَبْلُغَ الآفَاقَ، فَيُصْنَعُ بِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[1].

---

(١) لە ڕيزى ڕاست گۆياندا بن.

(٢) بڕوانە: ٣٣.

٦٠٩٦-سەمورەیکوڕی جوندوب‌ﷺ دەڵێ:پێغەمبەرﷺفەرمووی: (( (ئەم شەو لەخەومدا) دووپیاوم[2]بینی هاتن بۆلام، هەردووکیان وتیان ئەوکەسەیکەبینیت لالغاوی دەقلێشێنرا ئەوە درۆزنێك بوو قسەیەکی درۆی دەکرد، لێیەوەوەردەگیرا هەتا دەگەشتە هەموو لایەك، جا هەتارۆژی دوایی هەر ئاوای لێ دەکرێ)).

## ٧٠-بابٌ: الْهَدْيِ الصَّالِحِ

٦٠٩٧-حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي أُسَامَةَ: حَدَّثَكُمُ الأَعْمَشُ، سَمِعْتُ شَقِيقًا قَالَ: سَمِعْتُ حُذَيْفَةَ يَقُولُ: إِنَّ أَشْبَهَ النَّاسِ دَلاًّ وَسَمْتًا وَهَدْيًا بِرَسُولِ اللهِ ﷺ لاَبْنُ أُمِّ عَبْدٍ، مِنْ حِينَ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ إِلَى أَنْ يَرْجِعَ إِلَيْهِ، لاَ نَدْرِي مَا يَصْنَعُ فِي أَهْلِهِ إِذَا خَلاَ؟[3]

## ٧٠- باسێک: دەربارەی هەڵسوکەوتی چاک و جوان[4]

٦٠٩٧-حوزەیفەﷺ دەڵێ: بێگومان کەسێك لەهەمووکەس زیاتر لەپێغەمبەری خوا ﷺ بچێت لەشێوەی جوانیوڕێبازو ئاکاریدا ئیبنوئوممەمی عەبدە[5]، لەوکاتەوەیلە ماڵ خۆی دەردەچێ تا دەگەڕێتەوە ماڵەوە، بەڵام نازانین (عەبدوڵلا) لەناوماڵی خۆیدا کەبەتەنهایەچی دەکات؟.

٦٠٩٨-حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُخَارِقٍ، سَمِعْتُ طَارِقًا قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ: إِنَّ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ[6].

---

(١) بڕوانە: ٨٤٥.
(٢) ئەو دوو پیاوە فریشتە بوون. ئەم فەرموودە بە درێژی لە (كتاب الجنائز) باسکراوە بەژمارە: ١٣٨٦.
(٣) بڕوانە: ٣٧٦٢.
(٤) بەم شێوەش مانا کراوە: بەگا ڕۆشتن و قسەکردن بەجوانی.
(٥) واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ.
(٦) بڕوانە: ٧٢٧٧.

**٦٠٩٨- تاریق دەڵێ: عەبدوڵلا ﷺ وتی: بێگومان چاکترین وتە قورئانەکەی خوایە، وە چاکترین ڕێباز و ڕێنوێن، ڕێباز و ڕێنوێنی موحەممەدە ﷺ.**

## ٧١-بابُ الصَّبْرِ عَلَى الأَذَى وَقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾ الزمر

٦٠٩٩-حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي الأَعْمَشُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ أَحَدٌ -أَوْ: لَيْسَ شَيْءٌ- أَصْبَرَ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللهِ، إِنَّهُمْ لَيَدْعُونَ لَهُ وَلَدًا، وَإِنَّهُ لَيُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ»[1].

## ٧١- باسی(گەورەیی)دان بەخۆدا گرتن لەسەر ئازار،وە ئەم فەرمایشتەی خوایبەرز و بڵند:(بێگومان دان بە خۆدا گران بێژمارەپاداشتیان دەدرێتەوە)

**٦٠٩٩- ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کەس نییە -یان هیچ شتێك نییە- ئارام گرتر بێت لەسەر وتەیەکی ناشرین بیستبێتی لە خوای گەورە، لە ڕاستیدا خەڵکی منداڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن، لە هەمان کاتدا خوا لەش ساغ و بێوەیان دەکات و ڕۆزیشیان دەدات)).**

٦١٠٠-حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ شَقِيقًا يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ اللهِ: قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ قِسْمَةً كَبَعْضِ مَا كَانَ يَقْسِمُ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: وَاللهِ إِنَّهَا لَقِسْمَةٌ مَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللهِ. قُلْتُ: أَمَّا أَنَا لأَقُولَنَّ لِلنَّبِيِّ ﷺ. فَأَتَيْتُهُ وَهْوَ فِي أَصْحَابِهِ

(١) بڕوانە: ٧٣٧٨.

فَسَارَرْتُهُ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ وَغَضِبَ، حَتَّى وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَخْبَرْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: «قَدْ أُوذِيَ مُوسَى بِأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَصَبَرَ»[1].

**٦١٠٠- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (لە غەزای حونەیندا) دەست کەوتەکانی بەش کرد، وەك هەندێ لەو بەشکردنانەی جاران کە دەیکرد، ئینجا پیاوێکی ئەنصاری وتی: وەڵڵاهی ئەمە دابەش کردنێکە مەبەست پێی ڕەزامەندی خوا نەبووە، وتم: سوێند بێ من ئەم وتەیە بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێم، جا چوومە خزمەتی لە ناو هاوەڵانیدا بوو منیش بە نهێنی عەرزم کرد، ئەو وتەیە لەسەر پێغەمبەر ﷺ زۆر نارەحەت بوو دەم و چاوی تێك چوو توڕە بوو، هەتا ئاواتە خواز بووم ئەم هەواڵەم پێنەگەیان دایە، لە پاشان فەرمووی: ((بێگومان مووسا ﷺ لەمە زیاتر ئازار درا بەڵام دانی بەخۆیدا گرت)).**

## ٧٢-بابُ مَنْ لمْ يُوَاجِهِ النَّاسَ بِالْعِتَابِ

٦١٠١-حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، عَنْ مَسْرُوقٍ: قَالَتْ عَائِشَةُ: صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا فَرَخَّصَ فِيهِ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَخَطَبَ فَحَمِدَ اللَّهَ ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ؟! فَوَاللَّهِ إِنِّي لأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً»[2].

## ٧٢- باسی کەسێک ڕووبەڕوو سەرزەنشتی خەڵك نەکات

**٦١٠١- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شتێکی کرد دواتر ڕووخسەتی نەکردنی ئەو شتەیدا، بەڵام کەسانێك خۆیان لێ بەدوور گرت، ئینجا ئەوە بە پێغەمبەر**

---

(١) بڕوانە: ٣١٥٠.

(٢) بڕوانە: ٧٣٠١.

ﷺ گەشتەوە، پێغەمبەریش ﷺ وتاریدا سوپاسی خوای كرد و لە پاشان فەرمووی: ((ئەوە خەڵكانێك چییانە خۆیان بەدوور دەگرن لەشتێك كەمن دەیكەم؟ دەی سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە من لەوان چاكتر خوا دەناسم، وە لە هەمووشیان زیاتر لە خوا دەترسم)).

٦١٠٢-حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ -هُوَ ابْنُ أَبِي عُتْبَةَ مَوْلَى أَنَسٍ- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، فَإِذَا رَأَى شَيْئًا يَكْرَهُهُ عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ[1].

٦١٠٢- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە كچی ناو پەردە بەشەرم تر بوو، جائەگەر شتێكی بدیایە و پێی ناخۆش بوایە، بەدەم و چاویدا دەمان زانی.

## ٧٣-بابٌ: مَنْ أَكْفَرَ أَخَاهُ بِغَيْرِ تَأْوِيلٍ فَهُوَ كَمَا قَالَ

٦١٠٣-حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ وَأَحْمَدُ بْنُ سَعِيدٍ قَالاَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، أَخْبَرَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لأَخِيهِ: يَا كَافِرُ. فَقَدْ بَاءَ بِهِ أَحَدُهُمَا».

وَقَالَ عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ، سَمِعَ أَبَا سَلَمَةَ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

(١) بروانە: ٣٥٦٢.

## ٧٣- باسێک: هەرکەسێک برا مسوڵمانەکەی کافر بکات بەبێ پاساوێکی ڕاست،ئەوە خۆی وەهایە کە وتوویەتی(بەبراکەی)

**٦١٠٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێك بەبرا (مسوڵمانە)کەی بڵێ: ئەی کافر، ئەوە بێگومان ئەو کافر کردنە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێکیان[1])).**

**-عیکریمەی کوڕی عەممار لە یەحیاوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدەوە کە لە ئەبو سەلەمەی بیستووە، ئەویش لە ئەبو هوڕەیرەی بیستووە، ئەبو هوڕەیرەش ﷺ لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە[2].**

٦١٠٤-حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لِأَخِيهِ: يَا كَافِرُ. فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا».

**٦١٠٤- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك بەبرا (مسوڵمانە) کەی بڵێ: ئەی کافر، ئەوە بێگومان ئەو کافر کردنە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێکیان[3])).**

٦١٠٥-حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الإِسْلَامِ كَاذِبًا فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، وَلَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ رَمَى مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ»[1].

---

(١) یان قسەکەی ڕاستەو کەسەکە کافرە یان خۆی کافر دەبێت ئەگەر ڕاست نەبوو.

(٢) ئەمە ڕشتەیەکی ترە بۆ فەرموودەکەی پێشوو کە عەبدوڵڵای کوڕی یەزید زیاد کراوە، لە نێوان یەحیاو ئەبو سەلەمەدا هەر بۆ ئەوەش هێناویەتی.

(٣) یان قسەکەی ڕاستەو کەسەکە کافرە یان خۆی کافر دەبێت ئەگەر ڕاست نەبوو.

**٦١٠٥- ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە کەسابیتی کوڕی زەحاك بۆی گێڕایەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك سوێند بخوات بە ئاینێك جگە ئیسلام، ئەوە بەو جۆرەیە کە وتوویەتی[٢]، هەر کەسێکیش لە دونیادا بەشتێك خۆی بکوژێت، لە دۆزەخدا بەهەمان شت سزا دەدرێت، وە نەفرین کردنی باوەڕدار وەك کوشتنی وایە، هەر کەسێکیش باوەڕدارێك تۆمەتبار بکات بەبێ باوەڕی، ئەوە وەك ئەوە وایە بیکوژێت)).**

## ٧٤- بابُ مَنْ لَمْ يَرَ إِكْفَارَ مَنْ قَالَ ذَلِكَ مُتَأَوِّلاً أَوْ جَاهِلاً

وَقَالَ عُمَرُ لِحَاطِبٍ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ قَدِ اطَّلَعَ إِلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: قَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ"[٣].

٦١٠٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبَادَةَ، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ، أَخْبَرَنَا سَلِيمٌ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يَأْتِي قَوْمَهُ فَيُصَلِّي بِهِمُ الصَّلاَةَ، فَقَرَأَ بِهِمُ الْبَقَرَةَ، قَالَ: فَتَجَوَّزَ رَجُلٌ فَصَلَّى صَلاَةً خَفِيفَةً، فَبَلَغَ ذَلِكَ مُعَاذًا فَقَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ. فَبَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا قَوْمٌ نَعْمَلُ بِأَيْدِينَا، وَنَسْقِي بِنَوَاضِحِنَا،وَإِنَّ مُعَاذًا صَلَّى بِنَا الْبَارِحَةَ، فَقَرَأَ الْبَقَرَةَ فَتَجَوَّزْتُ، فَزَعَمَ أَنِّي مُنَافِقٌ.فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا مُعَاذُ، أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟ -ثَلاَثًا- اقْرَأْ ﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ۝١ ﴾ الشمس، وَ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ۝١ ﴾ الأعلى، وَنَحْوَهَا»[٤].

---

(١) بڕوانە: ١٣٦٣.

(٢) واتە: ئەو کەسە وتەکەی خۆی بەسەریدا دەچەسپێ ئەگەر وتەکەی ڕاست نەبوو، وە ئەگەر ڕاستی کرد ئەوە بەسەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ سەر ئاینی ئیسلام.

(٣) بڕوانە: ٣٠٠٧.

(٤) بڕوانە: ٧٠٠.

## ٧٤- باسی ئەو کەسەی کە ڕای وانییە کەسێک ئەو قسەیە بڵێ[1] کافر بکرێت، ئەگەر پاساوێکی هەبێت یان نەزان بێت

-عومەر ﷺ وتی بە حاتەب ﷺ بەڕاستی دووڕووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ چوزانیت؟ لەوانەیە خوا ئاگاداری بەژداربووانی بەدر بێت، فەرموبێتی بێگومان من لێتان خۆش بووم)).

٦١٠٦- جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە کە موعازی کوڕی جەبەل ﷺ هەمیشە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان دەڕۆشتەوە بۆ لای هۆزەکەی و هەمان نوێژی بۆ دەکردنەوە (بە کۆمەڵ)، ئینجا سوڕەتی بەقەڕەی بۆخوێندن، (جابیر) دەڵێ: ئینجا پیاوەکە درێژەی نەدایە و نوێژێکی بە تەنهای و کورتی کرد، جا ئەوە[2] بەموعاز گەشتەوە، موعاز وتی: ئەو پیاوە تووشی ناپاکی بووە، قسەکەی موعاز بە پیاوەکە گەشتەوە، پیاوەکەش ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەر و ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە خەڵکانێکین کارەکانمان بەدەستی خۆمان دەکەین، وە بە وشترەکانمان ئاودێری دەکەین، وە بێگومان شەوی ڕابردوو موعاز پێش نوێژی بۆ کردین و سوڕەتی بەقەرەی خوێند، منیش نوێژم بەکورتی و خێرایی کرد، ئەو بەقسەی خۆی من بوومەتە دووڕوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی موعاز ئایا تۆ خەڵکی (لە نوێژی بەکۆمەڵ) دەتارێنیٚ، سیٚ جار دوبارەی کردەوە. ((سوڕەتی ﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ١ ﴾، وە ﴿ سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١ ﴾ هاوشێوەی ئەوانە بخوێنە)).

---

(١) بەبراکەی بڵێ ئەی کافر.

(٢) نوێژ کردنی پیاوەکە بەخێرایی و جیابوونەوەی لە ئەوان.

٦١٠٧- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا أَبُو الْمُغِيرَةِ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى. فَلْيَقُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ، فَلْيَتَصَدَّقْ»[1].

**٦١٠٧-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس لە ئێوە سوێندی خوارد و لە سوێند خواردنەکەیدا وتی: سوێند بەلات و عوززا، ئەوە با بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، وە هەر کەس بە هاوڕێکەی بڵێ: وەرە با قومارت لەگەڵ بکەم، ئەوە باماڵێك بکات بە خێر)).**

٦١٠٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ فِي رَكْبٍ وَهْوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَنَادَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ، وَإِلاَّ فَلْيَصْمُتْ»[2].

**٦١٠٨- ئیبنو عومەر ﷺ گەشت بە عومەری کوڕی خوتتاب ﷺ لە کاروانێکدا عومەر بەسەری باوکی سوێندی دەخوارد، پێغەمبەری خواش ﷺ بانگی کردن فەرمووی: ((ئاگاداربن بێگومان خوا قەدەغەی کردوە لێتان کە سوێند بخۆن بە باوکتان، جا هەر کەس سوێندی خوارد، ئەوە با تەنها سوێند بە خوا بخوات، ئەگەر نا بێدەنگ بێت)).**

## ٧٥- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ الغَضَبِ وَالشِّدَّةِ لِأَمْرِ اللهِ

وَقَالَ اللَّهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ﴿٧٣﴾ ﴾ التوبة

---

(١) بڕوانە: ٤٨٦٠.

(٢) بڕوانە: ٢٦٧٩.

٦١٠٩- حَدَّثَنَا يَسَرَةُ بْنُ صَفْوَانَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ، وَفِي الْبَيْتِ قِرَامٌ فِيهِ صُوَرٌ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُهُ، ثُمَّ تَنَاوَلَ السِّتْرَ فَهَتَكَهُ، وَقَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُصَوِّرُونَ هَذِهِ الصُّوَرَ»[1].

## ٧٥- باسی ئەوەی دروستە لە تووڕە بوون و توندی لەبەر فەرمانی خودا

**خواش دەفەرمووی: ( (ئەی موحەمەد ﷺ خەبات بکە دژی بێباوەڕان و دووڕووان، وە توند و تیژبە لە دژیان).**

**٦١٠٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام و لە ماڵدا پەردەیەك هەبوو وێنەی پێوە بوو، جا پێغەمبەر ﷺ ڕەنگی دەم و چاوی گۆڕا، لە پاشان پەردەکەی ڕایکێشا و دڕاندی، عائیشە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەخترین سزا لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەو کەسانەیە ئەم وێنانە دروست دەکەن)).**

٦١١٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلَاةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا. قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطُّ أَشَدَّ غَضَبًا فِي مَوْعِظَةٍ مِنْهُ يَوْمَئِذٍ - قَالَ:- فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيَتَجَوَّزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الْمَرِيضَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَةِ»[2].

**٦١١٠-ئەبو مەسعوود ﵁ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: بەڕاستی من دوا دەکەوم (ناڕۆم بۆ) لە نوێژی بەیانیان لەبەر فلانە کەس کە نوێژەکەمان بۆ درێژ دەکاتەوە، دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە لە ئامۆژگاری کردندا ئەوەندەی**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٧٩.

(٢) بڕوانە: ٩٠.

**ئەو ڕۆژە تووڕە بووبێت، دەڵێ: فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە، بەڕاستی لە ئێوەدا کەسی وا هەیە خەڵکی دوور دەخاتەوە (لە نوێژی بەکۆمەڵ)، جا هەر کامێکتان پێشنوێژی بۆ خەڵکی کرد با نوێژەکەی کورت بێت، چونکە بێگومان لە ناو نوێژ خوێناندا نەخۆش و بەتەمەن و خاوەن ئیشیان تێدایە)).**

٦١١١- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي رَأَى فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ نُخَامَةً فَحَكَّهَا بِيَدِهِ، فَتَغَيَّظَ ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا كَانَ فِي الصَّلاَةِ فَإِنَّ اللَّهَ حِيَالَ وَجْهِهِ، فَلاَ يَتَنَخَّمَنَّ حِيَالَ وَجْهِهِ فِي الصَّلاَةِ»[1].

**٦١١١- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد لە قیبلەی مزگەوتدا بەڵغەمێکی بینی بەدەستی (بەبەردێك) کڕاندی، ئینجا زۆر ڕقی هەستا، لە پاشان فەرمووی: ((ئەگەر کەسێك لە ئێوە لە نوێژدا بوو، ئەوە بێگومان خوا بەرانبەریەتی، دەی کەواتە با لە نوێژدا بەڵغەم فڕێ نەداتە بەرانبەری خۆیەوە)).**

٦١١٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، أَخْبَرَنَا رَبِيعَةُ بْنُ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ يَزِيدَ -مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: «عَرِّفْهَا سَنَةً، ثُمَّ اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ اسْتَنْفِقْ بِهَا، فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَضَالَّةُ الْغَنَمِ قَالَ: «خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ قَالَ: فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ -أَوِ احْمَرَّ وَجْهُهُ- ثُمَّ قَالَ: «مَالَكَ وَلَهَا؟مَعَهَا حِذَاؤُهَا وَسِقَاؤُهَا حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا»[2].

---

(١) بڕوانە: ٤٠٦.

(٢) بڕوانە: ٩١.

**٦١١٢-زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی شتی دۆزراوە، ئەویش فەرمووی: ((ساڵێك جاڕی بۆ بدە، پاشان بزانە بەچی بەستراوە و لە چی دایە، لە پاشان خەرجی بکە (و سوودی لێ ببینە)، جا ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەرەوە))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی مەڕی ونبوو (حوکمی چییە)؟ فەرمووی: ((بیبە چونکە بێگومان ئەو مەڕە یان بۆ تۆیە یان بۆ براکەتە یان بۆ گورگە))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی وشتری ونبوو (حوکمی چییە)؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە تووڕە بوو هەتا هەردوو کوڵمی زۆر سوور بوویەوە -یان ڕووخساری زۆر سوور بویەوە- لە پاشان فەرمووی: ((چیتە بەسەریەوە؟ پێڵاو جەونە و ئاوی خۆی پێیە، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە)).**

٦١١٣ - وَقَالَ المَكِّيُّ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ.
وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي سَالِمٌ أَبُو النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ- عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: احْتَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حُجَيْرَةً مُخَصَّفَةً -أَوْ حَصِيرًا- فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِيهَا، فَتَتَبَّعَ إِلَيْهِ رِجَالٌ وَجَاءُوا يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، ثُمَّ جَاءُوا لَيْلَةً فَحَضَرُوا، وَأَبْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْهُمْ فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ، فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ وَحَصَبُوا البَابَ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ مُغْضَبًا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا زَالَ بِكُمْ صَنِيعُكُمْ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُكْتَبُ عَلَيْكُمْ، فَعَلَيْكُمْ بِالصَّلَاةِ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ خَيْرَ صَلَاةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ».

**٦١١٣-زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنێکی (لە مزگەوتدا) جیاکردەوە - یان حەسیریکی دا لە دەوری، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ هەتەدەر و لەو شوێنەدا نوێژی دەکرد، ئینجا پیاوانێك هاتن لە دوایەوە**

نوێژیان دەکرد، ئەنجا شەوێك هاتن و ئامادەبوون بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت و نەهات بۆ لایان، بۆیە ئەوانیش دەنگیان بەرز کردەوە و دەرگاکەیان دایە بەر وردە بەرد[1]، پێغەمبەریش ﷺ هاتە دەرەوە بە توڕەییەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێیان: ((لەسەر ئەم کارەتان[2] بەردەوام بوون، هەتا گومانم وابوو کە لە داهاتوودا فەرز دەکرێت لەسەرتان، لەبەر ئەوە لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن، چونکە بە دڵنیاییەوە چاکترین و گەورەترین نوێژی مرۆڤ لە ماڵەوە دەکرێت، جگە لە نوێژە فەرزەکان)).

## ٧٦- بابُ الحَذَرِ مِنَ الْغَضَبِ

لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ الشورى، ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ آل عمران.

٦١١٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ».

## ٧٦- باسی ئەگادار بوون و خۆپاراستن لە تووڕەیی

بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە ئەوانەی لە گوناهە گەورەکان و خراپە زۆر ناشیرینەکان دوور دەکەونەوە، وە کاتێ ڕق و قینیان

---

(١) بۆ ئاگادار کردنەوەی نەوەک لە بیری چووبێت.

(٢) ئەو نوێژکردنەیان لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ بەکۆمەڵ.

**هەڵسێت، ئەوان لێ دەبوورن)، (ئەوانەی ماڵ دەبەخشن (لە ڕێی خوادا) لە کاتی خۆشی[1] و ناخۆشیدا، وە ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و دەبوورن لە خەڵکی، خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت) ٦١١٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کەسی ئازا و بەهێز (پاڵەوان) نییە زۆر خەڵك بدات بەزەویدا، بەڵکو بەڕاستی ئازا و بەهێز کەسێکە لە کاتی تووڕەبووندا خۆی پێ دەگیرێ (و ڕقی خۆی دەخواتەوە) )).**

٦١١٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ عِنْدَهُ جُلُوسٌ، وَأَحَدُهُمَا يَسُبُّ صَاحِبَهُ مُغْضَبًا قَدِ احْمَرَّ وَجْهُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ، لَوْ قَالَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ». فَقَالُوا لِلرَّجُلِ: أَلاَ تَسْمَعُ مَا يَقُولُ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: إِنِّي لَسْتُ بِمَجْنُونٍ[2].

**٦١١٥-سولەیمانی کوڕی صورەد ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین دوو پیاو لای پێغەمبەردا ﷺ جنێویان بەیەکتریدا، یەکێکیان جنێوی بە هاوڕێکەی دەدا تورە ببوو ڕووخساری زۆر سوور بوو بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من وتەیەك دەزانم، ئەگەر ئەو کەسە بیڵێ ئەو تووڕەیییەی هەیەتی نامێنێ و دەڕوات، ئەگەر بڵێت: پەنا دەگرم بە خوا لەشەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خوا))، خەڵکەکەش بە پیاوەکەیان وت: ئایا گوێت لێیە پێغەمبەر ﷺ چی دەفەرموێ؟ وتی: خۆ من شێت نیم.**

---

(١) دەوڵەمەندی.

(٢) بڕوانە: ٣٢٨٢.

٦١١٦- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرٍ -هُوَ ابْنُ عَيَّاشٍ- عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَوْصِنِي. قَالَ: «لاَ تَغْضَبْ». فَرَدَّدَ مِرَارًا، قَالَ: «لاَ تَغْضَبْ».

**٦١١٦-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ((تووڕە مەبە)) کابرا چەند جاری وتەکەی خۆی دووبارە کردەوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ((تووڕە مەبە)).**

## ٧٧- بَابُ الحَيَاءِ

٦١١٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي السَّوَّارِ الْعَدَوِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْحَيَاءُ لاَ يَأْتِي إِلاَّ بِخَيْرٍ». فَقَالَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ: مَكْتُوبٌ فِي الحِكْمَةِ: إِنَّ مِنَ الْحَيَاءِ وَقَارًا، وَإِنَّ مِنَ الْحَيَاءِ سَكِينَةً. فَقَالَ لَهُ عِمْرَانُ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَتُحَدِّثُنِي عَنْ صَحِيفَتِكَ.

## ٧٧- باسی (فەزڵ و گەورەیی) شەرم و حەیا

**٦١١٧- عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((شەرم و حەیا لە خێر بەولاوە هیچی تر ناهێنێت))، بوشەیری کوڕی کەعب دەڵێ: لە حیکمەت و داناییدا نوسراوە لە حەیا و شەرمدا سەنگینی هەیە، وە لە حەیا و شەرمدا ئارامی هەیە، وەقار و سەنگینی بەشێکن لە حەیا، وە ئارامی بەشێکە لە حەیا، عیمرانیش وتی: من فەرموودەی پێغەمبەری خوات ﷺ بۆ دەگێڕمەوە، کەچی تۆ قسەی ناو دەفتەرەکەتم بۆ دەکەی.**

٦١١٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَجُلٍ وَهْوَ يُعَاتَبُ فِي الْحَيَاءِ يَقُولُ: إِنَّكَ لَتَسْتَحْيِي. حَتَّى كَأَنَّهُ يَقُولُ: قَدْ أَضَرَّ بِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ»[1].

**٦١١٨-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای پیاوێکدا سەرزەنشتی برایەکی دەکرد دەربارەی شەرم وحەیا پێی دەوت: تۆ شەرم دەکەیت هەتا وەك ئەوەی پێی بڵێ: بێگومان شەرم کردن زیانی لێ داوی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((وازی لێ بێنە، چونکە بەڕاستی شەرم و شکۆ بەشێکە لە باوەڕ)).**

٦١١٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ مَوْلَى أَنَسٍ -قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: اسْمُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي عُتْبَةَ- سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا[2].

**٦١١٩- قەتادە لە ئازادکراوێکی ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە - ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی عوتبە بوو- دەڵێ: لە ئەبو سەعیدی خودریم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ لە کچی ناو پەردە بەشەرم و شکۆتر بوو.**

## ٧٨- بابُ "إِذَا لَمْ تَسْتَحِي فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ"

٦١٢٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، حَدَّثَنَا أَبُو مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الأُولَى إِذَا لَمْ تَسْتَحِي فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٤.

(٢) بڕوانە: ٣٥٦٢.

## ٧٨- باسى[٢] ((ئەگەر شەرمت نەكرد ئەوە چيت ويست بيكە))

**٦١٢٠- ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ((بێگومان يەكێك لەو وتەى پێغەمبەرايەتى كە بەخەڵك گەشتووە (ئەمەيە): ئەگەر شەرمت نەكرد، كەواتە هەرچيت ويست بيكە)).**

## ٧٩- بَابُ مَا لاَ يُسْتَحْيَا مِنه مِنَ الحَقِّ لِلتَّفَقُّهِ فِي الدِّينِ

٦١٢١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ، لاَ يَسْتَحِي مِنَ الْحَقِّ، فَهَلْ على الْمَرْأَةِ غُسْلٌ إِذَا احْتَلَمَتْ؟ فَقَالَ: «نَعَمْ، إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ»[٣].

## ٧٩- باسى ئەوەى كە شەرمى لێناكرێ لە (وتەى) ڕاستى بۆ شارەزابوون لە ئايين

**٦١٢١- زەينەبى كچى ئەبى سەلەمە لە ئوممو سەلەمەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئوممو سولەيم ﷺ هات بۆ خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ بێگومان خوا لە ئاست حەقدا شەرم ناكات، ئايا ئافرەت خۆشۆردنى لەسەرە ئەگەر شەيتانى بوو؟ پێغەمبەرى خواش ﷺ فەرمووى: ((بەڵێ ئەگەر ئاوى بينى (بەجلەكانيەوە) )).**

---

(١) بڕوانە: ٣٤٨٣.

(٢) ئەم فەرموودەى پێغەمبەر ﷺ.

(٣) بڕوانە: ١٣٠.

٦١٢٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَارِبُ بْنُ دِثَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ شَجَرَةٍ خَضْرَاءَ لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا وَلاَ يَتَحَاتُّ». فَقَالَ الْقَوْمُ: هِيَ شَجَرَةُ كَذَا، هِيَ شَجَرَةُ كَذَا. فَأَرَدْتُ أَنْ أَقُولَ هِيَ النَّخْلَةُ وَأَنَا غُلاَمٌ شَابٌّ فَاسْتَحْيَيْتُ. فَقَالَ: «هِيَ النَّخْلَةُ».

وَعَنْ شُعْبَةَ، حَدَّثَنَا خُبَيْبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ مِثْلَهُ، وَزَادَ: فَحَدَّثْتُ بِهِ عُمَرَ فَقَالَ: لَوْ كُنْتَ قُلْتَهَا لَكَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وَكَذَا[1].

**٦١٢٢-موحاریبی كوڕی دیسار دەڵێ: لە ئیبنو عومەرم ﷺ بیست دەیوت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نموونەی باوەڕدار وەك درەختێكی هەمیشە سەوز وایە، گەڵای ناوەرێت، وە گەڵاكانی بەریەكتری ناكەون و بوەرێن))، جا كەسێكیان وتی: ئەو درەختەیە، ئەو درەختەیە، (عەبدوڵڵا دەڵێ:) منیش ویستم بڵێم: ئەو درەختە دار خورمایە، وە من لەو كاتەدا لاوێكی گەنج بووم بۆیە شەرمم كرد (قسە بكەم)، ئینجا فەرمووی: ((ئەو درەختە دار خورمایە)).**

**وە لە شوعبەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: خوبەیبی كوڕی عەبدوڕەحمان بۆی گێڕاینەوە لە حەفصی كوڕی عاصیمەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەكەی پێشووی گێڕایەوە و ئەمەشی بۆ زیاد كرد: ئەو باسەم بۆ عومەر ﷺ گێڕایەوە ئەویش وتی: ئەگەر تۆ بتوتایە (دار خورمایە)، ئەوە خۆشتر بوو لام لەوە و لەوە.**

٦١٢٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا مَرْحُومٌ، سَمِعْتُ ثَابِتًا، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ تَعْرِضُ عَلَيْهِ نَفْسَهَا، فَقَالَتْ: هَلْ لَكَ حَاجَةٌ فِيَّ؟ فَقَالَتِ ابْنَتُهُ: مَا أَقَلَّ حَيَاءَهَا! فَقَالَ: هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ، عَرَضَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَفْسَهَا[1].

---

(١) بڕوانە: ٦١.

**٦١٢٣- مەرحوم دەڵێ: لەسابیتم بیست وتی: ئەویش لە ئەنەسی ﷺ بیست دەیوت: ئافرەتێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆی بۆ پێغەمبەر ﷺ پێشنیار كرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پێویستیت بە من هەیە (مارەم كەیت)؟ كچەكەی ئەنەسیش وتی: چەند بێ شەرمە! (ئەنەس) وتی پێی: ئەو ئافرەتە لە تۆ چاكترە، خۆی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنیار كردوە (مارەی كات).**

## ٨٠- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا»

وَكَانَ يُحِبُّ التَّخْفِيفَ وَالْيُسْرَ عَلَى النَّاسِ.

٦١٢٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا النَّضْرُ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: لَمَّا بَعَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ قَالَ لَهُمَا: «يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا». قَالَ أَبُو مُوسَى: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضٍ يُصْنَعُ فِيهَا شَرَابٌ مِنَ الْعَسَلِ يُقَالُ لَهُ: الْبِتْعُ، وَشَرَابٌ مِنَ الشَّعِيرِ يُقَالُ لَهُ: الْمِزْرُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٢].

## ٨٠- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((كار ئاسان كەن قورس و گرانی مەكەن))

**-وە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە حەزی لە ئاسانكاری و سووك كردنی (ئیش و كار) بوو لەسەر خەڵكی.**

**٦١٢٤-سەعدی كوڕی ئەبی بوردە لە باوكیەوە ئەویش لە باپیریەوە (كە ئەبو مووسایە) ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو و موعازی**

---

(١) بڕوانە: ٥١٢٠.

(٢) بڕوانە: ٢٢٦١.

كوڕى جەبەلى ﷺ نارد (بۆ يەمەن)، بەهەردووكيانى فەرموو: ((ئاسانكاربن و گرانكار مەبن، وە مژدەدەربن و تۆقێنەر مەبن، لەگەڵ يەكتردا بگونجێن (و جياواز مەبن) ))، ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەرى خوا ئێمە لە وڵاتێك داين خواردنەوەيەكى تێدايە لە هەنگوين دروست دەكرێ، پێی دەوترێ: بيتع، هەروەها خواردنەوەيەكى تيايە لە جۆ دروست دەكرێ، پێی دەڵێن: ميزر، پێغەمبەرى خواش ﷺ فەرمووى: ((هەموو سەرخۆش كەرێك حەرامە)).

٦١٢٥- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَسَكِّنُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا»[١].

٦١٢٥-ئەنەسى كوڕى ماليك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (( ئاسانكار بن گرانكار مەبن، لەسەر خۆبن خەڵك ڕاو مەنێن)).

٦١٢٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ قَطُّ إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِنَفْسِهِ فِي شَيْءٍ قَطُّ، إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ، فَيَنْتَقِمَ بِهَا لِلَّهِ[٢].

٦١٢٦- عوروە لە عائيشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە عائيشە وتی: پێغەمبەرى خوا ﷺ هەركات لە نێوان دوو شتدا سەرپشك كرابێت ئاسانەكەيانى وەرگرتووە و كردوە، بەمەرجی تاوان نەبووبێت، خۆ ئەگەر تاوان بووبێت ئەو دوورترين كەس بووە لێيەوە، وە پێغەمبەرى خوا ﷺ هەرگيز لە هيچ شتێكدا لەبەر خۆی

(١) بڕوانە: ٦٩.
(٢) بڕوانە: ٣٥٦٠.

**تۆڵەی لە كەس نەكردۆتەوە، مەگەر ڕێز و حورمەتی (ئایینی) خوا شكێنرابێت، ئەوجا لەبەر خوا و ڕێزی (ئایینەكەی) تۆڵەی دەكردەوە.**

٦١٢٧- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنِ الأَزْرَقِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: كُنَّا عَلَى شَاطِئِ نَهْرٍ بِالأَهْوَازِ قَدْ نَضَبَ عَنْهُ الْمَاءُ، فَجَاءَ أَبُو بَرْزَةَ الأَسْلَمِيُّ عَلَى فَرَسٍ، فَصَلَّى وَخَلَّى فَرَسَهُ، فَانْطَلَقَتِ الْفَرَسُ، فَتَرَكَ صَلاَتَهُ وَتَبِعَهَا حَتَّى أَدْرَكَهَا فَأَخَذَهَا، ثُمَّ جَاءَ فَقَضَى صَلاَتَهُ، وَفِينَا رَجُلٌ لَهُ رَأْيٌ، فَأَقْبَلَ يَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا الشَّيْخِ تَرَكَ صَلاَتَهُ مِنْ أَجْلِ فَرَسٍ. فَأَقْبَلَ فَقَالَ: مَا عَنَّفَنِي أَحَدٌ مُنْذُ فَارَقْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. وَقَالَ: إِنَّ مَنْزِلِي مُتَرَاخٍ، فَلَوْ صَلَّيْتُ وَتَرَكْتُ لَمْ آتِ أَهْلِي إِلَى اللَّيْلِ. وَذَكَرَ أَنَّهُ صَحِبَ النَّبِيَّ ﷺ فَرَأَى مِنْ تَيْسِيرِهِ[1].

**٦١٢٧-ئەزرەقی كوڕی قەیس دەڵێ: ئێمە لە قەراغی ڕووبارێكدا بووین لە ئەهواز كە ئاوەكەی وشكی كردبوو، ئینجا ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ هات بەسوار ئەسپێكەوە نوێژی كرد و ئەسپەكەی بەرەڵا كرد، ئەسپەكەش ڕۆشت، ئەبو بەرزە نوێژەكەی وازلێ هێنا و شوێن ئەسپەكەی كەوت، پێی گەشت و گرتی و پاشان هات و نوێژەكەی تەواو كرد، پیاوێكمان تیابوو ڕای خراپ بوو، جا هات وتی: سەیری ئەو پیاوە پیرە بەتەمەنە بكەن وازی لە نوێژەكەی هێنا لەبەر ئەسپێك، ئینجا ئەبو بەرزە هات وتی: كەس قسەی توندی پێ نەوتووم لەو كاتەوەی لە پێغەمبەر خوا ﷺ جیا بوومەتەوە، وە وتی: بەڕاستی ماڵەكەم دوورە ئەگەر نوێژ بكەم (ئەسپەكەم) واز لێ بێنم، بۆ شەو ناگەمەوە ماڵەوە، وە وتی: ئەو هاوڕێیەتی پێغەمبەری ﷺ كردوە و ئاسانكاری ئەوی دیوە.**

٦١٢٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، ح. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَالَ فِي

---

(١) بروانە: ١٢١١.

الْمَسْجِدِ، فَثَارَ إِلَيْهِ النَّاسُ لِيَقَعُوا بِهِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعُوهُ، وَأَهْرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ -أَوْ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ- فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ»[1].

**٦١٢٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە عەرەبێکی دەشتەکی لە مزگەوتدا میزی کرد، ئینجا خەڵکی هەموو هورۆژان ویستیان لێی بدەن، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: ((وازی لێ بێنن، وە دۆڵچەیەکی پڕ لە ئاو - یان دۆڵچەیەك ئاوی - بکەن بەسەریدا، چونکە بێگومان ئێوە بە ئاسانکاری نێردراون، وە بەگرانکار نەنێردراون)).**

## ٨١- باب الانْبِسَاطِ إِلى النَّاسِ

وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ ﷺ : خَالِطِ النَّاسَ، وَدِينَكَ لَا تَكْلِمَنَّهُ، وَالدُّعَابَةِ مَعَ الأَهْلِ.

٦١٢٩- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو التَّيَّاحِ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَيُخَالِطُنَا حَتَّى يَقُولَ لأَخٍ لِي صَغِيرٍ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟»[2].

## ٨١- باسی ڕووخۆشی و سوعبەت کردن لەگەڵ خەڵکیدا

**-ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: تێکەڵاوی خەڵکی بکە و ناتەواوی بۆ ئاینەکەت دروست مەکە، وە سوعبەت کردن لەگەڵ کەس و کاردا (دروستە).**

**٦١٢٩-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێکەڵاوی لەگەڵماندا دەکرد، هەتا بە برایەکی بچووکمی دەفەرموو: ((ئەی ئەبا عومەیر نوغەیر[1] چی کرد؟)).**

---

(١) بروانە: ٢٢٠.

(٢) بروانە: ٦٢٠٣.

٦١٣٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ لِي صَوَاحِبُ يَلْعَبْنَ مَعِي، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ يَتَقَمَّعْنَ مِنْهُ، فَيُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ فَيَلْعَبْنَ مَعِي.

**٦١٣٠- عائیشه ﵂ دەڵێ: من لەگەڵ چەند کچێکدا لای پێغەمبەردا ﷺ یاریم دەکرد، من هەندێ دەستە کچی هاوڕێم هەبوو لەگەڵمدا یاریان دەکرد، جا کە پێغەمبەری خوا دەهاتەوە بۆ ماڵەوە کچەکان خۆیان دەشاردەوە لەبەر ئەو، وە پێغەمبەر ﷺ دەیناردن بۆ لام و لە گەڵمدا یارییان دەکرد.**

## ٨٢- بابُ الْمُدَارَاةِ مَعَ النَّاسِ

وَيُذْكَرُ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ : إِنَّا لَنَكْشِرُ فِي وُجُوهِ أَقْوَامٍ، وَإِنَّ قُلُوبَنَا لَتَلْعَنُهُمْ.

٦١٣١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ، حَدَّثَهُ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ على النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: «ائْذَنُوا لَهُ، فَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ أَوْ بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ». فَلَمَّا دَخَلَ أَلَانَ لَهُ الْكَلَامَ. فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ مَا قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ فِي الْقَوْلِ! فَقَالَ: «أَيْ عَائِشَةُ، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللَّهِ مَنْ تَرَكَهُ -أَوْ وَدَعَهُ- النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ»[٢].

## ٨٢- باسی هەڵکردن لەگەڵ خەڵکیدا (سوننەتە)

**-لە ئەبو دەرداوە ﵁ دەگێڕدرێتەوە کە وتوویەتی: ئێمە لە ڕووی کەسانێکدا زەردەخەنە و پێکەنین ئەنجام دەدەین، لە ڕاستیشدا دڵەکانمان نەفرینیان لێ دەکەن.**

---

(١) نوغەیر باڵندەیەکی بچووک بوو هی ئەبو عومەیر بوو. بڕوانە: إرشاد الساري:١٣٥/١٣.

(٢) بڕوانە: ٦٠٣٢.

**٦١٣١- ئیبنو لمونكەدیر دەڵێ: عورووەی كوڕی زوبەیر بۆی گێڕایەوە كە عائیشە ﵂ بۆی گێڕاوەتەوە كە پیاوێك مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ خواست بێتە خزمەتی، جا فەرمووی: ((مۆڵەتی بدەن ئای چەن كوڕێكی خراپی هۆزەكەیەتی، وە ئای چەن برایەكی خراپی هۆزەكەیەتی))، ئینجا كە هاتە ژوورەوە پێغەمبەر ﷺ بە نەرمی قسەی لەگەڵدا كرد، (پیاوەكە ڕۆشت عائیشە دەڵێ:) منیش عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر ئەوەت فەرموو كە فەرمووت، پاشان بە نەرمی قسەت لەگەڵدا كرد، ئەویش فەرمووی: ((ئەی عائیشە بەڕاستی خراپترین كەس لای خوا ئەو كەسەیە خەڵكی وازی لێ بێنن -یان دووركەونەوە لێی- لە بەر شەڕ و خراپەكەی)).**

٦١٣٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُهْدِيَتْ لَهُ أَقْبِيَةٌ مِنْ دِيبَاجٍ مُزَرَّرَةٌ بِالذَّهَبِ، فَقَسَمَهَا فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَعَزَلَ مِنْهَا وَاحِدًا لِمَخْرَمَةَ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: «خَبَأْتُ هَذَا لَكَ».

قَالَ أَيُّوبُ بِثَوْبِهِ أَنَّهُ يُرِيهِ إِيَّاهُ، وَكَانَ فِي خُلُقِهِ شَيْءٌ. رَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ.

وَقَالَ حَاتِمُ بْنُ وَرْدَانَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ المِسْوَرِ: قَدِمَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَقْبِيَةٌ[١].

**٦١٣٢-عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی مولەیكە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ چەند كەوایەكی دیباجی بەدیاری بۆهێنرابوو، قۆپچەكانیان ئاڵتوون بوون، پێغەمبەریش ﷺ لە نێوان كەسانێك لە هاوەڵانیدا دابەشی كرد، دانەیەكیان لا خستبوو[٢] بۆ مەخرەمە، جا كەهات فەرمووی: ((ئەم كەوایەم بۆتۆ**

(١) بڕوانە: ٢٥٩٩.

(٢) جیای كردبوویەوە و دابەشی نەكردبوو.

شاردۆتەوە))، ئەیوب ئاماژەی بە پۆشاكەكەی خۆی دەكرد (كردەوەكەی پێغەمبەری ﷺ دەگێڕایەوە)، كە چۆن كەواكەی پێشان دەدا، وە مەخرەمە لە ڕەوشتیدا زبرییەك هەبوو.

-حەممادیش ئەم فەرموودەی لە ئەیوبەوە گێڕاوەتەوە.

-وە حاتیمی كوڕی وەردان دەڵێ:ئەیوب بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو ئەبی مولەیكەوە لە میسوەرەوە دەڵێ: چەند كەوایەك هاتبوو بۆ پێغەمبەر ﷺ.

## ٨٣- بابٌ: لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ

وَقَالَ مُعَاوِيَةُ: لا حلم إلا بتجربة.

٦١٣٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ».

## ٨٣- باسێک: باوەڕدار لە كونێكەوە دوو جار ناگەزرێت

-موعاویە ﷺ دەڵێ: هیچ داناییەك نییە بە ئەزموون پەیدا نەكرێت.

-٦١٣٣ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((باوەڕدار لە یەك كونەوە دوو جار ناگەزرێت)).

## ٨٤- بابُ حَقِّ الضَّيْفِ

٦١٣٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ؟». قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: «فَلاَ تَفْعَلْ، قُمْ وَنَمْ، وَصُمْ وَأَفْطِرْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقًّا،

وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّكَ عَسَى أَنْ يَطُولَ بِكَ عُمُرٌ، وَإِنَّ مِنْ حَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا فَذَلِكَ الدَّهْرُ كُلُّهُ». قَالَ: فَشَدَّدْتُ، فَشُدِّدَ عَلَيَّ. فَقُلْتُ: فَإِنِّي أُطِيقُ غَيْرَ ذَلِكَ. قَالَ: «فَصُمْ مِنْ كُلِّ جُمُعَةٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ». قَالَ: فَشَدَّدْتُ، فَشُدِّدَ عَلَيَّ. قُلْتُ: أُطِيقُ غَيْرَ ذَلِكَ. قَالَ: «فَصُمْ صَوْمَ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ». قُلْتُ: وَمَا صَوْمُ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ؟ قَالَ: «نِصْفُ الدَّهْرِ»[١].

## ٨٤- باسی (ڕوونکردنەوەی ) مافی میوان

**٦١٣٤-عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام و فەرمووی: ((ئایا ئەو هەواڵەی دراوە ڕاستە، کە تۆ شەو هەموو شەونوێژ دەکەیت و ڕۆژ بەڕۆژوو دەبیت؟)) وتم بەڵێ، فەرمووی: ((دەی وا مەکە، شەونوێژ بکەو بشخەوە، بەڕۆژووش ببەو بەڕۆژووش مەبە، چونکە بەڕاستی لاشەت مافی هەیە لە سەرت، وە چاوت مافی هەیە لەسەرت و، میوانت مافی هەیە لەسەرت، وە خێزانت مافی هەیە لەسەرت، وە بێگومان لەوانەیە تەمەنت درێژ بێت (لاوازبیت و ئەوانەت بۆ نەکرێ)، وە بەڕاستی بەسە بۆ تۆ هەموو مانگێك سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگریت، چونکە دڵنیابە بەهەر چاکەیەکت دە ئەوەندەی خۆی پاداشت بۆ هەیە، ئەوە (دەکاتە ڕۆژووگرتنی) ساڵەکە هەمووی))، (عەبدوڵڵا دەڵێ:) من لەسەر خۆم توندم کرد، بۆیە لەسەرم توندکرا، وتم: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ((دەی لە هەموو هەفەیەکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە))، وتی: من توندم کرد (لەسەرخۆم)، بۆیە لەسەرم توند کرا، وتم: من لەو زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ((دەی ڕۆژوو بگرە بەرۆژوو گرتنی داوود ﷺ))، وتم: ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەری خوا داوود ﷺ کامەیە؟ فەرمووی: (( نیوەی ساڵەکەیە))** [٢].

---

(١) بڕوانە: ١١٣١.

(٢) واتە: ڕۆژی بەڕۆژووبە ڕۆژێک بەڕۆژوو مەبە.

## ٨٥- بابُ إِكْرَامِ الضَّيْفِ وَخِدْمَتِهِ إِيَّاهُ بِنَفْسِهِ

وَقَوْلِهِ: ﴿ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾﴾ الذاريات

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: يُقَالَ: هُوَ زَوْرٌ، وهؤلاء زَوْرٌ وَضَيْفٌ، وَمَعْنَاهُ أَضْيَافُهُ وَزُوَّارُهُ؛ لأَنَّهَا مَصْدَرٌ مِثْلُ: قَوِمٍ، رِضًا، وَعَدْلٍ. يُقَالَ: مَاءٌ غَوْرٌ، وَبِئْرٌ غَوْرٌ، وَمَاآنِ غَوْرٌ وَمِيَاهٌ غَوْرٌ. وَيُقَالُ: الغَوْرُ: الغائِرُ لَا تَنَالُهُ الدِّلَاءُ، كُلُّ شَيْءٍ غُرْتَ فِيهِ فَهُوَ مَغَارَةٌ. تَزَّاوَرُ: تَمِيلُ مِنَ الزَّوَرِ، وَالْأَزْوَرُ: الأَمْيَلُ.

٦١٣٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْكَعْبِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، جَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهْوَ صَدَقَةٌ، وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ».

حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ مِثْلَهُ، وَزَادَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»[1].

## ٨٥- باسی ڕێزگرتنی میوان (سوننەتە، وە سوننەتە) خاوەن ماڵ بۆخۆی خزمەتی بکات

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (میوانە ڕێزدارەکانی ئیبراهیم ﷺ).**

**وە ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: دەوترێت: ئەو میوانە، وە ئەوانە میوانن،** (زَوْرٌ) **و** (ضَيْفٌ) **بەمانای** (أَضْيَافُهُ) **و** (زُوَّارُهُ) **دێت چونکە هەرکام لە:** (زَوْرٌ) **و** (ضَيْفٌ) **چاوگن وەك:** (قَوِمٍ، رِضًا، وَعَدْلٍ) **واتە: کەسانێك جێی ڕەزامەندی و ڕاست و دروستن. وە دەوترێت:** (مَاءٌ غَوْرٌ) **و** (بِئْرٌ غَوْرٌ) **واتە: ئاوێکی ڕۆچوو وە بیرێکی ڕۆچوو،** (وَمَاءانِ غَوْرٌ)**: دوو ئاوی ڕۆچوو، وە** (وَمَيَاهٌ غَوْرٌ) **چەند ئاوێکی**

---

(١) بڕوانە: ٦٠١٩.

**ڕۆچوو، وه دەوترێت: (الغَوْرُ) كه چاوگه واته: (الغائِرُ لَا تَنَالُهُ الدِّلَاءُ) ئەو ئاوه ڕۆچوومیه كه دۆڵچه نایگاتێ پێی هەڵناگۆزرێ، هەرشتێك بچێته ناویەوه ئەوه (مَغَارَةٌ) یه. (تَزَّاوَرُ) لا دەدات له (الزَّوَر)ـەوه هاتووه وەرگیراوه، وه (الْأَزْوَرُ) واته زۆر لاربۆوه.**

**٦١٣٥- ئەبو شورەیحی كەعبی ﷺ له پێغەمبەری خواوه ﷺ دەگێڕێتەوه كه فەرموویەتی: ((هەر كەسێك باوەڕی هەیه به خوا و به ڕۆژی دوایی با ڕێز له میوانەكەی بگرێت، بەخشیشەكەی[1] شەو و ڕۆژێكه، میواندارێكەیشی سێ ڕۆژه، ئینجا ئەوەی دوا ئەو (سێ ڕۆژه) بێت ئەوه خێر و چاكەیه[2]، وه دروست نییه بۆ میوانەكه ئەوەنده لای[3] بمێنێتەوه و دانیشێت ناڕەحەتی بكات)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ): ئیسماعیل بۆی گێڕاینەوه و وتی: مالیك هاوشێوەی فەرموودەكەی پێشووی بۆ گێڕامەوه و ئەمەشی بۆ زیاد كرد: ((هەر كەس باوەڕی هەیه به خوا و به ڕۆژی دوایی، ئەوه با چاك بڵێ یان بێدەنگ بێت)).**

٦١٣٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ مَهْدِيٍّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»[4].

**٦١٣٦-ئەبو هورەیره ﷺ له پێغەمبەرەوه ﷺ دەگێڕێتەوه كه فەرموویەتی: ((هەر كەسێك باوەڕی هەیه به خوا و به ڕۆژی دوایی، با ئازاری دراوسێكەی**

---

(١) دیارییەكەی.

(٢) لەگەڵ میوانەكە دەكرێت.

(٣) خاوەن ماڵ و خانەخوێکە بمێنێتەوە.

(٤) بڕوانە: ٥١٨٥.

**نەدات، وە هەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی، با ڕێزی میوانەکەی بگرێت، وە هەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بە ڕۆژی دوایی، ئەوە باچاك بڵێ یان بێدەنگ بێت)).**

٦١٣٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلاَ يَقْرُونَنَا، فَمَا تَرَى؟ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ الَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ»[1].

**٦١٣٧- ئەبو لخەیر لە عوتبەی کوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕایەوە دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا جەنابت دەماننێری (بۆکارێك)، جا لای هۆزێك لادەدەین و دادەبەزین میوانداریمان ناکەن، جا ڕای جەنابت چییە؟ جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەمووی پێمان: ((ئەگەر لای هۆزێك لاتاندا و دابەزین و ئەوەی پێویستە بۆ میوان فەرمانیان کرد بۆتان بکرێت، ئەوە لێیان قبوڵ کەن، بەڵام ئەگەر وایان نەکرد ئەوە ئەوەی مافی میوانە و پێویستە بۆی بکرێت لێیان بسەنن (با بەزۆریش بێت).**

٦١٣٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»[2]

---

(١) بڕوانە: ٢٤٦١.

(٢) بڕوانە: ٥١٨٥.

**.٦١٣٨-ئەبو هوڕەیرە ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك باوەڕی هەبێ بە خوا و بە ڕۆژی دوایی، با ڕێزی میوانەکەی بگرێت، وە هەر کەسێك باوەڕی هەبێ بە خوا و بە ڕۆژی دوایی، با پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێ، وە هەر کەسێك باوەڕی هەبێ بە خوا و بەڕۆژی دوایی، با چاك بڵێ یان بێدەنگ بێت)).**

## ٨٦- بابُ صُنْعِ الطَّعَامِ وَالتَّكَلُّفِ لِلضَّيْفِ

٦١٣٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا أَبُو الْعُمَيْسِ، عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: آخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ سَلْمَانَ وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَرَأَى أُمَّ الدَّرْدَاءِ مُتَبَذِّلَةً، فَقَالَ: لَهَا مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: أَخُوكَ أَبُو الدَّرْدَاءِ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا. فَجَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ، فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا فَقَالَ: كُلْ، فَإِنِّي صَائِمٌ. قَالَ: مَا أَنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأْكُلَ. فَأَكَلَ. فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يَقُومُ، فَقَالَ: نَمْ. فَنَامَ، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ، فَقَالَ: نَمْ. فَلَمَّا كَانَ آخِرُ اللَّيْلِ قَالَ سَلْمَانُ: قُمِ الآنَ. قَالَ: فَصَلَّيَا، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ. فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَدَقَ سَلْمَانُ». أَبُو جُحَيْفَةَ وَهْبٌ السُّوَائِيُّ، يُقَالُ وَهْبُ الْخَيْرِ[1].

## ٨٦- باسی خواردن دروست کردن و زۆر لە خۆ کردن (ئەرك کێشان) بۆ میوان

**٦١٣٩- ئەبو جوحەیفە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان سەلمان و ئەبو دەرداوە، جا سەلمان سەردانی ئەبو دەردای کرد،**

(١) بڕوانە: ١٩٦٨.

**ئینجا ئوممو دەردای بینی زۆر پەڕپووت بوو، پێی وت: ئەوە چیتە ئاوات لە خۆت کردوە؟ ئەویش وتی: ئەبودەردای برات هیچ پێویستی بە دونیا نییە، ئەبو دەردا هاتەوە خواردنی بۆسەلمان دروست کرد، (بەسەلمانی) وت: نانەکەت بخۆ من بەڕۆژووم، سەلمان وتی: منیش نان ناخۆم تا تۆش نەخۆیت، ئەویش خواردی، کە شەو هات ئەبو دەردا ڕۆشت شەونوێژ بکات، سەلمان وتی: بخەوە ئەویش خەوت، پاشان ڕۆشت شەونوێژ بکات، سەلمان ووتی بخەوە، ئەنجا کاتێ کۆتایی شەو بوو سەلمان وتی: ئێستا هەستە (بۆ شەونوێژ)، دەڵێ: ئیتر پێکەوە شەونوێژیان کرد، ئینجا سەلمان پێی وت: بێگومان پەروەردگارت مافی هەیە لەسەرت، نەفست مافی هەیە لەسەرت، وە هاوسەرت مافی هەیە لەسەرت، جا هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی پێ بدە، ئەنجا ئەبو دەردا ڕۆشت بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەو باسەی بۆگێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووی: ((سەلمان ڕاست دەکات)).**
**ئەبو جوحەیفە: وەهبی سوائیییە، پێی دەوترێت: وەهبی خەیر.**

## ٨٧- بَابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الْغَضَبِ وَالْجَزَعِ عِنْدَ الضَّيْفِ

٦١٤٠- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الجُرَيْرِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ تَضَيَّفَ رَهْطًا فَقَالَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ: دُونَكَ أَضْيَافَكَ، فَإِنِّي مُنْطَلِقٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَافْرُغْ مِنْ قِرَاهُمْ قَبْلَ أَنْ أَجِيءَ. فَانْطَلَقَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَأَتَاهُمْ بِمَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: اطْعَمُوا. فَقَالُوا: أَيْنَ رَبُّ مَنْزِلِنَا؟ قَالَ: اطْعَمُوا. قَالُوا: مَا نَحْنُ بِآكِلِينَ حَتَّى يَجِيءَ رَبُّ مَنْزِلِنَا. قَالَ: اقْبَلُوا عَنَّا قِرَاكُمْ، فَإِنَّهُ إِنْ جَاءَ وَلَمْ تَطْعَمُوا لَنَلْقَيَنَّ مِنْهُ. فَأَبَوْا، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ يَجِدُ عَلَيَّ، فَلَمَّا جَاءَ تَنَحَّيْتُ عَنْهُ، فَقَالَ: مَا صَنَعْتُمْ؟ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ. فَسَكَتُّ، ثُمَّ قَالَ: يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ. فَسَكَتُّ، فَقَالَ: يَا غُنْثَرُ، أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ إِنْ كُنْتَ تَسْمَعُ صَوْتِي لَمَّا جِئْتَ. فَخَرَجْتُ فَقُلْتُ: سَلْ أَضْيَافَكَ. فَقَالُوا:

صَدَقَ، أَتَانَا بِهِ. قَالَ: فَإِنَّمَا انْتَظَرْتُمُونِي، وَاللهِ لاَ أَطْعَمُهُ اللَّيْلَةَ. فَقَالَ الآخَرُونَ: وَاللهِ لاَ نَطْعَمُهُ حَتَّى تَطْعَمَهُ. قَالَ: لَمْ أَرَ فِي الشَّرِّ كَاللَّيْلَةِ، وَيْلَكُمْ، مَا أَنْتُمْ؟ لِمَ لاَ تَقْبَلُونَ عَنَّا قِرَاكُمْ؟ هَاتِ طَعَامَكَ. فَجَاءَهُ فَوَضَعَ يَدَهُ فَقَالَ: بِاسْمِ اللهِ، الأُولَى لِلشَّيْطَانِ. فَأَكَلَ وَأَكَلُوا[1].

## ٨٧- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە لە تووڕە بوون و بێ ئارامی و شپرزەیی لای میواندا

**٦١٤٠-ئەبو عوسمان دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو بەکر میوانداری چەند کەسێکی کرد، بە عەبدوڕەحمانی وت: لەگەڵ میوانەکانت بەو (ئاگات لێیان بێت)، چونکە من دەڕۆم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، جا پێش ئەوەی من بێمەوە نان و خواردنیان پێ بدە، عەبدوڕەحمانیش چوو ئەو (خواردنەی) هەیبوو بۆی هێنان وتی: فەرموو بخۆن، میوانەکانیش وتیان: خاوەن ماڵەکەمان لە کوێیە؟ عەبدوڕەحمان وتی: خواردنەکەتان بخۆن، وتیان: ئێمە نان ناخۆین هەتا خاوەن ماڵەکەمان نەیەتەوە، وتی: میوانداریەکەمان قەبوڵ بکەن (و نانەکەتان بخۆن)، چونکە بەڕاستی ئەگەر (باوکم) بێتەوە و ئێوە نانتان نەخواردبێ سزامان دەدات، بەڵام ئەوان ملیان نەدا (نان بخۆن)، جا زانیم کە باوکم نیگەران دەبێ لێم، بۆیە کە هاتەوە دوور کەوتمەوە لێی، ئەویش وتی: چیتان کرد؟ ئەوانیش پێیان وت، ئەبو بەکریش وتی: ئەی عەبدوڕەحمان، منیش بێدەنگ بووم، جارێکی تر وتی: عەبدوڕەحمان، هەر بێدەنگ بووم، ئینجا وتی: ئەی نەفامی نالەبار، سوێندت دەدەم بەخوا ئەگەر گوێت لە دەنگمە دەبێ بێیت، منیش هاتمە دەرەوە و**

(١) بڕوانە: ٦٠٢.

وتم: پرسيار له ميوانەكانت بكە، ميوانەكانيش وتيان: ڕاست دەكات، خواردنى بۆ هێناين، وتى: كەواتە چاوەڕوانى منتان كردوە، سوێند بەخوا ئەم شەو نان ناخۆم، ميوانەكانيش وتيان: سوێند بەخوا ئێمەش نان ناخۆين تا تۆ نەيخۆيت، وتى: لە خراپەدا وێنەى ئەم شەوم نەديوە هاوار بۆ ئێوە ئێوە كێن؟ بۆچى ميوانى ئێمە قەبوڵ ناكەن؟ خواردنەكەت بێنە، عەبدوڕەحمانيش خواردنەكەى هێنا، ئينجا ئەبو بەكر دەستى برد بۆ خواردنەكە و وتى: بەناوى خواوە حاڵەتەكەى يەكەم بۆ شەيتان بوو[1]، ئيتر دەستى بە خواردن كرد و ئەوانيش (ميوانەكان) خوارديان.

## ٨٨- بابُ قَوْلِ الضَّيْفِ لِصَاحِبِهِ لاَ آكُلُ حَتَّى تَأْكُلَ

فِيهِ حَدِيثُ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٦١٤١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ ﷺ جَاءَ أَبُو بَكْرٍ بِضَيْفٍ لَهُ أَوْ بِأَضْيَافٍ لَهُ، فَأَمْسَى عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَتْ أُمِّي: احْتَبَسْتَ عَنْ ضَيْفِكَ -أَوْ أَضْيَافِكَ- اللَّيْلَةَ. قَالَ: مَا عَشَّيْتِهِمْ؟ فَقَالَتْ عَرَضْنَا عَلَيْهِ -أَوْ عَلَيْهِمْ فَأَبَوْا أَوْ- فَأَبَى، فَغَضِبَ أَبُو بَكْرٍ فَسَبَّ وَجَدَّعَ وَحَلَفَ لاَ يَطْعَمُهُ، فَاخْتَبَأْتُ أَنَا، فَقَالَ يَا غُنْثَرُ. فَحَلَفَتِ الْمَرْأَةُ لاَ تَطْعَمُهُ حَتَّى يَطْعَمَهُ، فَحَلَفَ الضَّيْفُ -أَوِ الأَضْيَافُ- أَنْ لاَ يَطْعَمَهُ أَوْ -يَطْعَمُوهُ- حَتَّى يَطْعَمَهُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: كَأَنَّ هَذِهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَدَعَا بِالطَّعَامِ فَأَكَلَ وَأَكَلُوا، فَجَعَلُوا لاَ يَرْفَعُونَ لُقْمَةً إِلاَّ رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرُ مِنْهَا، فَقَالَ: يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ، مَا هَذَا؟ فَقَالَتْ: وَقُرَّةِ عَيْنِي إِنَّهَا الآنَ لأَكْثَرُ قَبْلَ أَنْ نَأْكُلَ. فَأَكَلُوا، وَبَعَثَ بِهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَذَكَرَ أَنَّهُ أَكَلَ مِنْهَا[2].

---

(١) يان پارووى يەكەم كە سوێندى خوارد نايخوات بۆ شەيتان بوو يا حاڵەتى يەكەم كە تووڕە بوونەكە بوو.
(٢) بڕوانە: ٦٠٢.

## ٨٨- باسی میوان بەهاوڕێکەی[١] بڵێ: (خواردن) ناخۆم هەتا تۆ نەخۆیت

-لەم باسەدا فەرموودەکەی تیایە کە ئەبی جوحەیفە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[٢].

٦١٤١-ئەبو عوسمان دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ میوانێکی خۆی- یان چەند میوانێکی خۆی- هێنایەوە، جا ئەبو بەکر خۆی ئێوارە لای پێغەمبەر ﷺ مایەوە، ئینجا کاتێ هاتەوە دایکم وتی: ئەم شەو دواکەوتی لە میوانەکەت -یان لە میوانەکانت - ئەبو بەکر وتی: خواردنی ئێوارەت پێ نەداون؟ دایکیشم وتی: خستمانە بەردەمی - یان خستمانە بەردەمیان نەیان خوارد یا- نەیخوارد، بۆیە ئەبو بەکر تووڕە بوو جنێوی دا و دوعای لووت و گوێی بڕینی لێ کردن، سوێندی خوارد کە لەو خواردنە نەخوات، (عەبدوڕەحمان دەڵێ): من خۆم شاردبوویەوە ئینجا وتی: ئەی نەزانی نالەبار، ژنەکەش (دایکی عەبدوڕەحمان) سوێندی خوارد لەو خواردنە نەخوات هەتا ئەبو بەکر لێی نەخوات، میوانەکەش - یان میوانەکان- سوێندیان خوارد کە لێی نەخوات - یان لێی نەخۆن- هەتا ئەبو بەکر لێی نەخوات، ئەبو بەکریش وتی: ئەو حاڵەتە (یائەو سوێند خواردنە)[٣] دەڵێی لە شەیتانەوە بوو، بۆیە داوای خواردنەکەی کرد و خواردی و ئەوانی کەش خواردیان، جا پارووبەکیان بەرز نەدەکردەوە (بۆ دەمیان) ئیللا لە ژێریەوە زیاتر لە پاروەکە دەهاتەوە شوێنی، ئەبو بەکر ﷺ وتی: ئەمە چییە ئەی خوشکی بەنی فیراس؟ ئەویش وتی: سوێند بەچاو و دڵ ڕۆشنی (موحەممەد ﷺ)، بێگومان ئیستا زۆرترە لە کاتی

(١) واتە: خاوەن ماڵەکە، یان خانە خوێکە.
(٢) بەژمارە: ١٩٦٨ لە صحیحی بوخاریدا.
(٣) ئەبو بەکر خواردی.

پێش خواردنی، جا خواردیان خواردنەکەشیان نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ[1]، وە (عەبدڕەحمان) وتی: پێغەمبەریش ﷺ لێی خوارد.

## ٨٩- بَابُ إِكْرَامِ الْكَبِيرِ، وَيَبْدَأُ الأَكْبَرُ بِالْكَلَامِ وَالسُّؤَالِ

٦١٤٢- ٦١٤٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ -هُوَ ابْنُ زَيْدٍ- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ -مَوْلَى الأَنْصَارِ- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، وَسَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ أَتَيَا خَيْبَرَ فَتَفَرَّقَا فِي النَّخْلِ، فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ، فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَحُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ ابْنَا مَسْعُودٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَتَكَلَّمُوا فِي أَمْرِ صَاحِبِهِمْ فَبَدَأَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَكَانَ أَصْغَرَ الْقَوْمِ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كَبِّرِ الْكُبْرَ». -قَالَ يَحْيَى: لِيَلِيَ الكَلَامَ الأَكْبَرُ. فَتَكَلَّمُوا فِي أَمْرِ صَاحِبِهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَسْتَحِقُّونَ قَتِيلَكُمْ -أَوْ قَالَ: صَاحِبَكُمْ- بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْكُمْ؟». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمْرٌ لَمْ نَرَهُ. قَالَ: «فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ فِي أَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَوْمٌ كُفَّارٌ. فَوَدَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ قِبَلِهِ. قَالَ سَهْلٌ: فَأَدْرَكْتُ نَاقَةً مِنْ تِلْكَ الإِبِلِ، فَدَخَلَتْ مِرْبَدًا لَهُمْ فَرَكَضَتْنِي بِرِجْلِهَا.

قَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ بُشَيْرٍ عَنْ سَهْلٍ، قَالَ يَحْيَى: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ مَعَ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، وَقَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ بُشَيْرٍ، عَنْ سَهْلٍ وَحْدَهُ[2].

## ٨٩- باسی ڕێزگرتنی کەسی بەتەمەن، وە لە سەرەتادا کەسی بەتەمەن قسە بکات و پرسیار بکات

٦١٤٢- ٦١٤٣- سولەیمانی کوڕی حەرب بۆی گێڕاینەوە وتی: حەمماد -کە کوڕی زەیدە - بۆی گێڕاینەوە، لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە بوشەیری کوڕی

(١) یان ئەو قەصعەی خواردنەکەی تێدا بوو ناردیان بۆ پێغەمبەر، وەک لە شەرحی قەستەلانیدا هاتووە (إرشاد الساري:١٣ /١٥١).
(٢) بڕوانە: ٢٧٠٢.

یەساری ئازاد کراوی ئەنصارەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصەی کوڕی مەسعوود چوون بۆخەیبەر، لە ناو دار خورماکاندا لە یەکتری جیابوونەوە، ئینجا عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژرا، عەبدوڕەحمانی کوڕی سەهل و حوییصە و موحەییصەی کوڕانی مەسعوود هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا دەربارەی بەسەرهاتی هاوڕێکەیان قسەیان کرد، عەبدوڕەحمان دەستی بە قسە کرد- کە لە هەموویان تەمەنی کەمتر بوو- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((گەورەکە پێشخە)) [1] - یەحیا دەڵێ: با گەورەکە قسە بکات- ئیتر قسەیان کرد دەربارەی بابەتی هاورێکەیان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوێنی کوژراوەکەتان دەکەوێت -یان فەرمووی: ((هاوڕێکەتان- بەسوێند خواردنی پەنجا کەستان؟)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا شتێك کە نەمان دیووە، (چۆن سوێندی لەسەر بخۆین؟) فەرمووی: ((جوولەکەکان ئێوە ئازاد دەکەن (لە سوێند خواردن) بە سوێند خواردنی پەنجا کەس))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، جوولەکە گەلێکی بێ باوەڕن[2]، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێنەکەی پێدان، سەهل دەڵێ: بە مێ حوشترێك لەو وشترانە (ی لەخوێنەکەدا درابوون) گەشتم، چوویە شوێنی موڵی وشترەکانیان بە قاچی لەقەیەکی لێ دام.

-لەیس دەڵێ: یەحیا بۆی گێڕامەوە لە بوشەیرەوە ئەویش لە سەهلەوە، یەحیا وتی: وابزانم وتی: لەگەڵ ڕافیعی کوڕی خەدیجدا[3].

-ئیبنو عویەینە دەڵێ: یەحیا بۆی گێڕاینەوە لە بوشەیرەوە لە سەهلەوە بەتەنها.

---

(١) با ئەو قسە بکات لە پێشەوە.

(٢) چۆن باوەڕ بە سوێند خواردنیان بکەین.

(٣) واتە لەگەڵ سەهلدا خەدیجیش گێراویەتیەوە.

٦١٤٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَخْبِرُونِي بِشَجَرَةٍ مَثَلُهَا مَثَلُ الْمُسْلِمِ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا، وَلاَ تَحُتُّ وَرَقَهَا». فَوَقَعَ فِي نَفْسِي [أَنَّهَا] النَّخْلَةُ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ وَثَمَّ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَلَمَّا لَمْ يَتَكَلَّمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هِيَ النَّخْلَةُ». فَلَمَّا خَرَجْتُ مَعَ أَبِي قُلْتُ يَا أَبَتَاهْ وَقَعَ فِي نَفْسِي [أَنَّهَا] النَّخْلَةُ. قَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَقُولَهَا؟ لَوْ كُنْتَ قُلْتَهَا كَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: مَا مَنَعَنِي إِلاَّ أَنِّي لَمْ أَرَكَ وَلاَ أَبَا بَكْرٍ تَكَلَّمْتُمَا، فَكَرِهْتُ[1].

**٦١٤٤-نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ناوی درەختێکم پێ بڵێن وەکو مسوڵمان وایە، هەموو کاتێ[2] بەفەرمانی پەروەردگاری بەردەگرێت، گەڵاکانی بەریەکتری ناکەون و بومرن))، (ئبنوعومەر دەڵێ): هات بەدڵمدا کە دار خورمایە، بەڵام حەزم نەکرد قسە بکەم کە ئەبو بەکر و عومەر لەوێدا بوون، ئینجا کە هەردووکیان قسەیان نەکرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دار خورمایە))، جا کە لەگەڵ باوکمدا هاتینە دەرەوە وتم: باوکە هات بەدڵمدا دار خورمایە، عومەر وتی چی وای لێکردی نەیڵێیت؟ ئەگەر بتوتایە لەوە و لەوە خۆشتر بوو لام، (عەبدوڵڵا) وتی: هیچ شتێك ڕێگرم نەبوو (لە وتنی) جگە لەوەی کە من تۆ و ئەبو بەکرم نەدی قەسە بکەن، بۆیە منیش حەزم نەکرد قسە بکەم.**

## ٩٠- بابُ مَا يَجُوزُ مِنَ الشِّعْرِ وَالرَّجَزِ وَالْحُدَاءِ وَمَا يُكْرَهُ مِنْهُ

وَقَوْلِهِ: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟

(١) بڕوانە: ٦١.
(٢) کە دیاری کراوە بۆ بەرگرتن.

مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُواْ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾ ﴾ الشعراء. قَالَ ابن عَبَّاسٍ فِي كُلِّ لَغْوٍ يَخُوضُونَ.

٦١٤٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الأَسْوَدِ بْنِ عَبْدِ يَغُوثَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً».

## ٩٠- باسی ئەوەی کە دروستە لە (خوێندنەوەی) هۆنراوە ڕەجەز و گۆرانی وشتر لێخوڕین، وە باسی ئەوەی کە ناپەسەندە لە هۆنراوە

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (شاعیرەکان تەنها گومڕایان شوێنیان دەکەون، ئایا نابینی ئەوانە بە هەموو دۆڵ و شیوێکدا بەسەر لێشێواوی دەڕۆن (شیعر دەڵێن)، وە بەڕاستی ئەوانە شتێك دەڵێن کە خۆیان نایکەن، جگە لەوانەیان بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردوە، وە یاد و زیکری خوایان زۆر کردوە، وە تۆڵەیان سەندووە لە پاش ئەوەی ستەمیان لێ کراوە، وە ئەوانەی ستەمیان کردوە لەمەودوا دەزانن کە چۆن گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە (بۆ لای خوا دوای مردن) ).**

**-ئیبنو عەبباس ﵁ دەڵێ: ﴿ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ ﴾ دەربارەی هەموو قسەیەکی پڕ و پوچ قسە دەکەن و ڕۆدەچن تێیدا.**

**٦١٤٥-مەروانی کوڕی حەکەم گێڕایەوە کە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبد یەغوس بۆی گێڕایەوە، کە ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ بۆی گێڕایەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی لە بەشێکی هۆنراوەدا دانایی هەیە))**

٦١٤٦. - حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ سَمِعْتُ جُنْدَبًا يَقُولُ بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ يَمْشِي إِذْ أَصَابَهُ حَجَرٌ فَعَثَرَ فَدَمِيَتْ إِصْبَعُهُ فَقَالَ:
«هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ... وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ».

**٦١٤٦-ئەسوەدی كوڕی قەیس دەڵێ: لە جوندەبم ﷺ بیست دەیوت: لە كاتێكدا پێغەمبەر ﷺ (لە غەزایەكدا) بەرێگادا دەڕۆشت بەردێك بەر قاچی كەوت و هەڵكەوت، بەهۆیەوە پەنجەیەكی خوێنی لێ هات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((تۆ تەنها پەنجەیەك نیت خوێنت لێ هات؟ لە پێناوی خودا ئەومت بەسەر هات)).**

٦١٤٧- حَدَّثَنَا ابْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ مَهْدِيٍّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ : قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ: كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللَّهَ بَاطِلُ. وَكَادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ"[1].

**٦١٤٧-ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕاسترینی ئەو وشانەی كە شاعیر وتوویەتی وتەی لەبیدە كە دەڵێ: ئاگاداربن درۆیە هەموو شت جگەلە خوا، نزیك بوو ئومەییەی كوڕی ئەبی صەلت مسوڵمان ببێ)).**

٦١٤٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، فَسِرْنَا لَيْلاً، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ لِعَامِرِ بْنِ الأَكْوَعِ: أَلاَ تُسْمِعُنَا مِنْ هُنَيْهَاتِكَ؟ قَالَ: وَكَانَ عَامِرٌ رَجُلاً شَاعِرًا، فَنَزَلَ يَحْدُو بِالْقَوْمِ يَقُولُ:
يَقُولُ:
اللَّهُمَّ لَوْلاَ أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا ....... وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا

(١) بڕوانە: ٣٨٤١.

فَاغْفِرْ فِدَاءٌ لَكَ مَا اقْتَفَيْنَا ... فَاغْفِرْ فِدَاءٌ لَكَ مَا اقْتَفَيْنَا

إِنَّا إِذَا صِيحَ بِنَا أَتَيْنَا ... وَأَلْقِيَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا

وَبِالصِّيَاحِ عَوَّلُوا عَلَيْنَا.

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ هَذَا السَّائِقُ؟». قَالُوا: عَامِرُ بْنُ الأَكْوَعِ. فَقَالَ: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: وَجَبَتْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ، لَوْ أَمْتَعْتَنَا بِهِ. قَالَ: فَأَتَيْنَا خَيْبَرَ فَحَاصَرْنَاهُمْ حَتَّى أَصَابَتْنَا مَخْمَصَةٌ شَدِيدَةٌ، ثُمَّ إِنَّ اللَّهَ فَتَحَهَا عَلَيْهِمْ، فَلَمَّا أَمْسَى النَّاسُ الْيَوْمَ الَّذِي فُتِحَتْ عَلَيْهِمْ أَوْقَدُوا نِيرَانًا كَثِيرَةً. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا هَذِهِ النِّيرَانُ؟ على أَيِّ شَيْءٍ تُوقِدُونَ؟». قَالُوا: عَلَى لَحْمٍ. قَالَ: «على أَيِّ لَحْمٍ؟». قَالُوا: عَلَى لَحْمِ حُمُرٍ إِنْسِيَّةٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَهْرِقُوهَا وَاكْسِرُوهَا». فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْ نُهَرِيقُهَا وَنَغْسِلُهَا؟ قَالَ: «أَوْ ذَاكَ». فَلَمَّا تَصَافَّ الْقَوْمُ كَانَ سَيْفُ عَامِرٍ فِيهِ قِصَرٌ، فَتَنَاوَلَ بِهِ يَهُودِيًّا لِيَضْرِبَهُ، وَيَرْجِعُ ذُبَابُ سَيْفِهِ، فَأَصَابَ رُكْبَةَ عَامِرٍ، فَمَاتَ مِنْهُ، فَلَمَّا قَفَلُوا قَالَ سَلَمَةُ: رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَاحِبًا. فَقَالَ لِي «مَا لَكَ؟». فَقُلْتُ: فِدًى لَكَ أَبِي وَأُمِّي، زَعَمُوا أَنَّ عَامِرًا حَبِطَ عَمَلُهُ. قَالَ: «مَنْ قَالَهُ؟». قُلْتُ: قَالَهُ فُلَانٌ وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ، وَأُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ الأَنْصَارِيُّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَذَبَ مَنْ قَالَهُ، إِنَّ لَهُ لأَجْرَيْنِ -وَجَمَعَ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ- إِنَّهُ لَجَاهِدٌ مُجَاهِدٌ، قَلَّ عَرَبِيٌّ نَشَأَ بِهَا مِثْلَهُ»[1].

**٦١٤٨- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتین بۆ خەیبەر، بەشەو ڕۆشتین، پیاوێك لە ناو خەڵکەکە بە عامیری کوڕی ئەکوەعی وت: ئەی عامیر بۆ شتێك لە هۆنراوەکانت نادمیت بە گوێماندا؟ دەڵێ: عامیریش پیاوێکی شاعیر بوو، جا دابەزی دەستی کرد بە شیعر ووتن بە دەنگەوە بۆ خەڵکەکەی دەوت:**

**خودایە ئەگەر تۆ نەبویتایە ڕێنمون نەدەبووین**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٧٧.

زەکاتیشمان نەدەدا و نوێژمان نەدەکرد

(ئەی خوایە) دەی لێمان خۆشبە بەلێبوردنێك لە لایەن خۆتەوە لەو فەرمانانەی نەمان کردوە

وە پێمان دامەزراو بکە ئەگەر ڕوو بەڕووی دوژمن بووینەوە

وە ئارامییەك بڕژێنە بەسەرماندا

تا ئەگەر دوژمن بەسەرماندا بنەڕێنێ مل نەدەین

کە بە نیازن بە نەڕە و هاوارەوە بێنە سەرمان

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئاواز بێژە کێیە؟)) وتیان: عامیری کوڕی ئەکوەعە، فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوای لێ بێ))، پیاوێ لە ناوخەڵکەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزای بۆگیرا بوو[1]، بۆچی نەتهێشت دڵخۆش بین بەئاوازەکەی[2]؟ دەڵێ: ئەنجا هاتینە خەیبەر و گەمارۆماندان تا تووشی برسێتیەکی سەخت بووین[3]، لە پاشان خوای گەورە بۆی فەتح کردن (و سەری خستن)، جا کە ئێوارەی ئەو ڕۆژەی کە بۆیان فەتح کرا بەسەردا هات خەڵك ئاگرێکی زۆریان کردەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئاگرانەی کردویانەتەوە چییان بەسەرەوەمیە؟)) وتیان: گۆشتیان بەسەرەوەمیە، فەرمووی: ((چ گۆشتیکیان بەسەرەوەمیە؟)) وتیان: گۆشتی کەریماڵی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بیانڕێژن و مەنجەڵەکان بشکێنن))، جا پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆ گۆشتەکە نەڕژێن و مەنجەڵەکان بشۆین؟ فەرمووی: ((یا وا بکەن))، جا کاتێ خەڵکەکە (هەردوو بەرەی جەنگ) ڕیز بوون و بەرانبەر یەکتری وەستان، شمشێرەکەی عامیر کورت بوو، دای هێنابویەوە بیدات لە جولەکەیەك[4]، نووکی

(١) کە شەهید ببێت.

(٢) بۆچی ئەو دوعایەت بۆ کرد ئیتر شەهید دەبێ نامێنێ بۆمان.

(٣) بەهۆی درێژە کێشانی گەمارۆکەوە.

(٤) کە ناوی مەرحەب بوو.

**شمشێرەكەی گەڕابوویەوە دابووی لە كڵاوەی ئەژنۆی عامیر و بەوە مرد، سەلەمە دەڵێ: كاتێ گەڕاینەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بینیمی ڕەنگم تێكچوو بوو فەرمووی: ((چیتە؟)) منیش عەرزم كرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوك و دایكم بە قوربانت بێ ! ئەڵێن: بێگومان عامیر هەموو كردەوەكانی پوچەڵ بۆتەوە، فەرمووی: ((كێ ئەو قسەی كردوە؟)) وتم: فلان و فلان و فلان و ئوسەیدی كوڕی حوزەیری ئەنصاری وتوویانە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوەی وای ووتوە درۆی كردوە بێگومان ئەو دوو پاداشتی بۆ هەیە)) - دوو پەنجەی كۆ كردەوە - وە فەرمووی: ((ئەو زۆر هەوڵدەر بو (لە چاكە و عیبادەتدا)، وە خەباتگێڕ بوو كەم عەرب (كەس) هەیە وەك عامیر لە مەدینەدا پەیدا بوبێت و گەورە بووبێت)).**

٦١٤٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ على بَعْضِ نِسَائِهِ وَمَعَهُنَّ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَقَالَ: «وَيْحَكَ يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدَكَ سَوْقًا بِالْقَوَارِيرِ». قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: فَتَكَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ بِكَلِمَةٍ لَوْ تَكَلَّمَ بَعْضُكُمْ لَعِبْتُمُوهَا عَلَيْهِ: قَوْلُهُ: «سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ»[١].

**٦١٤٩-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای هەندێك لە خێزانەكانی ئوممو سولەیمیشیان لەگەڵدا بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ ئەی ئەنجەشە بەهێواشی وشترەكان لێخوڕە (لەبەر) شوشەكان))، [٢] ئەبو قیلابە وتی: پێغەمبەر ﷺ وتەیەكی فەرمووە ئەگەر كەسێكتان ئەو وتەی بكردایە گاڵتەتان پێ دەكرد لەسەری كە ئەم فەرمایشتەیەتی: ((لێخوڕینت (هێواش بێت لەبەر) شوشەكان)).**

(١) بڕوانە: ٦١٦١، ٦٢٠٢، ٦٢٠٩، ٦٢١٠، ٦٢١١.

(٢) مەبەستی ئافرەتەكانە كە بە سواری وشترەكانەوەن كە وەک شوشەوان.

## ٩١- باب هِجَاءِ الْمُشْرِكِينَ

٦١٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂قَالَتِ اسْتَأْذَنَ حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي هِجَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَكَيْفَ بِنَسَبِي؟». فَقَالَ حَسَّانُ: لأَسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعَرَةُ مِنَ الْعَجِينِ.

وَعَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ذَهَبْتُ أَسُبُّ حَسَّانَ عِنْدَ عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: لاَ تَسُبُّهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[١].

## ٩١- باسی داشۆرینی هاوبەش دانەران (سوننەتە)

**٦١٥٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: حەسسان دەربارەی داشۆرینی بتپەرستان داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ((چۆن (دایان دەشۆری) لە کاتێکدا ڕەچەڵەکی من (لەگەڵیان تێکەڵە)؟)) حەسسان وتی: سوێند بەخوا ڕەچەڵکی تۆ لەناویاندا دەردێنم[٢]، وەك چۆن تاڵە موو لە هەویر دەردەهێنرێ.**

**وە هیشام لە عوروەی باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆشتم بۆ لای عائیشە تا جنێو بدەم بە حەسسان، عائیشەش ﵂ وتی: جنێوی پێ مەدە بەڕاستی ئەو بەرگری دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ (لە دژی بتپەرستان)**

٦١٥١- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ الْهَيْثَمَ بْنَ أَبِي سِنَانٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ فِي قَصَصِهِ يَذْكُرُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَخًا لَكُمْ لاَ يَقُولُ الرَّفَثَ». يَعْنِي بِذَاكَ: ابْنَ رَوَاحَةَ. قَالَ:

فِينَا رَسُولُ اللَّهِ يَتْلُو كِتَابَهُ... إِذَا انْشَقَّ مَعْرُوفٌ مِنَ الْفَجْرِ سَاطِعُ
أَرَانَا الْهُدَى بَعْدَ الْعَمَى فَقُلُوبُنَا... بِهِ مُوقِنَاتٌ أَنَّ مَا قَالَ وَاقِعُ

---

(١) بڕوانە: ٣٥٣١.

(٢) جیایی دەكەمەوە لە ڕەچەڵەكی ئەوان.

يَبِيتُ يُجَافِي جَنْبَهُ عَنْ فِرَاشِهِ... إِذَا اسْتَثْقَلَتْ بِالْكَافِرِينَ الْمَضَاجِعُ[1]

تَابَعَهُ عُقَيْلٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ الزُّبَيْدِيُّ: عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ وَالأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ

**٦١٥٠- ئیبنو شیهاب دەڵێ: هەیسەمی کوڕی ئەبو سینان بۆی گێڕایەوە کە لە ئەبو هورەیرەی ﷺ بیست لە چیرۆکەکانیدا باسی پێغەمبەری ﷺ دەکرد کە دەیفەرموو: ((بێگومان برایەکتان (مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەیە) کە قسەی هیچ و پووچ ناکات و ووتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناومان دایە (پێشنوێژیمان بۆ دەکات و) قورئانەکەی خوا دەخوێنێ**

**کە زانراوە لە کاتێ سپێدەی بەیان دەردەکەوێ و ڕوون دەبێتەوە**

**لە پاش کوێری ڕاستی نیشاندایین و دڵەکانمان باوەڕی پتەوی پێهێنا ئەوەی فەرموویەتی دێتەدی**

**شەو بە شەونوێژ بەسەر دەبات و توخنی ناو جێگای و نوێنەکەی ناکەوێ**

**کاتێ بت پەرستان لە ناو نوێنەکانیاندا بە تەمەڵی خەوتوون**

**عوقەیل لە زوهریەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی فەرموودەکەی یونس دەکات.**

**زوبەیدی لە زوهریەوە لە سەعید و ئەعرەجەوە هەردووکیان لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە، ئەویش هەمان فەرموودەی پێشووی گێڕاوەتەوە.**

٦١٥٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّهُ سَمِعَ حَسَّانَ بْنَ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيَّ يَسْتَشْهِدُ أَبَا هُرَيْرَةَ فَيَقُولُ: يَا أَبَا

---

(١) بڕوانە: ١١٥٥.

هُرَيْرَةَ، نَشَدْتُكَ بِاللَّهِ هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَا حَسَّانُ، أَجِبْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ؟». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ نَعَمْ[1].

**٦١٥٢- ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف دەگێڕێتەوە كە لە حەسسانی كوڕی سابیتی ئەنصاری بیست داوای شایەتی لە ئەبو هوڕەیرە كرد ﷺ و دەیوت: ئەی ئەبو هوڕەیرە ﷺ سوێنت دەدەم بەخوا ئایا گوێت لە پێغەمبەر ﷺ بوو كە دەیفەرموو: ((ئەی حەسسان لە بری پێغەمبەری خوا وەڵام بدەرەوە، خوایە بە جیبریل پشتیوانی بكە؟)) ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: بەڵێ**

٦١٥٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيٍّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِحَسَّانَ: «اهْجُهُمْ -أَوْ قَالَ: هَاجِهِمْ - وَجِبْرِيلُ مَعَكَ»[2].

**٦١٥٣-عەدیی كوڕی سابیت دەگێڕێتەوە لە بەرائەوە ﷺ كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەحەسسان: (( (بەشیعرەكانت) هێرش بكەرە سەریان (بتپەرستان) یان فەرموی: دایانشۆرە، جیبریلت لەگەڵ دایە)).**

## ٩٢- بابُ مَا يُكْرَهُ أَنْ يَكُونَ الْغَالِبُ عَلَى الإِنْسَانِ الشِّعْرُ حَتَّى يَصُدَّهُ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَالْعِلْمِ وَالْقُرْآنِ

٦١٥٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا حَنْظَلَةُ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا».

---

(١) بڕوانە: ٣٨٤١.

(٢) بڕوانە: ٣٢١٣.

## ٩٢- باسی ئەوەی ناپەسەندە کە هۆنراوە وتن زاڵبێ بەسەر مرۆڤدا، هەتا ڕێگری لێ بکات لە یادی خوا و زانست و قورئان [١]

٦١٥٤-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان ئەگەر هەناوی کەسێکیان پڕ ببێ لە کێم و زوخاو چاکترە لەوەی پڕ ببێ لە شیعر و هۆنراوە)).

٦١٥٥- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ رَجُلٍ قَيْحًا يَرِيهِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا»

٦١٥٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەگەر هەناوی کەسێکیان پڕ ببێ لە کێم و زوخ هەناوی بخوات و دایرزێنێت، چاکتر لەوەی پڕ ببێ لە شیعر و هۆنراوە)).

## ٩٣- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «تَرِبَتْ يَمِينُكَ»، وَ «عَقْرَى حَلْقَى»

٦١٥٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنَّ أَفْلَحَ أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ بَعْدَ مَا نَزَلَ الْحِجَابُ، فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لاَ آذَنُ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ رَسُولَ اللَّهِ ، فَإِنَّ أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلَكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ. فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلَكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَتُهُ. قَالَ: «ائْذَنِي لَهُ، فَإِنَّهُ عَمُّكِ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ». قَالَ عُرْوَةُ: فَبِذَلِكَ كَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: حَرِّمُوا مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ[٢].

---

(١) ڕێگری بکات لە یادی خوا کردن و زانست فێربوون و فێرکردن خەڵک و قورئان خوێندن.

(٢) بڕوانە: ٢٦٤٤.

## ٩٣- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((دەستت خۆش بێت[١]))، وە ئەم فەرموودەیەش ((خوا لە ناوی ببات و گەروو بینی بێتەیەک))[٢]

**٦١٥٦-عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ڕاستیدا ئەفلەحی برای ئەبی قوعەیس داوای مۆڵەتی کرد بێتە ژوورەوە پاش دابەزینی حیجاب، منیش وتم: سوێند بەخوا مۆڵەتی نادەم هەتا مۆڵەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرنەگرم، چونکە برای ئەبی قوعەیس ئەو کەسە نییە شیری داوە بە من، بەڵکو ژنی ئەبی قوعەیش شیری داوە بە من، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای من منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیاوە شیری نەداوە بە من، بەڵکو ژنەکەی شیری پێ داوم؟ فەرمووی: ((مۆڵەتی بدە، چونکە بێگومان ئەو پیاوە مامی تۆیە دەستت بچێت بە گڵدا))، عورەوە دەڵێ: جا لەبەر ئەوەیە عائیشە ﵂ هەمیشە دەڵێ: ئەوەی بەرەچەڵەك (مارەکردنی) حەرام دەبێت، ئێوە بەشیر خواردنیش حەرامی بکەن[٣].**

٦١٥٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الْحَكَمُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَنْفِرَ، فَرَأَى صَفِيَّةَ عَلَى بَابِ خِبَائِهَا كَئِيبَةً حَزِينَةً؛ لأَنَّهَا حَاضَتْ، فَقَالَ: «عَقْرَى حَلْقَى -لُغَةُ قُرَيْشٍ- إِنَّكِ لَحَابِسَتُنَا» ثُمَّ قَالَ: «أَكُنْتِ أَفَضْتِ يَوْمَ النَّحْرِ؟». يَعْنِي: الطَّوَافَ- قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: «فَانْفِرِي إِذًا»[٤].

---

(١) (تَرِبَتْ يَمِينُكِ) ئەم ڕستەیە لە زمانی عەرەبیدا بۆ دوعا لێکردن و دوعا بۆ کردنیش بە کار دێت، لەم فەرموودەدا بۆ دوعای خێر بۆ کردنە، دەتوانی بەم شێوانە مانای کەیت: دەستت خۆش بێت، دستت بچێت بەگڵدا.

(٢) بۆ دوعا لێ کردنە، (عقری) واتە: بەسەربڕین چیت، (حلقی) واتە: ورگی تووشی نەخۆشی بێت.

(٣) یان بە حەرامی دابنێن.

(٤) بڕوانە: ٢٩٤.

٦١٥٧-ئەسوەد لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ویستی بگەڕێتەوە (لە حەج) صەفییەی لە بەردەمی چادرەكەیدا بینی بێتاقەت و خەفەتبار بوو، چونكە كەوتو بوویە حەیزەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لەش بەباربیت گەرووت بێتە یەك -ئەمە شێوەزاری قورەیشە- تۆ ڕێگرمان دەبیت لە ڕۆشتن))، لە پاشان فەرمووی: ((ئایا ڕۆژی جەژن تەوافت كرد؟)) مەبەستی بە: (أَفَضْتِ): تەوافە، صەفییەش وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((كەواتە بگەڕێوە)) [(١)].

## ٩٤- باب مَا جَاءَ فِي زَعَمُوا

٦١٥٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي النَّضْرِ -مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ- أَنَّ أَبَا مُرَّةَ -مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ- أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ، وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟». فَقُلْتُ: أَنَا أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِي طَالِبٍ. فَقَالَ «مَرْحَبًا بِأُمِّ هَانِئٍ». فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غَسْلِهِ قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّي أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً قَدْ أَجَرْتُهُ، فُلاَنُ بْنُ هُبَيْرَةَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ». قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: وَذَاكَ ضُحًى[(٢)].

## ٩٤- باسی ئەوەی دەربارەی ((وایان وتووە))

٦١٥٨- ئوممو هانیئی كچی ئەبو تالیب ﵂ دەڵێ: ساڵی ئازادكردنی مەككە ڕۆشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، كە ڕۆشتم خۆی دەشۆری و فاتیمەی كچی پەردەیەكی بۆ كردبوو، ئوممو هانیئ دەڵێ: سڵاوم لێ كرد فەرمووی: ((ئەم ئافرەتە كێیە؟)) منیش

(١) لەگەڵماندا بۆ مەدینە.

(٢) بڕوانە: ٢٨٠.

وتم: منم ئوممو هانیئی کچی ئەبو تالیبە، فەرمووی: ((مەر حەبات لێ بێ ئوممو هانی))، جا کاتێ لە خۆشۆردنەکەی بوویەوە، هەڵسا و هەشت ڕکات نوێژی (سوننەتی) کرد، یەك پۆشاکی پێچابوو بەخۆیەوە، جا کە تەواو بوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (عەلی) کە برای دایکیمە دەڵێ بە پیاوێ کە من پەنام داوە دەیکوژم، کە فلانی کوڕی هوبەیرەیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێ تۆ پەنات دابێ لە لایەن ئێمەشەوە پەنادراوە ئەی ئوممو هانی))، ئوممو هانی وتی: کاتەکەش چێشتەنگاو بوو.

## ٩٥- بَابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ الرَّجُلِ: وَيْلَكَ

٦١٥٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً فَقَالَ: «ارْكَبْهَا». قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ: «ارْكَبْهَا». قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ: «ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ»[1].

## ٩٥- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک بڵێ: هاوار بۆ تۆ

٦١٥٩- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی دی وشترێکی گەورەی داوەتە بەر و لێی ئەخوڕێ، فەرمووی: ((سواری بە))، وتی: وشتری قوربانییە، فەرمووی: ((سواری بە))، وتی: وشتری قوربانییە، فەرمووی: ((سواری بە هاوار بۆ تۆ یان داماوی بۆ تۆ)).

٦١٦٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ لَهُ: «ارْكَبْهَا». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ. قَالَ: «ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ». فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَةِ[1].

---

(١) بروانە: ١٦٩٠.

**٦١٦٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێكی دی وشترێكی گەورەی داوەتە بەر و لێی ئەخوڕێ، فەرمووی: ((سواری بە)) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا وشتری قوربانییە، فەرمووی: ((سواری بە هاوار بۆتۆ یان داماوی بۆ تۆ))، لە جاری دووەم یان سێیەمدا فەرمووی: ((سواری بە هاوار بۆتۆ یان داماوی بۆ تۆ)).**

٦١٦١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. وَأَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، وَكَانَ مَعَهُ غُلاَمٌ لَهُ أَسْوَدُ، يُقَالُ لَهُ: أَنْجَشَةُ، يَحْدُو، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَيْحَكَ يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدَكَ بِالْقَوَارِيرِ»[٢].

**٦١٦١- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێكدا بوو غولامێكی ڕەش پێستی لەگەڵدا بوو كە هی خۆی بوو، پێی دەوترا: ئەنجەشە، بە گۆرانی وشترەكانی لێ دەخوڕی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ ئەی ئەنجەشە بەهێواشی وشترەكان لێخوڕە لەبەر شوشەكان))** [٣]

٦١٦٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَثْنَى رَجُلٌ على رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «وَيْلَكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ أَخِيكَ -ثَلاَثًا- مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحًا لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ أَحْسِبُ فُلاَنًا -وَاللَّهُ حَسِيبُهُ- وَلاَ أُزَكِّي على اللَّهِ أَحَدًا. إِنْ كَانَ يَعْلَمُ»[٤].

---

(١) بروانە: ١٦٨٩.
(٢) بروانە: ٦١٤٩.
(٣) مەبەستی ئافرەتەكانە كە بە سواری وشترەكانەوەن كە وەک شوشەوان.
(٤) بروانە: ٢٦٦٢.

**٦١٦٢- عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو بەكرە ﷺ له باوكیەوە دەگێڕێتەوە كە دەڵێ: پیاوێك مەدح و ستایشی پیاوێكی كرد له خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بۆیە فەرمووی: ((ماڵ وێران ملی هاوڕێكەت پەڕاند- سێ جار دووبارەی كردەوە- هەركام له ئێوە ناچار بوو ستایشی كەسێك بكات با بڵێت: پێم وایە فلان كەس وابێت - خواش چاكتر دەیناسێ- پاكانە بۆ كەس ناكەم لای خوای گەورە، ئەگەر دەیزانی (ئەو شتەی تێدایە) )).**

٦١٦٣- حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، عَنِ الأَوْزَاعِيِّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَالضَّحَّاكِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَقْسِمُ ذَاتَ يَوْمٍ قِسْمًا، فَقَالَ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ -رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ- يَا رَسُولَ اللَّهِ، اعْدِلْ. قَالَ: «وَيْلَكَ، مَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟». فَقَالَ عُمَرُ: ائْذَنْ لِي فَلأَضْرِبْ عُنُقَهُ. قَالَ: «لاَ، إِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِمْ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمُرُوقِ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يُنْظَرُ إِلَى نَصْلِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى رِصَافِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى نَضِيِّهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى قُذَذِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ، يَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ، آيَتُهُمْ رَجُلٌ إِحْدَى يَدَيْهِ مِثْلُ ثَدْيِ الْمَرْأَةِ، أَوْ مِثْلُ الْبَضْعَةِ تَدَرْدَرُ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَشْهَدُ لَسَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، وَأَشْهَدُ أَنِّي كُنْتُ مَعَ عَلِيٍّ حِينَ قَاتَلَهُمْ، فَالْتُمِسَ فِي الْقَتْلَى، فَأُتِيَ بِهِ عَلَى النَّعْتِ الَّذِي نَعَتَ النَّبِيُّ ﷺ[1].

**٦١٦٣- ئەبو سەلەمە و زەححاك له ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕایانەوە دەڵێ: ڕۆژێكیان له كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ (ئاڵتونێكی) دابەشكردنی دابەش كرد، زولخوەیصەرە – كە پیاوێك بوولە نەوەی تەمیم- وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دادگەربە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ ئەگەر من دادگەر**

(١) بڕوانە: ٣٣٤٤.

ئەبم كێ دادگەر دەبێت؟ )) جا عومەر ﷺ وتی: مۆڵەتم بدە با بدەم لە گەردنی، فەرمووی: ((نەخێر بێگومان چەند هاوڕێیەكی هەیە هەر كامتان نوێژی خۆی لە بەرانبەر نوێژی ئەواندا و ڕۆژووی خۆی لە بەرانبەری ڕۆژووی ئەواندا زۆر بەكەم دەزانێت، لە ئایینی (ئیسلام) دەردەچن وەك چۆن تیر لە نێچیرەكە دەردەچێت، سەیری سەرە ڕمەكەی دەكرێ هیچی پێوە نییە، پاشان سەیری سیرمەكە (ی قایم كردنی سەرەڕمەكە) دەكرێ هیچ شتێكی پێوە نییە، پاشان سەیری كلكی ڕمەكە دەكرێ هیچ شتێكی پێوە نییە، پاشان سەیری پەڕی ڕمكە دەكرێ هیچی پێوە نییە، بێگومان (تیرەكە) لە ڕیخ و خوێنەكە تێپەڕی[1]، وە لە كاتی جیاوازی دووبەرەكی خەڵكدا پەیدا دەبن[2]، نیشانەیان ئەوەیە پیاوێكیان تیایە قۆڵێكی وەك مەمكی ژن وایە، یان وەك پارچە گۆشتێك وایە بلەرێتەوە (بێت و بڕوا) )).

ئەبو سەعید ﷺ وتی: شایەتی دەدەم بە دڵنیاییەوە كە ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە، وە شایەتی دەدەم كە من لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبو تاڵیبدا بووم ﷺ كاتێ لە دژی ئەو كەسانە جەنگا، ئەنجا لە ناو كوژراوەكاندا گەڕان ئەنجامدرا (و ئەو پیاوە دۆزرایەوە) جا هێنایان، ئیتر سەیرم كرد بینیم بەو شێوەیە بوو كە پێغەمبەر ﷺ باسیكردبوو.

٦١٦٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْتُ. قَالَ: «وَيْحَكَ». قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى أَهْلِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ: «أَعْتِقْ

(١) واتە چۆن تیرێک بدات لە نێچیرێک ئەوەنە خێرا دەردەچێت هیچ لەگەڵ خۆی نەبات، ئەوانیش ئاوا لە ئیسلام دەردەچن و هیچ لەگەڵ خۆیان نابەن.

(٢) یان: لە چاكترین دەستە دەردەچن و دژیان دەوەستنەوە، وەک لەگێڕانەوەیەكی تردا هاتووە (إرشاد الساري: ١٠٣/٨)

رَقَبَةً». قَالَ: مَا أَجِدُهَا. قَالَ: «فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ». قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ. قَالَ: «فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا». قَالَ: مَا أَجِدُ. فَأُتِيَ بِعَرَقٍ، فَقَالَ: «خُذْهُ فَتَصَدَّقْ بِهِ». فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعَلَى غَيْرِ أَهْلِي؟! فَوَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ مَا بَيْنَ طُنُبَيِ الْمَدِينَةِ أَحْوَجُ مِنِّي. فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ قَالَ: «خُذْهُ».تَابَعَهُ يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: "وَيْلَكَ"[1].

**٦١٦٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تیا چووم، فەرمووی: ((چی بووە؟)) وتی: لە ڕەمەزاندا لەگەڵ ژنەکەم دروست بووم، فەرمووی: ((کۆیلەیەك ئازاد بکە))، وتی: کۆیلەم نییە، فەرمووی: ((دەی دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بە))، وتی: ناتوانم، فەرمووی: ((دەی خواردنی شەست هەژار بدە)) وتی: نیمە، ئینجا زەمیلەیەك هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیگرە و بیکە بەخێر))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیدەم بە کەسێك جگە لە ماڵ و منداڵی خۆم؟ دەی سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، لە نێوان ئەو دوو لایەی مەدینەدا ماڵێکی تیا نییە لە من هەژارتر و نەدارتر بێت، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی هەتا دانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن و فەرمووی: ((بیبە بۆ خۆتان)).**

**-یونس لە زوهریەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەوزاعی کردوە.**

**-عەبدوڕەحمان کوڕی خالید لە زوهریەوە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە بەم شێوە((وَيْلَكَ))[2].**

---

(١) بڕوانە: ١٩٣٦.

(٢) لە شوێنی (ويحك) ئەو (ويلك)ـی گێڕاوەتەوە.

٦١٦٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرٍو الأَوْزَاعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ الزُّهْرِيُّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي عَنِ الهِجْرَةِ. فَقَالَ: «وَيْحَكَ، إِنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَهَلْ تُؤَدِّي صَدَقَتَهَا؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ البِحَارِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا»[1].

**٦١٦٥- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بەرێ دەربارەی کۆچکردن، ئەویش فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ بەڕاستی کۆچکردن کارێکی سەخت و گرانە، ئایا وشترت هەیە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((ئایا زەکاتی دەدەیت؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((کەواتە تۆ چاکە بکە با لە دوورترین شوێنیش بێت لەوپەڕی دەریاکانیشەوە بێت، ئەوە دڵنیابە خوا هیچێك لە کردەوەکانت فەرامۆش ناکات)).**

٦١٦٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الْحَارِثِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ وَاقِدِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ، سَمِعْتُ أَبِي، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: «وَيْلَكُمْ -أَوْ وَيْحَكُمْ، قَالَ شُعْبَةُ: شَكَّ هُوَ- لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ». وَقَالَ النَّضْرُ، عَنْ شُعْبَةَ "وَيْحَكُمْ". وَقَالَ عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ: "وَيْلَكُمْ" أَوْ "وَيْحَكُمْ"[2].

**٦١٦٦-شوعبە لە واقیدی کوڕی موحەممەدی کوڕ زەیدەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ لە باوکم بیست گێڕایەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((هاوار بۆ ئێوە -یان گرفتاری بۆ ئێوە، شوعبە دەڵێ: واقیدی گومانی بردووە[3]- پاش من مەبنەوە بە کافر هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان)).**

---

(١) بڕوانە: ١٤٥٢.
(٢) بڕوانە: ١٧٤٢.
(٣) لە نێوان ئەو دوو وشەیەدا.

-نەزر لە شوعبەوە بە: ((وَيْحَكُمْ)) گێڕاویەتیەوە.

-عومەری كوڕی موحەممەد لە باوكیەوە بە: ((وَيْلَكُمْ)) یان: ((وَيْحَكُمْ)) گێڕاویەتیەوە.

٦١٦٧- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَتَى السَّاعَةُ قَائِمَةٌ؟ قَالَ: «وَيْلَكَ، وَمَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟». قَالَ: مَا أَعْدَدْتُ لَهَا إِلاَّ أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ: «إِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ». فَقُلْنَا: وَنَحْنُ كَذَلِكَ؟. قَالَ: «نَعَمْ». فَفَرِحْنَا يَوْمَئِذٍ فَرَحًا شَدِيدًا، فَمَرَّ غُلاَمٌ لِلْمُغِيرَةِ -وَكَانَ مِنْ أَقْرَانِي- فَقَالَ: «إِنْ أُخِّرَ هَذَا فَلَنْ يُدْرِكَهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ». وَاخْتَصَرَهُ شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ: سَمِعْتُ أَنَسًا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٦١٦٧- ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە كە پیاوێكی دەوارنشینی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا كەی قیامەت بەرپا دەبێت؟ فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ چیت ئامادەكردوە بۆی؟)) وتی: هیچم بۆ ئامادە نەكردوە تەنها ئەوەندە نەبێ خوا و پێغەمبەرەكەیم ﷺ خۆش دەوێت، فەرمووی: ((بێگومان تۆ (لە قیامەتدا) لەگەڵ ئەو كەسەدا خۆشت ویستووە))، ئێمەش وتمان هەمووومان هەر واین[2]؟ فەرمووی((بەڵێ))، ئیتر بۆیە ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش بووین، ئینجا مێرد منداڵی موغیرە كە هاوتەمەنی من بوو بەوێدا تێپەڕی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئەمە مردنی دواخرێت پیر نابێت هەتا قیامەت[3] بەرپا دەبێت))، شوعبە لە قەتادەوە گێڕاویەتیەوە دەڵێ لە ئەنەسم ﷺ بیست لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە، شوعبە فەرموودەكەی بە كورتتر هێنابوو.**

---

(١) بڕوانە: ٣٦٨٨.

(٢) هەمووومان لەگەڵ ئەو كەسە داین خۆشمان بوێ؟.

(٣) مەبەست لە قیامەت مردنی ئەو نەوەیە كە لەو كاتەدا لە ژیاندا بوون، وەك لە گێڕانەوەكانی تردا ڕوون دەبێتەوە.

## ٩٦- بابُ علامات الحب في الله ﷻ

لِقَوْلِهِ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران

٦١٦٨- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ»[١].

## ٩٦- باسی نیشانەی خۆش ویستنی لەبەر خوا ﷻ

**بە بەڵگەی فەرمایشتی (خوا): (ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت کەواتە دوای من بکەون، تا خواش ئێوەی خۆش بوێت)**

**٦١٦٨- عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە خۆشی بوێت)).**

٦١٦٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ : جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ تَقُولُ فِي رَجُلٍ أَحَبَّ قَوْمًا وَلَمْ يَلْحَقْ بِهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ».
تَابَعَهُ جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ وَسُلَيْمَانُ بْنُ قَرْمٍ وَأَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

**٦١٦٩-عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ چی دەفەرمووی دەربارەی پیاوێك کەسانێکی خۆش دەوێت و نەگەیشتووە بە پلەی ئەوان؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (( مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێ)).**

---

(١) بڕوانە: ٦١٦٩.
(٢) بڕوانە: ٦١٦٨.

-هەر یەك لە جەریری کوڕی حازیم و سولەیمانی کوڕ قەرەم و ئەبو عەوانە لە ئەعمەشەوە لە ئەبی وائیلەوە لە عەبدوڵڵاوە گێراویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ و پاڵپشتی گێڕانەوەی جەریری کوڕی عەبدولحەمیدیان کردوە.

٦١٧٠- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: الرَّجُلُ يُحِبُّ الْقَوْمَ وَلَمَّا يَلْحَقْ بِهِمْ؟ قَالَ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ». تَابَعَهُ أَبُو مُعَاوِيَةَ وَمُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ.

٦١٧٠-ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەر ﷺ وترا: پیاو هەیە خەڵکانێکی خۆش دەوێ کە نەگەیشتۆتە پلەی ئەوان؟ فەرمووی: ((مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسە دایە خۆشی بوێت)).-هەر یەك لە ئەبو موعاوییە و موحەممەدی کوڕی عوبەید ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سوفیانی سەوریان کردوە.

٦١٧١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: مَتَى السَّاعَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟». قَالَ: مَا أَعْدَدْتُ لَهَا مِنْ كَثِيرِ صَلاَةٍ وَلاَ صَوْمٍ وَلاَ صَدَقَةٍ، وَلَكِنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ: «أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ»(١).

٦١٧١-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد: قیامەت کەی دەبێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((چیت بۆ ئامادە کردوە؟)) وتی: نوێژ و ڕۆژ و ماڵ بەخشینی زۆرم بۆ ئامادە نەکردوە، بەڵام خوا و پێغەمبەرم خۆش دەوێت، فەرموی: ((تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدای خۆشت ویستووە)).

(١) بڕوانە: ٣٦٨٨.

## ٩٧- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ لِلرَّجُلِ: اخْسَأْ

٦١٧٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا سَلْمُ بْنُ زَرِيرٍ، سَمِعْتُ أَبَا رَجَاءٍ، سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لاِبْنِ صَائِدٍ: «قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا، فَمَا هُوَ؟». قَالَ: الدُّخُّ. قَالَ: «اخْسَأْ».

## ٩٧- باسی کەسێک بەکەسێکی تر بڵێ: بێدەنگبە[1]

**٦١٧٢- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیبنو صائیدی فەرموو: ((لە دڵمدا شتێکم بۆ شاردوویتەوە ئەو شتە چییە؟)) وتی:** (الدُّخُ)[2]**، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێدەنگبە ئەی بێ ڕێز)).**

٦١٧٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ انْطَلَقَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنْ أَصْحَابِهِ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ، حَتَّى وَجَدَهُ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ فِي أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ -وَقَدْ قَارَبَ ابْنُ صَيَّادٍ يَوْمَئِذٍ الْحُلُمَ- فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ظَهْرَهُ بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ: «أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟». فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الأُمِّيِّينَ. ثُمَّ قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ فَرَضَّهُ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «آمَنْتُ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ». ثُمَّ قَالَ لاِبْنِ صَيَّادٍ: «مَاذَا تَرَى؟». قَالَ يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُلِّطَ عَلَيْكَ الأَمْرُ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا». قَالَ: هُوَ الدُّخُّ.
قَالَ «اخْسَأْ، فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ». قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَأْذَنُ لِي فِيهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ؟. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ يَكُنْ هُوَ لاَ تُسَلَّطُ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ هُوَ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ»[1]

---

(١) (إخسأ): لە بنەڕەتدا بەمانای چغەیە کە بۆ سەگ بەکاردێت، بەڵام بۆ مرۆڤیش بەکاردێ ئەگەر بۆ بێدەنگ کردن و ڕیسوا کردنی بێت. بڕوانە: المعجم الإشتقاقي الموصل الألفاظ القرآن الكريم: ٣٦٨/١. وإرشاد الساري: ١٨٠/٣.
(٢) (الدُّخُ) ویستی بڵێ (الدُخان)، بەڵام نەیتوانی وەک فاڵچی کە چەند وشەیەک وەردەگرن لەو جنۆکانەوەی دۆستیانن ناتوانن بە تەواوی بیڵێن. (إرشاد الساري:١٣/١٨٠).

**٦١٧٣- سالیمی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﭫ بۆی گێرایەوە، کە عومەری کوڕی خەتتاب و کۆمەڵێ لە هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتن بەرەو شوێنی ئیبنو صەییاد[٢]، هەتا بینی لای قەلای بەنی مەغالە لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد – لەو کاتەدا ئیبنوصەییاد نزیك بالغ بوون ببوویەوە- هەستی نەکرد هەتا پێغەمبەر ﷺ لە دوایەوە دەستی مالی بەپشتیدا پاشان فەرمووی: ((ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟)) جا سەیرێکی پێغەمبەری ﷺ کرد و وتی: بێگومان شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارەکانی (عەرەبەکان)، پاشان ئیبنوصەییاد وتی: ئایا تۆشایەتی دەدەی کەمن پێغەمبەری خوام؟ جا پێغەمبەر ﷺ پالێکی پێوە نا[٣]، پاشان فەرمووی: ((باوەڕم هەیە بە خوا و بە پێغەمبەرانی، پاشان فەرمووی بەئیبنو صەییاد: ((چ جۆرە خەوێك دەبینی؟)) وتی: خەوی ڕاست و خەوی درۆش دەبینم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سەرت لێ شێوێنراوە؟)) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێی: ((من شتێکم لە دلمدا شاردۆتەوە بۆت چییە؟)) ئیبنو صەییاد وتی: (الدُّخُّ)، فەرمووی: ((بێدەنگبە تۆ لە پلەی خۆت (کە فالچیەتیە) تێپەڕ ناکەیت (ئەوەی پەنهانە نایزانیت) ))، ئەنجا عومەر ﭬ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆلەتم ئەدەیت بدەم لە گەردنی؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر (دەججال) خۆی بێت ئەوە تۆ ناتوانی بیکوژی و زاڵ ببیت بەسەریدا، وە ئەگەر ئەویش نەبێ کەلکێك لە کوشتنیدا نییە)).**

---

(١) بڕوانە: ١٣٥٤.

(٢) ئیبنو صەیاد: منداڵێکی جولەکە بوو، وە هەندێ دەڵێن لە هۆزی نەجارە.

(٣) (رَضَّهُ): بەم ماناش دێت: بەتوندی یەخەی گرت.

٦١٧٤ - قَالَ سَالِمٌ: فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: انْطَلَقَ بَعْدَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ الأَنْصَارِيُّ يَؤُمَّانِ النَّخْلَ الَّتِي فِيهَا ابْنُ صَيَّادٍ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، طَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَهْوَ يَخْتِلُ أَنْ يَسْمَعَ مِنِ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ، وَابْنُ صَيَّادٍ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشِهِ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا رَمْرَمَةٌ أَوْ زَمْزَمَةٌ فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، فَقَالَتْ لاِبْنِ صَيَّاد: أَيْ صَافِ -وَهْوَ اسْمُهُ- هَذَا مُحَمَّدٌ. فَتَنَاهَى ابْنُ صَيَّادٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ»[1].

**٦١٧٤-سالیم دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەو جارە لەگەڵ ئوبەی کوڕی کەعبی ئەنصاریدا هەردووکیان بەرەو ئەو باخە خورمایە ڕۆشتن کەئیبنو صەییادی لێیە[2]، ڕۆشتن هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت ناو باخەکەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەدایە پەنای قەدی دار خورماکان، دەیویست ئیبنو صەییاد ئاگای لێ نەبێت شتێکی لێ ببیستێ پێش ئەوەی ئیبنو صەییاد بیبینێ، لەو کاتەدا ئیبنوصەییاد لە سەر ڕاخەرە قەیفەکەی ڕاکشابوو ورتە ورتێکی لێوە دەهات، لە پڕ دایکی ئیبنو صەییاد پێغەمبەری ﷺ بینی کە خۆی دەدایە پەنای قەدی دار خورماکان وتی: بە ئیبنو صەییاد ئەی صاف -کە ناوی ئیبنو صەییاد بوو- ئەوە موحەممەدە، ئیتر ئیبنو صەییاد بێدەنگ بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی ئەگەر ئەو (دایکی) لێی گەڕایە ڕوون دەبوویەوە)).**

٦١٧٥ - قَالَ سَالِمٌ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: «إِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ وَقَدْ أَنْذَرَ قَوْمَهُ، لَقَدْ أَنْذَرَهُ نُوحٌ قَوْمَهُ، وَلَكِنِّي سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ، وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ»[3].

---

(١) بڕوانە: ١٣٥٥.

(٢) ئیبن صەیاد: منداڵێکی جولەکە بوو، وە هەندێ دەڵێن لە هۆزی نەجارە.

(٣) بڕوانە: ٣٠٥٧.

**٦١٧٥- سالیم دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ناو خەڵکەکەدا هەستا و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو جۆرەی شیاوی بێت، پاشان باسی دەججالی کرد و فەرمووی: ((بێگومان من لە دەججال ئاگادارتان دەکەمەوە (دەتان ترسێنم)، هەموو پێغەمبەرێك بەدڵنیایی یەوە گەلەکەی ئاگادار کردۆتەوە لە دەججال، بێگومان نووح ﷺ گەلەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە من لە بارەی دەججالەوە وتەیەکتان پێ دەڵێم هیچ پێغەمبەرێك پێش من بەگەلەکەی نەوتووە: بزانن کە دەججال چاوێکی کوێرە (یەکڵە چاوە)[١]، بەڵام بێگومان خوا چاوی کوێر نییە (یەکڵە چاو نییە) )).**

## ٩٨- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ مَرْحَبًا

وَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِفَاطِمَةَ ﷺ: "مَرْحَبًا بِابْنَتِي". وَقَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: جِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: "مَرْحَبًا بِأُمِّ هَانِئٍ" وقد سلفا.

٦١٧٦- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَبُو التَّيَّاحِ، عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ على النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَرْحَبًا بِالْوَفْدِ الَّذِينَ جَاءُوا غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ نَدَامَى». فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا حَيٌّ مِنْ رَبِيعَةَ وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مُضَرُ، وَإِنَّا لاَ نَصِلُ إِلَيْكَ إِلاَّ فِي الشَّهْرِ الْحَرَامِ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ فَصْلٍ نَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ، وَنَدْعُو بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا. فَقَالَ: «أَرْبَعٌ وَأَرْبَعٌ: أَقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَآتُوا الزَّكَاةَ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَأَعْطُوا خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ، وَلاَ تَشْرَبُوا فِي الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ»[٢].

---

(١) یەکڵەچاو: گیاندارێکە کە چاوێکی کوێربێت. (فەرهەنگی خاڵ: ل٦٥٩).

(٢) بڕوانە: ٥٣.

## ٩٨- باسی کەسێک بڵێ (بەکەسێکی تر) بەخێر بێیت[1]

- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەفاتیمە: ((بەخێربێیت کچەکەم)).

-ئوممو هانیی وتی: چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئوممو هانی خۆش هاتی)).

ئەم دوو فەرموودە پێشتر ڕابووردن.

٦١٧٦- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێك نوێنەری خێڵی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەخێربێن (بەهاتنتان) ڕوو زەرد و ڕیسوا و پەشیمان نابن))، ئەوانیش عەرزیان کرد پێغەمبەری خوا ئێمە خێڵێکین لە هۆزی ڕەبیعە لە نێوان ئێمە و جەنابتدا هۆزی موزەڕ هەیە، بۆیە ناتوانین بێینە خزمەتت لەو مانگانەدا نەبێ کە جەنگ تێیاندا حەرامە، کەواتە فەرمانی ڕوون و ئاشکرامان پێ بفەرموو، تا (هەموومان کاری پێ بکەین و) بەهۆیەوە بچینە بەهەشتەوە، وە هۆزەکەمانی پێ بانگ بکەین، وە فەرمووی: (فەرمان پێکراوەکان) چوارن، وە (قەدەغەکراوەکانیش) چوارن: نوێژ بکەن و زەکات بدەن و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرن و پێنج یەکی دەستکەوتی جەنگی بدەن (بەدەوڵەتی ئیسلامیی) ))، وە خواردنەوە مەخۆنەوە لە کولکەی هەڵکۆڵراو، کوپە (کەلە قوڕ و موو دروست دەکرا) و دەفری هەڵکوڵراو لە بنکی دار خورما و کوپە قیر و زەفت تێهەڵسواو)).

---

(١) خۆش هاتیت.

## ٩٩- بابُ يُدْعَى النَّاسُ بِآبَائِهِمْ

٦١٧٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْغَادِرُ يُرْفَعُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ»[1].

## ٩٩- باسی خەڵکی (لە قیامەتدا) بەناوی باوکیانەوە بانگ دەکرێن

**٦١٧٧-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پەیمان شکێن و ناپاك لە ڕۆژی قیامەتدا بەیداغێکی بۆ بەرز دەکرێتەوە و دەوترێت: ئەمە غەدر و پەیمان شکێنی فلانی کوڕی فلانە)).**

٦١٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْغَادِرَ يُنْصَبُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ»[2].

**٦١٧٨- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان پەیمان شکێن و ناپاك لە ڕۆژی قیامەتدا بەیداخێکی بۆ دادەچەقێنرێ و دەوترێت: ئەمە غەدر و ناپاکی فلانی کوڕی فلانە)).**

## ١٠٠- بابٌ: لاَ يَقُلْ: خَبُثَتْ نَفْسِي

٦١٧٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي».

---

(١) بڕوانە: ٣١٨٨.

(٢) بڕوانە: ٣١٨٨.

## ١٠٠- باسێک: با کەسێکتان نەڵێت: ((نەفسم پیس بوو)) (١)

**٦١٧٩- عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((با هیچ کەس لە ئێوە نەڵێت: نەفسم پیس بوو، بەڵکو بڵێت نەفسم پاك نییە)).**

٦١٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي». تَابَعَهُ عُقَيْلٌ.

**٦١٨٠- ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((با هیچ کەس لە ئێوە نەڵێت: نەفسم پیس بووە، بەڵکو بڵێت نەفسم پاك نییە)). عوقەیل ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یونسی کوڕی یەزید کردوە.**

## ١٠١- بَابٌ: لاَ تَسُبُّوا الدَّهْرَ

٦١٨١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَ اللَّهُ: يَسُبُّ بَنُو آدَمَ الدَّهْرَ، وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ»(٢).

## ١٠١- باسێک: جنێو بە ڕۆژگار (شەو و ڕۆژ) مەدەن

**٦١٨١-ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا فەرمووی: ئادەمی جنێو بە ڕۆژگار دەدات (هەڵسوڕێنەری) ڕۆژگار منم، شەو و ڕۆژ بەدەستی منە (ئاڵوگۆڕی پێ دەکەم) )).**

---

(١) (خَبُثَتْ) و (لَقِسَتْ) هەردووکیان بەمانای پیس بوونن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێی باش نەبوو وشەی (خبُثَتْ) بەکار بهێنرێت، بەڵکو وشەی: (لَقِسَتْ) لە جیاتی بەکار بێت، چونکە وشەکە ناشرین و ناخۆشە.

(٢) بڕوانە: ٤٨٢٦.

٦١٨٢- حَدَّثَنَا عَيَّاشُ بْنُ الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تُسَمُّوا الْعِنَبَ الْكَرْمَ، وَلاَ تَقُولُوا: خَيْبَةَ الدَّهْرِ. فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْرُ»[١].

**٦١٨٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((بەترێ (و درەختەکەی) مەڵێن کەرم [٢]، وە مەڵێن نائومێدی ڕۆژگار چونکە بەڕاستی خوا (هەڵسوڕێنەری) ڕۆژگارە)).**

## ١٠٢- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «إِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ»

وَقَدْ قَالَ: "إِنَّمَا الْمُفْلِسُ الذِي يُفْلِسُ يَوْمَ القِيَامَةِ". كَقَوْلِهِ "إِنما الصُّرَعَةُ الذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ"[٣]. كَقَوْلِهِ: "لَا مَلِكَ إِلَّا لِلَّهِ". فَوَصَفَهُ بِانْتِهَاءِ الْمُلْكِ، ثُمَّ ذَكَرَ الْمُلُوكَ أَيْضًا فَقَالَ:

﴿ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا ﴿٣٤﴾ ﴾ النمل

٦١٨٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَيَقُولُونَ الْكَرْمُ، إِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ»[٤].

---

(١) بڕوانە: ٤٨٢٦، ٦١٨٣.

(٢) کەرەم: بە داری ترێ و داری مێویش دەڵێن، هۆی ناپەسەند وتنی ئەم وشەیە لەبەر ئەوەیە بە ئارەقیش دەوترێت کەرەم، وە لە وانەیە کە پێ بوترێ کەرەم ئارەقیان بیربێنێتەوە.

(٣) بڕوانە: ٦١١٤.

(٤) بڕوانە: ٦١٨٢.

## ١٠٢- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ((بێگومان كەرم[1] دڵی باوەڕدارە[2]))

-وە بێگومان (پێغەمبەر ﷺ) فەرموویەتی: ((بەڕاستی مایە پوچ ئەو كەسەیە لە ڕۆژی قیامەتدا مایە پوچ بێت))، ئەمەش وەكو ئەم فەرموودەیە وایە: ((بەڕاستی ئازا و پاڵەوان ئەو كەسەیە خۆی بگرێت لە كاتی توڕەییدا))، هەروەها وەك ئەم فەرموودەیە: ((هەرچی موڵكە هی خودایە))، وەسفی خوای كردوە كە موڵك لە لای ئەودا تەواو دەبێت سەرەنجام هی خوایە، پاشان باسی پادشاكان دەكات دەفەرموێ: ((بێگومان پادشاكان هەر كاتێ (بەزۆر) چوونە شارێكەوە خراپ وێرانی دەكەن)).

٦١٨٣-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( (بەمێو) دەڵێن كەرم لە ڕاستیدا كەرم دڵی باوەڕدارە)).

## ١٠٣- بابُ قوْلِ الرَّجُلِ: فَدَاكَ أبِي وَأُمِّي

فِيهِ الزُّبَيْرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[3].

٦١٨٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي سَعْدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُفَدِّي أَحَدًا غَيْرَ سَعْدٍ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «ارْمِ فَدَاكَ أَبِي وَأُمِّي». أَظُنُّهُ يَوْمَ أُحُدٍ[4].

---

(١) كەرەم چەند مانایەكی هەیە: لێبوردن، بەخشندەیی، جوامێری، بەڕێز.
(٢) مەبەست پێی دڵی باوەڕدار لە هەموو شتی شیاوترە بە ناوی كەرەم.
(٣) بڕوانە: ٣٧٢٠.
(٤) بڕوانە: ٢٩٠٥.

## ١٠٣- باسى پياوێک (بەکەسێکى تر ) بڵێ: باوک و دايکم بە قوربانت بێ

-لەم باسەدا فەرموودەى زوبەير ﷺ هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاويەتيەوە.

٦١٨٤- عەلى ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ نەبيستووە خۆى بكات بە قوربان و فيداى هيچ كەس جگەلە سەعد، گوێم لێ بوو دەيفەرموو: (بەسەعد): ((بهاوێژە دايك و باوكم بەفيدات بێ))، وابزانم ڕۆژى غەزاى ئوحود بوو.

## ١٠٤- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ: جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاكَ

وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ لرسول الله ﷺ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا[1].

٦١٨٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ أَقْبَلَ هُوَ وَأَبُو طَلْحَةَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَمَعَ النَّبِيِّ ﷺ صَفِيَّةُ مُرْدِفَهَا عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا كَانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَثَرَتِ النَّاقَةُ، فَصُرِعَ النَّبِيُّ ﷺ وَالْمَرْأَةُ، وَأَنَّ أَبَا طَلْحَةَ -قَالَ: أَحْسِبُ- اقْتَحَمَ عَنْ بَعِيرِهِ، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاكَ، هَلْ أَصَابَكَ مِنْ شَيْءٍ؟. قَالَ: «لاَ، وَلَكِنْ عَلَيْكَ بِالْمَرْأَةِ». فَأَلْقَى أَبُو طَلْحَةَ ثَوْبَهُ عَلَى وَجْهِهِ فَقَصَدَ قَصْدَهَا، فَأَلْقَى ثَوْبَهُ عَلَيْهَا، فَقَامَتِ الْمَرْأَةُ، فَشَدَّ لَهُمَا عَلَى رَاحِلَتِهِمَا فَرَكِبَا، فَسَارُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِظَهْرِ الْمَدِينَةِ -أَوْ قَالَ: أَشْرَفُوا عَلَى الْمَدِينَةِ- قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «آيِبُونَ تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ». فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُهَا حَتَّى دَخَلَ الْمَدِينَةَ[2].

---

(١) بروانە: ٣٩٠٤.

(٢) بروانە: ٣٧١.

## ١٠٤- باسی (دروستە) کەسێک بڵێ خودا بمکات بەقوربانت

-ئەبو بەکر ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ وت: بە باوك و دایکمانەوە بە فیدات بین.

٦١٨٥- یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو و ئەبو تەڵحە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ هاتن، صەفییە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە پاشکۆی وشترەکەیدا بوو، جا کاتێ لەڕێگادا بوون وشترەکە سەرسمێکیدا و پێغەمبەر و ﷺ ئافرەتەکە لە وشترەکە کەوتنە خوارەوە، وە ئەبو تەڵحەش- وتی: وابزانم- لە وشترەکەی خۆی فڕێدایە خوارەوە و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا بمکات بەقوربانت ئایا هیچ شتێکت تووش بووە؟ فەرمووی: ((نەخێر بەڵام بڕۆ بۆ لای ئافرەتەکە))، ئەنجا ئەبو تەڵحە کراسەکەی دابە ڕووخساری خۆیدا و بەرەو ئافرەتەکە ڕۆشت و کراسە (کە دابووی بەرووخساری خۆیدا) دای بەسەر صەفییەدا، ئەنجا ئافرەتەکە هەستایەوە ئەوسا ئەبو تەڵحە وشترەکەی توند و تۆڵ کردەوە، هەردووکیان سوواربوون و ڕۆشتن هەتا ئەوکاتەی گەشتنە نزیك مەدینە- وتی: یا مەدینەیان بینی- پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((گەڕاینەوە تەوبەکارین خواپەرستین سوپاسگوزارین بۆ پەروەردگارمان))، ئیتر بەردەوام ئەم دوعایەی دەخوێند هەتا ڕۆشتە ناو شاری مەدینە.

## ١٠٥- بابُ أَحَبِّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ تعالى

٦١٨٦- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقُلْنَا: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلاَ كَرَامَةَ. فَأَخْبَرَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «سَمِّ ابْنَكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ»[1].

---

(١) بروانە: ٣١١٤.

## ١٠٥- باسی خۆشەویسترین ناو لای خوای بەرز و بڵند

٦١٨٦-جابیر ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە (ئەنصاری) ژنەکەی کوڕێکی بوو ناوی نا قاسیم، ئێمە پێمان وت بە کەسناوی ئەبو قاسیم ناوت ناهێنین و ڕێزداریش نابی لامان بەو کەسانەوە، ئینجا ئەو هەواڵە درا بە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((کوڕەکەت ناو بنێ عەبدوڕەحمان)).

## ١٠٦- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «تسَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي»

قَالَهُ أَنَسٌ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

٦١٨٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقَالُوا: لاَ نَكْنِيهِ حَتَّى نَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ. فَقَالَ: «سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي»[2].

## ١٠٦- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ (( بەناوی منەوە ناو (ی منداڵتان) بنێن، بەڵام بەکەسناوی منە کەسناو (لە خۆتان ) مەنێن))

-ئەنەس ﷺ ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

٦١٨٧- جابیر ﷺ دەڵێ: پیاوێکمان کوڕێکیان بوو ناوی نا قاسیم وتیان: کەس ناوی (ئەبو قاسیمی) لێ نانێین هەتا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ نەکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەناوی منەوە ناوی بنێن، بەڵام بەکەسناو منەوە کەسناو (لە خۆتان) مەنێن))

(١) بڕوانە: ٢١٢٠.

(٢) بڕوانە: ٣١١٤.

٦١٨٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي»[1].

**٦١٨٨-ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێ: ئەبو لقاسیم ﷺ فەرمووی: ((بەناوی منەوە ناو بنێن بەڵام بە کەسناوی منەوەکەسناو (لە خۆتان) مەنێن)).**

٦١٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷠: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقَالُوا: لاَ نَكْنِيكَ بِأَبِي الْقَاسِمِ، وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْنًا. فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «أَسْمِ ابْنَكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ»[2].

**٦١٨٩-جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷠ دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە (ئەنصاری) کوڕێکیان بوو ناوی نا قاسیم، (ئەنصاریەکان) وتیان کەس ناوی** (أبو القاسيم)**ت لێ نانێین و چاو و دڵخۆشت ناکەین (بەو کەسناوە). ئینجا کابرا هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەو باسەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ناوی کوڕەکەت بنێ عەبدوڕحمان)).**

## ١٠٧- بابُ اسْمِ الحَزْنِ

٦١٩٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ نَصْرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أَبَاهُ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «مَا اسْمُكَ؟». قَالَ: حَزْنٌ. قَالَ: «أَنْتَ سَهْلٌ». قَالَ: لاَ أُغَيِّرُ اسْمًا سَمَّانِيهِ أَبِي. قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: فَمَا زَالَتِ الْحُزُونَةُ فِينَا بَعْدُ.

٦١٩٠م- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ وَمَحْمُودٌ قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ بِهَذَا[3].

---

(١) بروانە: ١١٠.

(٢) بروانە: ٣١١٤.

(٣) بروانە: ٦١٩٣.

## ١٠٧- باسی ناوی حەزن[1]

٦١٩٠-ئیبنو لموسەییەب لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە (موسەییەبی) باوکی چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((ناوت چییە؟)) وتی: حەزن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((تۆ سەهلیت))[2] وتی: ناوێك باوکم ناوی ناوم نایگۆڕم، ئیبنو لموسەییەب وتی: جا بەردەوام ئەو سەختیەمان تیا بوو دوا ئەوە.

٦١٩٠م- زوهری لە ئیبنو لموسەییەبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە.

## ١٠٨- بابُ تَحْوِيلِ الاسْمِ إِلى اسْمٍ أَحْسَنَ مِنْهُ

٦١٩١- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: أُتِيَ بِالْمُنْذِرِ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ حِينَ وُلِدَ، فَوَضَعَهُ عَلَى فَخِذِهِ -وَأَبُو أُسَيْدٍ جَالِسٌ- فَلَهَا النَّبِيُّ ﷺ بِشَيْءٍ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَأَمَرَ أَبُو أُسَيْدٍ بِابْنِهِ فَاحْتُمِلَ مِنْ فَخِذِ النَّبِيِّ ﷺ، فَاسْتَفَاقَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَيْنَ الصَّبِيُّ؟». فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: قَلَبْنَاهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «مَا اسْمُهُ». قَالَ: فُلَانٌ. قَالَ: «وَلَكِنْ أَسْمِهِ الْمُنْذِرَ». فَسَمَّاهُ يَوْمَئِذٍ الْمُنْذِرَ.

## ١٠٨- باسی گۆڕینی ناوێک بۆ ناوێکی جوانتر لەو

٦١٩١-سەهل ﷺ دەڵێ کاتێ مونزیری کوڕی ئەبی ئوسەید لە دایك بوو هێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش خستیە سەر ڕانی و ئەبو ئوسەیدیش دانیشتبوو، جا پێغەمبەر ﷺ سەرقاڵ بوو بە شتێکەوە لە بەردەمیدا بوو، ئەبو ئوسەیدیش فەرمانی کرد و کوڕەکەیان لەسەر ڕانی پێغەمبەر ﷺ هەڵگیرا، جا

---

(١) (حَزْنٌ) واتە: زەوی سەخت بەرز، پێچەوانە دەشت و سارا. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٣/١٦٤.

(٢) واتە: تۆ ناوت سەهلە.

**کە پێغەمبەر ﷺ سەرقاڵیەکەی نەما فەرمووی: ((کوا منداڵەکە؟)) ئەبو ئوسەید وتی: ئەی پێغەمبەر خوا گەڕاندمانەوە (بۆ ماڵەوە)، فەرمووی: ((ناوی چییە؟)) وتی: ناوی فلانە، فەرمووی: ((بەڵام من ناوی دەنێم مونزیر))، ئیتر لەو ڕۆژەوە پێغەمبەر ﷺ ناوی نا مونزیر.**

٦١٩٢- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ زَيْنَبَ كَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَقِيلَ: تُزَكِّي نَفْسَهَا. فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَيْنَبَ.

**٦١٩٢-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە زەینەب پێشتر ناوی بەڕرە بوو وترا: خۆی بە چاك دادەنێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا زەینەب.**

٦١٩٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الْحَمِيدِ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ شَيْبَةَ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ فَحَدَّثَنِي، أَنَّ جَدَّهُ حَزْنًا قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «مَا اسْمُكَ؟». قَالَ اسْمِي حَزْنٌ. قَالَ: «بَلْ أَنْتَ سَهْلٌ». قَالَ: مَا أَنَا بِمُغَيِّرٍ اسْمًا سَمَّانِيهِ أَبِي. قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: فَمَا زَالَتْ فِينَا الْحُزُونَةُ بَعْدُ[1].

**٦١٩٣-عەبدولحەمیدی کوڕی جوبەیری کوڕی شەیبە وتی: لای سەعیدی کوڕی موسەییەب دانیشتم بۆی گێڕامەوە کە حەزنی باپیرەی ﷺ هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی پێی: ((ناوت چییە؟)) وتی: ناوم حەزنە، فەرمووی: ((نەخێر بەڵکو تۆ ناوت سەهلە))، وتی: من ناوێك کە باوکم ناوی ناوم نایگۆڕم، ئیبنولموسەییەب دەڵێ: جا بەردەوام ئەو سەختی و زبریەمان تیایە لەو ڕۆژەوە بەدواوە.**

(١) بڕوانە: ٦١٩٠.

## ١٠٩- بَابُ مَنْ سَمَّى بِأَسْمَاءِ الأَنْبِيَاءِ

وَقَالَ أَنَسٌ ﷺ : قَبَّلَ النَّبِيُّ ﷺ إِبْرَاهِيمَ. يَعْنِي: ابنهُ[1].

٦١٩٤- حَدَّثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ: قُلْتُ لاِبْنِ أَبِي أَوْفَى: رَأَيْتَ إِبْرَاهِيمَ ابْنَ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: مَاتَ صَغِيرًا، وَلَوْ قُضِيَ أَنْ يَكُونَ بَعْدَ مُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيٌّ عَاشَ ابْنُهُ، وَلَكِنْ لاَ نَبِيَّ بَعْدَهُ.

## ١٠٩- باسی کەسێک (کوڕی) بەناوی پێغەمبەرانەوە ناوبنێت

**ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئیبراهیمی ماچ کرد، واتە: ئیبراهیمی کوڕی.٦١٩٤- ئیسماعیل دەڵێ: بە ئیبنو ئەبی ئەوفام ﷺ وت: ئیبراهیمی کوڕی پێغەمەرت ﷺ بینی؟ وتی:بەمنداڵی مرد، ئەگەربڕیار بوایە لە پاش موحەممەد ﷺ پێغەمبەرێك ببوایە کوڕەکە دەژیا، بەڵام لە پاش موحەممەد ﷺ پێغەمبەر نییە.**

٦١٩٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ قَالَ: لَمَّا مَاتَ إِبْرَاهِيمُ ﷺقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لَهُ مُرْضِعًا فِي الْجَنَّةِ»[2].

**٦١٩٥- عەدیی کوڕی سابیت دەڵێ: لە بەڕائم ﷺ بیست وتی: کاتێ ئیبراهیم (ی کوڕی پێغەمبەر ﷺ) مرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئیبراهیم لە بەهەشتدا دایەنێکی هەیە (شیری دەداتێ) )).**

٦١٩٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ حُصَيْنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَمُّوا بِاسْمِي وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي، فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ». وَرَوَاهُ أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

---

(١) بڕوانە: ١٣٠٣.

(٢) بڕوانە: ١٣٨٢.

**٦١٩٦-جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەناوی منەوە ناو (ی منداڵ) بنێن، بەڵام بەکەسناوی منەوە کەس ناو مەنێن، چونکە بەڕاستی من دابەش کەرم (شت و مەك) لە نێوانتاندا دابەش دەکەم)). وە ئەنەسیش ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە.**

٦١٩٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَمُّوا بِاسْمِي وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي، وَمَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ صُورَتِي، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٢].

**٦١٩٧-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((بەناوی منەوە خۆتان ناو بنێن بەڵام کەسناوەکەم مەکەن بە کەسناو بۆ خۆتان، هەر کەسێك لە خەویدا من ببینێ ئەوە بەڕاستی منی دیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ لە شێوەی مندا خۆی پیشان (ی خەڵك) بدات، وە هەر کەسێ بەئەنقەست درۆ بەدەم منەوە بکات، ئەوە با لە دۆزەخدا شوێنی خۆی دابنێ)).**

٦١٩٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ، وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ، وَدَفَعَهُ إِلَيَّ، وَكَانَ أَكْبَرَ وَلَدِ أَبِي مُوسَى[٣]

**.٦٤٩٨-ئەبو بوردە لە ئەبو مووساوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کوڕێکمان بوو بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ناوی نا ئیبراهیم و دەنکێ خورمای جووی و**

---

(١) بروانە: ٣١١٤.
(٢) بروانە: ١١٠.
(٣) بروانە: ٥٤٦٧.

**هێنای بەمەلاشویدا، وە دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کرد و دایەوە پێم. وە ئەو (ئیبراهیمە) گەورە ترین مندالّی ئەبو مووسا بوو.**

٦١٩٩- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عِلاَقَةَ، سَمِعْتُ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ[1]. رَوَاهُ أَبُو بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦١٩٩-موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: لەو ڕۆژەدا کە ئیبراهیم[2] مرد خۆرگیرا.**

**-ئەبو بەکرەش ﷺ ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

## ١١٠- بَابُ تَسْمِيَةِ الوَلِيدِ

٦٢٠٠ - أَخْبَرَنَا أَبُو نُعَيْمٍ الْفَضْلُ بْنُ دُكَيْنٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، وَالْمُسْتَضْعَفِينَ بِمَكَّةَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ»[3].

## ١١٠- باسی (حوکمی) ناونان بەناوی ولید

**٦٢٠٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە سەری بەرز دەکردەوە لە کورنووشی ڕکاتی (کۆتایی) نوێژەدا دەیفەرموو: ((خوایە وەلیدی کوڕی وەلید و سەلەمەی کوڕی هیشام و عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە ڕزگار بکەیت، خوایە**

---

(١) بروانە: ١٠٤٣.

(٢) کوڕی پێغەمبەر ﷺ.

(٣) بروانە: ٨٠٤.

ئیمانداره لاواز و بێ دەسەڵاتەکان ڕزگار بکەیت، خوایە تۆڵە و سزای خۆت بەتوندی بدەی بەسەر موزەڕدا، خوایە گرانی و قات و قڕییان بەسەردا بێنی وەکو قات و قڕی سەردەمی یوسف ﷺ)).

## ١١١- بابُ مَنْ دَعَا صَاحِبَهُ فَنَقَصَ مِن اسْمِهِ حَرْفًا

وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ : قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: "يَا أَبَا هِرٍ".

٦٢٠١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشَ[1]، هَذَا جِبْرِيلُ يُقْرِئُكِ السَّلاَمَ». قُلْتُ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. قَالَتْ: وَهْوَ يَرَى مَا لاَ نَرَى[2].

## ١١١- باسی کەسێک هاوڕێکەی بانگ بکات پیتێکی ناوەکەی نەڵێت

ئەبو حازیم دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەی ئەبا هیر))[3] .

٦٢٠١- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیش ئەوە جیبریلە ﷺ سەلامت لێ دەکات))، منیش وتم: سەلام و بەزەیی خوای لەسەر بێ. عائیشە وتی: ئەو (پێغەمبەرە ﷺ) شتانێك دەبینێ ئێمە نایبینین.

---

(١) بە (يَا عَائِشَ) هاتووە کە پیتی شینەکە سەری هەبێت، وە بە (يَا عَائِشُ) یش هاتووە کە پیتی شینەکە بۆری هەبێت. (إرشاد الساري:٢٠٢/١٣).

(٢) بڕوانە: ٣٢١٧.

(٣) ناوی ئەبو هورەیرەی ﷺ کردە بە (يَا أَبَا هِرٍ).

٦٢٠٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ فِي الثَّقَلِ، وَأَنْجَشَةُ غُلَامُ النَّبِيِّ ﷺ يَسُوقُ بِهِنَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَنْجَشَ، رُوَيْدَكَ، سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ»[1].

**٦٢٠٢-ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئوممو سولەیم[2] لەگەڵ ئەو وشترەدا بوو کە کەلوپەلی هەلگرتبوو، ئەنجەشەی غولامی پێغەمبەریش ﷺ وشترەکانی لێ دەخوڕی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەنجەش لەسەر خۆ و هێواش لێخوڕە (وریای) شوشەکان بە)).**

## ١١٢- بَابُ الْكُنْيَةِ لِلصَّبِيِّ وَقَبْلَ أَنْ يُولَدَ لِلرَّجُلِ

٦٢٠٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقًا، وَكَانَ لِي أَخٌ يُقَالُ لَهُ: أَبُو عُمَيْرٍ -قَالَ: أَحْسِبُهُ فَطِيمٌ- وَكَانَ إِذَا جَاءَ قَالَ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟». نُغَرٌ كَانَ يَلْعَبُ بِهِ، فَرُبَّمَا حَضَرَ الصَّلَاةَ وَهُوَ فِي بَيْتِنَا، فَيَأْمُرُ بِالْبِسَاطِ الَّذِي تَحْتَهُ فَيُكْنَسُ وَيُنْضَحُ، ثُمَّ يَقُومُ وَنَقُومُ خَلْفَهُ فَيُصَلِّي بِنَا[3].

## ١١٢- باسی کەسناو بۆ کوڕێک منداڵ بێت (دروستە)، هەروەها بۆ پیاوێکیش پێش ئەوەی منداڵی ببێت

**٦٢٠٣-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس ڕەوشتی جوانتر بوو، من برایەکم هەبوو پێی دەوترا ئەبو عومەیر- دەڵێ: وابزانم لە شیر بڕابوویەوە- وە هەمیشە کە پێغەمبەر ﷺ بهاتایە (بۆ لای ئوممو سولەیم) دەیفەرموو: ((ئەی**

---

(١) بڕوانە: ٦١٤٩.

(٢) دایکی ئەنەس.

(٣) بڕوانە: ٦١٢٩.

ئەبا عومەیر نوغەیر چی دەکات؟ )) نوغەیر باڵندەیەك بوو یاری پێ دەکرد، هەندێ جار نوێژ دەبوو پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی ئێمەدا بوو، جا فەرمانی دەکرد بەو ڕاخەری لە ژێریدا بوو گسك دەدرا و ئاوی لێ دەپرژێنرا، لە پاشان بە پێوە دەوەستا و ئێمەش لە دوایەوە دەوەستاین پێشنوێژی بۆ دەکردین.

## ١١٣- بابُ التَّكَنِّي بِأَبِي تُرَابٍ وَإِنْ كَانَتْ لَهُ كُنْيَةٌ أُخْرَى

٦٢٠٤- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: إِنْ كَانَتْ أَحَبَّ أَسْمَاءِ عَلِيٍّ ﷺ إِلَيْهِ لأَبُو تُرَابٍ، وَإِنْ كَانَ لَيَفْرَحُ أَنْ يُدْعَى بِهَا، وَمَا سَمَّاهُ أَبُو تُرَابٍ إِلاَّ النَّبِيُّ ﷺ. غَاضَبَ يَوْمًا فَاطِمَةَ، فَخَرَجَ فَاضْطَجَعَ إِلَى الْجِدَارِ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَجَاءَهُ النَّبِيُّ ﷺ يَتْبَعُهُ، فَقَالَ: هُوَ ذَا مُضْطَجِعٌ فِي الْجِدَارِ فَجَاءَهُ النَّبِيُّ ﷺ وَامْتَلأَ ظَهْرُهُ تُرَابًا، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَمْسَحُ التُّرَابَ عَنْ ظَهْرِهِ يَقُولُ: «اجْلِسْ يَا أَبَا تُرَابٍ»[1]. قَالَ سُفْيَانُ يَقُولُ غَيْرُهُ: تَفْسِيرُهُ: شَاهَانْ شَاهْ[2].

## ١١٣- باسی کەسناو نان بە ئەبی توراب، با کەسناوی تریش هەبێت

٦٢٠٤- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: خۆشەویسترین ناو لە ناوەکانی عەلی ﷺ بەلای عەلیەوە ئەبو توراب بوو، لەڕاستیدا زۆر پێی خۆش بوو بەو ناوەوە بانگ بکرێت، هەر پێغەمبەریش ﷺ ناوی نا ئەبو توراب، ڕۆژێکیان عەلی فاتیمەی ﷺ تووڕە کرد، بۆیە لە ماڵ دەرچوو (ڕۆشت) لە پەنای دیوارێك لەناو مزگەوتدا ڕاکشا، پێغەمبەریش ﷺ هات بەدوایدا دەگەڕا، جا فەرمووی ئەوە تا لای ئەو دیوارەدا ڕاکشاوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای پشتی هەمووی تۆزاوی بوو بوو،

(١) بڕوانە: ٤٤١.
(٢) بڕوانە: ٦٢٠٥.

ئینجا پێغەمبەریش ﷺ دەستی کرد بەلابردن و سڕینی تۆزەکەی پشتی و دەیفەرموو: ((دانیشە ئەی ئەبو توراب)).

## ١١٤- بابُ أَبْغَضِ الأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ ﷻ

٦٢٠٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَخْنَى الأَسْمَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللَّهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاَكِ»[1].

## ١١٤- باسی بوغزێنراوترینی ناوەکان لای خوا ﷻ

٦٢٠٥-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ناشیرینترین ناوەکان لە ڕۆژی قیامەتدا لای خوا پیاوێکە خۆی ناونابێت پادشای پادشایان)).

٦٢٠٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رِوَايَةً قَالَ: «أَخْنَعُ اسْمٍ عِنْدَ اللَّهِ -وَقَالَ سُفْيَانُ غَيْرَ مَرَّةٍ: أَخْنَعُ الأَسْمَاءِ عِنْدَ اللَّهِ- رَجُلٌ تَسَمَّى بِمَلِكِ الأَمْلاَكِ». قَالَ سُفْيَانُ:يقولُ غَيْرُهُ: تَفسيرُهُ شاهان شا[2].

٦٢٠٦-ئەبو هوڕەیرە ﷺ بەگێڕانەوە (لە پێغەمبەرەوە ﷺ) فەرمووی: ((ڕیسواترین و نزمترین ناو لای خوا - سوفیان زیاد لە جارێك وتوویەتی- ڕیسواترینی ناوەکانی لای خوا- پیاوێکە خۆی ناو بنێت بە پادشای پادشایان))، سوفیان دەڵێ غەیری (ئەبی زیناد) دەڵێ: ماناکەی[3] (بە فارسی): شاهان شاهە.

---

(١) بڕوانە: ٦٢٠٦.
(٢) بڕوانە: ٦٢٠٥.
(٣) ملك الأملاك.

## ١١٥- بابُ كُنْيَةِ الْمُشْرِكِ

وَقَالَ المِسْوَرُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "إِلَّا أَنْ يُرِيدَ ابن أَبِي طَالِبٍ"(١).

٦٢٠٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ فَدَكِيَّةٌ، وَأُسَامَةُ وَرَاءَهُ، يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي حَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَسَارَا حَتَّى مَرَّا بِمَجْلِسٍ فِيهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَإِذَا فِي الْمَجْلِسِ أَخْلَاطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ وَالْيَهُودِ، وَفِي الْمُسْلِمِينَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ، فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ خَمَّرَ ابْنُ أُبَيٍّ أَنْفَهُ بِرِدَائِهِ وَقَالَ: لاَ تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا. فَسَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ وَقَفَ فَنَزَلَ فَدَعَاهُمْ إِلَى اللَّهِ وَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ: أَيُّهَا الْمَرْءُ، لاَ أَحْسَنَ مِمَّا تَقُولُ إِنْ كَانَ حَقًّا، فَلاَ تُؤْذِنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا، فَمَنْ جَاءَكَ فَاقْصُصْ عَلَيْهِ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَاغْشَنَا فِي مَجَالِسِنَا فَإِنَّا نُحِبُّ ذَلِكَ. فَاسْتَبَّ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْيَهُودُ حَتَّى كَادُوا يَتَثَاوَرُونَ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْفِضُهُمْ حَتَّى سَكَتُوا، ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دَابَّتَهُ فَسَارَ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَى سَعْدُ، أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالَ أَبُو حُبَابٍ -يُرِيدُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَي- قَالَ: كَذَا وَكَذَا». فَقَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ، اعْفُ عَنْهُ وَاصْفَحْ، فَوَالَّذِى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ لَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِالْحَقِّ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ، وَلَقَدِ اصْطَلَحَ أَهْلُ هَذِهِ البَحْرَةِ عَلَى أَنْ يُتَوِّجُوهُ وَيُعَصِّبُوهُ بِالْعِصَابَةِ، فَلَمَّا رَدَّ اللَّهُ ذَلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَ شَرِقَ بِذَلِكَ، فَذَلِكَ فَعَلَ بِهِ مَا رَأَيْتَ. فَعَفَا عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ يَعْفُونَ عَنِ الْمُشْرِكِينَ وَأَهْلِ الْكِتَابِ كَمَا أَمَرَهُمُ اللَّهُ،

(١) بڕوانه: ٥٢٣٠.

وَيَصْبِرُونَ عَلَى الأَذَى، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ ﴿١٨٦﴾ ﴾ آل عمران. الآيَةَ،

وَقَالَ: ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ﴿١٠٩﴾ ﴾ البقرة. فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَأَوَّلُ فِي الْعَفْوِ عَنْهُمْ مَا أَمَرَهُ اللَّهُ بِهِ حَتَّى أَذِنَ لَهُ فِيهِمْ، فَلَمَّا غَزَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَدْرًا، فَقَتَلَ اللَّهُ بِهَا مَنْ قَتَلَ مِنْ صَنَادِيدِ الْكُفَّارِ، وَسَادَةِ قُرَيْشٍ، فَقَفَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ مَنْصُورِينَ غَانِمِينَ مَعَهُمْ أُسَارَى مِنْ صَنَادِيدِ الْكُفَّارِ وَسَادَةِ قُرَيْشٍ، قَالَ ابْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ هَذَا أَمْرٌ قَدْ تَوَجَّهَ، فَبَايِعُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الإِسْلاَمِ فَأَسْلَمُوا[1].

## ١١٥- باسی (حوکمی) کەسناو بۆ هاوبەش دانەر

**ـمیسوەر دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((مەگەر کوڕی ئەبی تاڵیب بیەوێ))[2].**

**٦٢٠٧- عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە ئوسامەی کوڕی زەید ﵄ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر خوا ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو کە (کورتانێکی) قەیفەی فەدەکی لێ کرابوو، وە ئوسامەی کوڕی زەیدی لە پاشکۆی خۆیدا سوار کردبوو، سەردانی سەعدی کوڕی عوبادەی[3] دەکرد لە (ماڵەکانی) بەنی حاریسەی کوڕی خەزرەج، پێش ڕووداوی بەدر، (ئوسامە) دەڵێ: جا ڕۆشت تا تێپەڕی بەلای کۆڕێکی دانیشتندا کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی تیابوو، ئەوەش پێش ئەوەبوو عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مسوڵمان ببێت، جا کۆڕەکە تێکەڵ بوو لە مسوڵمانان و هاوبەشدانەرە بتپەرستەکان و جولەکەکان، وە لە ناو**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٨٧.

(٢) کچەکەم تەڵاق بدات، جا کچەکەی ئەوان مارە بکات، ئەمە بوخاری گێڕاویەتیەوە بە ژمارە: ٥٢٣٠ لە صەحیحەکەیدا.

(٣) کە نەخۆش بوو.

مسوڵمانەكاندا عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحەش هەبوو، جا كاتێ تەپ و تۆزی گوێدرێژەكە چوو بەسەر كۆڕەكەدا، عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی بە پۆشاكەكەی لوتی داپۆشی پاشان وتی: تەپ و تۆز مەكەن بەسەرماندا، پێغەمبەری خواش ﷺ سەلامی لێ كردن، پاشان وەستا و دابەزی و خەڵكەكەی بانگ كرد بۆ لای خوا (و ئایینی ئیسلام)، وە قورئانی بەسەردا خوێندن، ئەنجا عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی كابرا لەم قسانەی تۆ دەیكەیت چاكتر نییە، ئەگەر ڕاست بێت، بەڵام بەم قسانەت ئەزێتمان مەدە لە كۆڕی دانیشتنەكەماندا، بگەڕێرەوە بۆ جێگا و شوێنی خۆت، جا هەر كەسێك هات بۆ لات ئەم قسە و بەسەرهاتەی بۆ باس بكە، عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحە ﷺ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە كۆڕەكانماندا وەرە بۆ لامان، چونكە بەڕاستی ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە، ئیتر مسوڵمانەكان و بتپەرستەكان و جوولەكەكان دەستیان كرد بە جنێودان و قسە وتن بە یەكتری، هەتا خەریك بوو پەلاماری یەكتر بدەن، پێغەمبەریش ﷺ بەردەوام هێوری دەكردنەوە تا ئارام بوونەوە و بێدەنگ بوون، پاشان پێغەمبەر ﷺ سواری گوێدرێژەكەی بوو ڕۆشت تا چووە لای سەعدی كوڕی عوبادە ﷺ ، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی سەعد ئایا نەتبیستووە ئەبو حوباب چی ووتوە؟ - مەبەستی عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی بوو- واو وای ووتووە))، سەعدی كوڕی عوبادەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆم و باوكم بە قوربانت بین، لێی ببورە و چاوپۆشی لێ بكە، سا سوێند بەو زاتەی قورئانی بۆ تۆ دابەزاندوە بەڕاستی خوا ئەو ڕاستیەی هێنا كە بۆ تۆ دابەزی، سوێند بەخوا خەڵكی ئەم شارە ڕێكەوتبوون كە تاجی پادشایەتی بكەنە سەری و سەرپێچی پادشای بپێچن بەسەریەوە، جا كاتێ خوا نەیهێشت ئەوە ببێ بەهۆی ئەو پەیامە ڕاستەی خوا بەتۆیدا (ناردی بۆمان) بەوە پەست

بوو، ئەوەش ئەوەی پێکردوە کە بینیت، بۆیە پێغەمبەری خواش لێی خۆش بوو. پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ڕەوشتیان وابوو لە بتپەرستان و نامەدارەکان خۆش دەبوون بەو جۆرەی خوا فەرمانی پێکردون، وە ئارامیان دەگرت لەسەر ئازار و ناڕەحەتیان، خوای گەورە دەفەرمووێ: (وە سوێند بێت بێگومان (لە مەودوا) لەوانەی کە نامەیان پێدراوە لە پێش ئێوەدا، وە لەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا داناوە (ئازار و) قسەی ناخۆش زۆر دەبیستن) تا کۆتایی ئایەتەکە و دەفەرمووێ: (زۆر لە خاوەن نامەکان ئاواتەخوازن) تا کۆتایی ئایەتەکە. پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە لێبوردنی لەوان جێ بەجێ دەکرد و مانای دەکرد کە خوا فەرمانی پێداوە، تا خوای گەورە مۆڵەتیدا (بجەنگێت) لە دژیان، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ غەزای بەدری ئەنجامدا و خوا بەو غەزایە کۆمەڵێ لە سەرانی قوڕەیشی کوشت و لە ناوبرد، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانیشی بە سەرکەوتووی و دەستکەوتەوەگەڕانەوە وچەند دیلێکیشیان لە سەران وگەورەکانی قوڕەیش لەگەڵ خۆیان هێنایەوە. کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە بتپەرستان و هاوبەشدانەران وتیان: ئەمە کارێکە (ئایینی ئیسلام) سەرکەوتوو و چەسپا، ئیتر پەیمانیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پابەندی بە ئیسلامەوە و مسوڵمان بوون.

٦٢٠٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ نَفَعْتَ أَبَا طَالِبٍ بِشَيْءٍ؟ فَإِنَّهُ كَانَ يَحُوطُكَ وَيَغْضَبُ لَكَ. قَالَ: «نَعَمْ، هُوَ فِي ضَحْضَاحٍ مِنْ نَارٍ، لَوْلاَ أَنَا لَكَانَ فِي الدَّرَكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ»[١].

---

(١) بڕوانە: ٣٨٨٣.

٦٢٠٨- عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی نەوفەل لە عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیبەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا تۆ هیچ سوود و قازانجێکت گەیاندووە بە ئەبو تالیبی (مامت)؟ چونکە بەڕاستی ئەو (مامەت) دەیپاراستیت و لەسەرت تووڕە دەبوو (لەسەری دەکردیتەوە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو (ئەبوتالیب) ئەوەتا لە ناو ئاگرێکدا تا قولە پێیەکانی دێت، ئەگەر من نەبوومایە لەبەشی هەرە خوارەوەی دۆزەخدا بوو)).

## ١١٦- بابٌ: المَعَارِيضُ مَنْدُوحَةٌ عَنِ الكَذِبِ

وَقَالَ إِسْحَاقُ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يقول: مَاتَ ابن لأَبِي طَلْحَةَ، فَقَالَ: كَيْفَ الغُلَامُ؟ فقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: هَدَأَ نَفَسُهُ، وَأَرْجُو أَنْ يَكُونَ قَدِ اسْتَرَاحَ. وَظَنَّ أَنَّهَا صَادِقَةٌ[1].

٦٢٠٩- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَحَدَا الْحَادِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْفُقْ يَا أَنْجَشَةُ -وَيْحَكَ- بِالْقَوَارِيرِ»[2].

## ١١٦- باسێک: (لە قسەکردنی بە) ناڕاستەوخۆ بوار هەیە لە بێ نیازبوون لە درۆ

-ئیسحاق وتی: لە ئەنەسم ﷺ بیست وتی: کوڕێکی ئەبو تەڵحە مردبوو، ئەبو تەڵحە وتی: مێرد منداڵەکە چۆنە؟ ئوممو سولەیم وتی: ئارام و بێدەنگە، وە ئومێد دەکەم پشووی دابێت، وە (ئەبو تەڵحە) وای زانی هاوسەری ڕاست دەکات.

(١) بروانە: ١٣٠١.
(٢) بروانە: ٦١٤٩.

**٦٢٠٩-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکی دابوو گۆرانی بێژەکە[١] گۆرانی وت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەنجەشە هێواش و لەسەرخۆبە - کۆستت کەوێ -لەبەر شووشەکان[٢])).**

٦٢١٠- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ وَأَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي سَفَرٍ، وَكَانَ غُلاَمٌ يَحْدُو بِهِنَّ يُقَالُ لَهُ: أَنْجَشَةُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «رُوَيْدَكَ يَا أَنْجَشَةُ سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ». قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ يَعْنِي: النِّسَاءَ[٣].

**٦٢١٠-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێك دابوو مێرد منداڵێکیش گۆرانی دەوت بۆ وشترەکان[٤]، پێی دوترا: ئەنجەشە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەنجەشە لەسەر خۆبە لە لێخوڕینی وشترەکان لەبەر شووشەکان))، ئەبو قیلابە دەڵێ: (شووشەکان) مەبەستی پێی ئافرەتەکان بوو.**

٦٢١١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا حَبَّانُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ حَادٍ يُقَالُ لَهُ: أَنْجَشَةُ، وَكَانَ حَسَنَ الصَّوْتِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «رُوَيْدَكَ يَا أَنْجَشَةُ، لاَ تَكْسِرِ الْقَوَارِيرَ». قَالَ قَتَادَةُ: يَعْنِي: ضَعَفَةَ النِّسَاءِ[٥].

**٦٢١١-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوڕانیبێژێکی وشتر لێخوڕی هەبوو پێی دەوترا: ئەنجەشە، دەنگ خۆش بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((هێواش لەسەر خۆبە ئەنجەشە بۆ ئەوەی شووشەکان نەشکێن))، قەتادە دەڵێ: واتە: ئافرەتە لاوازەکان[٦].**

---

(١) کە گۆرانی دەوت بۆ وشترەکان خێرا بڕۆن.
(٢) مەبەستی پێی ئافرەتە سوارییەکان بوو.
(٣) بڕوانە: ٦١٤٩.
(٤) کە ئافرەتەکان بە سواریانەوە بوون.
(٥) بڕوانە: ٦١٤٩.
(٦) چونکە زوو ئازاریان پێ دەگات.

٦٢١٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ بِالْمَدِينَةِ فَزَعٌ، فَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرَسًا لأَبِي طَلْحَةَ فَقَالَ: «مَا رَأَيْنَا مِنْ شَيْءٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا»(١).

**٦٢١٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە مەدینەدا ترس و بێمك دروست بوو(٢)، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ سواری ئەسپێکی ئەبو تەڵحە بوو(٣) فەرمووی: ((هیچمان نەبینی وە بەڕاستی ئەم ئەسپە زۆر خێرایە و بەهەڵمەتە)).**

## ١١٧- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ لِلشَّيْءِ: لَيْسَ بِشَيْءٍ. وَهُوَ يَنْوِي لَيْسَ بِحَقٍّ

وقال ابن عباس ﷺ: قال النبي ﷺ للقبرين: "يُعذبان وما يعذبان في كبير وإنه لكبير"(٤).

٦٢١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا مَخْلَدُ بْنُ يَزِيدَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ عُرْوَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ عُرْوَةَ يَقُولُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: سَأَلَ أُنَاسٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْكُهَّانِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسُوا بِشَيْءٍ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ أَحْيَانًا بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ، فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ قَرَّ الدَّجَاجَةِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كَذْبَةٍ»(٥).

## ١١٧- باسی کەسێک بە شتێک بڵێ هیچ نییە، کە ئەو کەسە مەبەستی ئەوەیە ڕاست نییە

**وە ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (( (ئەو دوو کەسە) سزا دەدرێن بەهۆی شتێکەوە گەورە نییە، بەڵام لەڕاستیدا گەورەیە))**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٢٧.

(٢) گوایە دوژمن هێرش بێنن بۆ سەر مەدینە.

(٣) ڕۆشت بۆ دەرەوەی مەدینە بەدەم هەواڵەکەوە کە گەڕایەوە فەرمووی: هیچم نەبینی...

(٤) بڕوانە: ٢١٦.

(٥) بڕوانە: ٣٢١٠.

٦٢١٣- عوروه دەڵێ: عائیشه ﵂ دەڵێ: کەسانێك پرسیاریان له پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی فاڵچیەکان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێیان: (( (وتەکانیان) هیچ نیین))، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ له ڕاستیدا هەندێ جار ئەوان (فاڵچیەکان) باسی شتێکی (نهێنی)مان بۆ دەکەن ڕاست دەردەچێت و وادەبێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەوه وشەیەکی ڕاسته جنۆکه دەیفڕێنێ و دەیدات به گوێی دۆستەکەیدا (فاڵچیەکەدا) وەك گاره گاری مریشك، ئەوانیش زیاتر له هەزار درۆی لەگەڵ تێکەڵ دەکەن)).

## ١١٨- بابُ رَفْعِ الْبَصَرِ إِلى السَّمَاءِ وَقَوْلُهُ تَعالى: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾﴾ الغاشية

وَقَالَ أَيُّوبُ: عَنِ ابن أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂: رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ[١].

٦٢١٤- حَدَّثَنَا ابْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ثُمَّ فَتَرَ عَنِّي الْوَحْيُ، فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي إِلَى السَّمَاءِ فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ قَاعِدٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ»[٢].

(١) بڕوانه: ٤٤٥١.
(٢) بڕوانه: ٤.

## ١١٨- باسی چاو بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان[1] (دروستە)، وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (دەی بۆ ورد نابنەوە لە وشتر چۆن دروست کراوە، وە وردنابنەوە لە ئاسمان کە چۆن بەرز کراوەتەوە))

-ئەیوب: لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان.

٦٢١٤-جابیر کوڕی عەبوڵلا ﵄ دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((پاشان هاتنی نیگا بۆم پچڕا، جا لە کاتێکدا بە ڕێگادا دەڕۆشتم لە ئاسمانەوە گوێم لە دەنگێك بوو، منیش چاوم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، یەکسەر ئەو فریشتەیەم بینی کە لە (ئەشکەوتی) حیڕا هات بۆ لام، لەسەر کورسیەك دانیشتووە لە نێوان ئاسمان و زەویدا)).

٦٢١٥- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي شَرِيكٌ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ مَيْمُونَةَ وَالنَّبِيُّ ﷺ عِنْدَهَا، فَلَمَّا كَانَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ أَوْ بَعْضُهُ قَعَدَ فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ فَقَرَأَ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران[2].

٦٢١٥-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: شەوێك لە ماڵی مەیمونە[3] مامەوە، پێغەمبەریش ﷺ لە لای ئەو بوو، جا کاتێ سێ یەکی کۆتایی شەو بوو -یان هەندێکی بوو- پێغەمبەر ﷺ هەستا و دانیشت و سەرنجی ئاسمانی دەدا و ئەم ئایەتەی خوێندەوە (بەڕاستی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا، وە لە جیاوازی گۆڕانی شەو و ڕۆژدا چەندەها بەڵگەی هەیە بۆ خاوەن ژیرییەکان).

(١) بۆ سەیر کردن و سەرنجدان.

(٢) بڕوانە: ٣٨٨٣.

(٣) پوری بوو، کە خوشکی دایکی بوو.

## ١١٩- بَابُ نَكتِ الْعُودِ[1] فِي المَاءِ وَالطِّينِ

٦٢١٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي مُوسَى أَنَّهُ كَانَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَائِطٍ مِنْ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ، وَفِي يَدِ النَّبِيِّ ﷺ عُودٌ يَضْرِبُ بِهِ بَيْنَ الْمَاءِ وَالطِّينِ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَسْتَفْتِحُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». فَذَهَبْتُ فَإِذَا أَبُو بَكْرٍ، فَفَتَحْتُ لَهُ وَبَشَّرْتُهُ بِالْجَنَّةِ، ثُمَّ اسْتَفْتَحَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: «افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ». فَإِذَا عُمَرُ، فَفَتَحْتُ لَهُ وَبَشَّرْتُهُ بِالْجَنَّةِ، ثُمَّ اسْتَفْتَحَ رَجُلٌ آخَرُ -وَكَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ- فَقَالَ: «افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ، عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ أَوْ تَكُونُ». فَذَهَبْتُ فَإِذَا عُثْمَانُ، فَفَتَحْتُ لَهُ وَبَشَّرْتُهُ بِالْجَنَّةِ، فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي قَالَ. قَالَ اللَّهُ الْمُسْتَعَانُ[2].

## ١١٩- باسی پیا کێشانی چیلکەیەک بە ئاو و قوڕدا و جێگاکەی چاڵ کات

**٦٢١٦- ئەبو مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوو لە باخێك لە باغەکانی مەدینەدا، وە پێغەمبەر ﷺ چیلکەیەکی بەدەستەوە بوو دەیکێشا بە نێوان ئاو و قوڕەکەدا، ئینجا پیاوێك هات داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بۆی بکەرەوە و موژدەی بەهەشتیشی پێ بدە))، منیش ڕۆشتم دەبینم ئەبو بەکرە ﷺ دەرگاکەم بۆ کردەوە و موژدەی بەهەشتیشم پێدا، پاشان پیاوێکی تر داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد فەرمووی: ((بۆی بکەرەوە و موژدەی پێ بدە بەبەهەشت))، بینیم عومەرە ﷺ دەرگاکەم بۆ کردەوە و موژدەی بەهەشتیشم پێدا، لە پاشان پیاوێکی تر داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد، پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابوویەوە ئینجا دانیشت و فەرمووی: ((بۆی بکەرەوە و موژدەی بەهەشتیشی پێ بدە لەگەڵ**

(١) لە ڕیوایەتی ئەبی زەڕ و کوشمیهەنیی کە دوو گێڕەوەی صەحیحی بوخارین بەم جۆرەیە: (بابُ مَن نَكَتَ العُودَ فِي المَاءِ وَالطِّينِ) واتە: باسی کەسێک چیلکە بکێشێت بەئاو و قوڕدا جێگاکەی چاڵ کات.

(٢) بڕوانە: ٣٦٧٤.

بەلایەكدا كە تووشی دەبێت)) یان ((ڕوو دەدات))، جا ڕۆشتم دەبینم عوسمانە، منیش دەرگاكەم بۆ كردەوە و موژدەی بەهەشتیشم دایە، وە ئەو هەواڵەشم پێ وت كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، عوسمان وتی: خوا پشت و پەنام بێت.

## ١٢٠- بابُ الرَّجُلِ يَنْكُتُ الشَّيْءَ بِيَدِهِ فِي الأَرْضِ

٦٢١٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ وَمَنْصُورٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي جَنَازَةٍ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ الأَرْضَ بِعُودٍ، فَقَالَ: «لَيْسَ مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ فُرِغَ مِنْ مَقْعَدِهِ مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ». فَقَالُوا: أَفَلاَ نَتَّكِلُ؟ قَالَ: «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ. ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥﴾ الليل، الآيَةَ[1].

## ١٢٠- باسی كەسێك شتێك لە زەوی هەڵكۆڵێ (بە چیلكەیەك) بە دەستەوەیەتی[2]

**٦٢١٧- عەلی ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین لەگەڵ مردوویەكدا (ئامادە بووین)، جا پێغەمبەر ﷺ بەچیلكەیەك زەویەكەی هەڵدەكۆڵی و فەرمووی:((بێگومان هەر كەس لە ئێوە شوێنەكەی لە بەهەشت و شوێنەكەی لە دۆزەخدا نوسراوە))، هاوەڵانیش وتیان: دەی بۆچی پشت بەو (نووسینە) نەبەستین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەوڵبدەن و كار بكەن هەموو كەسێ ئامادەكراوە (بۆ ئەوەی بۆی دروست كراوە)، وە ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: (ئینجا ئەو كەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێ و پارێزگار بێت، تاكۆتایی ئایەتەكە.**

---

(١) بڕوانە: ١٣٦٢.

(٢) بەزۆری كەسێك وا دەكات بیر لە شتێك بكاتەوە ئامادەی كات بیڵێ.

## ١٢١- بابُ التَّكْبِيرِ وَالتَّسْبِيحِ عِنْدَ التَّعَجُّبِ

٦٢١٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَتْنِي هِنْدُ بِنْتُ الْحَارِثِ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتِ اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ! مَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الْخَزَائِنِ؟ وَمَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الْفِتَنِ؟ مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجَرِ -يُرِيدُ بِهِ أَزْوَاجَهُ- حَتَّى يُصَلِّينَ؟ رُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الآخِرَةِ»[١].

وَقَالَ ابن أَبِي ثَوْرٍ، عَنِ ابن عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: طَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ قَالَ: "لَا". قُلْتُ: اللَّهُ أَكْبَرُ.

## ١٢١- باسی (الله أكبر) و (سبحان الله) كردن له كاتی سەر سوڕمان (له شتێك)

**٦٢١٨- ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەوێك لە خەو هەستا و فەرمووی: ((پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەمشەو چەند گەنجینە و خەزێنە (دەستی مسوڵمانان) دەكەوێ و وەردەگیرێ؟ وە چەند ئاشووب و فیتنەیەك داباری؟! كێ ئافەرەتانی ئەم ماڵانە[٢] خەبەر دەكاتەوە- مەبەستی هاوسەرەكانی خۆی بوو- بۆ ئەوەی شەونوێژ بكەن، چونكە زۆر كەس لە دونیادا پۆشتەیە بەڵام لە دواڕۆژدا ڕووت و قووتە)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئیبنو ئەبی سەور لە ئیبنو عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە ئەویش لە عومەرەوە ﵁ دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرم ﷺ كرد: خێزانەكانت تەڵاق داوە؟ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئەڵڵاهو ئەكبەر.**

---

(١) بڕوانە: ١١٥.

(٢) مەبەستی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ خۆیەتی.

**٦٢١٩- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ.**

وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَتِيقٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْحُسَيْنِ، أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَزُورُهُ -وَهْوَ مُعْتَكِفٌ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الْغَوَابِرِ مِنْ رَمَضَانَ- فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً مِنَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ فَقَامَ مَعَهَا النَّبِيُّ ﷺ يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ الَّذِي عِنْدَ مَسْكَنِ أُمِّ سَلَمَةَ -زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ مَرَّ بِهِمَا رَجُلَانِ مِنَ الأَنْصَارِ فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ نَفَذَا، فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّمَا هِيَ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ». قَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ!. وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا. قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنِ ابْنِ آدَمَ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا»[1].

**٦٢١٩- عەلی کوڕی حوسەین ﷺ گێڕایەوە کە صەفییەی کچی حویەیی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: کە ئەو (صەفییە) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی بکات[2] -لە کاتێکدا لە ئیعتیکاف دابوو لە مزگەوتدا لە دەی کۆتایی ڕەمەزاندا، - جا تا ماوەیەك لە عیشا بە دواوە لە خزمەتیدا قسەی کرد، پاشان هەستا و بگەڕێتەوە (بۆ ماڵی خۆی)، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیدا گەڕایەوە تا صەفییە گەشتە دەرگای مزگەوت کە لای ماڵی ئوممو سەلەمە بوو، (لەو کاتەدا) دوو پیاوی ئەنصاری بەلایاندا تێپەڕین و سەلامیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ پێی وتن: ((پەلە مەکەن بێگومان ئەم ئافرەتە صەفییەی کچی حوەیەییە))، دوو پیاوەکە وتیان: پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتەکەی پێغەمبەریان لا گران و قورس بوو، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان شەیتان لە مرۆڤدا دەگاتە ئەو شوێنەی خوێنی دەگاتێ، وە بەڕاستی لەوە ترسام کە شتێکی خراپ بخاتە دڵتانەوە)).**

---

(١) بروانە: ٢٠٣٥.

(٢) لە شەودا سەردانی کرد، لە جێگایەکی تردا بوخاری گێڕاویەتیەوە (إرشاد الساري: ٤٤٣/٣).

## ١٢٢- بابُ النَّهْيِ عَنِ الخَذْفِ

٦٢٢٠- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ صُهْبَانَ الأَزْدِيَّ يُحَدِّثُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْخَذْفِ وَقَالَ: «إِنَّهُ لاَ يَقْتُلُ الصَّيْدَ وَلاَ يَنْكَأُ الْعَدُوَّ وَإِنَّهُ يَفْقَأُ الْعَيْنَ، وَيَكْسِرُ السِّنَّ»[١].

## ١٢٢- باسی ڕێگریکردن له پەلەپیتکه گرتن

**٦٢٢٠-عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی موزەنی ﷺ گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەلەپیتکه گرتنی قەدەغه کرد و فەرمووی: ((بێگومان نێچیر ناکوژێت و دوژمن کوڵەوار و بریندار ناکات، بەڵام (هەندێ جار) چاو کوێر دەکات و ددان دەشکێنێ)).**

## ١٢٣- بابُ الحَمْدِ لِلْعَاطِسِ

٦٢٢١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: عَطَسَ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا وَلَمْ يُشَمِّتِ الآخَرَ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: «هَذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَهَذَا لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ»[٢].

## ١٢٣- باسی سوپاسی خواکردنی کەسێ کە دەپژمێت

**٦٢٢١-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ وتی: دوو پیاو له خزمەت پێغەمبەردا ﷺ پژمین، پێغەمبەر ﷺ نزای خێری بۆ یەکێکیان کرد، بۆ ئەوەی کەیانی نەکرد، ئینجا عەرزی کرا (بۆ جیاوازیت کردن)، فەرمووی: ((ئەومیان سوپاسی خوای کرد، ئەوکەیان سوپاسی خوای نەکرد))[٣].**

---

(١) بڕوانە: ٤٨٤١.

(٢) بڕوانە: ٦٢٢٥.

(٣) سوننەتە کەسێک پژمی بڵێ: (الحمد الله) هاوڕێکەشی پێی بڵێ: (یرحمك الله) بەهاوڕێکەی بڵێ: (یهدیك الله ویُصلح بالك).

## ١٢٤- بابُ تَشْمِيتِ الْعَاطِسِ إِذَا حَمِدَ اللهَ

فِيهِ أَبُو هُرَيْرَةَ[1].

٦٢٢٢- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَشْعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ بِسَبْعٍ: وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ المَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجِنَازَةِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَرَدِّ السَّلَامِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِبْرَارِ المُقْسِمِ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ -أَوْ قَالَ: حَلْقَةِ الذَّهَبِ- وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالسُّنْدُسِ، وَالْمَيَاثِرِ[2].

## ١٢٤- باسی نزای خێرکردن بۆ پژمیو ئەگەر سوپاسی خوای کرد (دروستە)

**لەم باسەدا فەرموودەیەك هاتووە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە.**

**٦٢٢٢- بەڕا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی حەوت شتی پێ کردین و ڕێگری حەوت شتی لێ کردین: فەرمانی پێ کردین بە سەردانی کردنی نەخۆش و بەشوێن کەوتنی تەرم و وتنی** (يرحمك الله) **بەکەسێ دەپژمێ و دەڵێ:** (الحمد لله)، **بە دەمەوە چونی دەعوەتکەر، وەڵامدانەوەی سەلام، وە یارمەتی دانی ستەم لێکراو و، باوەڕکردن بە سوێند خۆر و نەخستنی سوێندەکەی.**

**وە ڕێگری لێ کردین لە ئەموستیلەی ئاڵتوون- یان فەرمووی: هەڵقەی ئاڵتوون- وە لە لەبەرکردنی ئاوریشمی ئەستوور و دیباج [3]، وە ئاوریشمی ناسك و سەر زینی ئاوریشمی.**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٨٩، ٦٢٢٤.

(٢) بڕوانە: ١٢٣٩.

(٣) دیباج جۆرێکە لە ئاوریشم.

## ١٢٥- بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الْعُطَاسِ، وَمَا يُكْرَهُ مِنَ التَّثَاؤُبِ

٦٢٢٣- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَحَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يُشَمِّتَهُ، وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِذَا قَالَ: هَا. ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ»[1].

## ١٢٥- باسی ئەوەی پژمین سوننەتە و باوێشکدان ناپەسەندە

**٦٢٢٣-ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خودا پژمینی خۆش دەوێ، وە حەزی بە باوێشك دان نییە، جا ئەگەر کەسێکتان پژمی و سوپاسی خوای کرد، ئەوە پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك گوێی لێی بوو پێی بڵێ: (یرحمك الله) واتە: خودا ڕەحمت پێ بکات، بەڵام باوێشکدان لە شەیتانەوەیە، با هەتا دەتوانی بیگێڕێتەوە، چونکە کاتێ دەڵێ: ها (کە باوێشك دەدات) شەیتان پێی پێدەکەنێ)).**

## ١٢٦- بَابٌ: إِذَا عَطَسَ كَيْفَ يُشَمَّتُ؟

٦٢٢٤- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ. وَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ -أَوْ صَاحِبُهُ-: يَرْحَمُكَ اللَّهُ. فَإِذَا قَالَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ. فَلْيَقُلْ: يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ».

---

(١) بڕوانە: ٣٢٨٩.

## ١٢٦- باسێک: ئەگەر کەسێک پژمی چۆن پێی بوترێت خودا ڕەحمت پێ بکات؟

٦٢٢٤-ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان پژمی با بڵێت سوپاس بۆ خوا[1]، وە با براکەشی - یان هاوڕێکەی - پێی بڵێت: خوا ڕەحمت پێ بکات ئەگەر پێی وت: خوا ڕەحمت پێ بکات، با ئەویش بڵێ خودا هیدایەتان بدات و حاڵ و کارتان چاك بکات)).

## ١٢٧- بابٌ: لاَ يُشَمَّتُ الْعَاطِسُ إِذَا لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ

٦٢٢٥- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: عَطَسَ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا وَلَمْ يُشَمِّتِ الآخَرَ. فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، شَمَّتَّ هَذَا وَلَمْ تُشَمِّتْنِي. قَالَ: «إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَلَمْ تَحْمَدِ اللَّهَ»[2].

## ١٢٧- باسێک: بە پژمیو ناوترێ خوا ڕەحمت پێ بکات ئەگەر سوپاسی خوای نەکرد

٦٢٢٥-ئەنەس ﷺ دەڵێ: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ پژمین، بە یەکێکیانی فەرموو (يرحمك الله) خوا ڕەحمت پێ بکات، بەوەی تریانی نەوت (يرحمك الله)، جا ئەوەیان پێی نەوت وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (نزات بۆ ئەو پیاوە کرد (کە پژمی) بەڵام نزات بۆ من نەکرد، فەرمووی: ((بێگومان ئەو پیاوە سوپاسی خوای کرد، بەڵام تۆ سوپاسی خوات نەکرد)).

---

(١) بڵێ (الحمد لله) بە عەرەبی.

(٢) بڕوانە: ٦٢٢١.

## ١٢٨- بابٌ: إِذَا تثاءب فَلْيَضَعْ يَدَهُ عَلى فِيهِ

٦٢٢٦- حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ وَحَمِدَ اللَّهَ كَانَ حَقًّا عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يَقُولَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ. وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَثَاءَبَ ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ»[1].

## ١٢٨- باسێک: ئەگەر کەسێک پژمی با دەست بخاتە سەر دەمی

**٦٢٢٦- ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان خودا پژمینی پێ خۆشە، وە حەزی بە باوێشك دان نییە، جا ئەگەر کەسێکتان پژمی و سوپاسی خوای کرد، ئەوە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك گوێی لێی بوو پێی بڵێ: (یَرْحَمُكَ اللَّهُ) واتە: خودا ڕەحمت پێ بکات، بەڵام باوێشکدان بێگومان لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر باوێشکی هات با هەتا دەتوانی بیگێڕێتەوە، چونکە کەسێکتان کاتێ باوێشك دەدات شەیتان پێی پێدەکەنێ)).**

(١) بڕوانە: ٣٢٨٩.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٧٩- كِتَابُ الِاسْتِئْذَانِ

بەناوى خواى بەخشندەى میهرەبان

# ٧٩- پەڕاوى مۆڵەت خواستن

## ١- بابُ بَدْءِ السَّلَامِ

٦٢٢٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ، طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، فَلَمَّا خَلَقَهُ قَالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ النَّفَرِ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ جُلُوسٌ، فَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ، فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ. فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَقَالُوا: السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. فَزَادُوهُ: وَرَحْمَةُ اللَّهِ. فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ، فَلَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدُ حَتَّى الآنَ»[1].

## ١- باسى سەرەتاى سەلام كردن

**٦٢٢٧- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتى: ((خوا ئادەمى ﷺ دروست كرد لەسەر شێوەى خۆى، درێژییەكەى شەست باڵ بوو، جا كە دروستى كرد خوا فەرمووى: بڕۆ سەلام بكە ئا لەو چەند فریشتەیەى دانیشتوون، ئینجا گوێ بگرە بزانە چۆن سەلامت لێ دەكەن، ئیتر ئەوە سەلام كردنى تۆ و نەوەكانتە (لە نێوان خۆتاندا)، جا ئادەمیش ﷺ (ڕۆشت) وتى:** (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ) **فریشتەكانیش وتیان:** (السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ)

(١) بروانە: ٣٣٢٦.

فریشتەكان (وَرَحْمَةُ اللَّهِ) یان بۆ زیاد كرد، ئەنجا هەر كەس دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەم دەبێ[1] ﷺ، ئیتر بەردەوام مرۆڤەكان. (لە جوانی و بەرزی و گەورەیدا) كەم دەكەن تا ئەمڕۆ)).

## ٢- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ النور.

وَقَالَ سَعِيدُ بْنُ أَبِي الحَسَنِ لِلْحَسَنِ: إِنَّ نِسَاءَ العَجَمِ يَكْشِفْنَ صُدُورَهُنَّ وَرُءُوسَهُنَّ. قَالَ: اصْرِفْ بَصَرَكَ. وقال اللهِ ﷻ: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ۚ ﴿٣٠﴾ ﴾ النور. وَقَالَ قَتَادَةُ: عَمَّا لا يَحِلُّ لَهُمْ ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴿٣١﴾ ﴾ النور. ﴿ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ ﴿١٩﴾ ﴾ غافر. مِنَ النَّظَرِ إِلَى مَا نُهِيَ عَنْهُ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: فِي النَّظَرِ إِلَى التِي لَمْ تَحِضْ مِنَ النِّسَاءِ: لَا يَصْلُحُ النَّظَرُ إِلَى شَيْءٍ مِنْهُنَّ مِمَّنْ يُشْتَهَى النَّظَرُ إِلَيْهِ وَإِنْ كَانَتْ صَغِيرَةً. وَكَرِهَ عَطَاءٌ النَّظَرَ إِلَى الجَوَارِي اللاتِي يُبَعْنَ بِمَكَّةَ، إِلَّا أَنْ يُرِيدَ أَنْ يَشْتَرِيَ.

---

(١) لە جوانی و ڕێک و پێک و باڵا بەرزیدا.

## ٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە، مەچنە هیچ ماڵێک جگە لە ماڵەکانی خۆتان هەتا پرس دەکەن (بە خاوەنەکانیان)، وە (دوای ئەوەی مۆڵەت دران) سەلام بکەن لە خاوەن ماڵەکە، ئەوە چاکترە بۆتان بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری وەرگرن، ئینجا ئەگەر کەستان نەدی تیایدا، ئەوە مەچنە ژوورەوە بۆ ئەو ماڵە هەتا مۆڵەت نەدرێن، وە ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە ئەبێ بگەڕێنەوە، ئەوە چاکتر و پاکترە بۆتان، وە خوا زانایە بە هەموو ئەو کردەوانەی دەیکەن، هیچ گوناهێکتان لە سەر نییە (گوناهبار نابن) کە بچنە ئەو ماڵانەی کەسی تیا نیشتەجێ نییە و کەل و پەلی خۆتانی تیا بێت (وەک ئوتێل)، وە خوا دەزانێ بەوەی ئاشکرای دەکەن و بەوەی دەیشارنەوە)

-سەعیدی کوڕی ئەبی لحەسەن وتی بەحەسەن: بێگومان ژنانی عەجەم سنگ و سەریان دەردەخەن، حەسەن وتی: ڕووت وەرچەرخێنە لێیان، خوا ﷻ دەفەرموێ: ( (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ بە ئافرەتانی باوەڕدار چاویان داخەن و بپارێزن (لە سەیرکردنی نامەحرەم)، وە عەورەتیان (لە داوێن پیسی) بپارێزن). وە قەتادە دەڵێ[1]: (عەورەتیان بپارێزن) لەوەی حەڵاڵ نییە بۆیان. (وە بڵێ: بە ئافرەتانی باوەڕداریش چاویان داخەن و بپارێزن (لە سەیرکردنی نامەحرەم)، وە عەورەتیان بپارێزن (لە داوێن پیسی) )

---

(١) لە مانای ﴿وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ٣٠﴾ النور.

**﴿ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ ﴿١٩﴾ ﴾ لە سەیرکردنی ئەوەی کە ڕێگری لێ کراوە.**

**-زوهری دەڵێ: دەربارەی سەیرکردنی کچێ نەکەوتبێتە حەیزەوە لە ئافرەتان، دروست نییە سەیرکردنی هیچ شوێنێکیان، لەو کچانەی کە حەز بە سەیرکردنیان دەکرێ با کچەکە بچووکیش بێت.**

**عەتا بەلایەوە ناپەسەند بوو سەیرکردنی ئەو کەنیزەکانەی لە مەککەدا دەفرۆشرێن مەگەر بیەوێ بیکڕێت.**

٦٢٢٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ، أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أَرْدَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْفَضْلَ بْنَ عَبَّاسٍ يَوْمَ النَّحْرِ خَلْفَهُ عَلَى عَجُزِ رَاحِلَتِهِ، وَكَانَ الْفَضْلُ رَجُلاً وَضِيئًا، فَوَقَفَ النَّبِيُّ ﷺ لِلنَّاسِ يُفْتِيهِمْ، وَأَقْبَلَتِ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ وَضِيئَةٌ تَسْتَفْتِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَأَعْجَبَهُ حُسْنُهَا، فَالْتَفَتَ النَّبِيُّ ﷺ والفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، فَأَخْلَفَ بِيَدِهِ فَأَخَذَ بِذَقَنِ الْفَضْلِ، فَعَدَلَ وَجْهَهُ عَنِ النَّظَرِ إِلَيْهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْتَوِيَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، فَهَلْ يَقْضِي عَنْهُ أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ قَالَ: «نَعَمْ»[1]

**.٦٢٢٨-عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ دەڵێ: لە ڕۆژی جەژنی قورباندا پێغەمبەری خوا ﷺ فەزڵی کوڕی عەبباسی لە پاشکۆی خۆیدا لە دواوەی وشترەکەیدا سوار کردبوو، فەزڵیش کەسێکی جوان بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەدیار خەڵکەکەوە وەستابوو وەڵامی پرسیارەکانی دەدانەوە، ئافرەتێکی خەسعەمی جوان هات پرسیاری دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەزڵیش دەستی کرد بە سەیرکردنی و جوانیەکەی سەرنجی ڕاکێشا، پێغەمبەریش ﷺ لای**

(١) بڕوانە: ١٥١٣.

کردەوە و فەزڵیش سەیری ئافرەتەکەی دەکرد، پێغەمبەر ﷺ دەستی برد بۆ پشتەوە و ملی فەزڵی گرت، ڕووی وەرچەرخان لە سەیرکردن بۆ ئافرەتەکە، ئینجا ئافرەتەکە وتی: بێگومان فەریزەی خوا کە حەجە بەسەر بەندەکانیەوە پێویست بووە لەسەر باوکم کە پیرێکی بەتەمەنە ناتوانێ بەسەر وڵاخەوە بوەستێت، دەی ئایا دەکرێ لە بری خۆی من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: ((بەڵێ)).

٦٢٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ أَخْبَرَنَا أَبُو عَامِرٍ حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ - رضى الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ «إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ بِالطُّرُقَاتِ». فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَنَا مِنْ مَجَالِسِنَا بُدٌّ نَتَحَدَّثُ فِيهَا. فَقَالَ «إِذَا أَبَيْتُمْ إِلاَّ الْمَجْلِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ». قَالُوا وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ «غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الأَذَى، وَرَدُّ السَّلاَمِ، وَالأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ»[1].

٦٢٢٩- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئاگاداربن لەسەر ڕێگا و بانەکاندا دامەنیشن))، هاوەڵانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چارمان نییە هەر دادەنیشنین، بێگومان هەر ئەوە جێگای دانیشتنمانە دەمەتەقێی تێدا دەکەین، فەرمووی: ((جا ئەگەر هەر دادەنیشن ئەوە مافی ڕێگا و بان بدەن))، ووتیان مافی ڕێگا چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((چاوپاراستن و ئازار نەدان (ی خەڵکی)، وەڵامدانەوەی سەلام و فەرماندان بەچاکە و قەدەغەکردنی خراپە)).

(١) بڕوانە: ٢٤٦٥.

## ٣- بابٌ: السَّلَامُ اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ اللَّهِ تَعَالَى

**وقوله**: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ﴿٨٦﴾﴾ **النساء**

٦٢٣٠- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي شَقِيقٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ قُلْنَا: السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ قَبْلَ عِبَادِهِ، السَّلَامُ عَلَى جِبْرِيلَ، السَّلَامُ عَلَى مِيكَائِيلَ، السَّلَامُ عَلَى فُلَانٍ، فَلَمَّا انْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلَامُ، فَإِذَا جَلَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَقُلِ: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ. فَإِنَّهُ إِذَا قَالَ ذَلِكَ أَصَابَ كُلَّ عَبْدٍ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. ثُمَّ يَتَخَيَّرْ بَعْدُ مِنَ الكَلَامِ مَا شَاءَ»[1].

## ٣- باسێک: (السلام) ناوێکە لە ناوەکانی خوای بەرز و بڵند، وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (هەر کاتێک سڵاوێکتان لێ کرا ئەوە بە چاکتر لەو سڵاوە سڵاو بکەن، یان وەکو خۆی بیسەننەوە)

**٦٢٣٠- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە جاران لە دوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان دەکرد و دەمان وت: سەلام لە سەر خودا بێت پێش بەندەکانی، سەلام لەسەر جیبریل بێت و سەلام لەسەر میکائیل بێت، سەلام لەسەر فلان بێت، جا کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی بوویەوە ڕووی تێکردین و فەرمووی: ((بێگومان خوا بۆ خۆی سەلام و ئاشتیە، کەواتە ئەگەر کەسێکتان لە نوێژیدا دانیشت بۆ تەحیات خوێندن با بڵێ:** (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ

(١) بڕوانە: ٨٣١.

وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ[1]**)). چونكه بەڕاستی كە ئەمەی وت هەموو بەندەیەكی چاك دەگرێتەوە لە ئاسمان لە زەویدا، (وە بڵێن):** (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ[2]**) پاشان دوای ئەمە چ وتەیەكی پێخۆشە هەڵیبژێرێ و دوعای پێ بكات)).**

## ٤- بَابُ تَسْلِيمِ الْقَلِيلِ عَلَى الْكَثِيرِ

٦٢٣١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»[3].

## ٤- باسی سەلام كردنی (خەڵكانی) كەم لە (خەڵكانێكی) زۆر

**٦٢٣١-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بچووك سەلام بكات لە گەورە، وە پیادە لە دانیشتوو، كەم لە زۆر)).**

## ٥- بَابُ تَسْلِيمِ الرَّاكِبِ عَلَى الْمَاشِي

٦٢٣٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا مَخْلَدٌ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي زِيَادٌ أَنَّهُ سَمِعَ ثَابِتًا - مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدٍ- أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»[1].

---

(١) واتە: موڵك و دەسەڵاتی تەواو ڕەحمەت و بەزیی و وشەی پاك و چاك هەر بۆ خودایە، سڵاو ڕەحمەت و بەرەكەتی خوات لەسەربێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، سڵاو لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاكەكانی خوای گەورە بێت.

(٢) واتە: شایەتی ئەدەم كە هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە (ألله)، وە شایەتی ئەدەم كە موحەممەد بەندە و نێردراوی خودایە.

(٣) بڕوانە: ٦٢٣٢، ٦٢٣٣، ٦٢٣٤.

## ٥- باسی سەلام کردنی سوار لە پیادە

**٦٢٣٢-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوارە سەلام بکات لە پیادە، پیادەش سەلام بکات لە دانیشتوو، کەمیش سەلام بکات لە زۆر)).**

## ٦- بابُ تَسْلِيمِ المَاشِي عَلَى القَاعِدِ

٦٢٣٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي زِيَادٌ، أَنَّ ثَابِتًا أَخْبَرَهُ -وَهْوَ مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدٍ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى المَاشِي وَالْمَاشِي عَلَى القَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الكَثِيرِ»[٢].

## ٦- باسی سەلام کردنی پیادە لە دانیشتوو

**٦٢٣٣-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((سوار سەلام بکات لە پیادە، پیادەش سەلام بکات لە دانیشتوو، کەمیش سەلام بکات لە زۆر)).**

## ٧- بابُ تَسْلِيمِ الصَّغِيرِ عَلَى الكَبِيرِ

٦٢٣٤ - وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَارُّ عَلَى القَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الكَثِيرِ»[٣].

---

(١) بڕوانە: ٦٢٣١.

(٢) بڕوانە: ٦٢٣١.

(٣) بڕوانە: ٦٢٣١.

## ٧- باسی سەلام کردنی بچووک لە گەورە

**٦٢٣٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بچووك سەلام بكات لە گەورە، پیادەش لە دانیشتوو، كەمیش لە زۆر)).**

## ٨- بابُ إِفْشَاءِ السَّلَامِ

٦٢٣٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَبْعٍ: بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَنَصْرِ الضَّعِيفِ، وَعَوْنِ الْمَظْلُومِ، وَإِفْشَاءِ السَّلَامِ، وَإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ، وَنَهَى عَنِ الشُّرْبِ فِي الْفِضَّةِ، وَنَهَانَا عَنْ تَخَتُّمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ رُكُوبِ الْمَيَاثِرِ، وَعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالْقَسِّيِّ، وَالإِسْتَبْرَقِ[1].

## ٨- باسی بڵاو کردنەوەی سەلام (لە ناو خەڵکدا)

**بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بەحەوت شت: بەسەردانی کردنی نەخۆش و شوێنکەوتنی تەرم و هەر کەس پژمی وتی: (الحمد لله) پێی بڵێ: (یرحمك الله)، وە سەرخستنی کەسی لاواز و بەهاناوە چوونی و یارمەتی دانی ستەم لێکراو، بڵاوکردنەوەی سەلام و نەخستنی سوێندی سوێنخۆر. وە ڕێگری کرد لە خواردنەوە لە دەفری زیودا، وە ڕێگری لێ کردین لە ئەموستیلەی ئاڵتون و لە سواربوونی سوارگەی(٢) ئاوریشم و لە پۆشینی ئاوریشم و دیباج[٣] و قەسسیی[١] و ئاوریشمی ئەستور)).**

---

(١) بروانە: ١٢٣٩.

(٢) سەرزینێکی ئاوریشمە ناوئاخنی لۆکەیان خورییە، لەسەر زینی ئەسپ و ماین دادەنرێ، بۆ جوانی و نەرم و شلی دەخرێتە سەر زینی وڵاخەکە.

(٣) جۆرێکە لە ئاوریشم.

## ٩- بابُ السَّلاَمِ لِلْمَعْرِفَةِ وَغَيْرِ المَعْرِفَةِ

٦٢٣٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَعَلَى مَنْ لَمْ تَعْرِفْ»[٢].

## ٩- باسی سەلام کردن لە ناسراو و نەناسراو (دروستە)

**٦٢٣٦- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتی: کام ئیسلامەتیە باشترە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خواردن بدەیت (بە هەژاران) و سەلام بکەیت لەو کەسەی دەیناسی و لەو کەسەش نایناسی)).**

٦٢٣٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيَصُدُّ هَذَا، وَيَصُدُّ هَذَا وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ». وَذَكَرَ سُفْيَانُ أَنَّهُ سَمِعَهُ مِنْهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ[٣].

**٦٢٣٧- ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دروست نییە بۆ هیچ مسوڵمانێك لەسێ ڕۆژ زیاتر قسە لەگەڵ براکەیدا نەکات، کە بەیەکتری دەگەن ئەوسا ئەمەیان ڕوو وەرگێڕێ و ئەویان ڕوو وەرگێڕێ، وە چاکترینیان ئەو کەسەیانە لە پێشدا سەلام بکات (لەوەی کەیان) )). وە سوفیان وتی: ئەو فەرموودەی سێ جار لە زوهری بیستووە.**

---

(١) قوماشێکی کەتانە ئاوریشمی تێکەڵە.

(٢) بڕوانە: ١٢.

(٣) بڕوانە: ٦٠٧٧.

## ١٠- بابُ آيَةِ الحِجَابِ

**٦٢٣٨-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّهُ كَانَ ابْنَ عَشْرِ سِنِينَ مَقْدَمَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ المَدِينَةَ، فَخَدَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ عَشْرًا حَيَاتَهُ، وَكُنْتُ أَعْلَمَ النَّاسِ بِشَأْنِ الحِجَابِ حِينَ أُنْزِلَ، وَقَدْ كَانَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ يَسْأَلُنِي عَنْهُ، وَكَانَ أَوَّلَ مَا نَزَلَ فِي مُبْتَنَى رَسُولِ اللَّهِ بِزَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ، أَصْبَحَ النَّبِيُّ ﷺ بِهَا عَرُوسًا فَدَعَا القَوْمَ، فَأَصَابُوا مِنَ الطَّعَامِ ثُمَّ خَرَجُوا، وَبَقِيَ مِنْهُمْ رَهْطٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَطَالُوا المُكْثَ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ فَخَرَجَ وَخَرَجْتُ مَعَهُ، كَيْ يَخْرُجُوا، فَمَشَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى جَاءَ عَتَبَةَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، ثُمَّ ظَنَّ رَسُولُ اللَّهِ أَنَّهُمْ خَرَجُوا فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى زَيْنَبَ فَإِذَا هُمْ جُلُوسٌ لَمْ يَتَفَرَّقُوا، فَرَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، حَتَّى بَلَغَ عَتَبَةَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، فَظَنَّ أَنْ قَدْ خَرَجُوا، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، فَإِذَا هُمْ قَدْ خَرَجُوا، فَأُنْزِلَ آيَةُ الحِجَابِ، فَضَرَبَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ سِتْرًا[١].

## ١٠- باسی (دابەزینی) ئایەتی حیجاب [٢]

**٦٢٣٨- ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بۆی گێڕامەوە کە ئەو کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە تەمەنی دە ساڵ بوو، (ئەنەس دەڵێ) وە من دە ساڵ خزمەتکاری پێغەمبەرم ﷺ کرد لەو ماوەیەی لە ژیاندا بوو، وە من شارەزاترین کەسم بە بابەتی حیجاب کاتێ قورئانی لەسەر دابەزێنرا، وە بێگومان ئوبەیی کوڕی کەعب دەربارەی حیجاب پرسیاری لێ دەکردم، وە یەکەم دابەزین لە بارەیەوە دابەزی کاتێ بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی جەحشی گواستبوویەوە و پێغەمبەر ﷺ پێی بوو بە زاوا، جاخەڵکی بانگ کرد و نانیان خوارد، پاشان خەڵکەکە ڕۆشتن بەڵام چەند کەسێکیان لای پێغەمبەری**

---

(١) بڕوانە: ٤٧٩١.

(٢) کە فەرمان دەکات بە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە خۆیان دەرنەخەن بۆ خەڵکی.

**خوا ﷺ مانەوە و درێژەیان بەمانەوەکەیاندا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و ڕۆشتە دەرەوە منیش لەگەڵیدا ڕۆشتمە دەرەوە تا ئەو کەسانە بڕۆن، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت منیش لەگەڵیدا ڕۆشتم هەتا چووە بەردەم ژوورەکەی عائیشە ﵂، پاشان وای زانی ئەو کەسانە ڕۆشتوون بۆیە گەڕایەوە، منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە هەتا چوویە ژوورەوە بۆ لای زەینەب، دەبینێ هەر دانیشتوون و هەڵنەساون، ئیتر پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە، هەتا گەیشتە بەردەم ژوورەکەی عائیشە ﵂، گومانی وا بوو ئەوان ڕۆشتوون ئینجا گەڕایەوە، منیش لەگەڵیدا گەڕامەوە، جا دەبینم دەرچوون و ڕۆشتوون، ئیتر (ئایەتی) حیجاب دابەزی، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پەردەی لە نێوان من و خۆیدا دادایەوە.**

٦٢٣٩- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، قَالَ أَبِي: حَدَّثَنَا أَبُو مِجْلَزٍ عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ النَّبِيُّ ﷺ زَيْنَبَ دَخَلَ الْقَوْمُ فَطَعِمُوا، ثُمَّ جَلَسُوا يَتَحَدَّثُونَ، فَأَخَذَ كَأَنَّهُ يَتَهَيَّأُ لِلْقِيَامِ فَلَمْ يَقُومُوا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَامَ، فَلَمَّا قَامَ قَامَ مَنْ قَامَ مِنَ الْقَوْمِ وَقَعَدَ بَقِيَّةُ الْقَوْمِ، وَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَاءَ لِيَدْخُلَ فَإِذَا الْقَوْمُ جُلُوسٌ، ثُمَّ إِنَّهُمْ قَامُوا فَانْطَلَقُوا، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ، فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ فَأَلْقَى الْحِجَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ ﴿٥٣﴾ ﴾ الآيَةَ، الأحزاب.

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: فِيهِ مِنَ الفقْهِ أَنَّهُ لَمْ يَسْتَأْذِنْهُمْ حِينَ قَام وَخَرَجَ، وَفِيهِ أَنَّهُ تَهَيَّأَ لِلقِيَامِ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَقُومُوا[1].

(١) بڕوانە: ٤٧٩١.

٦٢٣٩- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ زینەبی كچی جەحشی (مارە كرد و) گوێزایەوە، خەڵكەكە هاتنە ژوورەوە و نانیان خوارد، پاشان دانیشتن و قسەیان دەكرد، لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺ دەتووت خۆی ئامادە دەكات بۆ هەستان بەڵام خەڵكەكە هەڵنەستان، جا كە ئەوەی دی هەستا، ئەنجا كە پێغەمبەر ﷺ هەستا ئەوەی لە خەڵكەكە هەستا (لەگەڵی) هەستان، بەڵام خەڵكەكەی تر دانیشتن، وە پێغەمبەر ﷺ هات بێتە ژوورەوە دەبینێ ئەو كەسانە دانیشتوون، لە پاشان هەستان و ڕۆشتن، (ئەنەس دەڵێ): منیش هەواڵم دا بە پێغەمبەر ﷺ كە ئەو پیاوانە ڕۆشتن، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هات هەتا چوویە ژوورەوە، منیش ڕۆشتم بڕۆمە ژوورەوە، بەڵام پەردەكەی لە نێوان من و خۆیدا دادایەوە، بەو هۆیەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەكانی پێغەمبەر ﷺ)، تاكۆتایی ئایەتەكە.
ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) وتی: لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ كە پێغەمبەر ﷺ كاتێ هەستا و ڕۆشتە دەرەوە مۆڵەتی لە خەڵكەكە نەخواست، وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ كە پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادە كرد بۆ هەستان مەبەستی ئەوە بوو كە ئەوان هەستن.

## ١١- بابُ الِاسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ

٦٢٤٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ أَخْبَرَنَا يَعْقُوبُ حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ صَالِحٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ احْجُبْ نِسَاءَكَ. قَالَتْ فَلَمْ يَفْعَلْ، وَكَانَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ يَخْرُجْنَ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ، خَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَهْوَ فِي الْمَجْلِسِ فَقَالَ عَرَفْتُكِ يَا سَوْدَةُ. حِرْصًا عَلَى أَنْ يُنْزَلَ الْحِجَابُ. قَالَتْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ آيَةَ الْحِجَابِ[1].

---

(١) بڕوانە: ١٤٦، ١٤٧، ٤٧٩٥، ٥٢٣٧.

## ١١- باسێک: مۆڵەت خواستن (دانراوە) لەبەر چاو (نەکەوتن بەشتانێک کە دروست نییە)

**٦٢٤٠- عورووەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ هەمیشە بە پێغەمبەری خوای ﷺ دەوت: مەیەڵە خێزانەکانت دەرکەون، عائیشە دەڵێ: بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وای نەدەکرد، وە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەم شەو بۆ ئەو شەو لە ماڵ دەڕۆشتنە دەرەوە (بۆ دەست بەئاو گەیاندن) بۆ مەناصیع[1]، شەوێك سەودەی کچی زەمعە لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە (بۆ دەست بەئاو گەیاندن)، سەودە ئافرەتێکی باڵا بەرز بوو، عومەری کوڕی خەتتابیش بینی لە کاتێکدا عومەر لە ناو کۆمەڵێکدا بوو وتی: سەودە دەتناسینەوە (عومەر بۆیە وای دەکرد) پەرۆشی بوو، فەرمانی حیجاب دابەزێ، عائیشە دەڵێ: بەو هۆیەوە خوا ﷻ ئایەتی حیجاب و خۆداپۆشینی دابەزاند.**

٦٢٤١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: حَفِظْتُهُ كَمَا أَنَّكَ هَا هُنَا، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: اطَّلَعَ رَجُلٌ مِنْ جُحْرٍ فِي حُجَرِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِدْرًى يَحُكُّ بِهِ رَأْسَهُ، فَقَالَ: «لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُ لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ، إِنَّمَا جُعِلَ الِاسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ»[2].

**٦٢٤١- زوهری وتی: ئەم فەرمووودەیەم لەبەر کردوە وەك چۆن تۆ ئێستا ئالێرە دایت، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﵁ وتی: پیاوێك لە کونێکەوە سەیری ماڵی پێغەمبەری ﷺ کرد- پێغەمبەریش ﷺ بەئاسنێ وەك دانی شانە[3] سەری دەخوراند-فەرمووی: ((ئەگەر بمزانیایە تۆ سەیر دەکەیت ئەم (ئاسن)ـەم دەکرد بە چاوتدا، بێگومان بۆیە مۆڵەت وەرگرتن دانراوە لەبەر ئەوەی بینین (ی ناشەرعی ڕوونەدات) )).**

---

(١) کە چۆڵاییەکی فراوان بوو لە پاڵ مەدینەدا.

(٢) بڕوانە: ٥٩٢٤.

(٣) یان تەختەیەک وەک دانی شانە.

٦٢٤٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ بَعْضِ حُجَرِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَامَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ بِمِشْقَصٍ -أَوْ بِمَشَاقِصَ- فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَخْتِلُ الرَّجُلَ لِيَطْعُنَهُ[1].

**٦٢٤٢-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە یەکێ لە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ (لە کونێکەوە) تەماشای دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ هەستاو چوو بۆی بە نووکە تیرێکی پانەوە-یا چەند نووکە تیرێکەوە- جا دەڵێی بە پێش چاومەوەیە سەیری دەکەم، دەیویست پیاوەکە ئاگای لە خۆی نەبێت تا (تیرەکە) بکات بە چاویدا.**

## ١٢- بَابُ زِنَا الْجَوَارِحِ دُونَ الْفَرْجِ

٦٢٤٣- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمْ أَرَ شَيْئًا أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِنْ قَوْلِ أَبِي هُرَيْرَةَ. حَدَّثَنِي مَحْمُودٌ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا، أَدْرَكَ ذَلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ، وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِي، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ كُلَّهُ وَيُكَذِّبُهُ»[2].

## ١٢- باسی داوێن پیسی ئەندامەکان جگە لە داوێن

**٦٢٤٣- ئیبنو عەبباس[3] ﷺ دەڵێ: هیچ شتێکم نەدیوە بە ئەندازەی ئەم وتەیەی ئەبو هورەیرە ﷺ لە (لەمەم)[4] بچێت، کەلە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە**

---

(١) بڕوانە: ٦٨٨٩، ٦٩٠٠.

(٢) بڕوانە: ٦٦١٢.

(٣) ئەم فەرموودە بە دوو سەنەد و ڕشتە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

(٤) (اللَّمم) واتە: گوناهی بچووك.

فەرموويیەتی: ((بێگومان هەموو ئادەمیزادێك خوا بەشی خۆی داوێن پیسی لە چارەی نووسیوە، هەر دەبێ ئەوەی توش ببێت، جا داوێن پیسی چاو سەیرکردن (ی نامەحرەمە)، وە داوێن پیسی زمان قسەکردن (ی حەرامە) دەرونیش ئاواتی بۆ دەخوازێت و حەزی لێ دەكات، داوێنیش ئەوە هەموی پشت ڕاست دەكاتەوە و ئەنجامی دەدات، یان بەدرۆی دەخات و ئەنجامی نادات)).

## ١٣- بَابُ التَّسْلِيمِ وَالِاسْتِئْذَانِ ثَلاَثًا

٦٢٤٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا سَلَّمَ سَلَّمَ ثَلاَثًا، وَإِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلاَثًا[1].

## ١٣- باسی سەلام كردن و مۆڵەت خواستن سێ جارە

**٦٢٤٤- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە:كە پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ سەلامی بكردایە سێ جار سەلامی دەكرد، وە كاتێ وتەی بفەرمووایە سێ جار دەیوتەوە.**

٦٢٤٥- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ خُصَيْفَةَ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: كُنْتُ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ الأَنْصَارِ، إِذْ جَاءَ أَبُو مُوسَى كَأَنَّهُ مَذْعُورٌ، فَقَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى عُمَرَ ثَلاَثًا، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي فَرَجَعْتُ، فَقَالَ: مَا مَنَعَكَ؟ قُلْتُ: اسْتَأْذَنْتُ ثَلاَثًا، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي فَرَجَعْتُ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلاَثًا فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَلْيَرْجِعْ». فَقَالَ: وَاللَّهِ لَتُقِيمَنَّ عَلَيْهِ بِبَيِّنَةٍ، أَمِنْكُمْ أَحَدٌ سَمِعَهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ: وَاللَّهِ لاَ يَقُومُ مَعَكَ إِلاَّ أَصْغَرُ الْقَوْمِ. فَكُنْتُ أَصْغَرَ

---

(١) بروانه: ٩٤.

الْقَوْمِ، فَقُمْتُ مَعَهُ فَأَخْبَرْتُ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ ذَلِكَ. وَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: أَخْبَرَنِي ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنِي يَزِيدُ، عَنْ بُسْرٍ، سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ بِهَذَا[1].

**٦٢٤٥- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: من لە کۆڕێکدا بووم لە کۆڕ و دانیشتنەکانی ئەنصاریەکان، لەپڕ ئەبو مووسا ﷺ هات وەکو ترسێنرابێ وابوو، جا وتی سێ جار مۆڵەتم لە عومەر ﷺ خواست بۆ چوونە ژوورەوە بەڵام مۆڵەتی نەدام منیش گەڕامەوە، عومەر وتی: چی ڕێگرت بوو (بێیت بۆ لامان)؟ وتم: سێ جار مۆڵەتم خواست بەڵام مۆڵەتم پێ نەدرا بۆیە منیش گەڕامەوە، پێغەمبەری خواش فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان سێ جار مۆڵەتی خواست و مۆڵەتی پێ نەدرا ئەوا با بگەڕێتەوە))، ئینجا عومەر وتی: سوێند بەخوا یان شایەت دێنی لەسەری، ئایا کەستان ئەمەی لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە؟ ئوبەیی کوڕی کەعب وتی: سوێند بەخوا دەبێ بچووکترینی ئەم خەڵکە لەگەڵت بێت (ئەبو سەعید دەڵێ:) منیش لە هەموویان بچووکتر و منداڵتر بووم، بۆیە هەستام و لەگەڵی ڕۆیشتم بۆ عومەرم گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو فەرموودەیەی فەرمووە.**

**-ئیبنو لموبارەك دەڵێ: ئیبنو عویەینە بۆی گێڕاینەوە وتی: یەزید لە بوسرەوە بۆی گێڕامەوە وتی: لە ئەبو سەعیدم ﷺ بیست ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوە.**

## ١٤- بابٌ: إِذَا دُعِيَ الرَّجُلُ فَجَاءَ، هَلْ يَسْتَأْذِنُ؟

وقَالَ سَعِيدٌ: عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "هُوَ إِذْنُهُ".

٦٢٤٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ ذَرٍّ. وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عُمَرُ بْنُ ذَرٍّ، أَخْبَرَنَا مُجَاهِدٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ،

---

(١) بروانە: ٢٠٦٢.

فَوَجَدَ لَبَنًا فِي قَدَحٍ فَقَالَ: «أَبَا هِرٍّ، الْحَقْ أَهْلَ الصُّفَّةِ فَادْعُهُمْ إِلَيَّ». قَالَ: فَأَتَيْتُهُمْ فَدَعَوْتُهُمْ، فَأَقْبَلُوا فَاسْتَأْذَنُوا فَأُذِنَ لَهُمْ، فَدَخَلُوا[1].

## ١٤- باسێک: ئەگەر کەسێک بانگ کرا و هات، ئایا داوای مۆڵەت دەکات؟

-سەعید دەڵێ و دەگێڕێتەوە لە قەتادەوە ئەویش لە ئەبی ڕافیعەوە لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: (( (بانگکردن) مۆڵەت دانی ئەو کەسەیە)).٦٢٤٦-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ چوینە ژوورەوە بۆماڵەوەیان، جا هەندێ شیری بینی لە جامێکدا فەرمووی: ((ئەبا هیر بڕۆ بۆ لای خەڵکی صوفە و بانگیان بکە بۆ لای من))، وتی: منیش ڕۆشتم بۆ لایان و بانگم کردن، ئەوانیش هاتن و مۆڵەتیان خواست بێنە ژوورەوە، مۆڵەت دران و هاتنە ژوورەوە.

## ١٥- بَابُ التَّسْلِيمِ عَلَى الصِّبْيَانِ

٦٢٤٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْجَعْدِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَيَّارٍ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ مَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ وَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْعَلُهُ.

## ١٥- باسی سەلام کردن لەمنداڵان (دروستە)

٦٢٤٧-ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە کە خۆی تێپەڕی بەلای چەند منداڵێکدا سەلامی لێ کردن و وتی: پێغەمبەر ﷺ وای دەکرد.

---

(١) بڕوانە: ٥٣٧٥.

## ١٦- بابُ تَسْلِيمِ الرِّجَالِ عَلَى النِّسَاءِ، وَالنِّسَاءِ عَلَى الرِّجَالِ

٦٢٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: كُنَّا نَفْرَحُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ. قُلْتُ: وَلِمَ؟ قَالَ: كَانَتْ لَنَا عَجُوزٌ تُرْسِلُ إِلَى بُضَاعَةَ -قَالَ ابْنُ مَسْلَمَةَ: نَخْلٍ بِالْمَدِينَةِ- فَتَأْخُذُ مِنْ أُصُولِ السِّلْقِ فَتَطْرَحُهُ فِي قِدْرٍ، وَتُكَرْكِرُ حَبَّاتٍ مِنْ شَعِيرٍ، فَإِذَا صَلَّيْنَا الْجُمُعَةَ انْصَرَفْنَا وَنُسَلِّمُ عَلَيْهَا، فَتُقَدِّمُهُ إِلَيْنَا، فَنَفْرَحُ مِنْ أَجْلِهِ.

## ١٦- باسی (دروستە) پیاوان سەلام لە ژنان بکەن، وە ژنان سەلام لە پیاوان بکەن

**٦٢٤٨-سەهل ﷺ دەڵێ ئێمە بە (هاتنی) ڕۆژی هەینی دڵخۆش دەبووین، (ئەبو حازم دەڵێ) وتم: بەسەهل بۆ؟ وتی: پیرەژنێکمان هەبوو، کەسێکی دەنارد بۆ بوزاعە- ئیبنو مەسلەمە دەڵێ: (بوزاعە) باخێکی خورما بوو لە مەدینە- جا هەندێ لاسکە سڵقی دەهێنا دەیکردە قابلەمەیەکەوە، وە هەندێ جۆشی دەهاڕی، ئینجا کەنوێژی هەینیمان دەکرد و دەگەڕاینەوە سەلاممان لێ دەکرد ئەو خواردنەی بۆ دەهێناین، لەبەر ئەوە بە (هاتنی ڕۆژی) هەینی دڵخۆش بووین.**

٦٢٤٨م- وَمَا كُنَّا نَقِيلُ وَلاَ نَتَغَدَّى إِلاَّ بَعْدَ الْجُمُعَةِ[١].

**٦٢٤٨م- وە ئێمە نەدەخەوتین و نانمان نەدەخوارد (لە ڕۆژی هەینیدا)، پاش نوێژی هەینی نەبوایە.**

٦٢٤٩- حَدَّثَنَا ابْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ، هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ

(١) بروانە: ٩٣٨.

عَلَيْكِ السَّلاَمَ». قَالَتْ: قُلْتُ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، تَرَى مَا لاَ نَرَى. تُرِيدُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ. تَابَعَهُ شُعَيْبٌ. وَقَالَ يُونُسُ وَالنُّعْمَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: وَبَرَكَاتُهُ[1].

**٦٢٤٩- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان لە عائیشەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە ئەوە جیبریلە ﷺ سەلامت لێ دەکات))، دەڵێ منیش وتم: (وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ[2]) ئەوەی تۆ دەیبینی ئێمە نایبینین. مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو[3])).**

**-شوعەیب ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی مەعمەر دەکات.**

**-یونس و نوعمان لە زوهریەوە ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە و وتیان: (وَبَرَكَاتُهُ) (ئەم وشەیان بۆ فەرموودەکە زیاد کرد).**

## ١٧- بابٌ: إِذَا قَالَ: مَنْ ذَا؟ فَقَالَ: أَنَا

٦٢٥٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا ﷺ يَقُولُ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي دَيْنٍ كَانَ عَلَى أَبِي، فَدَقَقْتُ الْبَابَ، فَقَالَ: «مَنْ ذَا؟». فَقُلْتُ: أَنَا. فَقَالَ: «أَنَا أَنَا». كَأَنَّهُ كَرِهَهَا[4].

## ١٧- باسێک: ئەگەر (خاوەن ماڵ) بڵێ: تۆ کێی؟ ئەویش بڵێ: منم

**٦٢٥٠-جابیر ﷺ دەڵێ: ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە قەرزێک کە لەسەر باوکم بوو، ئینجا تەقەمدا لە دەرگاکە[5] فەرمووی: ((ئەوە کێیە؟))**

---

(١) بڕوانە: ٣٢١٧.

(٢) واتە: سەلام و بەزەی خوا لەسەر ئەویش بێت.

(٣) کە جیبریل ﷺ دەبینێ.

(٤) بڕوانە: ٢١٢٧.

(٥) دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ.

منیش وتم: منم، ئەویش فەرمووی: ((منم، منم))، وەك ئەوە وابوو پێی ناخۆش بێت وتی: منم[١].

## ١٨- بَابُ مَنْ رَدَّ فَقَالَ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ

وَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ[٢]. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "رَدَّ المَلاَئِكَةُ عَلَى آدَمَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ"[٣].

## ١٨- باسی کەسێک وەڵامی (سەلام کەرەکە) بداتەوە بڵێ (عَلَيْكَ السَّلاَمُ)

**- عائیشە ﵂ (لە وەڵامی جیبریلدا ﵇ وتی:** (وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)

**واتە: سەلام و ڕەحمەت و فەڕ و بەرەکەتی خوای لەسەر بێ.**

**-وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فریشتەکان وەڵامی سەلامەکەی ئادەمیان ﵇ دایەوە و وتیان:** (السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ)).

٦٢٥١- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ ، أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». فَرَجَعَ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ. فَقَالَ: «وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ، فَارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». فَقَالَ فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الَّتِي بَعْدَهَا: عَلِّمْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ بِمَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ

---

(١) واتە: ناوی خۆم نەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بوو.

(٢) بڕوانە: ٦٢٤٩.

(٣) بڕوانە: ٣٢١٧.

ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا». وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ فِي الأَخِيرِ: «حَتَّى تَسْتَوِيَ قَائِمًا»[1].

**٦٢٥١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ لە جێگایەکی مزگەوتدا دانیشتبوو، پیاوەکە نوێژی کرد و پاشان هات و سەلامی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی پێی: ((**وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ**، بگەڕێرەوە و نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە بەڕاستی نوێژت نەکردوە))، ئەویش گەڕایەوە و نوێژەکەی کردەوە، لە پاشان هاتەوە و سەلامی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((**وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ**، بگەڕێرەوە و نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە بێگومان نوێژەکەت نەکردوە))، جا لە جاری دووەمدا یان ئەوی دوای دووەم -کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فێرم بکە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((کاتێ هەستای بۆ نوێژکردن جوان دەست نوێژ بگرە، پاشان ڕوو بکەرە قیبلە و بڵێ: **الله أكبر**، پاشان ئەوەی ئاسانە بەلاتەوە و لەبەرتە لە قورئان بیخوێنە، پاشان کڕنوش ببە، (بوەستە) هەتا لە کڕنوشدا لە جوڵە دەکەویت، پاشان بەرز ببەوە تا بەتەواوی ڕاست دەبیتەوە. پاشان سوژدە ببە، (بوەستە) هەتا لە سوژدەدا لە جوڵە دەکەویت، لە پاشان بەرز بەرەوە (لە سوژدە) هەتا ڕێك دادەنیشی، پاشان (جارێکی تر) سوژدە ببە (بوەستە) هەتا لە سوژدە دا لە جوڵە دەکەویت، پاشان بەرز بەرەوە هەتا بەدانیشتنەوە لە جوڵە دەکەوی، پاشان ئەمە بکە لە هەموو (ڕکاتێکی) نوێژەکەتدا)).**

**-ئەبو ئوسامە لە کۆتاییەکەیدا گێڕاویەتیەوە فەرمووی: ((هەتا ڕێك ڕادەوەستی (بەپێوە بۆ ڕکاتی دووەم ) )).**

---

(١) بروانە: ٧٥٧.

٦٢٥٢- حَدَّثَنَا ابْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنِي سَعِيدٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا»[1].

**٦٢٥٢-سەعید لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەبو ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((پاشان بەرز بەرەوە هەتا بەدانیشتانەوە لە جوڵە دەکەویت)).**

## ١٩- بابٌ: إِذَا قَالَ: فُلَانٌ يُقْرِئُكَ السَّلَامَ

٦٢٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ قَالَ: سَمِعْتُ عَامِرًا يَقُولُ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ حَدَّثَتْهُ أَنَّ النَّبِيَّ قَالَ لَهَا: «إِنَّ جِبْرِيلَ يُقْرِئُكِ السَّلَامَ». قَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللهِ[2].

## ١٩- باسێک: ئەگەر کەسێک بڵێ فلانەکەس سەلامت لێ دەکات

**٦٢٥٣- ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: ((ئەی عائیشە جیبریل ﷺ سەلامت لێ دەکات))، عائیشە وتی: سەلام و بەزەیی خوای لەسەر بێ.**

## ٢٠- بابُ التَّسْلِيمِ فِي مَجْلِسٍ فِيهِ أَخْلَاطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ

٦٢٥٤- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا هِشَامٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَكِبَ حِمَارًا عَلَيْهِ إِكَافٌ تَحْتَهُ قَطِيفَةٌ فَدَكِيَّةٌ، وَأَرْدَفَ وَرَاءَهُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَهْوَ يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ

---

(١) بڕوانە: ٧٥٧.

(٢) بڕوانە: ٣٢١٧.

الخَزْرَجِ -وَذَلِكَ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ- حَتَّى مَرَّ فِي مَجْلِسٍ فِيهِ أَخْلاَطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ وَالْيَهُودِ، وَفِيهِمْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، وَفِي الْمَجْلِسِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ، فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ، خَمَّرَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ أَنْفَهُ بِرِدَائِهِ ثُمَّ قَالَ: لاَ تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا. فَسَلَّمَ عَلَيْهِمُ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ وَقَفَ فَنَزَلَ، فَدَعَاهُمْ إِلَى اللَّهِ وَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ: أَيُّهَا الْمَرْءُ، لاَ أَحْسَنَ مِنْ هَذَا، إِنْ كَانَ مَا تَقُولُ حَقًّا، فَلاَ تُؤْذِنَا فِي مَجَالِسِنَا، وَارْجِعْ إِلَى رَحْلِكَ، فَمَنْ جَاءَكَ مِنَّا فَاقْصُصْ عَلَيْهِ. قَالَ ابْنُ رَوَاحَةَ: اغْشَنَا فِي مَجَالِسِنَا، فَإِنَّا نُحِبُّ ذَلِكَ. فَاسْتَبَّ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْيَهُودُ حَتَّى هَمُّوا أَنْ يَتَوَاثَبُوا، فَلَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ ﷺ يُخَفِّضُهُمْ، ثُمَّ رَكِبَ دَابَّتَهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فَقَالَ: «أَيْ سَعْدُ، أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالَ أَبُو حُبَابٍ». يُرِيدُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ- "قَالَ: كَذَا وَكَذَا" قَالَ: اعْفُ عَنْهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاصْفَحْ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ أَعْطَاكَ اللَّهُ الَّذِي أَعْطَاكَ، وَلَقَدِ اصْطَلَحَ أَهْلُ هَذِهِ الْبَحْرَةِ عَلَى أَنْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُونَهُ بِالْعِصَابَةِ، فَلَمَّا رَدَّ اللَّهُ ذَلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَ شَرِقَ بِذَلِكَ، فَذَلِكَ فَعَلَ بِهِ مَا رَأَيْتَ، فَعَفَا عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ[1].

## ٢٠- باسی (حوکمی) سەلام کردن لە کۆڕێک تێکەڵاوبن مسوڵمان و هاوەبە دانەریان تیابێت

**٦٢٥٤- عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ بۆی گێرایەوە کە پێغەمبەر خوا ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو کە (کورتانێکی) قەیفەیەکی فەدەکییەی لێ کرابوو، وە ئوسامەی کوڕی زەیدی لە پاشکۆی خۆیدا لە دوای خۆیەوە سوار کردبوو، دەچوو بۆ سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە[2] لە (ماڵەکانی) بەنی حاریسەی کوڕی خەزرەج- ئەو سەردانەش پێش ڕووداوی بەدر بوو- (ئوسامە) دەڵێ: ڕۆشت تا تێپەڕی بەلای کۆڕێکی دانیشتندا کە تێکەڵاو بوو**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٨٧.

(٢) کە نەخۆش بوو.

لە مسوڵمانان و هاوبەشدانەرە بتپەرستەکان و جولەکە، وە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولیشیان تیابوو، وە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەش لە کۆڕەکەدا بوو.

جاکاتێ تەپ و تۆزی گوێدرێژەکە چوو بەسەر کۆڕەکەدا، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بە پۆشاکەکەی لووتی داپۆشی، پاشان وتی: تەپ و تۆز مەکەن بەسەرماندا، پێغەمبەریش ﷺ سەلامی کرد لێیان، پاشان وەستا و دابەزی و خەڵکەکەی بانگ کرد بۆ لای خوا (و ئایینی ئیسلام)، وە قورئانی خوێند بەسەریاندا، ئەنجا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وتی: ئەی کابرا لەم قسانە چاکتر نییە، ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت ڕاست بێ، بەڵام ئەزێتمان مەدە لە کۆڕی دانیشتنەکەماندا، بگەڕێرەوە بۆ جێگا و شوێنی خۆت، جا هەر کەسێك هات بۆ لات ئەم قسە و بەسەرهاتەی بۆ باس بکە، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ﷺ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرە بۆ ناو کۆڕەکانمان، چونکە بەڕاستی ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە، ئیتر مسوڵمانەکان و بتپەرستەکان و جوولەکەکان دەستیان کرد بە جنێودان و قسەووتن بە یەکتر هەتا خەریك بوو پەلاماری یەکتر بدەن، پێغەمبەریش ﷺ بەردەوام هێوری دەکردنەوە تا ئارام بوونەوە و بێدەنگ بوون، پاشان پێغەمبەر ﷺ سواری گوێدرێژەکەی بوو ڕۆشت تا چووە لای سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی سەعد ئایا نەتبیستووە ئەبو حوباب چی ووتوە؟ - مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو- ئاوا و ئاوای ووتووە ))، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی ببورە و چاوپۆشی لێ بکە، جا سوێند بە خوا بەڕاستی خوا ئەو خەڵاتەی پێی بەخشیت کە پێیداویت، سوێند بەخوا خەڵکی ئەم شارە ڕێك کەوتبوون کە تاجی پادشایەتی بکەنە سەری و سەرپێچی پادشای ببێچن بەسەریەوە، جا کاتێ خوا نەیهێشت ئەوە ببێ بەهۆی ئەو پەیامە ڕاستەی خوا بەتۆیدا (ناردی بۆمان) بەوە پەست بوو، ئەوەش ئەوەی پێکردوە کە بینیت، بۆیە پێغەمبەری خواش لێی خۆش بوو.

## ٢١- بابُ مَنْ لَمْ يُسَلِّمْ عَلَى مَنِ اقْتَرَفَ ذَنْبًا وَلَمْ يَرُدَّ سَلَامَهُ حَتَّى تَتَبَيَّنَ تَوْبَتُهُ، وَإِلَى مَتَى تَتَبَيَّنُ تَوْبَةُ العَاصِي؟

وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو: لَا تُسَلِّمُوا عَلَى شَرَبَةِ الخَمْرِ.

٦٢٥٥- حَدَّثَنَا ابْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ كَعْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ يُحَدِّثُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ تَبُوكَ: وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كَلَامِنَا، وَآتِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ، فَأَقُولُ فِي نَفْسِي: هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلَامِ أَمْ لَا؟ حَتَّى كَمَلَتْ خَمْسُونَ لَيْلَةً، وَآذَنَ النَّبِيُّ ﷺ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى الْفَجْرَ[1].

## ٢١- باسی کەسێک سەلام نەکات لە کەسێک تاوانێکی کردبێت، وە هەروەها وەڵامی سەلامیشی نەداتەوە تاڕوون دەبێتەوە تەوبەی کردوە، وە تا چەندێ تەوبەی گوناهبار ڕوون دەبێتەوە؟

**-عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: سەلام مەکەن لە عارەق خۆران.**

**٦٢٥٥-عەبدوڵڵای کوڕی کەعب دەڵێ: لە کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ بیست باسی ئەو کاتەی دەکرد کە دوا کەوت لە غەزای تەبووک وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکردنی لەگەڵماندا قەدەغە کرد، منیش ئەڕۆشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەلامم لێ دەکرد، لە دڵی خۆمدا دەموت: ئاخۆ لێوەکانی جوڵاند بەوەڵامدانەوەی سەلامەکەم یان نا؟ (ماینەوە) هەتا پەنجا شەوی تەواوکرد، وە پێغەمبەر ﷺ قەبوڵ کردنی تەوبەمانی لە لایەن خواوە ڕاگەیاند کاتێ نوێژی بەیانی کرد.**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٥٧.

## ٢٢- بابٌ: كَيْفَ يُرَدُّ عَلَى أَهْلِ الذِّمَّةِ السَّلَامُ؟

٦٢٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ رَهْطٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ. فَفَهِمْتُهَا فَقُلْتُ: عَلَيْكُمُ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَقَدْ قُلْتُ: وَعَلَيْكُمْ».

## ٢٢- باسێک: چۆن وەڵامی سەلامی پەیمان بەستەکانی گاوور و جولەکە دەدرێتەوە[١]؟

**٦٢٥٦- عوروە گێڕایەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: کۆمەڵێ جولەکە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: مردن بۆ تۆ بێت، عائیشەش ﵂ وتی: منیش لە وتەکەیان تێگەشتم، بۆیە وتم: مردن و نەفرین بۆ خۆتان بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عائیشە لەسەر خۆبە، بێگومان خوا لەسەر خۆیی لە هەموو کارەکاندا پێ خۆشە))، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا گوێت لێ بوو چیان ووت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((دەی بێگومان منیش وتم: لەسەر خۆتان بێت)).**

٦٢٥٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمُ الْيَهُودُ فَإِنَّمَا يَقُولُ أَحَدُهُمْ: السَّامُ عَلَيْكَ. فَقُلْ: وَعَلَيْكَ»[٢].

---

(١) سەرنج: جولەکەکان کە هاتن وتیان (السام) بەشێوەیەک وتیان کە پێغەمبەری خوا ﷺ وا تێبگات کە دەڵێن: (السلام) بەڵام هەردووکیان هەم عائیشە هەم پێغەمبەر ﷺ هەستیان پێکرد.

(٢) بڕوانە: ٦٩٢٨.

**٦٢٥٧-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر جولەکە سەلامیان لێ کردن، ئەوە بێگومان کەسێك لەوان دەڵێ: مردن بۆ تۆ، تۆش بڵێ مردن بۆ خۆتان)).**

٦٢٥٨- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَقُولُوا: وَعَلَيْكُمْ»[1].

**٦٢٥٨-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: (( ئەگەر نامەدارەکان سەلامیان لێ کردن ئەوە پێیان بڵێن لەسەر ئێوە بێت )).**

## ٢٣- بابُ مَنْ نَظَرَ فِي كِتَابِ مَنْ يُحْذَرُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ لِيَسْتَبِينَ أَمْرُهُ

٦٢٥٩- حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ بُهْلُولٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ إِدْرِيسَ قَالَ: حَدَّثَنِي حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ وَأَبَا مَرْثَدٍ الْغَنَوِيَّ وَكُلُّنَا فَارِسٌ، فَقَالَ: «انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ، فَإِنَّ بِهَا امْرَأَةً مِنَ الْمُشْرِكِينَ مَعَهَا صَحِيفَةٌ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى الْمُشْرِكِينَ». قَالَ: فَأَدْرَكْنَاهَا تَسِيرُ عَلَى جَمَلٍ لَهَا حَيْثُ قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُلْنَا: أَيْنَ الكِتَابُ الَّذِي مَعَكِ؟ قَالَتْ: مَا مَعِي كِتَابٌ. فَأَنَخْنَا بِهَا، فَابْتَغَيْنَا فِي رَحْلِهَا فَمَا وَجَدْنَا شَيْئًا، قَالَ صَاحِبَايَ: مَا نَرَى كِتَابًا. قَالَ: قُلْتُ: لَقَدْ عَلِمْتُ مَا كَذَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ لَتُخْرِجِنَّ الكِتَابَ أَوْ لأُجَرِّدَنَّكِ. قَالَ: فَلَمَّا رَأَتِ الْجِدَّ مِنِّي أَهْوَتْ بِيَدِهَا إِلَى حُجْزَتِهَا -وَهْيَ مُحْتَجِزَةٌ بِكِسَاءٍ- فَأَخْرَجَتِ الكِتَابَ. قَالَ: فَانْطَلَقْنَا بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَا حَمَلَكَ

---

(١) بروانه: ٦٩٢٦.

يَا حَاطِبُ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟». قَالَ: مَا بِي إِلاَّ أَنْ أَكُونَ مُؤْمِنًا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَا غَيَّرْتُ وَلاَ بَدَّلْتُ، أَرَدْتُ أَنْ تَكُونَ لِي عِنْدَ الْقَوْمِ يَدٌ يَدْفَعُ اللَّهُ بِهَا عَنْ أَهْلِي وَمَالِي، وَلَيْسَ مِنْ أَصْحَابِكَ هُنَاكَ إِلاَّ وَلَهُ مَنْ يَدْفَعُ اللَّهُ بِهِ عَنْ أَهْلِهِ وَمَالِهِ. قَالَ: «صَدَقَ، فَلاَ تَقُولُوا لَهُ إِلاَّ خَيْرًا». قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: إِنَّهُ قَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، فَدَعْنِي فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ. قَالَ: فَقَالَ: «يَا عُمَرُ، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ قَدِ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ، فَقَدْ وَجَبَتْ لَكُمُ الْجَنَّةُ». قَالَ: فَدَمَعَتْ عَيْنَا عُمَرَ وَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ[1].

## ٢٣- باسی کەسێ سەیری نامەی کەسێک بکات کە لە دژی مسوڵمانان بێداری دەدات تا کارەکەی ڕوون بێتەوە

**٦٢٥٩- عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ من و زوبەیری کوڕی عەوامی و ئەبو مەرسەدی نارد- هەمووومان سوار چاك بووين- فەرمووی: ((بڕۆن هەتا دەگەنە (رَوْضَةَ خَاخٍ[2])، جا بێگومان لەوێدا ئافرەتێکی بتپەرستی تیایە نامەیەکی پێیە لە حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە (نوسراوە) بۆ بتپەرستان (ی مەککە لێی سەنن))، ئێمەش (ڕۆشتین) پێی گەیشتین لەو جێگەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەسواری وشترەکەیەوە دەڕۆشت، دەڵێ: (ڕامانگرت) وتمان: کوا ئەو نامەیەی پێتە، وتی: هیچ نامەیەکم پێ نییە، ئێمەش وشترەکەیمان یەخدا و بەناو کەل و پەلەکەیدا گەڕاین بەڵام هیچمان نەدۆزییەوە، دوو هاوڕێکەم وتیان: نامەمان نەبینی، دەڵێ وتم: بێگومان دەزانم پێغەمبەری خوا ﷺ درۆ ناکات سوێند بەو زاتەی سوێندی پێ دەخورێ ئەو نامەیە دەر دێنێت یان جل و بەرگت لەبەردا ناهێڵین و دایدەکەنین، ئەنجا کە زانی بە ڕاستمە - کەوایەکی لەبەردا بوو - دەستی برد و لە کەواکەیدا دەری هێنا [3]، دەڵێ: ئێمەش**

(١) بڕوانە: ٣٠٠٧.

(٢) شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا لە نزیک مەدینەیە. بڕوانە: إرشاد الساري: ٢٦٤/١٣.

(٣) کەواکەی لە ناو قەدیدا گرێی دابوو.

نامەکەمان هێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا فەرمووی: ((ئەی حاتیب چی پاڵی پێوە نای ئەم کارە بکەیت))، ووتی:هیچ شتێك لە ناخمدا نییە کە باوەڕدار نەمابم بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئایینەکەم نەگۆڕیوە و بێ باوەڕ نەبووم، ویستوومە لای ئەو کۆمەڵە (قورەیشەکان) چاکەیەکم هەبێ بەسەریانەوە بەو هۆیەوە خوا زیان لە ماڵ وخێزانم لادات، هیچ کام لە هاوەڵانت نییە مەگەر لە مەککە خزم و عەشیرەتی هەیە، کە خوا بە هۆیانەوە ماڵ و خێزانی بپارێزێ. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ڕاست دەکات، ووتەی چاك نەبێ هیچی پێ مەڵێن))، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتی: بە ڕاستی خیانەتی لە خوا و پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران کردوە، دەی وازم لێ بێنە تا بدەم لە گەردنی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عومەر تۆ چوزانیت لەوانەیە خوا ئاگاداری بەشداربووانی بەدر بێت (چی دەکەن)، وە فەرموو‌بێتی: ئەوەی حەزتان لێیە بیکەن، چونکە بە ڕاستی بەهەشتتان بۆ مسۆگەر بووە)).

دەڵێ: جا چاوەکانی عومەر ﷺ فرمێسکیان پیا هاتە خوارەوە وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن.

## ٢٤-بابٌ: كَيْفَ يُكْتَبُ إِلَى أَهْلِ الكِتَابِ؟

٦٢٦٠-حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ -وَكَانُوا تِجَارًا بِالشَّأْمِ- فَأَتَوْهُ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. قَالَ: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُرِئَ فَإِذَا فِيهِ: «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، السَّلاَمُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الهُدَى، أَمَّا بَعْدُ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٧.

## ٢٤- باسێک: چۆن نامە بنوسرێت بۆ خاوەن کتێبەکان؟

٦٢٦٠-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بۆی گێڕایەوە کە هیرەقل لەگەڵ چەند کەسێکی تری قورەیشدا ناردی بە شوێنیدا - کە چەند بازرگانێك بوون لە شام بوون- ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ لای هیرەقل، جا باسەکەی گێڕایەوە.

وتی: لە پاشان هیرەقل داوای نامەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد و خوێنرایەوە، جا لە نامەکەدا ئەمەی تیا بوو: ((بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان لە موحەممەدەوە کە بەندە و پێغەمبەری خودایە بۆ هیرەقلی گەورە و سەرۆکی ڕۆمەکان، سەلام لەو کەسەی شوێن ڕاستی دەکەوێ ئینجا دوای ئەوە)).

## ٢٥-بابٌ: بِمَنْ يُبْدَأُ فِي الكِتَابِ

٦٢٦١ - وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي جَعْفَرُ بْنُ رَبِيعَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلاً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَخَذَ خَشَبَةً فَنَقَرَهَا، فَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينَارٍ وَصَحِيفَةً مِنْهُ إِلَى صَاحِبِهِ.

٦٢٦١م- وَقَالَ عُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «نَجَرَ خَشَبَةً، فَجَعَلَ الْمَالَ فِي جَوْفِهَا، وَكَتَبَ إِلَيْهِ صَحِيفَةً: مِنْ فُلاَنٍ إِلَى فُلاَنٍ»[1].

## ٢٥- باسێک: لە نامە نوسیندا بەناوی کێ دەست پێ بکرێت

٦٢٦١-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێکی کرد لە بەنی ئیسرائیل کە دارێکی هێنا

---

(١) بڕوانە: ١٤٩٨.

و هەڵی کۆڵی و هەزار دیناری تێ خست، نامەیەکیشی لە خۆیەوە نووسی بۆ هاوڕێکەی[1](کە قەرزەکەی پێ دابوو).

٦٢٦١م-عەمری کوڕی ئەبی سەلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ دەڵێ :پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( پیاوێك دارێکی هەڵکۆڵی و پارەکەی خستە ناویەوە و نامەیەکیشی نووسی بۆ خاوەن قەرزەکە، لە فلان کەسەوە بۆ فلان کەس))

## ٢٦-بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ»

٦٢٦٢-حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّ أَهْلَ قُرَيْظَةَ نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْدٍ، فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيْهِ فَجَاءَ، فَقَالَ: «قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ». أَوْ قَالَ: «خَيْرِكُمْ». فَقَعَدَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «هَؤُلاَءِ نَزَلُوا عَلَى حُكْمِكَ». قَالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ أَنْ تُقْتَلَ مُقَاتِلَتُهُمْ، وَتُسْبَى ذَرَارِيُّهُمْ. فَقَالَ: «لَقَدْ حَكَمْتَ بِمَا حَكَمَ بِهِ الْمَلِكُ».

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: أَفْهَمَنِي بَعْضُ أَصْحَابِي، عَنْ أَبِي الْوَلِيدِ مِنْ قَوْلِ أَبِي سَعِيدٍ: "إِلَى حُكْمِكَ"[2].

## ٢٦- باسی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ:((هەستن بەپیریگەورەکەتانەوە))

٦٢٦٢- ئەبی ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەنو قورەیزە بەبڕیاری سەعدی کوڕی موعاز ڕازی بوون،

(١) قەرزی کردبوو لێی لەکاتی خۆیدا بەلەمی دەست نەکەوت لە ڕووبارەکە بیەڕێتەوە، پارەکەی لە کاتی خۆیدا بۆ بباتەوە، بۆیە خستیە قرۆڵی دارێکەوە لەگەڵ نامەیەکدا دای بە دەم ئاوەکەوە.بڕوانە: إرشاد الساري:١٣/٢٦٦.

(٢) بڕوانە: ٣٠٤٣.

پێغەمبەری خواش ﷺ ناردی بەدوایدا، سەعدیش هات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەستن بەپیری گەورە کەتانەوە))، یان فەرمووی: ((چاکترینتانەوە))، ئینجا سەعد لای پێغەمبەردا ﷺ دانیشت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئا ئەمانە بەبڕیاری تۆ ڕازیین؟)) سەعد وتی: دەی من بڕیار دەدەم جەنگکەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵەکانیشیان بکرێن بە کۆیلە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی بەو بڕیارە بڕیارتدا کە خوا بڕیاری دابوو)).

-ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: یەکێك لە هاوڕێکانم بۆی ڕوون کردمەوە و پێی وتم کە لە ئەبی وەلیدەوە گێڕایەوە: ئەم فەرموودە لە سەرەتاوە تا (إِلَى حُكْمِكَ) وتەی ئەبو سەعیدە.

## ٢٧-بابُ المُصافَحَةِ

وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ ﷺ : عَلَّمَنِي النَّبِيُّ ﷺ التَّشَهُّدَ، وَكَفِّي بَيْنَ كَفَّيْهِ[١].

وَقَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: دَخَلْتُ المَسْجِدَ فَإِذَا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ إِلَيَّ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّأَنِي[٢].

٦٢٦٣-حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: أَكَانَتِ الْمُصَافَحَةُ فِي أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ.

## ٢٧- باسی تەوقەکردن(دروستە)

-ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەحیات خوێندنی فێر کردم دەستم لە ناو دەستیدا بوو.

---

(١) بڕوانە: ٦٢٦٥.

(٢) بڕوانە: ٤٤١٨.

**کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: چوومە مزگەوتەوە، بینم پێغەمبەری خوای ﷺ لێیە، جا تەڵحەی کوڕی عەبدوڵلا بەخێرایی هات بە پیرمەوە هەتا تەوقەی لەگەڵ کردم و پیرۆزبای لێ کردم.**

٦٢٦٣- **قەتادە دەڵێ: بە ئەنەسم ﷺ وت: ئایە تەوقەکردن لە ناو هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ هەبوو؟ وتی: بەڵێ.**

٦٢٦٤-حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي حَيْوَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو عَقِيلٍ زُهْرَةُ بْنُ مَعْبَدٍ، سَمِعَ جَدَّهُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ هِشَامٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَهْوَ آخِذٌ بِيَدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ[1].

**٦٢٦٤-زوهرەی کوڕی مەعبەد لە عەبدوڵلای کوڕی هیشامی باپیرەی بیستووە وتی :ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، دەستی عومەری کوڕی خەتتابی گرتبوو ﷺ .**

## ٢٨-بابُ الأَخْذِ بِالْيَدَيْنِ

وَصَافَحَ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ ابن المُبَارَكِ بِيَدَيْهِ.

٦٢٦٥-حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سَيْفٌ قَالَ، سَمِعْتُ مُجَاهِدًا يَقُولُ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَخْبَرَةَ أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَفِّي بَيْنَ كَفَّيْهِ- التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنِي السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ: "التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ". وَهْوَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْنَا، فَلَمَّا قُبِضَ قُلْنَا: السَّلاَمُ. يَعْنِي: عَلَى النَّبِيِّ ﷺ[2].

---

(١) بروانە: ٣٦٩٤.

(٢) بروانە: ٨٣١.

## ٢٨- باسی گرتنی(دەستی کەسێک)بە هەردوو دەست

حەممادیکوڕیزەیدی بەهەردوو دەستی تەوقەیکرد لەگەڵ عەبدوڵلایکوڕی موبارەکدا.

**٦٢٦٥- ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ :پێغەمبەری خوا- ﷺ دەستم لە ناو هەردوو دەستیا بوو -فێری تەحیاتی کردم وەك چۆن فێری سوڕەتێکی قورئانی دەکرم :**((التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)) **(بەم جۆرەمان دەوت، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە ناومان دابوو، بەڵام کە گیانی کێشرا وەفاتی کرد وتمان:** (السَّلاَمُ)[1] **واتە: لەسەر پێغەمبەر بێتﷺ.**

## ٢٩-بابُ الْمُعَانَقَةِ وَقَوْلِ الرَّجُلِ: كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟

٦٢٦٦-حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا بِشْرُ بْنُ شُعَيْبٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ كَعْبٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيًّا -يَعْنِي: ابْنَ أَبِي طَالِبٍ- خَرَجَ مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ ﷺ.

وَحَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا عَنْبَسَةُ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ خَرَجَ مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ ﷺ فِي وَجَعِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، فَقَالَ النَّاسُ: يَا أَبَا حَسَنٍ، كَيْفَ أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: أَصْبَحَ بِحَمْدِ اللَّهِ بَارِئًا. فَأَخَذَ بِيَدِهِ الْعَبَّاسُ فَقَالَ: أَلاَ تَرَاهُ؟ أَنْتَ وَاللَّهِ بَعْدَ الثَّلاَثِ عَبْدُ الْعَصَا وَاللَّهِ إِنِّي لأُرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَيُتَوَفَّى فِي وَجَعِهِ، وَإِنِّي لأَعْرِفُ فِي وُجُوهِ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ الْمَوْتَ، فَاذْهَبْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَنَسْأَلَهُ فِيمَنْ يَكُونُ الأَمْرُ فَإِنْ كَانَ فِينَا

---

(١) واتە: پێشتر لە ژیاندا بوو دەمانوت: (السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ)، دواتر دەمانوت (السَّلاَمُ).

عَلِمْنَا ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ فِي غَيْرِنَا أَمَرْنَاهُ فَأَوْصَى بِنَا. قَالَ عَلِيٌّ: وَاللَّهِ لَئِنْ سَأَلْنَاهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَيَمْنَعُنَا لاَ يُعْطِينَاهَا النَّاسُ أَبَدًا، وَإِنِّي لاَ أَسْأَلُهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَبَدًا[1].

## ٢٩- باسی(حوكمی)دەست لە ملییەكتریكردن، وەكەسێك(بەكەسێكی تر)بڵێ:چۆن ڕۆژت كردەوە؟[2]

**٦٢٦٦- زوهری[3] دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی كەعب بۆی گێڕامەوە كە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ بۆی گێڕایەوە كە عەلی - مەبەستی كوڕی ئەبو تالیبە ﷺ -لای پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە لەو نەخۆشییەی كە تێیدا وەفاتی كرد، جا خەڵكی وتیان :ئەی باوكی حەسەن پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە؟ ئەویش وتی :سوپاس بۆخوا چاك بۆتەوە . ئەنجا عەبباسی كوڕی عەبدولوتەلیب ﷺ دەستی عەلی گرت و پێی وت :ئایا )نیشانەی مردنی (تیا نابینی، وەڵڵاهی تۆ پاش سێ ڕۆژی تر كەسێكی فەرمانت بەسەردا دەدرێت، وە سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە وای بۆ دەچم پێغەمبەری خوا ﷺ لەم نەخۆشییەیدا زۆر نابات دەمرێ، بەڕاستی من دەزانم ڕووخساری بەنی عەبدولوتەلیب لە كاتی) نزیكی (مردندا چی لێ دێت، بابڕۆین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ ، وە پرسیاری لێ بكەین ئەم كار) ی خیلافەت(ـە بۆ كێ دەبێت؟ جا ئەگەر لە ئێمە دابێ ئەوە دەیزانین، خۆ ئەگەر لە خەڵكانی تردا بوو دەیزانین و داوای لێ دەكەین وەسێتمان بۆ بكات، عەلیش وتی :وەڵڵاهی ئەگەر ئێمە ئەوكار) ی خیلافەت(ـە داوا بكەین لە پێغەمبەری خوا و ﷺ ئەویش پێمان نەدات، ئەوە خەڵك هەرگیز پێمان نادەن، وە بەڕاستی من داوای ناكەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ**

---

(١) بڕوانە: ٤٤٤٧.

(٢)یان بڵێ ئێستە حاڵت چۆنە.

(٣) ئەم فەرموودەیە بە دووسەنەد گێڕدراوەتەوە لە ئیمامی بوخاریەوە، تا ئیبنو شیهابی زوهری دوو سەنەدە، لەدوای زوهری دەبێتەوە بە یەک سەنەد.

## ٣٠- بَابُ مَنْ أَجَابَ بِلَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ

٦٢٦٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ مُعَاذٍ قَالَ: أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ -ثُمَّ قَالَ مِثْلَهُ ثَلاَثًا- «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ على العِبَادِ؟ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا». ثُمَّ سَارَ سَاعَةً فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ على اللَّهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ؟ أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ».

حَدَّثَنَا هُدْبَةُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ مُعَاذٍ بِهَذَا[1].

## ٣٠- باسی کەسێک (بانگ بکرێت) وەڵام بداتەوە: بە بەردەوام فەرمان بەردارتم و خۆشنودی تۆ بەدەست دێنم

**٦٢٦٧- ئەنەس لە موعازەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە کاتێکدا من لە پاشکۆی پێغەمبەردا ﷺ بووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی موعاز))، وتم: لە خزمەتام گوێڕایەڵتم خۆش نوودی تۆ بەدەست دێنم، پاشان سێ جار ئەو وتەی دووبارە کردەوە، وە فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی خوا چییە لەسەر بەندەکانی؟ ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی))، لە پاشان ماوەیەك ڕۆشت و جا فەرمووی: ((ئەی موعاز ))، وتم: فەرمان بەردارتم و خۆش نودی تۆ بەدەست دێنم، فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی بەندەکان لەسەر خوا چییە؟ ئەگەر ئەوەیان ئەنجامدا؟ ئەوەیە کە سزایان نەدات)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ): هودبە بۆی گێڕاینەوە وتی: هەممام بۆی گێڕاینەوە وتی: قەتادە بۆی گێڕاینەوە لە ئەنەسەوە ﷺ لە موعازەوە، ئەم فەرموودەی گێڕایەوە کە ڕابوورد.**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٥٦.

٦٢٦٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ، حَدَّثَنَا -وَاللَّهِ- أَبُو ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَرَّةِ الْمَدِينَةِ عِشَاءً، اسْتَقْبَلَنَا أُحُدٌ، فَقَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، مَا أُحِبُّ أَنَّ أُحُدًا لِي ذَهَبًا يَأْتِي عَلَيَّ لَيْلَةٌ أَوْ ثَلاَثٌ عِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ إِلاَّ أَرْصِدُهُ لِدَيْنٍ، إِلاَّ أَنْ أَقُولَ بِهِ فِي عِبَادِ اللَّهِ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا». وَأَرَانَا بِيَدِهِ. ثُمَّ قَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «الأَكْثَرُونَ هُمُ الأَقَلُّونَ إِلاَّ مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا». ثُمَّ قَالَ لِي: «مَكَانَكَ، لاَ تَبْرَحْ يَا أَبَا ذَرٍّ حَتَّى أَرْجِعَ». فَانْطَلَقَ حَتَّى غَابَ عَنِّي، فَسَمِعْتُ صَوْتًا فَخَشِيتُ أَنْ يَكُونَ عُرِضَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَرَدْتُ أَنْ أَذْهَبَ، ثُمَّ ذَكَرْتُ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَبْرَحْ». فَمَكُثْتُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، سَمِعْتُ صَوْتًا خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ عُرِضَ لَكَ، ثُمَّ ذَكَرْتُ قَوْلَكَ فَقُمْتُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ذَاكَ جِبْرِيلُ أَتَانِي، فَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟!. قَالَ: «وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ». قُلْتُ لِزَيْدٍ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّهُ أَبُو الدَّرْدَاءِ. فَقَالَ: أَشْهَدُ لَحَدَّثَنِيهِ أَبُو ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ.

قَالَ الأَعْمَشُ: وَحَدَّثَنِي أَبُو صَالِحٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ نَحْوَهُ.
وَقَالَ أَبُو شِهَابٍ، عَنِ الأَعْمَشِ: «يَمْكُثُ عِنْدِي فَوْقَ ثَلاَثٍ»[1].

**٦٢٦٨-زەیدی کوڕی وەهب وتی:- وللّاهی- ئەبو زەڕ ﷺ له ڕەبزە بۆی گێڕاینەوە وتی: من له خزمەت پێغەمبەردا ﷺ له عیشادا له بەردەڵانە ڕەشەکەی مەدینە پێکەوە بەرێگادا دەڕۆیشتین ، کێوی ئوحود ڕووبەڕوومان بوو، فەرمووی: ((ئەی ئەبو زەڕ پێم خۆش نییە کێوی ئوحود هی من بێت هەموو ئاڵتون بێت، شەوێ یان سێ شەو تێپەڕێ بەسەرمدا یەك دینارم لا مابێت، مەگەر دینارێك داینێم بۆ قەرزێك (کە لەسەرم بێ)، مەگەر ئەوەی کە ئاوەها و ئاوەها و ئاوەها بیبەخشم بە بەندەکانی خودا))، جا (ئەبو زەڕ) بەدەستی ئەوەی نیشانی داین،**

(١) بڕوانە: ١٢٣٧.

پاشان فەرمووی: ((ئەی ئەبو زەڕ)، وتم: هەمیشە گوێڕایەڵتم و خۆشنودی تۆم بەدەست دێنم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((ئەوانەی زۆرترینیان هەیە کەمترین (پاداشتیان) هەیە مەگە کەسێك ئاوەها و ئاوەها سامانەکەی ببەخشێت))، پاشان فەرمووی پێم: ((ئەبو زەڕ لە شوێنی خۆت ڕاوەستە و بەجێی مەیەڵە هەتا دەگەڕێمەوە))، ئینجا ڕۆشت هەتا لەمن ون بوو، جا گوێم لە دەنگێك بوو، ترسام کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی بەسەر هاتبێ، بۆیە ویستم بڕۆم (بۆ لای)، پاشان فەرمایشتەکەی پێغەمبەرم ﷺ بیرکەوتەوە کە فەرمووی: (شوێنی خۆت بەجێ مەهێڵە)، بۆیە مامەوە (کە هاتەوە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا گوێم لە دەنگێک بوو ترسام شتێکت لێ هاتبێ، لە پاشان فەرموودەکەی خۆتم بیرکەوتەوە، (مەجولێ لە شوێنی خۆت) بۆیە لەشوێنی خۆم وەستام، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەوە جیبریل ﷺ بوو هات بۆ لام و هەواڵی پێدام کە هەر کەس لەئوممەتەکەم بمرێت و هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی خوا دەڕواتە بەهەشتەوە))، عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر زینا و دزیشی بکات؟ فەرمووی ((ئەگەر زینا و دزیش بکات))، (ئەعمەش دەڵێ) وتم: بەزەید پێم گەیشتووە کەگێڕەرەوەی فەرموودەکە ئەبو دەردایە، (زەید) وتی: شایەتی دەدەم ئەبو زەڕ لە ڕەبزە ئەم فەرموودەی بۆ گێڕامەوە.

-ئەعمەش دەڵێ: ئەبو صالح بۆی گێڕامەوە لە ئەبو دەرداوە ﷺ وێنەی فەرموودەکەی پێشوو.

-ئەبو شیهاب گێڕایەوە لە ئەعمەشەوە بەم شێوە ((زیاد لە سێ شەو لام بمێنێتەوە)).

## ٣١- بابٌ: لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ

٦٢٦٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ»[1].

## ٣١- باسێک: کەسێک کەسێکی تر لەو جێگای دانیشتووە هەڵنەستێنێت

**٦٢٦٩-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پیاو پیاوێکی تر لە جێی دانیشتنەکەی هەڵنەستێنێ پاشان لە جێگاکەی دانیشێت)).**

## ٣٢- بابٌ: ﴿إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ انْشُزُوا فَانْشُزُوا (١١)﴾ الآيَةَ. المجادلة.

٦٢٧٠- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُقَامَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ وَيَجْلِسَ فِيهِ آخَرُ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَكْرَهُ أَنْ يَقُومَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يُجْلِسَ مَكَانَهُ[2].

## ٣٢- باسێک: ( کاتێ پێتان وترا، لە کۆڕ و دانیشگاکاندا جێگە بکەنەوە[3] ئێوەش فراوانی بکەن، خواش گوشادی بە ئێوە دەدات، وە کاتێ پێتان وترا هەستن ئێوەش هەستن )، تاکۆتایی ئایەتەکە

**٦٢٧٠-نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە قەدەغەی کرد کە پیاو لە جێ دانیشتنەکەی هەڵسێنرێت و کەسێکی کە تیایدا**

---

(١) بڕوانە: ٩١١.

(٢) بڕوانە: ٩١١.

(٣) فراوانی بکەن.

دانیشێت، بەڵکو جێگە بکەنەوە و فراوانی بکەن، وە ئیبنو عومەر ﭬ لای ناپەسەندبوو کە پیاو لە جێ دانیشتنەکەی هەستێ لە پاشان کەسێکی کە لە جێگاکەی دانیشێنرێت.

## ٣٣- بَابُ مَنْ قَامَ مِنْ مَجْلِسِهِ أَوْ بَيْتِهِ وَلَمْ يَسْتَأْذِنْ أَصْحَابَهُ، أَوْ تَهَيَّأَ لِلْقِيَامِ لِيَقُومَ النَّاسُ

٦٢٧١- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ: سَمِعْتُ أَبِي يَذْكُرُ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﭬ قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَيْنَبَ ابْنَةَ جَحْشٍ دَعَا النَّاسَ، طَعِمُوا ثُمَّ جَلَسُوا يَتَحَدَّثُونَ. قَالَ: فَأَخَذَ كَأَنَّهُ يَتَهَيَّأُ لِلْقِيَامِ فَلَمْ يَقُومُوا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَامَ، فَلَمَّا قَامَ قَامَ مَنْ قَامَ مَعَهُ مِنَ النَّاسِ وَبَقِيَ ثَلاَثَةٌ، وَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَاءَ لِيَدْخُلَ فَإِذَا الْقَوْمُ جُلُوسٌ، ثُمَّ إِنَّهُمْ قَامُوا فَانْطَلَقُوا. قَالَ: فَجِئْتُ فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدِ انْطَلَقُوا، فَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ، فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ فَأَرْخَى الْحِجَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ ﴿٥٣﴾ ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب[1].

## ٣٣- باسی کەسێک لە جێگاکەی یان ماڵەکەی خۆی هەستێ و مۆڵەت لە هاوڕێکانی نەخوازێ، یان خۆی ئامادە بکات بۆ هەستان بۆ ئەوەی خەڵکەکە هەستن

٦٢٧١- ئەنەسی کوڕی مالیک ﭬ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ زینەبی کچی جەحشی مارە کرد و گوێزایەوە، خەڵکی بانگ کرد (بۆشاییەکەی) و نانیان

(١) بڕوانە: ٤٧٩١.

**خوارد، پاشان دانیشتن و قسەیان دەکرد، ئەنەس دەڵێ: لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ دەتووت خۆی ئامادە دەکات بۆ هەستان بەڵام خەڵکەکە هەڵنەسان، جاکە ئەوەی دی هەستا، ئەنجا کە پێغەمبەر ﷺ هەستا ئەوەی هەستا (لەگەڵی) هەستا، بەڵام سێ کەس مانەوە، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هات بێتە ژوورەوە دەبینێ ئەو کەسانە دانیشتوون، لە پاشان هەستان و ڕۆشتن، (ئەنەس دەڵێ): منیش ڕۆشتم هەواڵمدا بە پێغەمبەر ﷺ کە ئەو پیاوانە ڕۆشتن، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هات هەتا چووە ژوورەوە، منیش ڕۆشتم بچمە ژوورەوە، بەڵام پەردەکەی لە نێوان من و خۆیدا دادایەوە، بەو هۆیەوە خوای بەرز و بڵند ئەم ئایەتەی دابەزاند: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێت)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوا: (بەراستی ئەو (ئازاردانەی پێغەمبەر ﷺ) تان بەلای خواوە (گوناهێکی) زۆر گەورەیە)).**

## ٣٤- بابُ الاِحْتِبَاءِ بِالْيَدِ وَهُوَ الْقُرْفُصَاءُ

٦٢٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي غَالِبٍ، أَخْبَرَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ الْحِزَامِيُّ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ مُحْتَبِيًا بِيَدِهِ هَكَذَا.

## ٣٤- باسی هەڵتروشکان کە دانیشتنە بە چیچکانەو دەست دانەبەر ئەژنۆ [١]

**٦٢٧٢-ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لە حەوشەی کەعبەدا بەچیچکانەوە دانیشتبوو دەستی دابوویە بەر ئەژنۆی ئاوەها.**

(١) جۆرە دانیشتنێکە سمتی دەخاتە زەوی و ڕانی دەنوسێنێ بەورگیەوە و دەستەکان دەداتە بەر ئەژنۆکانی، شێخ محمدی خاڵ دەڵێ: هەڵتروشکان: چیچکەکردن و خۆکزۆلە کردن. فەرهەنگی خاڵ: ل ٥١٣.

## ٣٥- بابُ مَنِ اتَّكَأَ بَيْنَ يَدَيْ أَصْحَابِهِ

وقَالَ خَبَّابٌ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهْوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً قُلْتُ: أَلَا تَدْعُو اللَّهَ؟ فَقَعَدَ[١].

٦٢٧٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْمُفَضَّلِ، حَدَّثَنَا الْجُرَيْرِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟». قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ»[٢].

## ٣٥- باسی کەسێک لە بەردەمی هاوەڵانیدا شانی دادابێت

**-خەبباب ﷺ دەڵێ: ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەسەر عاباکەی شانی دادابوو، عەرزم کرد: ئایا لە خوا ناپاڕێیتەوە (بۆمان)؟ ئینجا هەستا و دانیشت.**

**٦٢٧٣- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایا هەواڵتان پێ بدەم گوناهە هەرە گەورەکان چین؟)) هاوەڵانیش وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان بدەرێ، فەرمووی: ((هاوبەش دانانە بۆ خوا و سەرپێچی کردنی دایك و باوك))[٣].**

٦٢٧٤- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا بِشْرٌ مِثْلَهُ: وَكَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ فَقَالَ: «أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ». فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ[٤].

**٦٢٧٤- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) موسەددەد بۆی گێڕاینەوە وتی: بیشر وێنەی فەرموودەکەی پێشووی بۆ گێڕاینەوە و (ئەمەشی زیاد کرد) و پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابوویەوە جا دانیشت و فەرمووی: ((ئاگادار بن وە شایەتیدانی درۆ))، ئیتر ئەوەندە دووبارەی دەکردەوە هەتا وتمان خۆزگە بێدەنگ بوایە.**

---

(١) بڕوانە: ٣٦١٢.

(٢) بڕوانە: ٢٦٥٤.

(٣) سەرنج: لە ڕیوایەتەکانی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شانی دادا بوو پاشان دانیشت، ئینجا فەرمووی: ((سەرپێچی کردنی دایک و باوک))، هەر بۆیە ئیمامی بوخاری لەم عینوانەدا هێناویەتی.

(٤) بڕوانە: ٢٦٥٤.

## ٣٦- بابُ مَنْ أَسْرَعَ فِي مِشْيِهِ لِحَاجَةٍ أَوْ قَصْدٍ

٦٢٧٥- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنَّ عُقْبَةَ بْنَ الْحَارِثِ حَدَّثَهُ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الْعَصْرَ، فَأَسْرَعَ ثُمَّ دَخَلَ الْبَيْتَ[1].

## ٣٦- باسی کەسێ پەلە بکات لە ڕۆشتنندا لەبەر پێویستیەک یان مەبەستێک

**٦٢٧٥-ئیبنو ئەبی مولەیکە دەگێڕێتەوە کە عوقبەی کوڕی حاریس ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەسری کرد، بە پەلە ڕۆشت، پاشان چووە ماڵەوە.**

## ٣٧- بابُ السَّرِيرِ

٦٢٧٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي الضُّحَى، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي وَسْطَ السَّرِيرِ وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، تَكُونُ لِيَ الْحَاجَةُ فَأَكْرَهُ أَنْ أَقُومَ فَأَسْتَقْبِلَهُ، فَأَنْسَلُّ انْسِلاَلاً[2].

## ٣٧- باسی (حوکمی بوونی) نوێن[3]

**٦٢٧٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوەڕاستی نوێنی خەوتنەکەدا نوێژی دەکرد، منیش لە نێوان ئەو و قیبلەدا ڕاکشابووم، پێویستییەکم دەبوو پێم ناخۆش هەستم ڕووی تێبکەم، بۆیە بە هێواشی خۆم لە ژێر لێفەکەوە دەردەهێنا.**

---

(١) بڕوانە: ٨٥١.

(٢) بڕوانە: ٣٨٢.

(٣) نوێنی خەوتن کە بریتییە لە دۆشەک و بەتانی یان لێفە، پێشی دەوترێت پێخەف.

## ٣٨- بَابُ مَنْ أُلْقِيَ لَهُ الوِسَادَةُ

٦٢٧٧- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ. وَحَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ خَالِدٍ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الْمَلِيحِ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِيكَ زَيْدٍ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، فَحَدَّثَنَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ذُكِرَ لَهُ صَوْمِي، فَدَخَلَ عَلَيَّ، فَأَلْقَيْتُ لَهُ وِسَادَةً مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، فَجَلَسَ عَلَى الأَرْضِ، وَصَارَتِ الْوِسَادَةُ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَقَالَ لِي: «أَمَا يَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ؟». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «خَمْسًا». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «سَبْعًا». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «تِسْعًا». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «إِحْدَى عَشْرَةَ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «لاَ صَوْمَ فَوْقَ صَوْمِ دَاوُدَ، شَطْرَ الدَّهْرِ، صِيَامُ يَوْمٍ وَإِفْطَارُ يَوْمٍ»[1].

## ٣٨- باسی کەسێک پشتییەکی بۆ هەڵ بدرێت

**٦٢٧٧- ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەبو لەملیح وتی: لەگەڵ باوکتدا کە زەیدە ڕۆشتینە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ بۆی گێڕاینەوە وتی: کە ڕۆژوو گرتنی من باسکرابوو بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام منیش پشتیەکم بۆ دانا کە لە پێستە بوو پەلی دار خورمای لە ناودا بوو، وە پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەوی دانیشت و پشتیەکە کەوتە نێوان من و ئەوەوە، ئەنجا فەرمووی پێم: ((بەس نییە بۆت لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ[2]؟))، عەبدوڵڵا دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (بەسم نییە) فەرمووی: ((پێنج ڕۆژ))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (بەسم نییە)، فەرمووی: ((حەوت ڕۆژ)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (بەسم نییە)، فەرمووی: ((نۆ ڕۆژ)) وتم: ئەی پێغەمبەری**

(١) بڕوانە: ١١٣١.
(٢) بەڕۆژوو بیت.

**خوا ﷺ (بەسم نییە)، فەرمووی: ((یازدە ڕۆژ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (بەسم نییە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ڕۆژوو نییە لەسەرووی ڕۆژووی داوودەوە ﷺ نیوەی ساڵەکەیە، ڕۆژێك بەڕۆژوو بوون و ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبوون)).**

٦٢٧٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ أَنَّهُ قَدِمَ الشَّأْمَ.

وَحَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: ذَهَبَ عَلْقَمَةُ إِلَى الشَّأْمِ، فَأَتَى الْمَسْجِدَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي جَلِيسًا. فَقَعَدَ إِلَى أَبِي الدَّرْدَاءِ، فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ قَالَ: مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ. قَالَ: أَلَيْسَ فِيكُمْ صَاحِبُ السِّرِّ الَّذِي كَانَ لاَ يَعْلَمُهُ غَيْرُهُ؟ -يَعْنِي: حُذَيْفَةَ- أَلَيْسَ فِيكُمْ -أَوْ كَانَ فِيكُمْ- الَّذِي أَجَارَهُ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ ﷺ مِنَ الشَّيْطَانِ؟ -يَعْنِي: عَمَّارًا- أَوَلَيْسَ فِيكُمْ صَاحِبُ السِّوَاكِ وَالْوِسَادِ؟ -يَعْنِي ابْنَ مَسْعُودٍ- كَيْفَ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَقْرَأُ: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١﴾ الليل. قَالَ: ﴿وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى﴾ الليل. فَقَالَ: مَا زَالَ هَؤُلاَءِ حَتَّى كَادُوا يُشَكِّكُونِي، وَقَدْ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

**٦٢٧٨- ئیبراهیم دەڵێ: عەلقەمە ڕۆشت بۆ شام، ئینجا چووە مزگەوتەوە و دوو ڕکات نوێژی کرد و وتی: خودایە هاونشینێکم بۆ برەخسێنی (لەگەڵی دانیشم)، ئەنجا لای ئەبو دەردا دانیشت، ئەبو دەرداش پێی وت: تۆ خەڵکی کوێیت؟ عەلقەمەش وتی: خەڵکی کووفەم، وتی: بۆ ئێوە کەسێکتان تیا نییە یان کەسێك لە ئێوە هەیە خاوەنی نهێنی بێت کە جگەلە ئەو کەسی تر نایزانێت؟ - واتە: حوزەیفە- وتی: بۆ ئێوە کەسێکتان تیایە یان کەسێك لە ئێوە هەیە کە خوا**

(١) بڕوانە: ٣٢٨٧.

لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ لە شەیتان پاراستویەتی -واتە عەممار- وتی: وە ئایا کەسێکتان تیایە کە خاوەنی سیواك و بەرماڵ بوو؟ - واتە: ئیبنو مەسعوود- عەبدوڵلا چۆن ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ١﴾ی دەخوێند؟ وتی: (بەم جۆرەی دەخوێند) ﴿وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى﴾ وتی: بەردەوام ئائەمانە لەگەڵمدا هەوڵ دەدەن و خەریکن کە بە: ﴿ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ٣﴾. بخوێنمەوە لەوەی لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە لام بدەن.

## ٣٩- بابُ الْقَائِلَةِ بَعْدَ الْجُمُعَةِ

٦٢٧٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كُنَّا نَقِيلُ وَنَتَغَدَّى بَعْدَ الْجُمُعَةِ[١].

## ٣٩- باسی نوستنی نیوەڕوان پاش (نوێژی ) هەینی

٦٢٧٩-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئێمە (لە ڕۆژی هەیندا) نوستنی نیوەڕوان و خواردنمان لەپاش (نوێژی) هەینی ئەنجام دەدا.

## ٤٠- بابُ الْقَائِلَةِ فِي الْمَسْجِدِ

٦٢٨٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ مَا كَانَ لِعَلِيٍّ اسْمٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَبِي تُرَابٍ، وَإِنْ كَانَ لَيَفْرَحُ بِهِ إِذَا دُعِيَ بِهَا، جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْتَ فَاطِمَةَ ﷺ فَلَمْ يَجِدْ عَلِيًّا فِي الْبَيْتِ فَقَالَ: «أَيْنَ ابْنُ عَمِّكِ؟».

(١) بڕوانە: ٩٣٨.

فَقَالَتْ: كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ شَيْءٌ، فَغَاضَبَنِي فَخَرَجَ فَلَمْ يَقِلْ عِنْدِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِإِنْسَانٍ: «انْظُرْ أَيْنَ هُوَ؟» فَجَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هُوَ فِي الْمَسْجِدِ رَاقِدٌ. فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ قَدْ سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ شِقِّهِ فَأَصَابَهُ تُرَابٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُهُ عَنْهُ وَهُوَ يَقُولُ: «قُمْ أَبَا تُرَابٍ، قُمْ أَبَا تُرَابٍ»[1].

## ٤٠- باسی (حوکمی) نوستنی نیوەڕوان لە مزگەوتدا

**٦٢٨٠- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: عەلی ﷺ هیچ ناوێکی نەبوو بەلایەوە لە ئەبی توڕاب خۆشەویستر بێت، لە ڕاستیدا زۆر پێی خۆش بوو بەو ناوەوە بانگ بکرێ. پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ماڵی فاتیمە ﷺ و عەلی نەدی لە ماڵەوە، فەرمووی: ((ئامۆزاکەت لە کوێیە؟)) فاتیمە وتی: شتێ لە نێوانماندا ڕوویدا ئیتر ڕقی منی هەڵسان و چووە دەرەوە، نیوەڕۆ خەویشی لای من نەکرد. پێغەمبەری خوا ﷺ بەکەسێکی فەرموو: ((بزانە لە کوێیە؟)) ئەنجا کابرا هاتەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەتا لە مزگەوت ڕاکشاوە، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات لە کاتێکدا ئەو ڕاکشابوو پشتەماڵەکەی (کە دابووی بەخۆیدا) بەلایەکی یەوە نەمابوو تۆزی لێ نیشتووە، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی کرد بەسڕینی تۆزەکەی پێوەی بوو و دەیفەرموو: ((هەستە خۆڵاوی، هەستە خۆڵاوی[2])).**

## ٤١- بابُ مَنْ زَارَ قَوْمًا فَقَالَ عِنْدَهُمْ

٦٢٨١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ كَانَتْ تَبْسُطُ لِلنَّبِيِّ ﷺ نِطَعًا فَيَقِيلُ عِنْدَهَا عَلَى ذَلِكَ النِّطَعِ.

---

(١) بڕوانە: ٤٤١.

(٢) بەم جۆرەش مانا بکرێت دروستە: ((هەستە باوکی خۆڵ، هەستە باوکی خۆڵ)) کە وەرگێڕانی عەرەبیەکەی بێت، بەڵام من ئەو مانای لەسەرەوە کردوومە بەلامەوە گونجاوترە، یان عەرەبیەکەی هەر وەک خۆی بێت بڵێی: ((هەستە أبا تراب هەستە أبا تراب )).

قَالَ: فَإِذَا نَامَ النَّبِيُّ ﷺ أَخَذَتْ مِنْ عَرَقِهِ وَشَعَرِهِ فَجَمَعَتْهُ فِي قَارُورَةٍ، ثُمَّ جَمَعَتْهُ فِي سُكٍّ. قَالَ: فَلَمَّا حَضَرَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ الْوَفَاةُ أَوْصَى أَنْ يُجْعَلَ فِي حَنُوطِهِ مِنْ ذَلِكَ السُّكِّ. قَالَ: فَجُعِلَ فِي حَنُوطِهِ.

## ٤١- باسی کەسێک سەردانی خەڵکانێک بکات و خەوی نیوەڕوان لایان بخەوێ

**٦٢٨١-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئوممو سولەیم ﷺ ڕاخەرێکی پێستی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕادەخست، ئینجا نیوەڕۆ خەویشی لای ئوممو سولەیم لەسەر ئەو ڕاخەرە پێستەیە دەخەوت، (ئەنەس) دەڵێ: جا کە پێغەمبەر ﷺ دەخەوت، ئوممو سولەیم عەرەق و مووی پێغەمبەری ﷺ کۆ دەکردەوە لە شوشەیەکدا، لە پاشان دەیکردە ناو بۆنێکی خۆشەوە، (سومامە) دەڵێ: جا کاتێ ئەنەس کوڕی مالیك لە سەرەمەرگدا بوو وەسێتی کرد لەو بۆنە خۆشە [1] بکرێتە ئەو بۆنەوەی دەدرێت لە لاشەی (پاش مردنی)، (سومامە) دەڵێ: بۆیە ئەو بۆنە خۆشە کرایە ناو بۆنەکەی (کە لێی دەدرێت پاش مردنی).**

٦٢٨٢- ٦٢٨٣- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا ذَهَبَ إِلَى قُبَاءٍ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ فَتُطْعِمُهُ -وَكَانَتْ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ- فَدَخَلَ يَوْمًا فَأَطْعَمَتْهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ يَضْحَكُ. قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ». أَوْ قَالَ: «مِثْلُ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ». شَكَّ إِسْحَاقُ. قُلْتُ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَدَعَا، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟

---

(١) کە لە عەرەق و مووی پێغەمبەر ﷺ.

قَالَ: «نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ». أَوْ: «مِثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ». فَقُلْتُ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: «أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ». فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ زَمَانَ مُعَاوِيَةَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ[1].

**٦٢٨٢- ٦٢٨٣- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵا لێی بیستووە کە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەڕۆشت بۆ قوبا دەچوو بۆ ماڵی ئوممو حەرامی کچی میلحان و خواردنی دەدا بە پێغەمبەر ﷺ - وە ئوممو حەرام خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت بوو- جا جارێکیان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ماڵیان ئوممو حەرامیش چێشت و خواردنی پێدا، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت، پاشان لە خەو هەستا و پێدەکەنی. ئوممو حەرام دەڵێ منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هۆی پێکەنینەکەت چی بوو؟ ئەویش فەرمووی: ((لە ئوممەتەکەم کەسانێکم نیشاندرا کە جەنگاوەر بوون لە ڕێی خوادا سواری (کەشتی دەبن) بەناو دەریادا، دەڵێی پادشان لەسەر تەختەکەیان دانیشتوون))، یان فەرمووی: ((وەکو پادشا وان لەسەر تەختەکەیان دانیشتوون))، ئیسحاق گومانی بووە لە (نێوان ئەو دوو ڕستەیەدا) ئوممو حەرام وتی: منیش وتم: نزام بۆ بکە لای خوا کە من لەو جەنگاوەرانەبم، پێغەمبەریش ﷺ نزای بۆ کرد، پاشان سەری نایەوە و خەوت، پاشان خەبەری بوویەوە و پێدەکەنی (ئوممو حەرام دەڵێ) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هۆی چییە پێدەکەنیت؟ فەرمووی: ((لە ئوممەتەکەم کەسانێکم نیشاندرا کە جەنگاوەر بوون لە ڕێی خوادا سواری (کەشتی دەبن) بەناو ئەو دەریادا، دەڵێی پادشان لەسەر تەختەکەیان دانیشتوون)) یان فەرمووی: ((وەکو پادشا وان لەسەر تەختەکەیان دانیشتوون)) (ئوممو حەرام دەڵێ) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری**

(١) بڕوانە: ٢٧٨٨، ٢٧٨٩.

خوا نزام بۆ بکە لای خوا کە لەو جەنگاوەرانە بم، فەرمووی: ((تۆ لە یەکەمینەکانیت))، (ئەنەس دەڵێ:) وە لە سەردەمی موعاویەدا ﷺ ئوممو حەرام سواری کەشتی بوو لە دەریادا (بۆ خەبات لە ڕێی خوادا)، جا کاتێ لە دەریا هاتەدەر (بۆ وشکانی)، لە وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە و مرد.

## ٤٢- بَابُ الْجُلُوسِ كَيْفَمَا تَيَسَّرَ

٦٢٨٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ لِبْسَتَيْنِ، وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ: اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَالاحْتِبَاءِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ لَيْسَ عَلَى فَرْجِ الإِنْسَانِ مِنْهُ شَيْءٌ، وَالْمُلاَمَسَةِ، وَالْمُنَابَذَةِ[1]. تَابَعَهُ مَعْمَرٌ وَمُحَمَّدُ بْنُ أَبِي حَفْصَةَ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُدَيْلٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[2].

## ٤٢- باسی دانیشتن بە هەر شێوەیک گونجاو ئاسان بوو

٦٢٨٤- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە دوو شێوە پۆشاك لەبەرکردن، وە ڕێگری کردوە لە دوو جۆر فرۆشتن: ڕێگری کردوە لە خۆمەلۆتە کردن[3] وە ڕێگری کردوە پیاو بەجیجکانەوە دانیشێ، یەك پۆشاکی لەبەردابێ هیچی بەسەر عەورەتیەوە نەبێ. وە ڕێگری کردوە لە فرۆشتن بە دەست لێدان، وە لە فرۆشتن بە هەڵدان بۆ یەکتری.

-وە مەعمەر و موحەممەد کوڕی ئەبی حەفصە و عەبدوڵڵای کوڕی بودەیل لە زوهریەوە گێڕاویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی سوفیانی کوڕی عویەینە دەکەن.

---

(١) بڕوانە: ٣٦٧.

(٢) بڕوانە: ٣٦٧.

(٣) خۆپێچانەوەیە بە پۆشاکێک بەجۆرێک نەتوانێ دەستی لێوەی دەربێنێ.

## ٤٣- بابُ مَنْ نَاجَى بَيْنَ يَدَيِ النَّاسِ، وَمَنْ لَمْ يُخْبِرْ بِسِرِّ صَاحِبِهِ، فَإِذَا مَاتَ أَخْبَرَ بِهِ

٦٢٨٥- ٦٢٨٦- حَدَّثَنَا مُوسَى، عَنْ أَبِي عَوَانَةَ، حَدَّثَنَا فِرَاسٌ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: إِنَّا كُنَّا أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَهُ جَمِيعًا، لَمْ تُغَادَرْ مِنَّا وَاحِدَةٌ، فَأَقْبَلَتْ فَاطِمَةُ عليها السلام تَمْشِي، لاَ وَاللَّهِ مَا تَخْفَى مِشْيَتُهَا مِنْ مِشْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا رَآهَا رَحَّبَ قَالَ: «مَرْحَبًا بِابْنَتِي». ثُمَّ أَجْلَسَهَا عَنْ يَمِينِهِ -أَوْ عَنْ شِمَالِهِ- ثُمَّ سَارَّهَا، فَبَكَتْ بُكَاءً شَدِيدًا، فَلَمَّا رَأَى حُزْنَهَا سَارَّهَا الثَّانِيَةَ إِذَا هِيَ تَضْحَكُ. فَقُلْتُ لَهَا -أَنَا مِنْ بَيْنِ نِسَائِهِ-: خَصَّكِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالسِّرِّ مِنْ بَيْنِنَا ثُمَّ أَنْتِ تَبْكِينَ! فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَأَلْتُهَا: عَمَّا سَارَّكِ؟ قَالَتْ: مَا كُنْتُ لأُفْشِيَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سِرَّهُ. فَلَمَّا تُوُفِّيَ قُلْتُ لَهَا: عَزَمْتُ عَلَيْكِ بِمَا لِي عَلَيْكِ مِنَ الْحَقِّ لَمَّا أَخْبَرْتِنِي. قَالَتْ: أَمَّا الآنَ فَنَعَمْ. فَأَخْبَرَتْنِي قَالَتْ: أَمَّا حِينَ سَارَّنِي فِي الأَمْرِ الأَوَّلِ، فَإِنَّهُ أَخْبَرَنِي أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُهُ بِالْقُرْآنِ كُلَّ سَنَةٍ مَرَّةً «وَإِنَّهُ قَدْ عَارَضَنِي بِهِ الْعَامَ مَرَّتَيْنِ، وَلاَ أَرَى الأَجَلَ إِلاَّ قَدِ اقْتَرَبَ، فَاتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي، فَإِنِّي نِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ». قَالَتْ: فَبَكَيْتُ بُكَائِي الَّذِي رَأَيْتِ، فَلَمَّا رَأَى جَزَعِي سَارَّنِي الثَّانِيَةَ قَالَ: «يَا فَاطِمَةُ، أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ" أَوْ: "سَيِّدَةَ نِسَاءِ هَذِهِ الأُمَّةِ؟»[1].

## ٤٣- باسی کەسێک لەبەردەم خەڵکدا چپە بکات (بۆ کەسێک)، وە کەسێکیش نهێنی هاوڕێکەی بەکەس نەڵێ، ئینجا کە مرد نهێنیەکەی بەخەڵک بڵێ

**٦٢٨٥- ٦٢٨٦- مەسروق دەڵێ: عائیشە دایکی باوەڕداران رضي الله عنها وتی: ئێمەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ هەمووومان لە خزمەتیدا بووین، هیچ کاممان ئەوێمان**

(١) بڕوانە: ٣٦٢٣، ٣٦٢٤.

بە جێ نەهێشتبوو ئینجا فاتیمە هات بەپیادە، نەسوێند بەخوا ڕۆشتنی هیچ جیاوازی نەبوو لە ڕۆشتنی پێغەمبەر ﷺ، جا کە بینی بەخێری هێنا و فەرمووی: ((بەخێربێیت کچم))، پاشان لای ڕاستیەوە یان لای چەپیەوە دایینیشاند، لە پاشان سرتەیەکی بۆکرد، فاتیمەش زۆر گریا، جا کە دڵ تەنگیەکەی بینی سرەتیەکی تری بۆ کرد،جافاتیمە پێکەنی، (عائیشە دەڵێ:) من لە ناو هاوسەرانی پێغەمبەردا ﷺ پێم وت: پێغەمبەری خوا لە نێوان هەموواندا تۆی تایبەت کرد بەدرکاندنی نهێنی لات کەچی تۆ دەگریت، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و ڕۆشت، پرسیارم لێ کرد دەربارەی ئەو نهێنیەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی پێی؟ فاتیمە وتی: من هەرگیز نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرا ناکەم، ئینجا کاتێ وەفاتی کرد، (عائیشە دەڵێ) وتم: بە فاتیمە سوێندم لێ خواردیت بەو مافەی من هەمە بەسەرتەوە دەبێ هەواڵم پێ بدەیت [1]، فاتیمە وتی: لە ئێستادا بەڵێ باشە، جا هەواڵی پێدام وتی: جا کاتێ بۆ شتی یەکەم سرتەی بۆ کردم، بێگومان پێی وتم: کە جیبریل ﷺ هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی بۆ دەخوێندەوە ((بەڵام ئەم ساڵ دوو جار بۆی خوێندمەوە، بۆیە پێم وایە مردنم نزیکبۆتەوە، کەواتە لە خوا بترسە و ئارام بگرە، چونکە بەڕاستی پاشترین پێشەکەوتوو منم بۆ تۆ)) وتی: بۆیە بەو جۆرەی گریانەی بینیت گریام، جا کاتێ بێتاقەتی و ناڕەحەتی منی بینی سرتەی دووەمی بۆ کردم و فەرمووی: ((ئەی فاتیمە ئایا ڕازی نابیت کە سەر گەورەی ئافرەتانی باوەڕدار بیت؟))، یان ((گەورەی ئافرەتانی ئەم ئوممەتە بیت؟)).

---

(١) ئەو نهێنیانەی پێغەمبەر ﷺ چی بوو پێی وتی.

## ٤٤- بابُ الاسْتِلْقَاءِ

٦٢٨٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبَّادُ بْنُ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ مُسْتَلْقِيًا وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى[1].

## ٤٤- باسی پاڵکەوتن لەسەر پشت

**٦٢٨٧- عەببادی کوڕی تەمیم لە مامیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە مزگەوتدا بەپشتا پاڵکەوتبوو، لاقێکی نابوو سەر لاقەکەی تری.**

## ٤٥- بابُ لاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ

وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَنَٰجَيۡتُمۡ فَلَا تَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَمَعۡصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوۡاْ بِٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ لِيَحۡزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيۡسَ بِضَآرِّهِمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٠﴾ ﴾ المجادلة

وَقَوْلُهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ الى قوله: ﴿ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ المجادلة.

٦٢٨٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ. وَحَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانُوا ثَلاَثَةٌ فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ».

---

(١) بڕوانە: ٤٧٥.

## ٤٥- باسی نابێ دوو کەس چپە بکەن بەجیا لە کەسی سێیەم

وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە کە چپەتان کرد بە چپە باسی گوناه و دەست درێژی و سەرپێچی پێغەمبەر ﷺ مەکەن، وە باسی چاکە و پارێزگاری و لە خوا ترسان بکەن، وە لەو خوایە بترسن کە هەر لای ئەو کۆدەکرێنەوە، بێگومان چپە تەنها لە شەیتانەوەیە تا ئەوانە دڵتەنگ بکات کە بڕوایان هێناوە، لە کاتێکدا هیچ زیانیان پێ ناگەیەنێت، مەگەر بە فەرمانی خوا ئیماندارانیش با تەنها پشت بە خوا ببەستن).وە ئەم فەرمایشتەش: (ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە هەر کاتێك (ویستان) قسەی پەنهانی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن، ئەوە پێش چپە کردنەکەتان خێرێك بکەن، ئەمە بۆ خۆتان چاکتر و پاکترە، ئینجا ئەگەر هیچتان نەبوو ئەوە بێگومان خوا لێخۆش بوو میهرەبانە)، تا دەگاتە ئەم فەرمایشتە: (وە خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن).

٦٢٨٨ -عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر سێ کەس بوون ئەوە با دووانیان چپە نەکەن پێکەوە بە جیا لە سێیەمەکە)).

## ٤٦- بابُ حفْظِ السِّرِّ

٦٢٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: أَسَرَّ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ سِرًّا فَمَا أَخْبَرْتُ بِهِ أَحَدًا بَعْدَهُ، وَلَقَدْ سَأَلَتْنِي أُمُّ سُلَيْمٍ فَمَا أَخْبَرْتُهَا بِهِ.

## ٤٦- باسی پاراستنی نهێنی

**٦٢٨٩-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نهێنیەکی پێ وتم، منیش لەپاش ئەو بەکەسم نەوتووە، بەدڵنیاییەوە ئوممو سولەیمیش پرسیاری ئەو نهێنیەی لێ کردم، بەڵام من ئەو نهێنیەم پێ نەوت.**

## ٤٧- بابٌ: إِذَا كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ثَلاَثَةٍ فَلاَ بَأْسَ بِالْمُسَارَّةِ وَالْمُنَاجَاةِ

٦٢٩٠- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ : قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى رَجُلاَنِ دُونَ الآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، أَجْلَ أَنْ يُحْزِنَهُ».

## ٤٧- باسیک: ئەگەر لە سێ کەس زیاتر بوون، ئەو چپە و سرتە زیانی نییە و قەیناکات

**٦٢٩٠ -عەبدوڵلا ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر ئێوە سێ کەس بوون، ئەوە با دوو کەستان چپە نەکەن بە جیا لە کەسەکەی تریان، هەتا تێکەڵ دەبن بەخەڵك، لەبەر ئەوە کە دڵ تەنگ و غەمباری دەکات)).**

٦٢٩١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا قِسْمَةً، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: إِنَّ هَذِهِ لَقِسْمَةٌ مَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللَّهِ. قُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لآتِيَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَتَيْتُهُ وَهْوَ فِي مَلأٍ فَسَارَرْتُهُ، فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، ثُمَّ قَالَ: «رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَى مُوسَى، أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ»[1].

(١) بڕوانە: ٣١٥٠.

**٢٦٩١- شەقیق لە عەبدوڵلاوە ﷺ دەگێڕێتەوە کەووتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان دەستکەوتێکی دابەش کرد، پیاوێکی ئەنصاریش وتی: بەڕاستی ئەمە دابەش کردنێکە ڕەزامەندی خوا مەبەست نەبووە پێی، (عەبدوڵلا دەڵێ:) منیش وتم دەی سوێند بەخوا دەچمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا چوومە خزمەتی لە ناو کۆمەڵێکدا بوو قسەکەم بەپەنهانی بۆ گێڕایەوە، ئەویش تووڕە بوو بە جۆرێ ڕووخساری سوور هەڵگەڕا، پاشان فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوا لە مووسا عليه السلام بێت لەمە زیاتر ئازاردرا بەڵام ئارامی گرت)).**

## ٤٨- بابُ طُولِ النَّجْوى

وقوله: ﴿وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ ﴿٤٧﴾﴾ الإسراء. مَصْدَرٌ مِنْ نَاجَيْتُ، فَوَصفَهُمْ بِهَا، وَالْمَعْنَى: يَتَنَاجَوْنَ.

٦٢٩٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ، - عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَرَجُلٌ يُنَاجِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَمَا زَالَ يُنَاجِيهِ حَتَّى نَامَ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى[1].

## ٤٨- باسی چپەی درێژ

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (کاتێ پێکەوە چپە دەکەن)** (نجوى) **چاوگە لە** (نَاجَيْتُ) **وەسفی کردوون بە چپەکردن - واتە: پێکەوە چپە دەکەن.**

**٦٢٩٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: قامەت کرا بۆ نوێژ، پیاوێك چپەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، جا بەردەوام چپەی لەگەڵ دەکرد هەتا هاوەڵانی خەوتن، لە پاشان هەستا و نوێژی کرد.**

(١) بڕوانە: ٦٤٢.

## ٤٩- بابٌ: لاَ تُتْرَكُ النَّارُ فِي الْبَيْتِ عِنْدَ النَّوْمِ

٦٢٩٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ».

## ٤٩- باسێک: لە کاتی خەوتندا ئاگر لە ماڵدا بەجێ نەهێڵرێت

**٦٢٩٣- سالیم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((ئاگر لە ماڵەکانتاندا بەجێ مەهێڵن کاتێ دەخەون)).**

٦٢٩٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ بِالْمَدِينَةِ عَلَى أَهْلِهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَحُدِّثَ بِشَأْنِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ».

**٦٢٩٤- ئەبو مووسا ﷺ وتی: شەو ماڵێك لە مەدینە سووتا بەسەر خاوەنەکەیدا جا بەسەرهاتەکەیان گێڕدرایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((بەڕاستی ئەم ئاگرە دوژمنی ئێوەیە، بۆیە کە خەوتن لە خۆتانی بکوژێننەوە)).**

٦٢٩٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ كَثِيرٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَمِّرُوا الآنِيَةَ، وَأَجِيفُوا الأَبْوَابَ، وَأَطْفِئُوا الْمَصَابِيحَ، فَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ رُبَّمَا جَرَّتِ الْفَتِيلَةَ فَأَحْرَقَتْ أَهْلَ الْبَيْتِ»[1].

(١) بڕوانە: ٣٢٨٠.

٦٢٩٥-جابیر كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ((دەفرەكان داپۆشن، وە دەرگاكان دابخەن، وە چراكان بكوژێننەوە، چونكە بەڕاستی مشك (زیان بەخشی لە سنوور دەرچووی بچكۆلە)، هەندێك جار پلیتەی (چرا) كە ڕادەكێشێت و خەڵكی ماڵەكە دەسوتێنێت)).

## ٥٠- بَابُ إِغْلَاقِ الأَبْوَابِ بِاللَّيْلِ

٦٢٩٦- حَدَّثَنَا حَسَّانُ بْنُ أَبِي عَبَّادٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَطْفِئُوا الْمَصَابِيحَ بِاللَّيْلِ إِذَا رَقَدْتُمْ، وَغَلِّقُوا الأَبْوَابَ، وَأَوْكُوا الأَسْقِيَةَ، وَخَمِّرُوا الطَّعَامَ وَالشَّرَابَ». -قَالَ هَمَّامٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ:- وَلَوْ بِعُودٍ»[1].

## ٥٠- باسی داخستنی دەرگاكان بە شەودا (دروستە)

٦٢٩٦- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەشەودا كاتێ خەوتن چراكان بكوژێننەوە، دەرگاكانیش دابخەن، دەمی كوندە و مەشكەكان ببەستن، خواردن و خواردنەوە داپۆشن))، هەممام وتی: وابزانم فەرمووی ((با بە چیلكەیەكیش بێت لەسەری دانێیت)).

## ٥١- بَابُ الخِتَانِ بَعْدَ الكِبَرِ وَنَتْفِ الإِبْطِ

٦٢٩٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ قُزَعَةَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٣٢٨٠.

## ٥١- باسی خەتەنەکردن پاش پیربوون، وە هەڵکێشانی مووی بن باڵ

**٦٢٩٧- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: ((پێنج شت لە سروشتی پاکن: خەتەنەکردن، بەر تاشین، تووکی بن باڵ هەڵکەندن، سمێڵ کورت کردنەوە، نینۆك کردن)).**

٦٢٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ بَعْدَ ثَمَانِينَ سَنَةً، وَاخْتَتَنَ بِالْقَدُومِ». مُخَفَّفَةً.
حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا الْمُغِيرَةُ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، وَقَالَ: «بِالْقَدُّومِ»[٢].

**٦٢٩٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئیبراهیم ﷺ دوای تەمەنی هەشتا ساڵی خەتەنە کرا، وە بە تەشوێ[٣] خەتەنە کرا))، (بالقَدوم) پیتی دال یەك دال و دووان نییە. (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) قوتەیبە بۆی گێڕاینەوە وتی: موغیرە بۆی گێڕاینەوە لە ئەبی زینادەوە فەرمووی: ((بِالْقَدُّومِ)) پیتی دالەکە دووبارەیە.**

٦٢٩٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ، أَخْبَرَنَا عَبَّادُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مِثْلُ مَنْ أَنْتَ حِينَ قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: أَنَا يَوْمَئِذٍ مَخْتُونٌ. قَالَ: وَكَانُوا لاَ يَخْتِنُونَ الرَّجُلَ حَتَّى يُدْرِكَ[٤].

---

(١) بڕوانە: ٥٨٨٩.
(٢) بڕوانە: ٣٣٥٦.
(٣) (قدوم) مانای تریشی بۆ کراوە وەک: گوندێکە لە شام، یا ملە و گەردەنەیەکە، بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ماناکەی یەکەمن ( تەشوێ).
(٤) بڕوانە: ٦٣٠٠.

٦٢٩٩-سەعیدی كوڕی جوبیەر دەڵێ: پرسیار كرا لە ئیبنو عەبباس ﷺ، تۆ وەكو كێ بووی كاتێ پێغەبەر ﷺ گیانی كێشرا، وتی: من لەو ڕۆژگارەدا خەتەنە كرابووم، دەڵێ: خەڵكەكە باویان وابوو كوڕیان خەتەنە نەدەكرد هەتا باڵغ نەبوایە.

٦٣٠٠ - وَقَالَ ابْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا خَتِينٌ[1].

٦٣٠٠- سەعیدی كوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گیانی كێشرا من خەتەنە كرابووم.

## ٥٢- بابٌ: كُلُّ لَهْوٍ بَاطِلٌ إِذَا شَغَلَهُ عَنْ طَاعَةِ اللَّهِ ﷻ وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ. وقال الله ﷻ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٦﴾ ﴾ لقمان

٦٣٠١- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى. فَلْيَقُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ. فَلْيَتَصَدَّقْ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٢٩٩.

(٢) بڕوانە: ٤٨٦٠.

## ٥٢- باسێك: هەموو یاری و خەریك بوونێك ناڕەوایە ئەگەر كەسە بێ ئاگا بكات لە گوێڕایەڵی خوا ﷻ، وە كەسێك بە هاوڕێكەی بڵێت وەرە قومارت لەگەڵ بكەم. وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (هەندێ لە خەڵكی هەیە قسە و باسی بێهودە[1] دەكڕێ بۆ ئەوەی بەنەزانی خەڵك گومڕا بكات لە ڕێگای خوا)

**٦٣٠١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەس لە ئێوە سوێندی خوارد و لە سوێندەكەیدا وتی: سوێند بەلات و عوززا، ئەوە با بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) هەر كەسیش بە هاوڕێكەی وت: وەر قومارت لەگەڵ بكەم ئەوا باخێرێك بكات)).**

## ٥٣- بابُ مَا جَاءَ فِي البِنَاءِ

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: "مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: إِذَا تَطَاوَلَ رِعَاءُ البَهْمِ فِي البُنْيَانِ"[2].

٦٣٠٢- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ -هُوَ ابْنُ سَعِيدٍ- عَنْ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُنِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بَنَيْتُ بِيَدِي بَيْتًا يُكِنُّنِي مِنَ الْمَطَرِ وَيُظِلُّنِي مِنَ الشَّمْسِ، مَا أَعَانَنِي عَلَيْهِ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ.

## ٥٣- باسی ئەوەی دەربارەی خانوو دروست كردن هاتووە

**-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((لە نیشانەكانی (نزیك هاتنی) قیامەت ئەوەیە كاتێ شوانی بەرخۆڵەوان خانو و**

---

(١) وەك ئەفسانە و گۆرانی و مۆسیقا. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٣/٣٠٠.

(٢) بڕوانە: ٥٠.

**کۆشکی بەرز دروست دەکەن[1])).٦٣٠٢-سەعید لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: خۆم دی لە گەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەدەستی خۆم خانوویەکم دروست کرد، کە بمپارێزێ لە باران و سێبەرم بۆ بکات لە خۆر بمپارێزێ، هیچ کەسێك لە دروست کراوانی خوا لە دروستکردنیدا یارمەتی نەدام.**

٦٣٠٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، قَالَ عَمْرٌو: قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَاللَّهِ مَا وَضَعْتُ لَبِنَةً عَلَى لَبِنَةٍ، وَلاَ غَرَسْتُ نَخْلَةً، مُنْذُ قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ. قَالَ سُفْيَانُ: فَذَكَرْتُهُ لِبَعْضِ أَهْلِهِ، قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ بَنَى بَيْتًا. قَالَ سُفْيَانُ: قُلْتُ: فَلَعَلَّهُ قَالَ قَبْلَ أَنْ يَبْنِيَ.

**٦٣٠٣- عەمر دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ وتی: سوێند بەخوا خشتێکم دانەناوە لەسەر خشتێك، دار خورمایەکم نەناشتووە لەو کاتەوەی پێغەمبەر گیانی کێشرا و وەفاتی کردوە.**

**سوفیان دەڵێ: ئەم وتەیەم باس کرد بۆ کەسێکی ئیبنو عومەر، وتی: وەڵڵاهی بەدڵنیاییەوە (ئبنو عومەر) خانووی دروست کرد، سوفیان دەڵێ وتم: دەی لەوانەیە پێش لەوەی دروست بکات ئەوەی وتبێت.**

---

(١) یان ئەو شوانانە پێشبڕکێ یەکتری دەکەن لە دروست کردنی کۆشک و تەلاری بەرزدا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٨٠- كِتَابُ الدَّعَوَاتِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨٠- پەڕاوی نزا و پاڕانەوە

قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر

**ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە، بەڕاستی ئەوانەی خۆ بەگەورە دەزانن کە بمپەرستن لەمەو پاش بەسەر شۆڕی دەچنە دۆزەخەوە)**

## ١- بَابٌ: وَلِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ

٦٣٠٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ يَدْعُو بِهَا، وَأُرِيدُ أَنْ أَخْتَبِئَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي فِي الآخِرَةِ»[1].

## ١- باسێک: بۆ هەموو پێغەمبەرێک نزایەکی وەرگیراو هەبووە

**٦٣٠٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر پێغەمبەرێك نزایەکی هەبووە نزای پێ کردوە، بەڵام من دەمەوێ ئەو نزا و پاڕانەوە وەرگیراوەم هەڵی بگرم بۆ تکاکردن بۆ ئوممەتەکەم لە دوا ڕۆژدا)).**

(١) بروانە: ٧٤٧٤.

٦٣٠٥ - وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ: قَالَ مُعْتَمِرٌ: سَمِعْتُ أَبِي، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ نَبِيٍّ سَأَلَ سُؤْلاً -أَوْ قَالَ: لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ قَدْ دَعَا بِهَا- فَاسْتُجِيبَ، فَجَعَلْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

**٦٣٠٥-ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەموو پێغەمبەرێك داوایەکی کردوە -یان فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێك نزایەکی هەبوو نزای پێ کردوە - جالێی وەرگیراوە، منیش نزاکەم کردوە بە تکاکردن بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا)).**

## ٢- بابُ أفْضَلِ الاسْتِغْفَارِ

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّـٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَـٰرًا ﴿١٢﴾ ﴾ نوح، ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ آل عمران

## ٢- باسی گەورەترینی داوای لێخۆشبوون کردن لە خوا

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (داوای لێخۆشبوون بکەن لە پەروەردگارتان، بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێ خۆش بووە، ئینجا گەر وا بکەن بارانی خوڕەم و لێزمەتان بۆ دەبارێنێ، وە سامان و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشێ، وە باخ و باخاتی زۆرتان پێ دەدات، وە جۆگە ئاوی زۆرتان دەداتێ).**

**(وە ئەوانەی کەکاتێ کردەوەیەکی ناشرین دەکەن یا ستەم لە خۆیان دەکەن کە یادی خوایان کردەوە، ئینجا داوای لێ بوردن دەکەن بۆ گوناهەکانیان، ئایا بێجگە لە خوا کێ دەبورێ لە گوناهەکان؟ وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کە کردوویانە لە کاتێکدا بزانن گوناهە).**

٦٣٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ كَعْبٍ الْعَدَوِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي شَدَّادُ بْنُ أَوْسٍ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِى وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي، اغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ». قَالَ: «وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِنًا بِهَا، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهْوَ مُوقِنٌ بِهَا، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ، فَهْوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»[1].

**٦٣٠٦-شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((گەورەترین داوای لێ خۆش بوون لە خوا ئەوەیە کە بڵێیت: خودایە تۆ پەروەردگاری منی، هیچ پەرستراوێك ڕاست نییە جگە لە تۆ، تۆ منت دروست کردوە و من بەندەی تۆم، وە من لەسەر پەیمان و بەڵێنی تۆم تا بتوانم، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی ئەوەی کردوومە، دان دەنێم بە هەموو ئەو بەهرانەی ڕشتووتە بەسەرمدا، هەروەها دان دەنێم بە گوناه و تاوانمدا (کەواتە) لێم خۆشبە، چونکە بەڕاستی جگەلە تۆ کەس لە گوناهەکان خۆش نابێت)) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:((هەر کەس لە ڕۆژدا ئەمە بڵێ بە دڵنیاییەوە،**

(١) بڕوانە: ٦٣٢٣.

ئینجا لەو ڕۆژەدا بمرێ پێش ئەوەی ئێوارە بکاتەوە[1]، ئەوە بێگومان ئەو کەسە بەهەشتییە، هەر کەسیش لە شەودا ئەمە بڵێ بە دڵنیاییەوە، ئینجا بمرێ پێش ئەوەی ڕۆژ بکاتەوە، ئەوە بێگومان ئەو کەسە بەهەشتییە)).

## ٣- بَابُ اسْتِغْفَارِ النَّبِيِّ ﷺ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ

٦٣٠٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَاللَّهِ إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً».

## ٣- باسی داوای لێ خۆش بوون کردن پێغەمبەر ﷺ لە خوا لە شەو و ڕۆژیکدا

٦٣٠٧-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو ((وەڵڵاهی بە دڵنیاییەوە من لە ڕۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێ خۆشبوون لە خوا دەکەم و پەشیمان دەبمەوە)).

## ٤- بَابُ التَّوْبَةِ

قَالَ قَتَادَةُ: ﴿ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴿٨﴾ ﴾ التحريم. الصَّادِقَةُ النَّاصِحَةُ.

٦٣٠٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ حَدِيثَيْنِ: أَحَدُهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَالآخَرُ عَنْ نَفْسِهِ.

---

(١) ئێوارەی بەسەردا بێت و بکاتە ئێوارە.

قَالَ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ قَاعِدٌ تَحْتَ جَبَلٍ يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ، وَإِنَّ الْفَاجِرَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ على أَنْفِهِ. فَقَالَ بِهِ هَكَذَا -قَالَ أَبُو شِهَابٍ بِيَدِهِ فَوْقَ أَنْفِهِ- ثُمَّ قَالَ: «لَلَّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ رَجُلٍ نَزَلَ مَنْزِلاً وَبِهِ مَهْلَكَةٌ، وَمَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَوَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ نَوْمَةً، فَاسْتَيْقَظَ وَقَدْ ذَهَبَتْ رَاحِلَتُهُ، حَتَّى اشْتَدَّ عَلَيْهِ الحَرُّ وَالْعَطَشُ أَوْ مَا شَاءَ اللَّهُ، قَالَ: أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِي. فَرَجَعَ فَنَامَ نَوْمَةً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا رَاحِلَتُهُ عِنْدَهُ».

تَابَعَهُ أَبُو عَوَانَةَ وَجَرِيرٌ عَنِ الأَعْمَشِ. وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، حَدَّثَنَا عُمَارَةُ: سَمِعْتُ الْحَارِثَ. وَقَالَ شُعْبَةُ وَأَبُو مُسْلِمٍ: عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ. وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ. وَعَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ.

## ٤- باسی تەوبەکردن

**قەتادە دەڵێ: مەبەست لە:** ﴿ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴿٨﴾ ﴾ التحريم: **تەوبەیەکی ڕاستی چاکە بە ئیخلاسەوە بێت.**

**٦٣٠٨- حاریسی کوڕ سوەید دەڵێ: عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دوو فەرموودەی بۆگێڕاینەوە: یەکێکیان لە پێغەمبەرەوە، ئەوی کەشیان لە خۆیەوە[1] وتی: بێگومان بڕوادار تاوانەکانی (وەك کێو) دەبینێ، وەك لە دامێنی کێوێك دانیشتبێ و بترسی بکەوێ بەسەریدا، بێگومان کەسی گوناهباریش تاوانەکانی وەك مێشێك دەبینێ کە بەلا لوتیدا تێپەڕی، جا بەدەستی ئاوەهای لێ بکات، ئەبو شیهاب دەستی برد بۆ سەر لووتی[2] پاشان وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوا شادمان ترە بە تەوبەکردنی بەندەکەی لە پیاوێك کە لە شوێنێکدا**

---

(١) واتە: دووهەمەکەیان وتی: عەبدوڵڵا خۆیەتی کە پێی دوترێ (حديث موقوف) وتەی هاوەڵان.

(٢) واتە: بەشێوەی کرداری ڕوونی کردەوە چۆن مێشەکە دەر دەکات.

دابەزیبێ و لایدابێ جێی تیاچوون و مردن بێت، وڵاخێكی پێ بێ خۆراك و خواردنەوەكەی بەسەریەوە بێت، ئینجا سەری نابێتەوە و سەرخەوێكی شكاندبێت، كە خەبەری بووەتەوە (دەبینێ) وڵاخەكەی بەكەلوپەلەكەوە ڕۆشتبێت و نەمابێت، (جا بەشوێنیدا بگەڕێت) هەتا گەرما و تینوێتی زۆری بۆ بێنێت یان ئەوەی خوا بیەوێ، جا بڵێ: دەگێڕێمەوە بۆ شوێنەكەی پێشوو خۆم، ئیتر بگەڕێتەوە كە سەرخەوێ بشكێنێت لە پاشان (كە خەبەری دەبێتەوە) سەری بەرزدەكاتەوە، دەبینێ وڵاخەكەی بە بارەكەوە لایدا وەستاوە)) [1].

-ئەبوعەوانە و جەریر لە ئەعمەشەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە پاڵپشتی گێڕانەوەكەی ئەبو شیهاب دەكەن.

-ئەبو ئوسامە دەڵێ: ئەعمەش بۆی گێڕاینەوە وتی: عومارە بۆی گێڕاینەوە وتی: لە حاریسم بیست.

-شوعبەو ئەبو موسلیم لە ئەعمەشەوە گێڕایانەوە ئەویش لە ئیبراهیمی تەیمی یەو ئەویش لە حاریسی كوڕی سویدەوە گێڕاویەتیەوە[2].

-ئەبو موعاویە دەڵێ:ئەعمەش بۆی گێڕاینەوە لە عومارەوە لە ئەسوەدەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ ، هەروەها لە ئیبراهیمی تەیمیەوە لە حارسی كوڕی سویدەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ [3].

٦٣٠٩- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا حَبَّانُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَحَدَّثَنَا هُدْبَةُ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ سَقَطَ عَلَى بَعِيرِهِ وَقَدْ أَضَلَّهُ فِي أَرْضِ فَلَاةٍ»

---

(١) خوا زۆر لەو كەسە خۆشحاڵترە لە پەشیمان بوونەوەی بەندەكەی گەڕانەوەی بۆ لای خودا.

(٢) مەبەستی بوخاری ئەوەیە شوعبە و موسلم پێچەوانەی ئەبو شیهابیان كردوە لە ناوی مامۆستاكەی ئەعمەشدا، شوعبە و موسلیم دەڵێن ناوی ئیبراهیمی تەیمییە، ئەبو شیهاب دەڵێ ناوی عومارەیە.

(٣) ئەبو موعاویە لە هەردووكیانەوە گێڕاویەتیەوە.

**٦٣٠٩-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خودا شادوومانترە بە پەشیمان بوونەوەی بەندەکەی لە کەسێکتان، تووشی وشترەکەی بێت و بیدۆزێتەوە، لە کاتێکدا پێشتر ونی کرد بێت لە زەویەکی چۆڵی بێ ئاو و ئاوەدانیدا)).**

## ٥- بابُ الضَّجْعِ عَلَى الشِّقِّ الأَيْمَنِ

٦٣١٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، فَإِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ على شِقِّهِ الأَيْمَنِ، حَتَّى يَجِيءَ الْمُؤَذِّنُ فَيُؤْذِنَهُ[1].

## ٥- باسی ڕاکشان لەسەر لای ڕاست (سوننەتە)

**٦٣١٠- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە شەودا یازدە ڕکات نوێژی دەکرد، جا کە سپێدە دەردەکەوت و نوێژی بەیانی دەبوو، دوو ڕکات نوێژی سوننەتی کورتی دەکرد، پاشان لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا هەتا بانگبێژەکە دەهات بۆ لای ئاگاداری دەکردەوە (بۆ نوێژی بەیانی).**

## ٦- بابٌ: إِذَا بَاتَ طَاهِرًا وفضله

٦٣١١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: سَمِعْتُ مَنْصُورًا، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وَضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، وَقُلِ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِى إِلَيْكَ، رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ

---

(١) بڕوانە: ٦٢٦.

بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ. فَإِنْ مُتَّ مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَقُولُ». فَقُلْتُ: أَسْتَذْكِرُهُنَّ: وَبِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ. قَالَ: «لاَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ»[1].

## ٦- باسێك: ئەگەر كەسێك بە پاكی شەو بكاتەوە، وە گەورەیەكەی

**٦٣١١- بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو كاتەی دەچیتە سەر جێگای نوستنەكەت دەست نوێژ بگرە وەك دەست نوێژگرتنت بۆ نوێژ، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕاكشێ، وە بڵێ: خوایە خۆم دایە دەستی تۆ، وە كاروباری خۆم بە تۆ سپارد، تەنها پشتم بە تۆ بەستووە، ئومێدم هەر بەتۆیە، ترسیشم هەر لە تۆیە، هیچ پەناگا و پارێزەرێك نییە لە بەرانبەر تۆدا مەگەر لای خۆت، خوایە باوەڕم هەیە بەو پەڕاوەی داتبەزاندووە، وە بەو پێغەمبەرەی ناردووتە، جا ئەگەر لەو شەوتدا مردیت ئەوە لەسەر ئیمانداری دەمریت، كەواتە ئەم نزایە بكەرە كۆتاهەمینی قسەكانت))، بەڕاو دەڵێ: منیش ئەم نزایەی (پێغەمبەر ﷺ) دەخوێندەوە وتم:** (وَبِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ) **فەرمووی ((نەخێر،** وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ**))**[2].

## ٧- بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا نَامَ

**٦٣١٢-** حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: «بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا». وَإِذَا قَامَ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[3].

---

(١) بروانە: ٢٤٧.

(٢) واتە: بەراء لە جیاتی (وَبِنَبِيِّكَ) ووتی: (وَبِرَسُولِكَ) بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆی ڕاست كردەوە.

(٣) بروانە: ٦٣١٤، ٦٣٢٤، ٧٣٩٤.

## ٧- باسی کەسێک کاتێ بخەویت چی دەڵێت

**٦٣١٢-حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچووە ناو پێخەفی نوستنەکەیەوە دەیفەرموو: ((بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا)) واتە: بەناوی تۆوە خوایە دەمرم و دەژیم، وە کاتێکیش لە خەو هەستایە دەیفەرموو: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)) واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە پاش ئەوەی مراندینی، زیندوو کردنەوەش هەر لای ئەو دەبێت.**

٦٣١٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ قَالاَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، سَمِعَ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ رَجُلاً. وَحَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ الْهَمْدَانِيُّ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَوْصَى رَجُلاً فَقَالَ: «إِذَا أَرَدْتَ مَضْجَعَكَ فَقُلِ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ. فَإِنْ مُتَّ مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ»[1].

**٦٣١٣- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری پیاوێکی کرد و[2] فەرمووی: ((ئەو کاتەی دەچیتە سەر جێگای نوستنەکەت بڵێ: خوایە خۆم دایە دەستی تۆ، وە کاروباری خۆم بە تۆ سپارد، تەنها پشتم بەتۆ بەستووە، ئومێدم هەر بەتۆیە، ترسیشم هەر لە تۆیە، هیچ پەناگا و پارێزەرێك نییە لە بەرانبەر تۆدا مەگەر لای خۆت، خوایە باوەڕم هەیە بەو پەڕاوەی داتبەزاندووە، وە بەو پێغەمبەرەی ناردووتە، جا ئەگەر لەو شەوتدا مردیت ئەوە لەسەر ئیمانداری دەمریت)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٧.

(٢) لە گێڕانەوەکەی یەکەمدا دەڵێ: فەرمانی بە پیاوێک کرد.

## ٨- بابُ وَضْعِ اليَدِ تَحْتَ الخَدِّ الأَيْمَنِ

٦٣١٤- حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ المَلِكِ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا». وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[1].

## ٨- باسی دەست ڕاست خستنە ژێر کوڵمی ڕاست (لە کاتی خەوتندا سونەتە)

**٦٣١٤- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە شەودا دەچووە ناو پێخەفی نوستنەکەیەوە، دەستی دەخستە ژێر کوڵمی و دەیفەرموو:** ((اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا)) **واتە: خوایە بەناوی تۆوە دەمرم و دەژیم، کاتێکیش لە خەو هەستایە دەیفەرموو:** ((الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)) **واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە پاش ئەوەی مراندینی (بە خەوتن)، زیندوو کردنەوە (ی ڕۆژی دوایی)ش هەر لای ئەو دەبێت.**

## ٩- بابُ النَّوْمِ عَلَى الشِّقِّ الأَيْمَنِ

٦٣١٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، حَدَّثَنَا العَلاَءُ بْنُ الْمُسَيَّبِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ نَامَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي

---

(١) بڕوانە: ٦٣١٢.

أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ". وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَهُنَّ ثُمَّ مَاتَ تَحْتَ لَيْلَتِهِ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ». ﴿وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ ﴿١١٦﴾﴾ الأعراف. مِنَ الرَّهْبَةِ، مَلَكُوتٌ مُلْكٌ مَثَلُ: رَهَبُوتٌ خَيْرٌ مِنْ رَحَمُوتٍ، تَقُولُ: تَرْهَبُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَرْحَمَ[1].

## ٩- باسی خەوتن لەسەر لای ڕاست (سوننەتە)

**٦٣١٥- بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەچووە ناو پێخەفی نوستنەکەیەوە لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا و دەنوست، پاشان دەیفەرموو: ((خوایە خۆم دایە دەستی تۆ، وە کاروباری خۆم بە تۆسپارد، تەنها پشتم بە تۆ بەستووە، ئومێدم هەر بەتۆیە ترسیشم هەر لە تۆیە، هیچ پەناگا و پارێزەرێك نییە لە بەرانبەر تۆدا مەگەر لای خۆت، خوایە باوەڕم هەیە بەو پەڕاوەیە داتبەزاندووە، وە بەو پێغەمبەرەی ناردووتە))، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جا هەر کەس ئەو نزایانە بکات و بیانڵێت پاشان لەو شەوەدا بمرێت، ئەوە لەسەر ئیمانداری دەمریت)).**

﴿وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ ﴿١١٦﴾﴾ الأعراف[2] **لە** (الرَّهْبَةِ)**ەوە هاتووە (واتە: ترسێکی گەورەیان خستە دڵیانەوە)،** (مَلَكُوتٌ) **واتە: خاوەن دەسەڵات، وەکو:** (رَهَبُوتٌ خَيْرٌ مِنْ رَحَمُوتٍ) **واتە:** (مَلَكُوتٌ) **لەسەر کێشی** (رَهَبُوتٌ) **و** (رَحَمُوتٍ)**ە، مانای ئەم بڕگەی کۆتای وەك ئەوەیە کە دەڵێت** (تَرْهَبُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَرْحَمَ)**، واتە: خەڵك لێت بترسی چاکترە لەوەی بەزەییان پیاتا بێتەوە** [3].

---

(١) بڕوانە: ٢٤٧.

(٢)سوڕەتی ئەعراف ١١٦: ئەم وشانە هیچ پەیوەندیەکی بەم باسەوە نییە، بۆیە لە هەندێ نوسخەی بووخاریدا نییە.

(٣) دروستە بەم جۆرەش مانا بکرێت: خەڵک بترسێنی چاکترە لەوەی ڕەحمیان پێبکەیت. فەرموودەکە بەهەردوو شێوە ڕیوایەت کراوە بەو شێوەی سەرەوە، وەبەم شێوەش: (تُرْهَبُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تُرْحَمُ) فەرموودەی ژمارە (46260).

## ١٠- بَابُ الدُّعَاءِ إِذَا انْتَبَهَ مِن اللَّيْلِ

٦٣١٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا ابْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ سَلَمَةَ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ مَيْمُونَةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَتَى حَاجَتَهُ، غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ فَأَتَى القِرْبَةَ فَأَطْلَقَ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ وُضُوءَيْنِ لَمْ يُكْثِرْ وَقَدْ أَبْلَغَ، فَصَلَّى، فَقُمْتُ فَتَمَطَّيْتُ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَى أَنِّي كُنْتُ أَتَّقِيهِ، فَتَوَضَّأْتُ، فَقَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِأُذُنِي فَأَدَارَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَتَتَامَّتْ صَلاَتُهُ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ -وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ- فَآذَنَهُ بِلاَلٌ بِالصَّلاَةِ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ، وَكَانَ يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي بَصَرِي نُورًا، وَفِي سَمْعِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَفَوْقِي نُورًا، وَتَحْتِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَخَلْفِي نُورًا، وَاجْعَلْ لِي نُورًا». قَالَ كُرَيْبٌ: وَسَبْعٌ فِي التَّابُوتِ. فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ وَلَدِ الْعَبَّاسِ فَحَدَّثَنِي بِهِنَّ، فَذَكَرَ عَصَبِي وَلَحْمِي وَدَمِي وَشَعَرِي وَبَشَرِي، وَذَكَرَ خَصْلَتَيْنِ[1].

## ١٠- باسی ئەم پاڕانەوە (سوننەتە) ئەگەر کەسێک لە شەودا خەبەری بوویەوە

**٦٣١٦ -ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: شەوێك لای مەیمونە[2] مامەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بۆ پێویستیەکی لە خەو هەستا دەست و دەم و چاوی شۆری، پاشان خەوت، دواتر هەستا و ڕۆشت بۆ لای کونەیەك زاربێنەکەی کردەوە، پاشان دەستنوێژێکی گرت کە دەستنوێژێکی مام ناوەندی بوو، زۆر ئاوی بەکارنەهێنا (کەمیش نەبوو)، بەجوانی و ڕێك و پێکی دەستنوێژەی گرت و نوێژی کرد، جا منیش هەستام ڕاست و قنج بوومەوە نەبادا کەوا بزانێ من بەدزییەوە چاودێریم کردوە،**

---

(١) بڕوانە: ١١٧.

(٢) کە پوریەتی.

دەستنوێژم گرت، جا پێغەمبەر ﷺ هەستا و نوێژی کرد، منیش لای چەپیەوە وەستام (نوێژم کرد)، ئینجا گوێیەکمی گرت و سوڕاندمییەوە بۆ لای ڕاستی خۆی، جا نوێژەکەی بەسیازدە ڕەکات تەواو بوو، لە پاشان ڕاکشا و خەوت هەتا فوی دەکرد، چونکە پێغەمبەر ﷺ کە بخەوتایە فوی دەکرد لە (برى پرخە)، ئینجا بیلال ئاگادری کرد بۆ نوێژ کردن، ئیتر نوێژی کرد دەستنوێژیشی نەگرتەوە و لە دوعاکەیدا دەیفەرموو: ((خوادایە لە دڵمدا نوور بەرپا بکەی، وە لە چاومدا نوور بەرپا بکەی، وە لە گوێمدا نوور بەرپا بکەی، وە لە ڕاست و چەپ و سەر و ژێر و پێشەوە و پاشەوەم نوور بەرپا بکەی، وە نوورم پێ ببەخشە))، کوریب وتی: حەوت وشەن لە سنگمدا، ئینجا بەیەکێك لە کوڕەکانی عەبباس گەشتم ئەو حەوت (جۆرەی نووری) بۆ گێڕامەوە کە وتی: لە دەمارم و گۆشت و خوێنم و مووم و پێستم [1]، دوو شتی تریشی وت (بیرم نەماوە).

٦٣١٧- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ أَبِي مُسْلِمٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ الْحَقُّ وَوَعْدُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ" -أَوْ- "لاَ إِلَهَ غَيْرُكَ"[2].

٦٣١٧- تاووس لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە شەودا هەڵسایەوە شەونوێژی بکردایە دەیفەرموو: ((خوایە

(١) واتە: نوور لە مانەشدا بەرپا بکەیت.
(٢) بڕوانە: ١١٢٠.

**هەموو سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆ ڕووناك كەرەوەی ئاسمانەكان و زەوی، وە ڕووناك كەرەوەی ئەوەشی تێیان دایە، سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆ ڕاگری ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی تێیان دایە، سوپاس هەر بۆ تۆیە، تۆ ڕاستی و هەقی و بەڵێنت و فەرمایشتت ڕاست و دروستە، گەشتن بەحزورت (لە قیامەتدا) ڕاستە، بەهەشت ڕاستە و دۆزەخ ڕاستە، قیامەت ڕاستە، پێغەمبەران هەق و ڕاستن موحەممەدیش ﷺ ڕاستە، خوایە تەنها گەردن كەچی تۆم، و پشتم تەنها بەتۆ بەستووە، باوەڕم بەتۆ هێناوە، هەر بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوە، وە بە پشتیوانی تۆ دەچم بەگژ دوژمناندا، بڕیار و حوكم هەر لە تۆ وەردەگرم، دەی ئەوەی كردوومە و ئەوەشی دەیكەم لە تاوان لێم خۆشبە، ئەوەشی پەنهانم كردوە ئەوەشی ئاشكرام كردوە، تۆ پێش هەموو شتێك بوویت و دوا هەموو شتێكیش دەمێنیت، هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە تۆ -یا جگە لە تۆ پەرستراو نییە-)).**

## ١١- بابُ التَّكْبِيرِ وَالتَّسْبِيحِ عِنْدَ المَنَامِ

٦٣١٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ فَاطِمَةَ ﷺ شَكَتْ مَا تَلْقَى فِي يَدِهَا مِنَ الرَّحَى، فَأَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ تَسْأَلُهُ خَادِمًا، فَلَمْ تَجِدْهُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ، فَلَمَّا جَاءَ أَخْبَرَتْهُ. قَالَ: فَجَاءَنَا وَقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْتُ أَقُومُ، فَقَالَ: «مَكَانَكِ». فَجَلَسَ بَيْنَنَا حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِي، فَقَالَ: «أَلاَ أَدُلُّكُمَا عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ؟ إِذَا أَوَيْتُمَا إِلَى فِرَاشِكُمَا -أَوْ أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا- فَكَبِّرَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَسَبِّحَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَاحْمَدَا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، فَهَذَا خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ».

٦٣١٨م- وَعَنْ شُعْبَةَ، عَنْ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: التَّسْبِيحُ أَرْبَعٌ وَثَلاَثُونَ[1].

---

(١) بڕوانە: ٣١١٣.

## ١١- باسی (اللّه اكبر) و (سبحان اللّه ) كردن له كاتی خەوتندا

٦٣١٨- ئیبنو ئەبی لەیلا لە عەلیەوە دەگێڕێتەوە کە فاتیمە ﷺ سکاڵای ماندووبوونی دەستەکانی کرد بەهۆی هاڕیین بە دەستاڕ، بۆیە ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و داوای خزمەتکارێکی لێ بکات، بەڵام پێغەمبەری ﷺ نەبینی، بۆیە داواکەی بۆ عائیشە ﷺ باسکرد، جا کە پێغەمبەر ﷺ هاتەوە عائیشە ﷺ ئەو داوایەی بۆ باس کرد، عەلی دەڵێ: ئەنجا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان لە کاتێکدا چوو بووینە ناو نوێنی نووستنەکەمانەوە ویستم هەڵسم، فەرمووی: ((لە شوێنی خۆت بمێنە و مەجوڵێ))، لە نێوانماندا دانیشت (قاچی خستە سەر سنگم) هەتا ساردی قاچیم هەست پێ کرد لەسەر سنگم و فەرمووی: ((ئایا شتێکتان پێ بڵێم لە خزمەتکار چاکترە بۆ هەردووکتان؟ کاتێ ڕۆشتنە ناو نوێنی نوستنەکەتان - یان کاتێ چوونە سەر جێگای نووستنەکەتان - سی و سێ جار بڵێن (الله أكبر) و سی وسێ جار بڵێن (سبحان الله) و سی و سێ جار بڵێن (الحمد لله)، چونکە بەڕاستی ئەوە چاکترە بۆ هەردووکتان لە خزمەتکار)).

٦٣١٨م- لە شوعبەوە لە خالید و لە ئیبنو سیرینەوە دەڵێ: سی و چوار جار (سبحان الله) وتن.

## ١٢- بابُ التَّعَوُّذِ وَالْقِرَاءَةِ عِنْدَ المَنَامِ

**٦٣١٩-** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ نَفَثَ فِي يَدَيْهِ، وَقَرَأَ بِالْمُعَوِّذَاتِ، وَمَسَحَ بِهِمَا جَسَدَهُ[١].

## ١٢- باسی پەناگرتن بەخوا و قورئان خوێندن لە كاتی خەوتندا

**٦٣١٩- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا كاتێ بڕۆیشتایە ناو پێخەفی نوستنەكەی فووی دەكرد بە هەردوو دەستیدا و سوڕەتی پەنا پێگیراوەكانی[٢] دەخوێند، جا هەر دوو دەستی دەهێنا بە لاشەیدا.**

## ١٣- بابٌ

٦٣٢٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ الصَّالِحِينَ». تَابَعَهُ أَبُو ضَمْرَةَ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّاءَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ. وَقَالَ يَحْيَى وَبِشْرٌ: عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَرَوَاهُ مَالِكٌ، وَابْنُ عَجْلاَنَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٣].

---

(١) بڕوانە: ٥٠١٧.

(٢) بریتین لە سوڕەتی: ئیخلاس: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾، وە سوڕەتی فەلەق: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾، وە سوڕەتی ناس: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾.

(٣) بڕوانە: ٧٣٩٣.

## ١٣- باسێک

٦٣٢٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان چوویە ناو پێخەفی نوستنەکەی با پێخەفەکە ڕاوەشێنێت بەدیوی ناوەوەی پۆشاکەکەی [1]، چونکە نازانێت چی تیا جێ مابێت[2] (لە مار و مێرووی زیان بەخش)، پاشان بڵێت: بەناوی تۆوە پەروەردگارم تەنیشتم دانا و بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە، ئەگەر گیانی منت گرتەوە ئەوە بەزەیت پێدا بێتەوە، وە ئەگەر بەرەڵات کرد ئەوە بیپارێزە بەوەی کە بەندە چاکەکانتی پێ دەپارێزی)).

-ئەبو زەمرە و ئیسماعیلی کوڕی زەکەریا لە عوبەیدوڵڵاوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی زوهەیری کوڕ موعاویە دەکەن.

-وە یەحیا و بیشر لە عوبەیدوڵڵاوە دەیگێڕنەوە ئەویش لە سەعیدەوە لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ

-وە مالیك و ئیبنو عەجلان گێڕویانەتەوە لە سەعیدەوە لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

## ١٤- بابُ الدُّعَاءِ نِصْفَ اللَّيْلِ

٦٣٢١- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الأَغَرِّ وَأَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَتَنَزَّلُ رَبُّنَا ﷻ كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ وَمَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟»[3].

---

(١) واتە: پۆشاکەکە بگرێ بە دەستیەوە پێخەفەکە ڕاوەشێنێ دەستی نەدات لە پێخەفەکە بەڕووتی، بەڵکو بە دیوی ناوەوەی جلەکانی بیگرێت.

(٢) وەچی پێوەیە لەمارو مێروی زیان بەخەش.

(٣) بروانە: ١١٤٥.

## ١٤- باسی (فەزڵی ) پاڕانەوە لە نیوەی شەودا

٦٣٢١- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەموو شەوێك پەروەردگارمان ﷻ دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا کاتێ سێیەکی کۆتایی شەو ماوە دەفەرمووی: کێ لێم دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە؟ کێ داوام لێ دەکات تا داواکەی پێببەخشم؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات تا لێی خۆش بم)).

## ١٥- بابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ الخَلاَءِ

٦٣٢٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ»[1].

## ١٥- باسی دوعاکردن کاتی چوونە سەرئاو

٦٣٢٢- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە کە دەڕۆشتە سەر ئاو دەیفەرموو: ((خوایە من پەنا دەگرم بەتۆ لە شەیتانەکانی نێر و مێ)).

## ١٦- بابُ مَا يَقُولُ إِذَا أَصْبَحَ

٦٣٢٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا حُسَيْنٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ بُشَيْرِ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا

(١) بڕوانە: ١٤٢.

صَنَعْتُ. إِذَا قَالَ حِينَ يُمْسِي فَمَاتَ دَخَلَ الْجَنَّةَ -أَوْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ- وَإِذَا قَالَ حِينَ يُصْبِحُ فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ مِثْلَهُ"[1].

## ١٦- باسی کە ڕۆژ بوویەوە (مسوڵمان) چی دەڵێت

**٦٣٢٣-شەددادی كوڕی ئەوس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((گەورەترین داوای لێ خۆش بوون لە خوا ئەمەیە: خودایە تۆ پەروەردگاری منی، هیچ پەرەستراوێك ڕاست نیە جگەلە تۆ، تۆ منت دروست كردوە و من بەندەی تۆم، وە من لەسەر پەیمان و بەڵێنی تۆم تا بتوانم، دان دەنێم بە بەهرەكاندا، وە دان دەنێم بە گوناهە و تاوانمدا، كەواتە لێم خۆشبە، چونكە بەڕاستی جگە لە تۆ كەس لە گوناهەكان خۆش نابێت، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی ئەوەی كردوومە، ئەگەر كەسێ ئەمە بڵێ كاتێ ئێوارەی بەسەردا دێت جا بمرێ دەڕواتە بەهەشتەوە - یان لە بەهەشتیان دەبێت - وە ئەگەر كەسێ ئەمە بڵێ كاتێ ڕۆژ دەكاتەوە جا بمرێ، لە ڕۆژەكەیدا وەك ئەوی پێشوو دەبێت (واتە دەڕواتە بەهەشتەوە) ))**

.٦٣٢٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ المَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ قَالَ: «بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحْيَا». وَإِذَا اسْتَيْقَظَ مِنْ مَنَامِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[2].

**٦٣٢٤- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێ بیویستایە بخەوێ دەیفەرموو: ((**بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحْيَا**)) واتە: بەناوی تۆوە خوایە دەمرم و دەژیم، وە كاتێكیش لە خەو هەستایە دەیفەرموو: ((**الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ

---

(١) بڕوانە: ٦٣٠٦.

(٢) بڕوانە: ٦٣١٢.

**النُّشُورُ)) واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە پاش ئەوەی مراندینی، زیندوو کردنەوەش هەر لای ئەو دەبێت.**

٦٣٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ خَرَشَةَ بْنِ الْحُرِّ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: «اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا». فَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[1].

**٦٣٢٥- ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە لە شەودا بڕۆشتایەتە جێگای نوستنەکەی دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا)) واتە: بەناوی تۆوە خوایە دەمرم و دەژیم، وە کاتێکیش لە خەو هەستایە دەیفەرموو: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)) واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە پاش ئەوەی مراندینی (بە خەوتن)، زیندوو کردنەوەی ڕۆژی دواییش هەر لای ئەو دەبێت.**

## ١٧- بابُ الدُّعَاءِ فِي الصَّلَاةِ

٦٣٢٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي يَزِيدُ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاَتِي. قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ».

وَقَالَ عَمْرٌو، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ: إِنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو: قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ لِلنَّبِيِّ ﷺ[1].

---

(١) بڕوانە: ٧٣٩٥.

## ١٧- باسی دوعاکردن له ناو نوێژدا

٦٣٢٦- عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ له ئەبو بەکری صدیقەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەو بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: دوعایەکم فێر بکە لە نوێژەکانمدا دوعای پێ بکەم، ئەویش فەرمووی: ((بڵێ خوایە گیان من ستەمێکی زۆرم لە خۆم کردوە، جگە لە تۆش کەس لە تاوانەکان خۆش نابێت، دەی کەواتە بە لێخۆشبوونی تایبەتی خۆت لێم خۆش بە و بەزەیت پێمدا بێتەوە، بەڕاستی هەر تۆ لێخۆشبووی میهرەبانی)). -عەمر لە یەزیدەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە ئەبی لخەیرەوە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری بیستووە وتی: ئەبو بەکر ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ وت.

٦٣٢٧- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ سُعَيْرٍ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء. أُنْزِلَتْ فِي الدُّعَاءِ[٢].

٦٣٢٧ عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەو ئایەتە: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء[٣]، دەربارەی دوعا و نزا دابەزێنرا.

٦٣٢٨- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَقُولُ فِي الصَّلاَةِ: السَّلاَمُ عَلَى اللَّهِ، السَّلاَمُ عَلَى فُلاَنٍ. فَقَالَ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلاَمُ، فَإِذَا قَعَدَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَلْيَقُلِ: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ -إِلَى قَوْلِهِ

---

(١) بڕوانە: ٨٣٤.

(٢) بڕوانە: ٤٧٢٣.

(٣) ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە. واتە: وە لەنوێژکردنتدا دەنگ بەرزمەکەرەوە بەنهێنیش مەیکە لەو نێوەندەدا ڕێگایەك هەڵبژێرە.

الصَّالِحِينَ- فَإِذَا قَالَهَا أَصَابَ كُلَّ عَبْدٍ لِلَّهِ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ صَالِحٍ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. ثُمَّ يَتَخَيَّرُ مِنَ الثَّنَاءِ مَا شَاءَ»[1].

**٦٣٢٨- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە نوێژدا دەمانووت سەلام لە خوابێ، سەلام لەسەر فلاّن کەس بێ، ئەنجا ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێمان: ((بێگومان خوا خۆی سەلامە، جا ئەگەر کەسێکتان لە نوێژدا دانیشت بۆ تەحیات با بڵێ:** (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ) **تا دەگاتە:** (الصَّالِحِينَ). **جا ئەگەر ئەوە بڵێی: هەموو بەندەیەکی چاك دەگرێتەوە لە ئاسمان و زەویدا، (پاشان بڵێ:)** (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) **پاشان کام دوعا و نزای بەلاوە باشە هەڵیبژێرێ و پێی بپاڕێتەوە)).**

## ١٨- بَابُ الدُّعَاءِ بَعْدَ الصَّلاَةِ

٦٣٢٩- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، أَخْبَرَنَا يَزِيدُ، أَخْبَرَنَا وَرْقَاءُ، عَنْ سُمَىٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالدَّرَجَاتِ وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ. قَالَ: «كَيْفَ ذَاكَ؟». قَالَ: صَلَّوْا كَمَا صَلَّيْنَا، وَجَاهَدُوا كَمَا جَاهَدْنَا، وَأَنْفَقُوا مِنْ فُضُولِ أَمْوَالِهِمْ، وَلَيْسَتْ لَنَا أَمْوَالٌ. قَالُوا: «أَفَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَمْرٍ تُدْرِكُونَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَتَسْبِقُونَ مَنْ جَاءَ بَعْدَكُمْ، وَلاَ يَأْتِي أَحَدٌ بِمِثْلِ مَا جِئْتُمْ، إِلاَّ مَنْ جَاءَ بِمِثْلِهِ؟ تُسَبِّحُونَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ عَشْرًا، وَتَحْمَدُونَ عَشْرًا، وَتُكَبِّرُونَ عَشْرًا». تَابَعَهُ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ سُمَيٍّ. وَرَوَاهُ ابْنُ عَجْلاَنَ، عَنْ سُمَيٍّ وَرَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ. وَرَوَاهُ جَرِيرٌ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ. وَرَوَاهُ سُهَيْلٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

---

(١) بڕوانە: ٨٣١.

(٢) بڕوانە: ٨٤٣.

# ١٨- باسی نزا پاش نوێژ (دروستە)

٦٣٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: (هەژارەکان) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەن سەروەت و سامانە زۆرەکان و پلە بەرزەکان و ناز و نیعمەتی هەتا هەتاییان برد بۆ خۆیان (لە بەهەشتدا)، فەرمووی: ((ئەوە چۆنە؟)) وتیان: ئەوان نوێژیان کردوە چۆن ئێمە نوێژمان کردوە، وە خەباتیان کردوە چۆن ئێمە خەباتمان کردوە، وە ئەوان لە زیادەی ماڵ و سامانەکانیان بەخشیوە، بەڵام ئێمە ماڵ و سامانمان نییە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا شتێکتان پێ بڵێم بگەن بەوانەدا لە پێش ئێوەوەن، وە پێش بکەون لەوانەی کە دوای ئێوەوە دێن؟ وە هیچ کەس وێنەی ئەو کردەوەی ئێوە کردووتانە ناکات مەگەر کەسێك وێنەی کردەوەکەی ئێوە بکات؟ لە پاش هەموو نوێژێکی فەرز دە جار (سبحان الله) بکەن و دە جار (الحمد لله) بکەن و دە جار (الله أكبر) بکەن)).

-عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر لە سومەییەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی وەرقای کردوە.

-وە ئیبنو عەجلان گێڕاویەتیەوە لە سومەییە و ڕەجای کوڕی حەیوەتەوە.

-وە جەریر گێڕاویەتیەوە لە عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیعەوە لە ئەبی صاڵحەوە لە ئەبی دەرداوە ﷺ .

-وە سوهەیل لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

٦٣٣٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْمُسَيَّبِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ وَرَّادٍ -مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ- قَالَ: كَتَبَ الْمُغِيرَةُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ إِذَا سَلَّمَ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ

الْحَمْدُ، وَهْوَ على كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ». وَقَالَ شُعْبَةُ: عَنْ مَنْصُورٍ قَالَ: سَمِعْتُ الْمُسَيَّبَ[١].

**٦٣٣٠- وەڕاد - كە ئازاد كراوی موغیرەی كوڕی شوعبە بوو- دەڵێ: موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ نامەیەكی نووسی بۆ موعاویەی كوڕی ئەبی سوفیان، كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە دوای هەموو نوێژێكی فەرز كە سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو:** ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ)) **واتە: هیچ بەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لەخوا، كە هاوەڵی نییە هەموو دەسەڵات و ستایش هەر بۆ ئەوە و ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە، خوایە ئەوەی تۆ ببەخشی ڕێگری بۆ نییە، ئەوەش تۆ ڕێگری بیت كەس ناتوانێ بیدات، وە هیچ خاوەن پایەو دەسەڵاتێك دەسەڵاتەكەی سوودی نییە بۆی لە ڕۆژی دواییدا لە سزای تۆ.-شوعبە وتی: لە مەنصورەوە گێڕایەوە و وتی: ئەم فەرموودەم لە موسەییەب بیستووە.**

## ١٩- بابُ قَولِهِ ﷻ: ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ﴿١٠٣﴾﴾ التوبة وَمَنْ خَصَّ أَخَاهُ بِالدُّعَاءِ دُونَ نَفْسِهِ

وَقَالَ أَبُو مُوسَى: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عَامِرٍ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ"[٢].

٦٣٣١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ -مَوْلَى سَلَمَةَ- حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ الأَكْوَعِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى خَيْبَرَ، قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَيَا عَامِرُ، لَوْ أَسْمَعْتَنَا مِنْ هُنَيْهَاتِكَ. فَنَزَلَ يَحْدُو بِهِمْ يُذَكِّرُ: تَاللَّهِ لَوْلاَ اللَّهُ مَا اهْتَدَيْنَا. وَذَكَرَ شِعْرًا غَيْرَ هَذَا وَلَكِنِّي لَمْ

---

(١) بڕوانە: ٨٤٤.

(٢) بڕوانە: ٢٨٨٤.

أَحْفَظُهُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ هَذَا السَّائِقُ؟». قَالُوا: عَامِرُ بْنُ الأَكْوَعِ. قَالَ: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ». وَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْلاَ مَتَّعْتَنَا بِهِ. فَلَمَّا صَافَّ الْقَوْمَ قَاتَلُوهُمْ، فَأُصِيبَ عَامِرٌ بِقَائِمَةِ سَيْفِ نَفْسِهِ فَمَاتَ، فَلَمَّا أَمْسَوْا أَوْقَدُوا نَارًا كَثِيرَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَا هَذِهِ النَّارُ؟ على أَيِّ شَيْءٍ تُوقِدُونَ؟». قَالُوا: عَلَى حُمُرٍ إِنْسِيَّةٍ. فَقَالَ: «أَهْرِيقُوا مَا فِيهَا، وَكَسِّرُوهَا». قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ نُهَرِيقُ مَا فِيهَا وَنَغْسِلُهَا؟ قَالَ: «أَوْ ذَاكَ»[1].

## ١٩- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (دوعا و نزای خێریان بۆ بكەن) وە باسی كەسێك دوعایەك تایبەت بكات بە برایەكیەوە جگەلە خۆی

**- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خودایە لە عوبەیدوڵلای كوڕی ئەبی عامیر خۆشبە، خودای لە گوناهی عەبدوڵلای كوڕی قەیس خۆشبە)).**

**٦٣٣١-سەلەمەی كوڕی ئەكوەع ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشتین بۆ خەیبەر، پیاوێك لە ناو خەڵكەكەدا وتی: ئەی عامیر خۆزگە هەندێ لە هۆنراوە و وتەكانت دەدا بە گوێماندا؟ عامیریش دابەزی دەستی كرد بە هۆنراوە وتن بەدەنگەوە ئامۆژگاری دەكرد و دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر خوا نەبوایە ڕێنموون نەدەبووین، چەند هۆنراوەیەكی تر جگە لەمەی وت، بەڵام من لەبەرم نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئاواز بێژە كێیە[2]؟)) وتیان: عامیری كوڕی ئەكوەعە ﷺ ، فەرمووی: ((خوا ڕەحمی پێ بكات))[3].**

---

(١) بڕوانە: ٢٤٧٧.

(٢) بۆیە پێی دەوترێت (سائق) لێخوڕ چونكە بە ئاوازەكەی وشتر خێرا دەكات لە ڕۆشتنیاندا.

(٣) هاوەڵانی پێشتر زانیبویان پێغەمبەر ﷺ لە غەزادا داوای بەزەیی خوای بۆ هەركەسێك بەتایبەت بكردایە شەهید دەبوو.

**جا پیاوێکیش لەناو خەڵکەکەدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی دڵخۆشت نەکردین بە ئاوازەکەی[1] ، ئینجا کاتێ مسوڵمانەکان ڕیزبوون بەرانبەر خەڵکە (کافرە) کە وەستان لەگەڵیان جەنگان، عامیر بەنووکی شیرەکەی خۆی پێکراو مرد، ئینجا کە ئێوارەیان بەسەردا هات ئاگرێکی زۆریان کردەوە،پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەو ئاگرانە چین؟ چی شتێکیان بەسەر وەیە؟)) وتیان: (گۆشتی) گوێدرێژی ماڵییان لەسەرە، ئەویش فەرمووی: ((مەنجەڵەکان هەرچیان تیایە بیان ڕێژن و مەنجەڵەکان بشکێنن))، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی بۆ گۆشتەکەی کە لە مەنجەڵەکاندا نەڕژین و مەنجەڵەکان بشۆرین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((یا وابکەن)).**

٦٣٣٢- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرٍو: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَتَاهُ رَجُلٌ بِصَدَقَةٍ قَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلاَنٍ». فَأَتَاهُ أَبِي فَقَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى»[2].

**٦٣٣٢- عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێك زەکاتێکی بۆ بهێنایە دەیفەرموو: ((خوایە بەزەیی خۆت بڕژە بەسەر بنەماڵەی فلان کەسدا))، جا باوکم زەکاتەکەی برد بۆی پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە بەزەیی خۆت بڕژە بەسەر بنەماڵەی ئەبی ئەوفادا)).**

٦٣٣٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَرِيرًا قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الخَلَصَةِ؟». وَهْوَ نُصُبٌ كَانُوا يَعْبُدُونَهُ يُسَمَّى الْكَعْبَةَ الْيَمَانِيَةَ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ لاَ أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ، فَصَكَّ

---

(١) واتە: بە نزاکەت بۆی شەهید دەبێ، تۆ نەوهێشت بە ئاوازەکەی دڵخۆش بین.

(٢) بڕوانە: ١٤٩٧.

فِي صَدْرِي فَقَالَ: «اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا». قَالَ: فَخَرَجْتُ فِي خَمْسِينَ مِنْ أَحْمَسَ مِنْ قَوْمِي- وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: فَانْطَلَقْتُ فِي عُصْبَةٍ مِنْ قَوْمِي- فَأَتَيْتُهَا فَأَحْرَقْتُهَا، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا أَتَيْتُكَ حَتَّى تَرَكْتُهَا مِثْلَ الْجَمَلِ الأَجْرَبِ. فَدَعَا لأَحْمَسَ وَخَيْلِهَا[1].

**٦٣٣٣-قەیس دەڵێ: لە جەریرم ﷺ بیست وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((ئەری (بوتخانەی) زولخەلەصەم لەكۆڵ ناكەیتەوە و دڵخۆشم ناكەیت؟)) كە چەند بەرد و بتێك بوون خەڵكەكە دەیان پەرەستن، پێی دەوترا كەعبەی یەمەن، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من كەسێكم بەسەر ئەسپەوە خۆم ناگرم، ئینجا دەستی كێشا بەسنگمدا و فەرمووی: ((خودایە ڕایگرە (بەسەر ئەسپەوە) و بیكە بە ڕێ نیشاندراوێكی ڕێنیشاندەر))، دەڵێ: جا لەگەڵ پەنجا سواری ئەحمەس لە هۆزەكەمدا ڕۆشتم - هەندێ جار سوفیان دەیوت: جا تێم تەقاند لەگەڵ كۆمەڵێك لە هۆزەكەمدا - ئینجا چوومە زولخەلەصە و سوتاندم، لە پاشان هاتمەوە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا نەهاتم بۆ خزمەتی تۆ هەتا ئەو كاتەی كە بە جێم هێشت دەتووت وشتری گەڕی قەترانی پێدا كراوە، پێغەمبەریش ﷺ دوعای كرد بۆ (هۆزی) ئەحمەس و ئەسپەكانی.**

٦٣٣٤- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَنَسٌ خَادِمُكَ. قَالَ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ»[2].

**٦٣٣٤-ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئوممو سولەیم[1] عەرزی پێغەمبەری ﷺ كرد ئەمە ئەنەسە خزمەتكارتە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خودایە ماڵ و سامانی و منداڵی زۆر بكەیت، وە فەڕ و بەرەكەتیش بخەیتە ئەوەی پێیت بەخشی))**

---

(١) بڕوانە: ٣٠٢٠.

(٢) بڕوانە: ١٩٨٢.

٦٣٣٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يَقْرَأُ فِي الْمَسْجِدِ. فَقَالَ: «رَحِمَهُ اللَّهُ، لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً أَسْقَطْتُهَا فِي سُورَةِ كَذَا وَكَذَا»[٢].

**٦٣٣٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا گوێی لە پیاوێك بوو قورئانی دەخوێند، فەرمووی: ((خوا ڕەحمی پێ بكات بەڕاستی ئەوەندە و ئەوەندە ئایەتی بیرخستمەوە كە من لەو سورەتە و لەو سورەتە دەمپەڕاند)).**

٦٣٣٦- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، أَخْبَرَنِي سُلَيْمَانُ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ قَسْمًا، فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ هَذِهِ لَقِسْمَةٌ مَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللَّهِ. فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَغَضِبَ حَتَّى رَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ وَقَالَ: «يَرْحَمُ اللَّهُ مُوسَى، لَقَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ»[٣].

**٦٣٣٦- ئەبو وائیل دەڵێ: لە عەبدوڵڵام ﵁ بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ دەستكەوتێكی دابەش كرد، پیاوێكیش وتی: بەڕاستی ئەمە دابەشكردنێكە ڕەزامەندی خوای تیدا مەبەست نەبووە، عەبدوڵڵا دەڵێ: منیش قسەكەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش تووڕە بوو بە جۆرێ لەڕووخساریدا تووڕەییم دەبینی، وەفەرمووی ((خوا ڕەحم بە مووسا ﵇ بكات بێگومان لەمە زیاتر ئازار درا بەڵام ئارامی گرت)).**

---

(١) كە دایكی ئەنەسە ﵄.

(٢) بڕوانە: ٢٦٥٥.

(٣) بڕوانە: ٣١٥٠.

## ٢٠- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنَ السَّجْعِ فِي الدُّعَاءِ

٦٣٣٧- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ السَّكَنِ، حَدَّثَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلاَلٍ أَبُو حَبِيبٍ، حَدَّثَنَا هَارُونُ الْمُقْرِئُ، حَدَّثَنَا الزُّبَيْرُ بْنُ الخِرِّيتِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدِّثِ النَّاسَ كُلَّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ أَبَيْتَ فَمَرَّتَيْنِ، فَإِنْ أَكْثَرْتَ فَثَلاَثَ مِرَارٍ، وَلاَ تُمِلَّ النَّاسَ هَذَا الْقُرْآنَ، وَلاَ أُلْفِيَنَّكَ تَأْتِي الْقَوْمَ وَهُمْ فِي حَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِهِمْ فَتَقُصُّ عَلَيْهِمْ، فَتَقْطَعُ عَلَيْهِمْ حَدِيثَهُمْ فَتُمِلُّهُمْ، وَلَكِنْ أَنْصِتْ، فَإِذَا أَمَرُوكَ فَحَدِّثْهُمْ وَهُمْ يَشْتَهُونَهُ، فَانْظُرِ السَّجْعَ مِنَ الدُّعَاءِ فَاجْتَنِبْهُ، فَإِنِّي عَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابَهُ لاَ يَفْعَلُونَ إِلاَّ ذَلِكَ. يَعْنِي: لاَ يَفْعَلُونَ إِلاَّ ذَلِكَ الاجْتِنَابَ.

## ٢٠- باسی ئەوەی ناپەسەندە لە بەسەروا[1] دوعاکردن

**٦٣٣٧-عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: هەموو هەینیەك یەك جار قسە بۆ خەڵکی بکە، ئەگەر وات نەکرد با دوو جار بێت، ئەگەر زۆرت کرد با سێ جار بێت، خەڵکی بێزار مەکە لەم قورئانە، وە بەڕاستی نابێ وابتبینم بڕۆیتە لای کۆمەڵێ لە کاتێکدا لە قسە و باسێکی خۆیاندا، بەسەرهات و چیرۆکیان بۆ بگێڕیتەوە قسە و باسەکەیان پێ ببڕی و بێزاریان بکەیت، بەڵکو بێدەنگ بەو گوێ بگرە، جا ئەگەر داوایان لێ کردیت قسەیان بۆ بکە کاتێ حەزیان لێ بێت، سەرنج بدە ئەوەی دوا ڕێکخستنە (سەجعە) لە دوعادا خۆتی لێ بپارێزە، چونکە بەڕاستی من پێغەمبەر و ﷺ هاوەڵانیم وا بینیوە ئەو کارە ناکەن، واتە: خۆیان دەپاراست لە دوا ڕێکخستن (سەجع) لە دوعادا.**

(١) پێشی دەوترێ: دوا ڕێکخستن، بەکێش. بڕوانە (ئەلمونجید بە کوردی:٤٤٢/٢).

## ٢١- بابٌ: لِيَعْزِمِ[1] الْمَسْأَلَةَ، فَإِنَّهُ لا مُكْرِهَ لَهُ

٦٣٣٨- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ فَلْيَعْزِمِ المَسْأَلَةَ، وَلاَ يَقُولَنَّ: اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي. فَإِنَّهُ لاَ مُسْتَكْرِهَ لَهُ»[2].

## ٢١- باسێک: با بەسەر خواستی داوا بکات (لە خوا) چونکە بێگومان هیچ ناچار کەرێک نییە بۆ خوا

**٦٣٣٨-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکتان داوای (لە خوا) کرد با بەسوور بوونەوە داوا بکات (لە خوا)، وە نەڵێت: خودایە ئەگەر ویستت داواکەم پێ بدەیت، چونکە بێگومان هیچ ناچار کەرێك نییە بۆ خوا)).**

٦٣٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ. لِيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ، فَإِنَّهُ لاَ مُكْرِهَ لَهُ»[3].

**٦٣٣٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کەستان نەڵێن: خوایە لێم خۆشبە، خوایە ڕەحمم پێ بکە ئەگەر ویستت، با بەسوور خواستی داوا بکات، چونکە بێگومان هیچ ناچارکەرێك نییە بۆ خوا)).**

---

(١) (لِيَعْزِم المَسأَلَةَ) واتە: با بەسەر خواستی داوا بکات، یا بەهەتەری داوا بکات. بروانە: (ئەلمونجید بە کوردی: ٣٥٢/٣)، وە ڕاستە بڵێی بە سوور بوونەوە.

(٢) بروانە: ٧٤٦٤.

(٣) بروانە: ٧٤٧٧.

## ٢٢- بَابُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَعْجَلْ

٦٣٤٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ -مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي».

## ٢٢- باسی نزای بەندە گیرا دەكرێت بەمەرجێ پەلە نەكات

**٦٣٤٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمووی: ((نزای هەر كامتان گیرا دەكرێت، بەمەرجێ پەلە نەكات، بڵێ: دوعام كرد بەڵام گیرا نەكرا لێم)).**

## ٢٣- بَابُ رَفْعِ الأَيْدِي فِي الدُّعَاءِ

وَقَالَ أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ ﷺ : دَعَا النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَرَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ[١]. وَقَالَ ابن عُمَرَ ﷺ: رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَيْهِ وقال: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ"[٢].

٦٣٤١ - قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: وَقَالَ الأُوَيْسِيُّ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ وَشَرِيكٍ، سَمِعَا أَنَسًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ[٣].

## ٢٣- باسی بەرز كردنەوەی دەستەكان لە دوعادا (دروستە)

**-ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پاڕایەوە پاشان هەردوو دەستی بەرز كردەوە و سپیایی هەردوو بن باڵیم بینی.**

---

(١) بڕوانە: ٤٣٢٣.

(٢) بڕوانە: ٤٣٣٩.

(٣) بڕوانە: ١٠٣٠.

-ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە فەرمووی: ((خوایە لای تۆ خۆم بەری دەکەم لەوەی خالید کردوویەتی)).

٦٣٤١-ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئووەیسی دەڵێ: موحەممەدی کوڕی جەعفەر بۆی گێڕامەوە لە یەحیای کوڕی سەعید و شەریکەوە کە هەردووکیان لە ئەنەسیان ﷺ بیست، ئەویش گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەردوو دەستی بەرز کردەوە (لە دوعا کردندا)، هەتا سپیایی هەردوو بن باڵیم بینی.

## ٢٤- بابُ الدُّعَاءِ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِ القِبْلَةِ

٦٣٤٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَحْبُوبٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا. فَتَغَيَّمَتِ السَّمَاءُ وَمُطِرْنَا حَتَّى مَا كَادَ الرَّجُلُ يَصِلُ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَلَمْ تَزَلْ تُمْطَرُ إِلَى الْجُمُعَةِ الْمُقْبِلَةِ، فَقَامَ ذَلِكَ الرَّجُلُ أَوْ غَيْرُهُ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَصْرِفَهُ عَنَّا، فَقَدْ غَرِقْنَا. فَقَالَ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا». فَجَعَلَ السَّحَابُ يَتَقَطَّعُ حَوْلَ الْمَدِينَةِ وَلاَ يُمْطِرُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ[1].

## ٢٤- باسی دوعا کردن (دوعاکارەکە) ڕووی بە قیبلە نەبێت

٦٣٤٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا وتاری دەدا، جا پیاوێك هەستایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوابکە لەخوا بارانمان بۆ ببارێنێ، (ئەویش دوعای کرد) ئیتر ئاسمان بوو بە هەور و بارانمان بۆ باری، بەجۆرێ نزیك بوو پیاو نەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی، جا تا هەینی داهاتوو باران باری، ئینجا ئەو پیاوەی یان کەسێکی تر هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوا بکە لە خوا کە ئەو بارانەمان لێ لادات، بەراستی

(١) بروانە: ٩٣٢.

بووین بەژێر ئاوەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوایە ئەم بارانە بەدەور و بەرماندا ببارێنە و لە سەرمان مەیبارێنە))، ئەنەس دەڵێ: جا هەورەکە بوویە چەند پاچەیەکەوە بە دەرەوەی مەدینەدا بڵاوبوویەوە، باران بەسەر خەڵکی مەدینەدا نەدەباری.

## ٢٥- بَابُ الدُّعَاءِ مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ

٦٣٤٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى، عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى هَذَا الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي، فَدَعَا وَاسْتَسْقَى، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَقَلَبَ رِدَاءَهُ[1].

## ٢٥- باسی دوعا کردن (دوعا کارەکە) ڕوو بە قیبلە بێت

٦٣٤٣- عەبدوڵڵای کوڕی زەید دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە دەرەوە بۆ ئەو نوێژگە و داوای باران بارینی کرد، جا ڕووی کردە قیبلە و پۆشاکەکەی هەڵگەڕاندەوە.

## ٢٦- بَابُ دَعْوَةِ النَّبِيِّ ﷺ لِخَادِمِهِ بِطُولِ العُمُرِ وَبِكَثْرَةِ مَالِهِ

٦٣٤٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي الأَسْوَدِ، حَدَّثَنَا حَرَمِيٌّ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَتْ أُمِّي: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خَادِمُكَ أَنَسٌ ادْعُ اللَّهَ لَهُ. قَالَ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ»[2].

---

(١) بروانە: ١٠٠٥.

(٢) بروانە: ١٩٨٢.

## ٢٦- باسی پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ خزمەتكارەكەی بەتەمەن درێژی و زۆربوونی ماڵ و سامانی

**٦٣٤٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: دایكم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە ئەنەسی خزمەتكارتە، لە خوا بپاڕێرەوە بۆی، فەرمووی: ((خودایە ماڵ و سامانی و منداڵی زۆر بكەیت، وە فەڕ و بەرەكەتیش بخەیتە ئەوەی پێت بەخشی)).**

## ٢٧- بابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ الكَرْبِ

٦٣٤٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَبِي العَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو عِنْدَ الْكَرْبِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ»[1].

## ٢٧- باسی دوعا كران لە كاتی دڵتەنگی و ناڕەحەتیدا

**٦٣٤٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە كاتی دڵتەنگی و ناڕەحەتیدا ئەم دوعایەی دەكرد: ((هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە خوای گەورەی لەسەرخۆ، هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوای پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی، پەروەردگاری عەرشی گەورە)).**

٦٣٤٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامِ بْنِ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ». وَقَالَ وَهْبٌ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ مِثْلَهُ[2]

---

(١) بڕوانە: ٦٣٤٦، ٧٤٢٦، ٧٤٣١.

(٢) بڕوانە: ٦٣٤٥.

.٦٣٤٦-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە کاتی دڵتەنگی و ناڕەحەتیدا ئەم دووعایەی دەکرد: ((هیچ پەرستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوای گەورەی لەسەرخۆ، هیچ پەرستراوێك نییە جگەلە پەروەردگاری عەرشی گەورە، هیچ پەرستراوێك نییە جگەلە خوای پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی و پەروەردگاری عەرشی ڕێز لێگیراوە)). وهب وتی: شوعبە لە قەتادەوە هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشووی بۆ گێڕاینەوە.

## ٢٨- بَابُ التَّعَوُّذِ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ

٦٣٤٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنِي سُمَى، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ.

قَالَ سُفْيَانُ: الْحَدِيثُ ثَلاَثٌ زِدْتُ أَنَا وَاحِدَةً، لاَ أَدْرِي أَيَّتُهُنَّ هِيَ[١].

## ٢٨- باسی پەناگرتن (بەخوا) لە بەڵای بڕسبڕ[٢]

٦٣٤٧-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە پەنای دەگرت بەخوا لە بەڵای بڕستبڕ و لە تووشبوونی نەگبەتی و لە چارەنووسی خراپ و لە پێخۆشبوونی دوژمنان.

سوفیان دەڵێ: فەرموودەکە سێ بڕگەیە، من خۆم بڕگەیەکم بۆ زیاد کردوە نازانم ئەو بڕگە کامەیانە.

---

(١) بڕوانە: ٦٦١٦.

(٢) بڕس یان بڕست: هێزو هەناو:(بڕست)ت بڕیم. فەرهەنگی خاڵ: ل ٣٠.

## ٢٩- بابُ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى»

٦٣٤٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ فِي رِجَالٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ وَهُوَ صَحِيحٌ: «لَنْ يُقْبَضَ نَبِيٌّ قَطُّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ ثُمَّ يُخَيَّرُ». فَلَمَّا نَزَلَ بِهِ وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي، غُشِيَ عَلَيْهِ سَاعَةً، ثُمَّ أَفَاقَ فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى السَّقْفِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى». قُلْتُ: إِذًا لاَ يَخْتَارُنَا، وَعَلِمْتُ أَنَّهُ الْحَدِيثُ الَّذِي كَانَ يُحَدِّثُنَا وَهُوَ صَحِيحٌ. قَالَتْ: فَكَانَتْ تِلْكَ آخِرَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا: «اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى»[1].

## ٢٩- باسی پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ (لە کاتی مردنیدا) بەم نزایە: ((خودایە من هاوڕێ هەرە بەرزەکانم (هەڵبژاردوە) ))

**٦٣٤٨- ئیبنو شیهاب دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەییەب و عوروەی کوڕی زوبەیر لە ناو چەند پیاوێکی زانادا بوون بۆیان گێرامەوە کە عائیشە ﵂ وتی: پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ کە ساغ بوو دەیفەرموو: ((بێگومان هیچ پێغەمبەرێك گیانی نەکێشراوە هەتا شوێنی خۆی لە بەهەشتدا نەبینیبێ، لە پاشان سەرپشك دەکرێ))، جا کە کاتی گیان کێشانی هات لەو کاتەدا سەری لەسەر ڕانی من بوو، تا ماوەیەك هۆشی بەخۆی نەما، پاشان کە هۆشی کردەوە چاوی بەرز کردەوە بۆ بنمیچی ماڵەکە، لە پاشان فەمووی: ((خودایە لەگەڵ هاوڕێی هەرە بەرزدابم))، منیش وتم: کەواتە: لای ئێمە هەڵنابژێرێ، ئەوسا زانیم ئەمە ئەو فەرموودەیەی بوو کە پێشتر بۆی باس دەکردین کە لەشی ساغ بوو.**

**عائیشە ﵂ وتی: ئەو وتەیە کۆتا فەرموودەی بوو کە فەرمووی: ((خودایە لەگەڵ هاوڕێیانی هەرە بڵند دابم)).**

---

(١) بروانە: ٤٤٣٥.

## ٣٠- بَابُ الدُّعَاءِ بِالْمَوْتِ وَالْحَيَاةِ

٦٣٤٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: أَتَيْتُ خَبَّابًا وَقَدِ اكْتَوَى سَبْعًا، قَالَ: لَوْلاَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ[1].

## ٣٠- باسی (نا پەسەندی) دوعای مردن لە خۆکردن و دوعای (بەردەوام بوونی) ژیان[2]

**٦٣٤٩- قەیسی کوڕی ئەبی حازیم دەڵێ: چووین بۆ لای خەبباب سەردانیمان کرد، کە بێگومان حەوت جار خۆی داخ کردبوو، وتی: لەبەر ئەوە نەبوایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لێمان داوای مردن بکەین، داوای مردنم دەکرد.**

٦٣٥٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ قَالَ أَتَيْتُ خَبَّابًا وَقَدِ اكْتَوَى سَبْعًا فِي بَطْنِهِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: لَوْلاَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ[3].

**٦٣٥٠- ئیسماعیل وتی: قەیس بۆی گێڕامەوە و وتی: چووین بۆ لای خەبباب سەردانیمان کرد، کە بێگومان حەوت جار سکی خۆی داخ کردبوو، ئینجا گوێم لێبو دەیوت: لەبەر ئەوە نەبوایە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە لێمان داوای مردن بکەین، داوای مردنم دەکرد.**

٦٣٥١- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ

---

(١) بڕوانە: ٥٦٧٢.

(٢) ئەگەر ژیان بۆ دوعاکەرەکە خراپ بوو.

(٣) بڕوانە: ٥٦٧٢.

مُتَمَنِّيًا لِلْمَوْتِ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي»[1].

**٦٣٥١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((با کەسێکتان لەبەر زیانێك تووشی بووە ئاواتی مردن نەخوازێت، خۆ ئەگەر هەر ناچاربوو ئاوات بە مردن بخوازێت ئەوە بابڵێت: خودایە بمژییەنیت ئەگەر ژیان چاکترە بۆم، وە بم مرێنیت ئەگەر مردن چاکترە بۆم)).**

## ٣١- بَابُ الدُّعَاءِ لِلصِّبْيَانِ بِالْبَرَكَةِ وَمَسْحِ رُءُوسِهِمْ

وَقَالَ أَبُو مُوسَى: وُلِدَ لِي غُلَامٌ، فدعا له رسول الله ﷺ بِالْبَرَكَةِ[2].

## ٣١- باسی دوعای فەڕ و بەرەکەت کردن بۆ منداڵان و دەست هێنان بەسەریاندا

**- ئەبو مووسا ﷺ وتی: کوڕێکمان بوو پێغەمبەر ﷺ دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کرد.**

٦٣٥٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، عَنِ الجَعْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: سَمِعْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ يَقُولُ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ. فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلَ زِرِّ الحَجَلَةِ[3].

**٦٣٥٢- سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: پورم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕی خوشکەزایەم نەخۆشە و ئازاری هەیە.**

---

(١) بڕوانە: ٥٦٧١.

(٢) بڕوانە: ٥٤٦٧.

(٣) بڕوانە: ١٩٠.

**پێغەمبەریش ﷺ دەستی پیرۆزی هێنا بە سەرمدا و دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کردم، پاشان دەستنوێژی گرت و لە ئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، پاشان لە پشتیەوە وەستام و سەیری مۆری پێغەمبەرێتیەکەیم کرد، لە نێوان هەردووشانیدا وەك هێلکەی کەو وابوو.**

٦٣٥٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي عَقِيلٍ أَنَّهُ كَانَ يَخْرُجُ بِهِ جَدُّهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ هِشَامٍ مِنَ السُّوقِ -أَوْ إِلَى السُّوقِ- فَيَشْتَرِي الطَّعَامَ، فَيَلْقَاهُ ابْنُ الزُّبَيْرِ وَابْنُ عُمَرَ فَيَقُولاَنِ: أَشْرِكْنَا فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ دَعَا لَكَ بِالْبَرَكَةِ. فَرُبَّمَا أَصَابَ الرَّاحِلَةَ كَمَا هِيَ، فَيَبْعَثُ بِهَا إِلَى الْمَنْزِلِ[1].

**٦٣٥٣- ئەبی عەقیل دەگێڕێتەوە کە باپیرەی کە عەبدوڵلای کوڕی هیشامە لە بازاڕ دەیبردەوە -یان دەیبرد بۆ بازاڕ- ئینجا خۆراکی دەکڕی، جا ئیبنو زوبەیر و ئیبنو عومەر پێی دەگەشتن هەردووکیان دەیان وت: بمانکە بە هاوبەشی خۆت، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کردوویت، جاری واهەبوو وشتری باربەری وەك خۆی قازانج دەکرد و ئەوسا وشترە باربەرەکەی دەناردەوە بۆماڵەوە.**

٦٣٥٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحِ بْنِ كَيْسَانَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ، وَهُوَ الَّذِي مَجَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي وَجْهِهِ وَهُوَ غُلاَمٌ مِنْ بِئْرِهِمْ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٥٠٢.

(٢) بڕوانە: ٧٧.

**٦٣٥٤-ئیبنو شیهاب دەڵێ: مەحموودی کوڕی ڕەبیع بۆی گێڕامەوە وتی: ئەو بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی کردە دەمی لە بیرەکەیان و پرژاندی بە دەم و چاوی مەحموددا، لە کاتێکدا کە منداڵێکی (پێنج ساڵان) بوو.**

٦٣٥٥- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ فَيَدْعُو لَهُمْ، فَأُتِيَ بِصَبِيٍّ فَبَالَ على ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ إِيَّاهُ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ[1].

**٦٣٥٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵانی بۆ دەهێنرا، ئەویش دوعای بۆ دەکردن جا، کوڕێکی منداڵیان هێنا میزی کرد بە پۆشاکەکەی پێغەمبەردا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ داوای کرد ئاوی بۆ بێنن جا کردی بە شوێنی میزەکەدا و نەیشۆری.**

٦٣٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ ثَعْلَبَةَ بْنِ صُعَيْرٍ -وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ مَسَحَ عَيْنَهُ- أَنَّهُ رَأَى سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ يُوتِرُ بِرَكْعَةٍ[2].

**٦٣٥٦- زوهری دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی سەعلەبەی کوڕی صوعەیر بۆی گێڕامەوە وتی: - پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی تەڕی هێنا بە چاویدا- وە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصم بینی نوێژی ویتری یەك ڕکات کرد.**

## ٣٢- بابُ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

٦٣٥٧- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا الحَكَمُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى قَالَ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ فَقَالَ: أَلاَ أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً؟ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ عَلَيْنَا فَقُلْنَا: يَا

(١) بڕوانە: ٢٣٢.

(٢) بڕوانە: ٤٣٠٠.

رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ قَالَ: «فَقُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[١].

## ٣٢- باسی (چۆنێتی ) سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

**٦٣٥٧- عبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێ: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ به من گەشت وتی: دیارییەکت پێ ببەخشم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ناومان، ئێمەش وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان دەزانین چۆن سەلامت لەسەر بڵێین، بەڵام ئەی چۆن سڵاوات لەسەر بدەین؟ فەرمووی: (بڵێن:** اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ**)) واتە: ئەی خودایە ڕەحمەت و میهربانی خۆت بڕژە بەسەر موحەمەد و هاوسەرانی و نەوەکانیدا هەر ،وەکو ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت ڕژاندووە بەسەر کەس و کاری ئیبراهیمدا، بێگومان تۆ شایستەی سوپاس و بڵندی و شکۆمەندیت، وە خودایە فەڕ و بەرەکەتی خۆت بڕژە بەسەر موحەمەد و کەس وکاری موحەمەددا هەروەك فەڕ و بەرەکەتی خۆت ڕشتووە بەسەر کەس و کاری ئیبراهیمدا بەڕاستی تۆ شایستەی سوپاس و بڵندی و شکۆمەندیت)).**

٦٣٥٨- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي حَازِمٍ وَالدَّرَاوَرْدِيُّ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا السَّلاَمُ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي؟ قَالَ: «قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ»[٢]

---

(١) بڕوانە: ٣٣٧٠.

(٢) بڕوانە: ٤٧٩٨.

**٦٣٥٨- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە (شێوەی) سەلام كردن بوو لێت، ئەی چۆن سڵاوات بدەین لەسەرت؟ فەرمووی: ((بڵێن:** اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ)).

## ٣٣- بابُ هَلْ يُصَلَّى عَلَى غَيْرِ النَّبِيِّ ﷺ؟

وَقَوْلُه ﷻ: ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ﴿١٠٣﴾﴾ التوبة

٦٣٥٩- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كَانَ إِذَا أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ بِصَدَقَتِهِ، قَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ». فَأَتَاهُ أَبِي بِصَدَقَتِهِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى»[1].

## ٣٣- باسی ئایا جگەلە پێغەمبەر ﷺ سڵاوات لەسەر كەسی تر دەدرێت؟

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (دوعا و نزای خێریان بۆ بكە بەڕاستی دوعای تۆ ئارامی و دڵ خۆشیە بۆ ئەوان).**

٦٣٦٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ أَنَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: «قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[2].

---

(١) بڕوانە: ١٤٩٧.

(٢) بڕوانە: ٣٣٦٩.

**٦٣٦٠- ئەبو حومەید ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەوان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ((بڵێن:** اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)) **واتە: ئەی خودایە ڕەحمەت و میهربانی خۆت برژە بەسەر موحەمەد و هاوسەرانی و نەوەکانیدا، هەر وەکو ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت ڕژاندووە بەسەر کەس و کاری ئیبراهیمدا، وە فەڕ و بەرەکەتی خۆت ڕژاندووە بەسەر کەس و کاری ئیبراهیمدا بەڕاستی تۆ شایستەی سوپاس و بڵندی و شکۆمەندیت)).**

## ٣٤- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «مَنْ آذَيْتُهُ فاجعلها لَهُ زَكَاةً وَرَحْمَةً»

٦٣٦١- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺيَقُولُ: «اللَّهُمَّ فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ سَبَبْتُهُ فَاجْعَلْ ذَلِكَ لَهُ قُرْبَةً إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

## ٣٤- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((هەر کەسێکم ئازار دابێت ئەوە بیکەرە پاکبونەوە (ی گوناهەکانی) و ڕەحمەت و بەزەیی پێدا هاتنەوەی))

**٦٣٦١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((خودایە هەر باوەڕدارێك جنێوم پێ دابێت، ئەو جنێودانەی بۆ بگێڕە بە نزیك بوونەوە لە خۆت لە ڕۆژی قیامەتدا))** [1].

(١) سەرنج: عائیشە ﷺ هۆی ئەم فەرموودەیە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ: دوو پیاوە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باس شتێکیان لە گەڵیدا کرد و نازانم چی بوو، توڕەیان کرد و جنێوی پێدان و نەفرینی لێ کردن، جا کە ڕۆشتنە دەرەوە عەرزم کرد بۆ وات وت؟ فەرمووی: ((ئایا نازانی لا پەروەردگارم چیم بە مەرج گرتووە؟ وتوومە:

## ٣٥- بابُ التَّعَوُّذِ مِنَ الفِتَنِ

٦٣٦٢- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ : سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَحْفَوْهُ الْمَسْأَلَةَ، فَغَضِبَ، فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَقَالَ: «لاَ تَسْأَلُونِي الْيَوْمَ عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ بَيَّنْتُهُ لَكُمْ». فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ يَمِينًا وَشِمَالاً، فَإِذَا كُلُّ رَجُلٍ لاَفٌّ رَأْسَهُ فِي ثَوْبِهِ يَبْكِي، فَإِذَا رَجُلٌ كَانَ إِذَا لاَحَى الرِّجَالَ يُدْعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَبِي؟ قَالَ: «حُذَافَةُ»، ثُمَّ أَنْشَأَ عُمَرُ فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ رَسُولاً، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْفِتَنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا رَأَيْتُ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ كَالْيَوْمِ قَطُّ، إِنَّهُ صُوِّرَتْ لِي الْجَنَّةُ وَالنَّارُ حَتَّى رَأَيْتُهُمَا وَرَاءَ الحَائِطِ». وَكَانَ قَتَادَةُ يَذْكُرُ عِنْدَ الْحَدِيثِ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسْـَٔلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴿١٠١﴾ ﴾ المائدة[1].

## ٣٥- باسی پەناگرتن بەخوا لە تاقی کردنەوە[2]

**٦٣٦٢-قەتادە لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: (هاوەڵان) پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد هەتا ئەوەندە پرسیاریان لێ کرد تووڕە بوو، چوویە سەر دوانگەکە و فەرمووی: ((ئەمڕۆ پرسیاری هەر شتێکم لێ بکەن ڕوونی دەکەمەوە بۆتان))، ئیتر منیش دەستم کرد بە ڕوانین بە ڕاست و چەپدا، جا بینیم هەر کەسە و سەری لەناو پۆشاکەکەیدا بوو دەگریا، ئەوسا پیاوێك کە شەڕی بوایە لەگەڵ کەسانی تردا پێی دەوترا زۆڵ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ باوکمە؟ فەرمووی: ((حوزافەیە))، جا عومەر ﷺ هەستا وتی: ئێمە ڕازی**

---

خوایە من مرۆڤم، جا هەر مسوڵمانێک نەفرینم لێکرد یان جنێوم پێدا، ئەوە بیکەرە هۆی پاکبوونەوەی گوناهەکانی و پاداشت بۆی))، صەحیحی بوخاری فەرموودەی (٢٦٠٠)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی ((هەر کەسێک دوعام لێکرد و شیاوی ئەو دوعا لێکردنە نەبوو.) فەرموودەی (٢٦٠٣).

(١) بڕوانە: ٩٣.

(٢) (فتن) بەمانای ئاژاوە و گومڕایی و بێ باوەڕییە.

بووين خوا پەروەردگارمان بێت و ئيسلام ئاينمان بێت و موحەممەد ﷺ پێغەمبەرمان بێت، پەنا دەگرین بە خوا لە ئاژاوە، ئينجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەرگیز ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدی لە چاكە و خراپەدا، بێگومان وێنەی بەهەشت و دۆزەخم نیشاندرا (بە جۆرێ) هەردووكیانم لە پشت ئەو دیوارەوە[1] بینی)). وە قەتادە لەكاتی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا ئەم ئايەتەی دەخوێند و باسی دەكرد: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پرسیار مەكەن لە شتانێك ئەگەر ئاشكرا بكرێن بۆتان ناخۆش و خراپ دەبێت بۆتان).

## ٣٦- بَابُ التَّعَوُّذِ مِنْ غَلَبَةِ الرِّجَالِ

٦٣٦٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو -مَوْلَى الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حَنْطَبٍ- أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأَبِي طَلْحَةَ: «الْتَمِسْ لَنَا غُلاَمًا مِنْ غِلْمَانِكُمْ يَخْدُمُنِي». فَخَرَجَ بِي أَبُو طَلْحَةَ يُرْدِفُنِي وَرَاءَهُ، فَكُنْتُ أَخْدُمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كُلَّمَا نَزَلَ، فَكُنْتُ أَسْمَعُهُ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْبُخْلِ وَالْجُبْنِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ». فَلَمْ أَزَلْ أَخْدُمُهُ حَتَّى أَقْبَلْنَا مِنْ خَيْبَرَ، وَأَقْبَلَ بِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ قَدْ حَازَهَا، فَكُنْتُ أَرَاهُ يُحَوِّي وَرَاءَهُ بِعَبَاءَةٍ -أَوْ كِسَاءٍ- ثُمَّ يُرْدِفُهَا وَرَاءَهُ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ صَنَعَ حَيْسًا فِي نِطَعٍ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَدَعَوْتُ رِجَالاً فَأَكَلُوا، وَكَانَ ذَلِكَ بِنَاءَهُ بِهَا، ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى بَدَا لَهُ أُحُدٌ، قَالَ: «هَذَا جُبَيْلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ». فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَى الْمَدِينَةِ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ جَبَلَيْهَا مِثْلَ مَا حَرَّمَ بِهِ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَصَاعِهِمْ»[2].

---

(١) دیواری میحرابەكەی لە مزگەوتدا.

(٢) بڕوانە: ٣٧١.

# ٣٦- باسی پەناگرتن بەخوا لە (سەختی) زاڵبوونی پیاوانی (هەرچی و پەرچی) [١]

٦٣٦٣- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو تەڵحەی فەرموو: ((بگەڕێ لە ناو مێرد منداڵەكانتاندا مێرد منداڵێكم بۆ پەیدا بكە خزمەت كاریم بكات))، ئەبو تەڵحەش منی لە پاشكۆ خۆیدا سوار كرد و دەرچوو، ئیتر من بەردەستی و خزمەتی پێغەمبەری خوام ﷺ دەكرد، هەر كاتێ دابەزیایە و لای بدایە، جا من گوێم لێبوو زۆر دەیفەرموو: ((خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە خەم و پەژارە و نەتوانین و تەمەڵی و ڕژدەیی و ترسنۆكی و كەلەكە بوونی قەرز و زاڵبوونی پیاوان (بەسەرمدا) )) [٢]، جا بەردەوام خزمەتم دەكرد هەتا لە خەیبەر گەڕاینەوە، وە صەفییەی كچی حویەیی لەگەڵ خۆی هێنا كە بێگومان هەڵیبژاردبوو[٣] بۆ خۆی ئینجا دەمبینی عابایەك- یا پشتەماڵێكی- لە دوای خۆیەوە بۆ دانابوو (بەدەوری كوپەری وشتەركەدا پێچابوو)[٤]، پاشان لە پاشكۆی خۆیەوە سواری دەكرد (هاتین) تا گەیشتینە صەهبا، خورما و ڕۆنێك بەكەشكی كوتراوی دروست كرد لەسەر سفرەیەكی چەرم (داینا)، پاشان ناردمی و پیاوانێكم بانگ كرد و خواردیان، ئەوە گواستنەوەی صەفییە و نانی شاییەكەی بوو، پاشان هات تا كێوی ئوحودی لێوە دەركەوت فەرمووی: ((ئەوە كێوە چكۆلەیەكە ئێمەی خۆش دەوێ و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ))، جا كە مەدینەی لێوە دەركەوت فەرمووی: ((خوایە من نێوانی هەردوو شاخەكەی قەدەغە دەكەم وەك ئەوەی ئیبراهیم ﷺ مەككەی قەدەغە كرد، خوایە فەڕ و بەرەكەت بخەرە موود و صاعیانەوە)) [٥].

---

(١) هەندێ لە پیاوان دەڵێن (غلبة الرجال) واتە: ستەمی كار بەدەست و دەسەڵاتداری وڵات.

(٢) بە داواكردنی قەرزەكە لێم.

(٣) لە دەستكەوتەكانی خەیبەر.

(٤) بۆ ئەوەی ئەوەی سواری دەبێت لە كەوتن بیپارێزێ و بە پاڵ پێوەدانیشی پشوو بدات.

(٥) مود و صاع دوو دەفری پێوانەن كە خۆراك و شتی تریان پێ دەپێوان.

## ٣٧- بَابُ التَّعَوُّذِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ

٦٣٦٤- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أُمَّ خَالِدٍ بِنْتَ خَالِدٍ -قَالَ وَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا سَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ غَيْرَهَا- قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ[1].

## ٣٧- باسی پەناگرتن بەخوا لە سزای گۆڕ

**٦٣٦٤-سوفیان دەڵێ: موسای کوڕی عوقبە بۆی گێڕاینەوە وتی: لە ئوممی خالیدی کچی خالیدم ﵄ بیست- (مووسا) دەڵێ: لە کەسم نەبیست کە ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەر ﷺ بیستبێ جگە لە ئەو (ئوممو خالید)، وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست پەنای دەگرت (بەخوا) لە سزای گۆڕ.**

٦٣٦٥- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ، عَنْ مُصْعَبٍ: كَانَ سَعْدٌ يَأْمُرُ بِخَمْسٍ، وَيَذْكُرُهُنَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ بِهِنَّ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا -يَعْنِي: فِتْنَةَ الدَّجَّالِ- وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[2].

**٦٣٦٥- موصعەب دەڵێ: سەعد[3] فەرمانی دەکرد بەپێنج شت، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەو پێنج شتە کردوە: ((خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ڕژدەیی و ڕەزیلی، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکی، وە پەنات پێ ئەگرم کە بکەومە تەمەنی پەککەوتەیی، و پەنات پێ ئەگرم لە ئاشوبی دونیا - واتە: ئاشوب و فیتنەی دەججال - وە پەنات پێ ئەگرم لە سزای گۆڕ)).**

---

(١) بروانە: ١٣٧٦.

(٢) بروانە: ٢٨٢٢.

(٣) سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص ﵁ .

٦٣٦٦- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَتْ عَلَيَّ عَجُوزَانِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ فَقَالَتَا لِي: إِنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ. فَكَذَّبْتُهُمَا، وَلَمْ أُنْعِمْ أَنْ أُصَدِّقَهُمَا، فَخَرَجَتَا وَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ عَجُوزَيْنِ. وَذَكَرْتُ لَهُ، فَقَالَ: «صَدَقَتَا، إِنَّهُمْ يُعَذَّبُونَ عَذَابًا تَسْمَعُهُ الْبَهَائِمُ كُلُّهَا». فَمَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ فِي صَلاَةٍ إِلاَّ تَعَوَّذَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ[1].

**٦٣٦٦-مەسروق لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کە وتی: دوو پیرەژن لە پیرەژنەکانی جولەکەی مەدینە هاتن بۆ لام هەردووکیان وتیان پێم: بێگومان ئەو کەسانەی لە ناو گۆڕدان (مردووان) لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن، منیش باوەڕم پێ نەکردن، چاکم نەکرد کە باوەڕم پێ نەکردن، ئینجا هەردووکیان ڕۆیشتن، جا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام منیش عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پیرەژن... باسەکەم بۆ گێڕایەوە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەردووکیان ڕاستیان وتووە، بەڕاستی مردووان سزا دەدرێن بەجۆرێك هەموو بێزمانەکان دەیبیستن)).**
**جا دوای ئەوە پێغەمبەرم ﷺ نەدیوە لە نوێژدا ئیللا پەنای گرتووە بە خودا لە سزای گۆڕ.**

## ٣٨- بابُ التَّعَوُّذِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ

٦٣٦٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[2].

(١) بڕوانە: ١٠٤٩.
(٢) بڕوانە: ٢٨٢٣.

## ٣٨- باسی پەنا گرتن بە خوا لە تاقیکردنەوە لە کاتی ژیاندا و لە کاتی مردندا [١]

**٦٣٦٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە دەیفەرموو: ((خوایە پەنات پێ دەگرم لە تەمەڵی و سستی و ترسنۆکی و پیری، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای (ناو) گۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاشوب و تاقیکردنەوەی ژیان و مردن)).**

## ٣٩- بابُ التَّعَوُّذِ مِنَ المَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ

٦٣٦٨- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الغِنَى، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الفَقْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ عَنِّي خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ»[٢].

---

(١) لە کاتی ژیاندا لەو شتانەی تووشی دەبیت لە خەڵەتان بەدونیا و ئارەزووەکان و تاقیکردنەوەکانی کاتی مردن وەک پرسیاری ناو گۆڕ.

(٢) بڕوانە: ٨٣٢.

## ٣٩- باسی پەنا گرتن بە خوا لە گوناهبار و قەرزاری

٦٣٦٨- عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((خودایە من پەنا دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و، لە گوناهباری و، قەرزاری و لە تاقیكردنەوەی ناو گۆڕ و سزای ناوگۆڕ و لە تاقیكردنەوەی ئاگری دۆزەخ و سزای ئاگری دۆزەخ و لە شەڕی فیتنەی دەوڵەمەندی، وە پەنات پێ دەگرم لە تاقیكردنەوەی هەژاری، وە پەنات پێ دەگرم لە تاقی كردنەوەی دەججالی كوێر، خودایە گوناهو تاوانەكانم بە ئاوی بەفر و تەرزە بشۆرە، وە دڵم پاك بكەرەوە لە تاوان و گوناهەكان هەر وەك پۆشاكی پیس لە چڵك پاك دەكەیتەوە، وە نێوان من و تاوانەكان لە یەكتری دوور بخەرەوە، وەك چۆن دووریت خستۆتە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا)).

## ٤٠- بَابُ الاِسْتِعَاذَةِ مِنَ الْجُبْنِ وَالْكَسَلِ

﴿كُسَالَىٰ ﴿١٤٢﴾﴾ النساء. وكَسالَى واحد.

٦٣٦٩- حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ أَبِي عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»[1].

## ٤٠- باسی پەناگرتن بە خوا لە ترس و تەمەڵی

﴿كُسَالَىٰ ﴿١٤٢﴾﴾ النساء، و (كَسالىٰ) وەک یەک وان بەیەک مانا دێن کە تەمەڵییە.

٦٣٦٩-عەمری كوڕی ئەبی عەمر دەڵێ: لە ئەنەسم رضي الله عنه بیست وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە دەیفەرموو: ((خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە خەم و پەژارە و

(١) بڕوانە: ٣٧١.

نەتوانین و تەمەڵی و ترسنۆکی و ڕژدەیی و کەڵەکەبوونی قەرز و زاڵبوونی پیاوان (بەسەرمدا) ))[١].

## ٤١- بابُ التَّعَوُّذِ مِنَ الْبُخْلِ

الْبُخْلُ وَالْبَخَلُ وَاحِدٌ، مِثْلُ الحُزْنِ وَالْحَزَنِ.

٦٣٧٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنِي غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِهَؤُلَاءِ الْخَمْسِ وَيُحَدِّثُهُنَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ البُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[٢].

## ٤١- باسی پەنا گرتن بە خوا لە ڕەزیلی و ڕژدەیی

(الْبُخْلُ) و (الْبَخَلُ) وەك یەك وان، هەردوویان بەمانای ڕەزیلی و ڕژدەیی دێن وەك: (الحُزْنِ) و (الْحَزَنِ) یەك مانیان هەیە کە پەژارە و خەفەتە.

٦٣٧٠- موصعەبی کوڕی سەعد لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمانی بە ئائەم پێنج شتە دەکرد، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕانەوە کە فەرموویەتی: ((خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ڕژدەیی و ڕەزیلی، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکی، وە پەنات پێ دەگرم کە بکەومە تەمەنی پەککەوتەیی، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاشووبی دونیا، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای گۆڕ)).

---

(١) بەداواکردنی قەرزەکە لێم.

(٢) بڕوانە: ٢٨٢٢.

## ٤٢- بابُ التَّعَوُّذِ مِنْ أَرْذَلِ الْعُمُرِ

﴿أَرَاذِلُنَا ﴿٢٧﴾﴾ هود: سقَاطُنَا.

٦٣٧١- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ البُخْلِ»[1].

## ٤٢- باسی پەناگرتن بە خوا لە کەنەفتی و زۆر پیری

﴿أَرَاذِلُنَا ﴿٢٧﴾﴾ هود: **کەسە پەست و نزمەکانمان.**

**٦٣٧١-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە پەنای دەگرت بە خوا و دەیفەرموو: ((خودایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە تەمەڵی و پەنا دەگرم بە تۆ لە ترسنۆکی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە پیری و کەنەفتی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕەزیلی و ڕژدەیی)).**

## ٤٣- بابُ الدُّعَاءِ بِرَفْعِ الوَبَاءِ وَالْوَجَعِ

٦٣٧٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَمَا حَبَّبْتَ إِلَيْنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مُدِّنَا وَصَاعِنَا»[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٨٢٣.

(٢) بڕوانە: ١٨٨٩.

# ٤٣- باسی پاڕانەوە بە نەمانی درم و پەتا و نەخۆشی

**٦٣٧٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوایە مەدینەمان لە لا خۆشەویست بکە وەك مەککەت لە لا خۆشەویست کردوین یان زیاتر، نەخۆشی تایی مەدینە ببە بۆ جوحفە، خوایە بەرەکەت بخەیتە مود و صاعمان).**

٦٣٧٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ أَبَاهُ قَالَ: عَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ شَكْوَى أَشْفَيْتُ مِنْهَا عَلَى الْمَوْتِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَلَغَ بِي مَا تَرَى مِنَ الْوَجَعِ، وَأَنَا ذُو مَالٍ، وَلاَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَةٌ لِي وَاحِدَةٌ، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: فَبِشَطْرِهِ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ أُجِرْتَ، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ». قُلْتُ: أَأُخَلَّفُ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ قَالَ: «إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ فَتَعْمَلَ عَمَلاً تَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ ازْدَدْتَ دَرَجَةً وَرِفْعَةً، وَلَعَلَّكَ تُخَلَّفُ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلاَ تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ». قَالَ سَعْدٌ: رَثَى لَهُ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ أَنْ تُوُفِّيَ بِمَكَّةَ[1].

**٦٣٧٣- عامیری کوڕی سەعد لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: لە حەجی ماڵئاوایدا نەخۆش کەوتم خەریك بوو بمرم، پێغەمبەر ﷺ سەردانی کردم، منیش عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆت دەبینی چەندە نەخۆشم، منیش کەسێکی دەوڵەمەندم کەسیش نییە میراتم بگرێ جگە لە تاقە کچێکم، دە ئایا دروستە دوو سێیەکی ماڵەکەم بکەم بەخێر؟ فەرمووی: ((نەخێر)) وتم: ئەی نیوەی بکەم بەخێر؟ فەرمووی: (( (نەخێر [2] ) سێ یەك زۆریشە، بێگومان**

(١) بڕوانە: ٥٦.

(٢) لە صەحیحی مووسلیم دا ئەم وشە هەیە، فەرموودەی ژمارە: ٤٢٠٩.

ئەگەر تۆ منداڵەكانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بێڵێ باشترە لەوەی بەهەژاری بەجێیان بێڵی، وە دەست لە خەڵكی پان بكەنەوە، وە بێگومان تۆ هیچ خەرجیەك ناكێشیت كە مەبەست پێی ڕەزامەندی خودا بێت ئیللا پاداشتت دەدرێیتەوە، تەنانەت ئەو پاروەش كە دەیكەیت بەدەمی هاوسەرەكەتەوە))، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا من لە پاش (گەڕانەوەی) هاوەڵانم بەجێ دەهێڵرێم لە (مەككە یا لە دونیا)؟ فەرمووی: ((دڵنیابە ئەگەر بەجێش بمێنی و هەر كارێك ئەنجام بدەیت لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەوا پلە و پایەت بەرزدەبێتەوە، لەوانەیە بەجێ بهێڵرێیت تا كەسانێك سوودت لێ ببینن، وە كەسانی تریش بە هۆی تۆوە زیانیان پێ بگات، خودایە كۆچی هاوەڵانم بۆ بگەیەنە بەپایان و بەرەو دوا مەیان گەڕێنەوە، بەڵام داماو سەعدی كوڕی خەولەیە))، سەعد دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی بۆی تەنگ بوو لەبەر ئەوەی لە مەككە مرد و وەفاتی كرد.

## ٤٤- بابُ الاِسْتِعَاذَةِ مِنْ: أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَفِتْنَةِ النَّارِ

٦٣٧٤- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا الْحُسَيْنُ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ مُصْعَبٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: تَعَوَّذُوا بِكَلِمَاتٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَعَوَّذُ بِهِنَّ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٢٨٢٢.

## ٤٤- باسی پەنا گرتن بە خودا لە كەنەفتی و لە تاقیكردنەوەی دنیا و تاقیكردنەوەی ئاگری دۆزەخ

**٦٣٧٤-موصعەبی كوڕی سەعد لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە وتی: بەچەند وتەیەك پەنا بگرن بە خوا كە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە پەنای دەگرت بە خودا پێیان، (دەیفەرموو): ((خودایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ترسنۆكی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕەزیلی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەوە كە بگەڕێمەوە بۆكەنەفتی و زۆر پیری، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە تاقیكردنەوەی دونیا و سزای ناو گۆڕ))**

٦٣٧٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَغْرَمِ وَالْمَأْثَمِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ وَفِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الغِنَى، وَشَرِّ فِتْنَةِ الفَقْرِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا، كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ»[1].

**٦٣٧٥- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((خودایە من پەنا دەگرم بەتۆ لە تەمبەڵی و پیری، لە قەرزاری و گوناهباری، خودایە من پەنا دەگرم بەتۆ لە سزای ئاگری دۆزەخ، وە لە تاقیكردنەوەی ئاگر و سزای ناو گۆڕ، وە لە شەڕی تاقیكردنەوەی دەوڵەمەندی، وە شەڕی تاقیكردنەوەی هەژاری، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕی تاقیكردنەوەی دەججالی كوێر، خودایە گوناه و تاوانەكانم بە ئاوی بەفر و تەرزە بشۆرە، وە دڵم لەتاوان و گوناهەكان پاك بكەرەوە، هەروەك پۆشاكی سپی لە چڵك پاك دەكرێتەوە، وە نێوان من و**

(١) بروانە: ٨٣٢.

تاوانەکان لە یەکتری دوور بخەرەوە، وەك چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستۆتەوە)).

## ٤٥- بابُ الاسْتِعَاذَةِ مِنْ فِتْنَةِ الغِنَى

٦٣٧٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا سَلاَّمُ بْنُ أَبِي مُطِيعٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ خَالَتِهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْغِنَى، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[1].

## ٤٥- باسی پەناگرتن بەخوا لە تاقیکردنەوەی دەوڵەمەندی

**٦٣٧٦- هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە لە پوریەوە - عائیشە ﵂ - دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بەخواو دەیفەرموو: ((خودایە من پەنا دەگرم بەتۆ، وە لە تاقیکردنەوەی ئاگری دۆزەخ و لە سزای ئاگری دۆزەخ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ، وە پەنادەگرم بەتۆ لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە شەڕی تاقیکردنەوەی دەوڵەمەندی، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە شەڕی تاقیکردنەوەی هەژاری، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕی تاقی کردنەوە دەججالی کوێر))**

## ٤٦- بابُ التَّعَوُّذِ مِنْ فِتْنَةِ الفَقْرِ

٦٣٧٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ، وَفِتْنَةِ

---

(١) بروانە: ٨٣٢.

القَبْرِ وَعَذَابِ القَبْرِ، وَشَرِّ فِتْنَةِ الغِنَى، وَشَرِّ فِتْنَةِ الفَقْرِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ قَلْبِي بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الخَطَايَا، كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ المَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ»[1].

## ٤٦- باسی پەنا گرتن بە خوا لە تاقیکردنەوەی هەژاری

**٦٣٧٧- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((خودایە من پەنا دەگرم بەتۆ لە تاقیکردنەوەی ئاگری دۆزەخ و سزای ئاگری دۆزەخ، وە لە تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ و سزای ناو گۆڕ، وە لە خراپەی تاقیکردنەوەی دەوڵەمەندی، وە لە خراپەی تاقیکردنەوەی هەژاری، خودایە من پەنات پێ دەگرم لە تاقی کردنەوە دەججالی کوێر، خودایە دڵم بە ئاوی بەفر و تەرزە بشۆرە، وە دڵم لە گوناه و تاوان پاك بکەرەوە، هەر وەك پۆشاکی سپی لە چڵك پاك دەکەیتەوە، وە نێوان من و تاوانەکانم لە یەکتری دوور بخەرەوە وەك نێوان خۆر هەڵات و خۆر ئاوات دوور خستۆتەوە، خودایە من پەنا دەگرم لە تەمبەڵی و، گوناهباری و، قەرزاری)).**

## ٤٧- بابُ الدُّعَاءِ بِكَثْرَةِ الْمَالِ مَعَ البَرَكَةِ

٦٣٧٨، ٦٣٧٩- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَسٌ خَادِمُكَ ادْعُ اللَّهَ لَهُ: قَالَ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ». وَعَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ مِثْلَهُ[2].

---

(١) بڕوانە: ٨٣٢.
(٢) بڕوانە: ١٩٨٢.

## ٤٧- باسی دوعا کردن بۆ زۆر بوونی ماڵ و سامان لەگەڵ فەڕ و بەرەکەتدا

**٦٣٧٨-٦٣٧٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە ئوممو سولەیمەوە [1] گێڕایەوە کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە ئەنەسی خزمەتکارتە لای خوا دوعای بۆ بکە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خودایە ماڵ و سامان و منداڵی زۆر بکەیت، وە فەڕ و بەرەکەتیش بخەیتە ئەوەی پێت بەخشی)).**

**وە لە هیشامی کوڕی زەیدەوە وتی: وێنەی فەرموودەکەی پێشووم لە ئەنەسی کوڕی مالیکم بیست.**

٦٣٨٠- ٦٣٨١- حَدَّثَنَا أَبُو زَيْدٍ سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: أَنَسٌ خَادِمُكَ. قَالَ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ»[2].

**٦٣٨٠- ٦٣٨١- قەتادە دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست وتی: ئوممو سولەیم [3] وتی بە پێغەمبەر ﷺ: ئەمە ئەنەسی خزمەتکارتە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خودایە ماڵ و سامان و منداڵی زۆر بکەیت، وە فەڕ و بەرەکەتیش بخەیتە ئەوەی پێت بەخشی)).**

## ٤٨- بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ الاِسْتِخَارَةِ

٦٣٨٢- حَدَّثَنَا مُطَرِّفُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَبُو مُصْعَبٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الْمَوَالِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَلِّمُنَا الاسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كُلِّهَا

---

(١) کە دایکی ئەنەسە ﷺ.

(٢) بڕوانە: ١٩٨٢.

(٣) کە دایکی ئەنەسە ﷺ.

كَالسُّورَةِ مِنَ الْقُرْآنِ: «إِذَا هَمَّ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي -أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ- فَاقْدُرْهُ لِي، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي -أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ- فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِّنِي بِهِ. وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ»[1].

## ٤٨- باسی پاڕانەوە لە كاتی داوای ئەوەی باشترە خوا بۆت هەڵبژێرێت

**٦٣٨٢- جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو ئیش وكارێكدا فێری ئیستیخارەی[2] دەكردین وەك چۆن فێری سورەتێك لە قورئانی دەكردین و دەیفەرموو: ((ئەگەر كەسێكتان نیازی كارێكی هەبوو ئەوە با دوو ڕكاتی نوێژی سوننەت بكات، پاشان بڵێت خوایە داوای چاكەت لێ دەكەم بەزانیاری خۆت، وە داوای توانات لێدەكەم بە توانای خۆت، وە داوات لێ دەكەم لە بەهرەی گەورەت، چونكە بەڕاستی تۆ بەتوانایت و من هیچ توانام نییە، وە تۆ هەموو شت دەزانی و من نازانم، وە تۆ زانایت بە هەموو شتە پەنهانەكان. خودایە ئەگەر دەزانی ئەم كارە چاكە بۆ ئایین و ژیانم و پاشە ڕۆژم -یا بڵێ بۆ دونیا و دوا ڕۆژم - ئەوە بەنسیبم بكەیت و بۆم ئاسان بكە، وە ئەگەر دەزانی ئەم كارە خراپە بۆ ئایین و ژیانم و پاشە ڕۆژم -یا بڵێ بۆ دونیا و دوا ڕۆژم- ئەوە دووری خەرەوە لێم و منیش لەو دوور بخەرەوە، وە خەیر و چاكەم بە نسیب بكە لە هەر شوێنێكە، پاشان ڕازیم بكە پێی. وەكارەكەی ناو ببات (لە كاتی دوعاكەیدا) )).**

(١) بڕوانە: ١١٦٢.

(٢) ئیستیخارە: واتە: شتێكە دوو باری هەیە داوا بكەیت خێر و چاكە لە كامیان دایە خوا ئەوەیانت بۆ بكات.

## ٤٩- بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ الْوُضُوءِ

٦٣٨٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: دَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عَامِرٍ». وَرَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ مِنَ النَّاسِ»[1].

## ٤٩- باسی پاڕانەوە لە كاتی دەستنوێژ گرتندا

**٦٣٨٣- ئەبو بوردە لە ئەبو مووساوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ داوای ئاوای كرد و دەستوێژی گرت، لە پاشان هەردوو دەستی بەرز كردەوە و فەرمووی: ((خوایە لە عوبەید ئەبو عامیر خۆشبە))، (ئەوەندە دەستەكانی بەرز كردبوویەوە) سپایی بنباڵیم بینی، لە پاشان فەرمووی: ((خوایە لە ڕۆژی قیامەتدا بیخەرە سەرووی زۆربەی دروستكراوەكانت لە خەڵكی)).**

## ٥٠- بَابُ الدُّعَاءِ إِذَا عَلاَ عَقَبَةً

٦٣٨٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَكُنَّا إِذَا عَلَوْنَا كَبَّرْنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيُّهَا النَّاسُ، ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، وَلَكِنْ تَدْعُونَ سَمِيعًا بَصِيرًا». ثُمَّ أَتَى عَلَيَّ وَأَنَا أَقُولُ فِي نَفْسِي: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ. فَقَالَ: «يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ قَيْسٍ، قُلْ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ. فَإِنَّهَا كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ». أَوْ قَالَ: «أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ هِيَ كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ؟ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٨٨٤.

(٢) بڕوانە: ٢٩٩٢.

## ٥٠- باسی دوعا کردن کاتێ (مرۆڤ) چووە سەر شاخ و بەرزاییەک

٦٣٨٤-ئەبو مووسا ﷺ وتی: ئێمە لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین، جائێمە ئەگەر سەرکەوتینایە بۆ بەرزاییەك ئەللاهو ئەکبەرمان دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە، بەزەییتان بەخۆتاندا بێتەوە و زۆر دەنگ بەرز مەکەنەوە، چونکە بێگومان ئێوە هاوار لە زاتێکی کەڕ یان نادیار و دوور ناکەن، بەڵکو ئێوە هاوار لە زاتێکی بیسەری بینەر دەکەن))، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتە لام، منیش لە دڵی خۆمدا دەمووت: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) جا پێغەمبەریش فەرمووی: ((ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس بڵێ: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)[١] چونکە بێگومان ئەوە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت))، یان فەرمووی: ((ئایا وشەیەکت پێ بڵێم کە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت؟ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)).

## ٥١- بَابُ الدُّعَاءِ إِذَا هَبَطَ وَادِيًا

فِيهِ حَدِيثُ جَابِرٍ ﷺ.

## ٥١- باسی دوعا کردن کاتێ (مرۆڤ) دابەزی بۆ شیو و دۆڵێک

لەم باسەدا فەرموودەکەی جابیر ﷺ گێڕایەوە تیایە[٢].

---

(١) واتە: هەر گۆڕان و توانا و هێزێک بۆ خودایە.

(٢) بە ژمارە: ٢٠٩٩٣ ی بوخاری هێناویەتی.

## ٥٢- بَابُ الدُّعَاءِ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَوْ رَجَعَ

٦٣٨٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوٍ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنَ الأَرْضِ ثَلاَثَ تَكْبِيرَاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ»[1].

## ٥٢- باسی دوعا كردن كاتێ مسوڵمان ویستی سەفەر بكات یان گەڕایەوە لە سەفەر

**٦٣٨٥- عەبدوڵلای كوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بگەڕایەتەوە لە غەزا یا لە حەج یا لە عومرە سێ (الله اكبر)ی دەكرد، لەسەر هەموو بەرزاییەكی زەوییدا، پاشان دەیفەرموو: ((هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە جگە لە خوای تاك و تەنیا كە هیچ هاوبەشێكی نییە، هەموو موڵك و دەسەڵات و سوپاس هەر بۆ ئەوە و ئەو بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە، گەڕاینەوە تەوبەكارین خواپەرستین سوژ دەبەین، سوپاسگوزارین بۆ پەروەردگارمان، خوا بەڵێنەكەی بردە سەر و بەندەكەی خۆی (كە موحەممەد ﷺ) سەرخست و هەر خۆشی هەموو كۆمەڵەكانی تێكشكاند و بەزاندنی )).**

---

(١) بڕوانە: ١٧٩٧.

## ٥٣- بَابُ الدُّعَاءِ لِلْمُتَزَوِّجِ

٦٣٨٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺعَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ فَقَالَ: «مَهْيَمْ؟». أَوْ: «مَهْ؟» -قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»(١).

## ٥٣- باسی دوعا کردن بۆ کەسێ ژنی هێنابێ

**٦٣٨٦ - زەیدی کوڕی سابیت لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: پێغەمبەر بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ئاسەواری زەعفەرانی بینی فەرمووی: ((ئەمە چییە؟)) وتی: ژنێکم هێناوە لەسەر کێشی دەنکە خورمایەك ئاڵتوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا فەڕ و بەرەکەتت بەسەردا بڕژێنێ، خواردنی زەماوەند ساز بکە با بە مەڕێکیش بێت)).**

٦٣٨٧- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: هَلَكَ أَبِي وَتَرَكَ سَبْعَ -أَوْ تِسْعَ- بَنَاتٍ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟». قُلْتُ: ثَيِّبًا. قَالَ: «هَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ". أَوْ "تُضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ». قُلْتُ: هَلَكَ أَبِي فَتَرَكَ سَبْعَ -أَوْ تِسْعَ- بَنَاتٍ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً تَقُومُ عَلَيْهِنَّ. قَالَ: «فَبَارَكَ اللَّهُ عَلَيْكَ». لَمْ يَقُلِ ابْنُ عُيَيْنَةَ وَمُحَمَّدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنْ عَمْرٍو: «بَارَكَ اللَّهُ عَلَيْكَ»(٢).

**٦٣٨٧- عەمر لە جابیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە وتی: باوکم مرد و حەوت کچ - یان نۆ کچ - ی لێ بە جێما، منیش ئافرەتێکم مارە کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((جابیر ژنت هێناوە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((کچ یان بێوەژنت**

---

(١) بروانە: ٢٠٤٩.

(٢) بروانە: ٤٤٣.

هێناوە؟)) وتم: (کچم نەهێنا) بەڵکو بێوەژنم هێناوە، فەرمووی: ((ئەی بۆ کچێکت نەهێنا یاری لەگەڵ بکەیت و یاریت لەگەڵ بکات))، یان ((لەگەڵی پێبکەنی و لەگەڵت پێبکەنێت؟)) دەڵێ عەرزم کرد باوکم مرد و حەوت کچ -یان نۆ کچ- ی لێ بە جێما، منیش پێم ناخۆش بوو کچێکی وەك خۆیان بێنم بۆ لایان، بۆیە ئافرەتێکم هێنا سەرپەرشتیان بکات و ئیش و کاریان بە چاکی بکات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خوا فەڕ و بەرەکەتی تێ بخات بۆت)).

-ئیبنو عویەینە و موحەممەدی کوڕی موسلیم لە عەمرەوە گێڕایانەوە و نەیان وتووە: (بَارَكَ اللَّهُ عَلَيْكَ) واتە: خوا پیرۆزی کات لێت.

## ٥٤- بابُ مَا يَقُولُ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ

٦٣٨٨- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ كُرَيْبٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا. فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا»[1].

## ٥٤- باسی (مسوڵمان) چی بڵێ کاتێ چوویە لای ژنی خۆی

٦٣٨٨-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کەسێکیان کاتێ دەیەوێ لەگەڵ هاوسەریدا دروست بێت بڵێ: بەناوی خواوە خودایە شەیتانم لێ دوور خەرەوە، هەروەها شەیتان دووری بخەرەوە لەو (منداڵە)ی پێمان دەبەخشی، جا بێگومان لەو جووت بوونەی نێوانیاندا منداڵێك نووسرابێ، ئەوە هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت.

(١) بڕوانە: ١٤١.

## ٥٥- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً»

٦٣٨٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ»[1].

## ٥٥- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((ئەی پەروەردگامان لە دونیادا خێر و خۆشیمان پێ بدە))

**٦٣٨٩- ئەنەس ﷺ دەڵێ: بە زۆری نزا و پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەمە بوو: ((خودایە ئەی پەروەردگارمان هەم لە دونیا و هەم لە ڕۆژی دوایی خێر و خۆشیمان پێ بدە، وە لە سزای ئاگر بمان پارێزە)).**

## ٥٦- بابُ التَّعَوُّذِ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا

٦٣٩٠- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ، حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَلِّمُنَا هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ كَمَا تُعَلَّمُ الْكِتَابَةُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ نُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[2].

## ٥٦- باسی پەنا گرتن بە خودا لە تاقیکردنەوە بە دونیا

**٦٣٩٠- موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە وتی: پێغەمبەر ﷺ ئائەم وتانەی فێر دەکردین وەك چۆن مرۆڤ فێری نووسین دەکرێت، (دەیفەرموو): ((خودایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٢٢.

(٢) بڕوانە: ٢٨٢٢.

ڕەزیلی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە ترسنۆکی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی کە بگەڕێمەوە بۆ کەنەفتی و زۆر پیری، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە تاقیکردنەوەی دونیا و سزای ناو گۆڕ)).

## ٥٧- بَابُ تَكْرِيرِ الدُّعَاءِ

٦٣٩١- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُنْذِرٍ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طُبَّ حَتَّى إِنَّهُ لَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ قَدْ صَنَعَ الشَّيْءَ وَمَا صَنَعَهُ، وَإِنَّهُ دَعَا رَبَّهُ ثُمَّ قَالَ: «أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟». فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «جَاءَنِي رَجُلَانِ فَجَلَسَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ. قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ. قَالَ: فِيمَا ذَا؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ وَجُفِّ طَلْعَةٍ. قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي ذَرْوَانَ". وَذَرْوَانُ بِئْرٌ فِي بَنِي زُرَيْقٍ». قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى عَائِشَةَ فَقَالَ: «وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ». قَالَتْ: فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهَا عَنِ الْبِئْرِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَهَلاَّ أَخْرَجْتَهُ؟ قَالَ: «أَمَّا أَنَا فَقَدْ شَفَانِي اللَّهُ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا». زَادَ عِيسَى بْنُ يُونُسَ وَاللَّيْثُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُحِرَ النَّبِيُّ ﷺ فَدَعَا وَدَعَا. وَسَاقَ الْحَدِيثَ[1].

## ٥٧- باسی دووبارە و چەند بارە کردنەوەی دوعا

٦٣٩١- هیشام لە باوکیەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە، کە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ جادوی لێکرابوو هەتا وایدەزانی شتێکی کردوە و نەشیکردبوو، وە بێگومان لە پەروەردگاری پاڕایەوە و پاشان فەرمووی: ((ئەی

(١) بڕوانە: ٣١٧٥.

عائیشە زانیوتە کە خوا وەڵامی دامەوە دەربارەی ئەو داوایەی داوام کردبوو لێی؟ ئینجا عائیشەش وتی: ئەوە چۆن بوو ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((دوو پیاو [1] هاتن بۆ لام، جا یەکێکیان لای سەرمدا دانیشت، ئەوی کەشیان لای پێیەکانم دانیشت، ئینجا یەکێکیان بە هاوڕێکەی وت: ئەم پیاوە ناساغی و نەخۆشییەکەی چییە؟ وتی: جادووی لێکراوە، وتی: کێ جادووی لێ کردوە؟ وتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، وتی: جادووەکە لە چی دایە؟ وتی: لە شانە و مووی بەشانەوە هاتوو لەکیفی خورمای توێکڵی نێر دایە، وتی: لە کوێدایە؟ وتی: لە زەروان دایە)) زەروانیش بیرێکە لە بەنی زورەیق، عائیشە ﵂ دەڵێ: ئینجا پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆشت بۆ سەر بیرەکە، پاشان گەڕایەوە بۆ لای عائیشە ﵂، وە فەرمووی: ((سوێند بەخوا ئاوەکەی وەك ئاوێ وابوو خەنەی تێکرابێ، دار خورماکانیش (کە بەدەوریدا بوون) وەکو سەری شەیتانەکان بوون))، (عائیشە) دەڵێ: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە و باسی بیرەکەی کرد بۆ عائیشە ﵂، دەڵێ: منیش وتم: ئەی بۆچی جادووەکەت دەرنەهێنا؟ فەرمووی: ((بەدڵنیاییەوە من خوا شیفای دام، وە پێم ناخۆش بوو خراپەیەك بۆ ناو خەڵك بوروژێنم))

-عیسای کوڕی یونس و لەیسی کوڕی سەعد لە هیشامەوە گێڕاویانەتەوە لە باوکیەوە لە عائیشەوە ئەم زیادەیان گێڕاوەتەوە، عائیشە ﵂ دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ جادووی لێ کرا ئینجا دووعای کرد هەر دوعای کرد)، ئینجا فەرموودەکە وەك فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە.

---

(١) دوو فریشتە هاتنە خزمەتی.

## ٥٨- بابُ الدُّعَاءِ عَلَى المُشْرِكِينَ

وَقَالَ ابن مَسْعُودٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ"[1].

وَقَالَ: "اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ"[2].

وَقَالَ ابن عُمَرَ: دَعَا النَّبِيُّ ﷺ فِي الصَّلَاةِ: "اللَّهُمَّ العَنْ فُلَانًا وَفُلَانًا". حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ:

﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾[3].

## ٥٨- باسی دووعا کردن لە هاوبەش دانەران

**ئیبنو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خودایە پشتیوانیم بکە لە دژیان (کافرانی قورەیش) بە حەوت ساڵی قات و قڕی و گرانی، وەك حەوت ساڵەکەی (سەردەمی) یوسف ﷺ)).**

**وە فەرمووی: ((خودایە ئەبی جەهل لە ناوبەریت)).**

**ئیبنو عومەر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا ئەم دووعایەی کرد((خودایە فلاَن و فلاَن لە ڕەحم و بەزەیی خۆت دوور بخەرەوە))، هەتا خودا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: (لەو کارەدا هیچ شتێك بەدەست تۆ نییە).**

٦٣٩٢- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلَامٍ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنِ ابْنِ أَبِي خَالِدٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الأَحْزَابِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، سَرِيعَ الْحِسَابِ، اهْزِمِ الأَحْزَابَ، اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ»[4].

---

(١) بڕوانە: ١٠٠٧.

(٢) بڕوانە: ٢٤٠.

(٣) بڕوانە: ٤٠٦٩.

(٤) بڕوانە: ٢٨١٨.

**٦٣٩٢- ئیبنو ئەبی خالید دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفام ﷺ بیست وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە ڕۆژی جەنگی ئەحزابدا) دوعای کرد لەوانەی کۆبوووبوونەوە لە دژی و فەرمووی: ((ئەی خوایە دابەزێنەری قورئان کە لێپرسینەوەت خێرایە، ئەم تاقم و کۆمەڵانە تێکشکێنە، بیان شکێنە و ترس و بیم بخەرە ناویانەوە[١])).**

٦٣٩٣- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ فَضَالَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِنْ صَلاَةِ الْعِشَاءِ قَنَتَ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ سَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ»[٢].

**٦٣٩٣- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەیفەرموو: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)) لە ڕکاتی کۆتایی نوێژی عیشادا دوعای دەکرد و دەیفەرموو: ((خوایە عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە ڕزگار بکەیت، خوایە وەلیدی کوڕی وەلید ڕزگار بکەیت، خوایە سەلەمەی کوڕی هیشام ڕزگار بکەیت، خوایە ئیماندارە لاواز و بێ دەسەڵاتەکان ڕزگار بکەیت، خوایە تۆڵە و سزای خۆت بەتوندی بدەی بەسەر موزەڕدا، خوایە گرانی و قات و قڕییان بەسەردا بێنی وەکو قات و قڕی سەردەمی یوسف ﷺ)).**

(١) بییان هێنە لەرزە لە ترسانا پێیەکانیان خۆی نەگرێت لە زەویدا.
(٢) بڕوانە: ٨٠٤.

٦٣٩٤- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ : قَالَ بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ سَرِيَّةً يُقَالُ لَهُمُ: الْقُرَّاءُ، فَأُصِيبُوا، فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَجَدَ عَلَى شَيْءٍ مَا وَجَدَ عَلَيْهِمْ، فَقَنَتَ شَهْرًا فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ وَيَقُولُ: «إِنَّ عُصَيَّةَ عَصَوُا اللَّهَ وَرَسُولَهُ»[1].

**٦٣٩٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كۆمەڵێكی نارد كە پێیان دەوترا قورئان زانەكان[2] ئینجا كوژران، جا من پێغەمبەرم ﷺ نەدیوە بۆهیچ شتێك خەفەتبار و دڵتەنگ بوبێت ئەوەندەی بۆ ئەوان دڵتەنگ و خەفەتبار بوو، بۆیە یەك مانگ لە نوێژی بەیانیدا دووعای دەخوێند و دەیفەرموو: ((بێگومان هۆزی عوصەییە سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەكەیان كرد )).**

٦٣٩٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ الْيَهُودُ يُسَلِّمُونَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُونَ: السَّامُ عَلَيْكَ. فَفَطِنَتْ عَائِشَةُ إِلَى قَوْلِهِمْ فَقَالَتْ: عَلَيْكُمُ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ». فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَوَ لَمْ تَسْمَعْ مَا يَقُولُونَ؟ قَالَ: «أَوَلَمْ تَسْمَعِي أَنِّي أَرُدُّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَأَقُولُ وَعَلَيْكُمْ»[3].

**٦٣٩٥- عوروە گێڕایەوە لە عائیشەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: جولەكەكان سەلامیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەكرد و دەیانوت: مردن بۆ تۆ، عائیشەش ﷺ لە وتەكەیان تێگەشت، بۆیە وتی: مردن و نەفرین هەر لەسەر خۆتان بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عائیشە لەسەر خۆبە، بێگومان خوا لەسەر خۆیی**

(١) بڕوانە: ١٠٠١.
(٢) كە ژمارەیان حەفتا كەس بوو.
(٣) بڕوانە: ٢٩٣٥.

**لە هەموو کارەکاندا پێ خۆشە))، عائیشەش ﵂ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا گوێت لێ بوو چیان دەوت؟ فەرمووی: ((ئەی تۆش گوێت لێ نەبوو من ئەو وتەیەیان دەدەمەوە بەسەرخۆیاندا و دەڵێم: لەسەر خۆتان بێت)).**

٦٣٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا الأَنْصَارِيُّ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ، حَدَّثَنَا عَبِيدَةُ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، فَقَالَ: «مَلأَ اللَّهُ قُبُورَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ نَارًا؛ كَمَا شَغَلُونَا عَنْ صَلاَةِ الْوُسْطَى حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ». وَهْيَ صَلاَةُ الْعَصْرِ[1].

**٦٣٩٦- عەبیدە دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ﵁ بۆی گێڕاینەوە وتی: ئێمە لە ڕۆژی جەنگی خەندەقدا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین ﷺ فەرمووی: ((خوا ماڵ و گۆڕیان (کافران) پڕکات لە ئاگر، چۆن سەرقاڵیان کردین لە (ئەنجام دانی) نوێژی ناوەڕاست هەتا خۆرئاوا بوو)). وە (صَلاَةِ الْوُسْطَى - نوێژی ناوەڕاست) نوێژی عەسرە.**

## ٥٩- بابُ الدُّعَاءِ لِلْمُشْرِكِينَ

٦٣٩٧- حَدَّثَنَا عَلِيٌّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁**:** قَدِمَ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ دَوْسًا قَدْ عَصَتْ وَأَبَتْ، فَادْعُ اللَّهَ عَلَيْهَا. فَظَنَّ النَّاسُ أَنَّهُ يَدْعُو عَلَيْهِمْ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وَأْتِ بِهِمْ»[2].

(١) بڕوانە: ٢٩٣١.
(٢) بڕوانە: ٢٩٣٧.

## ٥٩- باسی دوعا کردن بۆ هاوبەش دانەران [١]

٦٣٩٧- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: توفەیلی کوڕی عەمر هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی هۆزی دەوس سەرپێچی خوایان کرد نایانەوێت (ڕاستی ببیستن)، بۆیە دوعایان لێ بکە (خوا لەناویان بەرێت)، ئنجا خەڵکەکەش گومانیان وا بوو کە پێغەمبەر ﷺ دوعایان لێ دەکات، بەڵام فەرمووی: ((خوایە هیدایەتی دەوس بدەیت (بۆ ئیسلام) بە مسوڵمانی بیانهێنە بۆ ئێرە)).

## ٦٠- بَابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ»

٦٣٩٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ صَبَّاحٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَايَايَ وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ».

وَقَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُعَاذٍ: وَحَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٢].

---

(١) خوا ڕێی ڕاستیان نیشان بدات و مسوڵمان بن.

(٢) بڕوانە: ٦٣٩٩.

## ٦٠- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((خودایە لە گوناهی ڕابردوو داهاتووم خۆشبە))

**٦٣٩٨-ئیبنو ئەبی مووسا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە هەمیشە بەم نزایە دەپاڕایەوە: ((پەروەردگارم لە تاوان و نەزانی و نەفامیم خۆش ببە، وە لە زیادەڕەویم لە هەموو کارەکانمدا خۆش ببە، هەروەها ئەوەی کەتۆ زاناتری پێی لە من، خوایە لە گشت تاوانەکانم خۆشبە لەوەی بە ئەنقەست، وە بە نەزانی وە بەگاڵتەوە کردبێتم، وە هەموو ئەو تاوانانەم هەیە، خودایە لەو گوناهانەم خۆشبە کە پێشتر کردوەمە ئەوانەی پاشتر کردوەمە، ئەوەی بەپەنهانی کردوەمە و ئەوەی بەئاشکرا کردوومە، بەڕاستی تۆ پێشخەری و هەر تۆش پاشخەری [١]، وە تۆ دەسەڵاتداری بەسەر هەموو شتێکدا)).**

**-عەبدوڵڵای کوڕی موعاز وتی: باوکم بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعبەی بۆی گێڕاینەوە لە ئەبی ئیسحاقەوە لە ئەبی بوردەی کوڕی ئەبی مووساوە لە باوکیەوە ﷺ ، لە پێغەمبەرەوە وێنەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە.**

٦٣٩٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ، حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مُوسَى وَأَبِي بُرْدَةَ -أَحْسِبُهُ- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي هَزْلِي وَجِدِّي، وَخَطَايَ وَعَمْدِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي»[٢].

---

(١) بەندەکان بۆ کردنی کاری چاکە یان نەکردنی، یان بۆ پاداشت و سزا.

(٢) بڕوانە: ٦٣٩٨.

**٦٣٩٩-ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە هەمیشە ئەم دوعایەی دەکرد: ((خودایە لە تاوان و نەفامیم خۆش ببە، وە لە زیادەڕەویم لە هەموو کارەکانمدا ببورە، وە لەوەش کە تۆ زاناتری پێی لە من، خودایە لەوەی بەگاڵتە یان بە جددی (کردوومە) خۆش ببە، وە لە هەڵەکانم و ئەوەی ئەنقەست کردوومە خۆش ببە، کە هەموو ئەوانەم هەیە)).**

## ٦١- بابُ الدُّعَاءِ فِي السَّاعَةِ التِى فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ

٦٤٠٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا أَيُّوبُ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «فِي الْجُمُعَةِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ وَهْوَ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ خَيْرًا إِلاَّ أَعْطَاهُ». وَقَالَ بِيَدِهِ، قُلْنَا: يُقَلِّلُهَا، يُزَهِّدُهَا[1].

## ٦١- باسی دوعا کردن لەو سەعاتەدا کە لە ڕۆژی هەینی دایە[2]

**٦٤٠٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبولقاسیم ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی هەینیدا سەعاتێك هەیە هەر مسوڵمانێك لەو کاتەدا ڕاوەستا بێت نوێژ بکات و داوای هەر چاکەیەك بکات، بێگومان (خوا داواکەی) پێی دەبەخشێت))، بەدەستی وای کرد، وتمان: کاتەکەی بە کورت و کەم دانا[3].**

## ٦٢- باب قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «يُسْتَجَابُ لَنَا فِي الْيَهُودِ، وَلاَ يُسْتَجَابُ لَهُمْ فِينَا»

٦٤٠١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ الْيَهُودَ أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ. قَالَ: «وَعَلَيْكُمْ». فَقَالَتْ عَائِشَةُ:

---

(١) بڕوانە: ٩٣٥.
(٢) دوعای تێدا گیرا دەبێت.
(٣) واتە: ئەو کاتەی داوای تێدا گیرا دەبێت لە ڕۆژی هەینیدا کاتێکی کەمە.

السَّامُ عَلَيْكُمْ، وَلَعَنَكُمُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْكُمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ، وَإِيَّاكِ وَالْعُنْفَ" أَوِ "الْفُحْشَ». قَالَتْ: أَوَ لَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: «أَوَ لَمْ تَسْمَعِي مَا قُلْتُ؟! رَدَدْتُ عَلَيْهِمْ، فَيُسْتَجَابُ لِي فِيهِمْ، وَلاَ يُسْتَجَابُ لَهُمْ فِيَّ».

## ٦٢- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((نزای ئێمە دەربارەی جوولەکە گیرا دەبێت، بەڵام نزای ئەوان دەربارەی ئێمە گیرا نابێت))

**٦٤٠١- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی مولەیکە لە عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە جولەکەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتیان (السَّامُ عَلَيْكَ) واتە: مردن بۆ تۆ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((وَعَلَيْكُمْ (مردن) بۆ خۆتان بێت))، عائیشەش ﵂ وتی: (مردن) بۆ خۆتان و نەفرینی خوا و غەزەبی خواتان لە سەر بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عائیشە هێواش و لەسەر خۆبە، توند و زبر و ڕەوشت و زمان پیس مەبە))، عائیشە وتی: ئایا گوێت لێ بوو چییان وت؟ فەرمووی: ((ئەی تۆش گوێت لێ بوو من چیم وت؟ وەڵامم دانەوە، ئینجا دووعاکەی من دەربارەیان گیرا دەکرێت، بەڵام دوعاکەی ئەوان دەربارەی من گیرا ناکرێت)).**

## ٦٣- بابُ التَّأْمِينِ

٦٤٠٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: الزُّهْرِيُّ حَدَّثَنَاهُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَمَّنَ الْقَارِئُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تُؤَمِّنُ، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

---

(١) بڕوانە: ٧٨٠.

## ٦٣- باسی ئامین کردن (پاش دوعا کردن)

٦٤٠٢- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کاتێ قورئان خوێن (پێشنوێژ) ئامینی کرد ئێوەش (نوێژگەران) ئامین بکەن، چونکە بەڕاستی هەر کەس ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا پێکەوە بێت لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووڕێت)).

## ٦٤- بَابُ فَضْلِ التَّهْلِيلِ

٦٤٠٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ، حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ رَجُلٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْهُ»[1].

## ٦٤- باسی فەزڵ و گەورەی (لا اله الا اللّه)

٦٤٠٣-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((هەر کەس لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێت: هیچ پەرەستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوای تاق و تەنها، هیچ هاوبەشی نییە، هەموو دەسەڵات و سوپاس هەر بۆ ئەوە، وە ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەوە وەك ئەوە وایە ئەو کەسە دە کۆیلەی ئازاد کردبێت، وە سەد چاکەی بۆ نووسراوە، وە سەد تاوانی لێ سڕاوەتەوە، وە ئەو زیکرە لەو ڕۆژەدا تا ئێوارە پارێزگار دەبێت بۆی لە شەیتان، وە هیچ کەس شتێکی لەوەی ئەم چاکتری نەهێناوە مەگەر کەسێك لەمەی ئەم زۆرتری کردبێت)).

---

(١) بروانە: ٣٢٩٣.

٦٤٠٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عَمْرٍو، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: مَنْ قَالَ عَشْرًا كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ. قَالَ عُمَرُ بْنُ أَبِي زَائِدَةَ: وَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي السَّفَرِ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ رَبِيعِ بْنِ خُثَيْمٍ مِثْلَهُ. فَقُلْتُ لِلرَّبِيعِ: مِمَّنْ سَمِعْتَهُ؟ فَقَالَ: مِنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ. فَأَتَيْتُ عَمْرَو بْنَ مَيْمُونٍ فَقُلْتُ: مِمَّنْ سَمِعْتَهُ؟ فَقَالَ: مِنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى. فَأَتَيْتُ ابْنَ أَبِي لَيْلَى فَقُلْتُ: مِمَّنْ سَمِعْتَهُ؟ فَقَالَ: مِنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ يُحَدِّثُهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ قَوْلَهُ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

وَقَالَ مُوسَى: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ دَاوُدَ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الرَّبِيعِ قَوْلَهُ. وَقَالَ آدَمُ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَيْسَرَةَ، سَمِعْتُ هِلاَلَ بْنَ يَسَافٍ، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ خُثَيْمٍ، وَعَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَوْلَهُ. وَقَالَ الأَعْمَشُ وَحُصَيْنٌ، عَنْ هِلاَلٍ، عَنِ الرَّبِيعِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَوْلَهُ. وَرَوَاهُ أَبُو مُحَمَّدٍ الْحَضْرَمِيُّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦٤٠٤-عەمری کوڕی زائیدە گێڕایەوە لە ئەبی ئیسحاقەوە لە عەمری کوڕی مەیموونە و گێڕاویەتیەوە وتی: هەر کەس دە جار بڵێت[1] وەك ئەوە وایە کۆیلەیەکی لە نەوەی ئیسماعیل ڕزگار کردبێت، عەمری کوڕی زائیدە وتی: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەفەر بۆی گێڕاینەوە لە شەعبیەوە لە ڕەبیعی کوڕی خوسەیمەوە وێنەی فەرموودەکەی ئەبی ئیسحاقی گێڕایەوە، ئینجا وتم بەرەبیع لە کێت بیستووە؟ وتی لە عەمری کوڕی مەیموون، ڕۆشتم بۆلای عەمری کوڕی مەیموون وتم: تۆ لە کێت بیستووە؟ ئەویش وتی: لە ئیبنو ئەبی لەیلا، جا چووم بۆلای ئیبنو ئەبی لەیلا، وتم: تۆ لە کێت بیستووە؟ وتی: لە ئەبی ئەیوبی ئەنصاریم بیستووە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە.**

(١) واتە: دە جار بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ).

-ئیبراهیمی کوڕی یوسف لە باوکیەوە گێڕایەوە لە ئەبی ئیسحاقەوە وتی عەمری کوڕی مەیموون بۆی گێڕامەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە لە ئەبی ئەیوبەوە ئەنصاریەوە ﷺ وتی لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

-مووسا دەڵێ: ووهەیب بۆی گێڕاینەوە لە داوودە و لە عامیرەوە، لە عەبدوڕەحمانی کوڕ ئەبی لەیلاوە لە ئەبی ئەیوبەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

-ئیسماعیل گێڕایەوە لە شەعبییەوە لە ڕبیعەوە، وتەی ڕەبیع خۆیەتی.

-ئادەم دەڵێ شوعبە بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدولەلیکی کوڕی مەیسەرە بۆی گێڕاینەوە وتی: لە هیلالی کوڕی یەسافم بیست ئەویش لە ڕەبیعی کوڕی خوسەیمە و عەمری کوڕ مەیموونەوە لە ئیبنو مەسعوودەوە ﷺ وتەی عەبدوڵلا خۆیەتی (واتە: مەوقوفە)..

-ئەعمەش و حوصین لە هیلالەوە گێڕاویانەتەوە لە ڕەبیعەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ ، وتەی عەبدوڵلا خۆیەتی.

-وە ئەبو موحەممەدی حەزرەمی لە ئەبو ئەیوبەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویتیەوە.

## ٦٥- بابُ فَضْلِ التَّسْبِيحِ

٦٤٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ سُمَيٍّ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ. فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».

## ٦٥- باسی فەزڵی (سبحان الله) کردن

**٦٤٠٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ:** (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ[1])، **هەموو تاوانەکانی دەوەرێت با وەك کەفی دەریاش بێت)).**

٦٤٠٦- حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ عُمَارَةَ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ على اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ»[2].

**٦٤٠٦-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((دوو وشە لەسەر زمان سوکن (بوترێن) لە تەرازوودا قورسن، ئەو دوو وشە خۆشەویستن لای خوای بە بەزەیی، (کە بریتین لە):** (سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ[3])**).**

## ٦٦- بابُ فَضْلِ ذِكْرِ اللَّهِ تعالى

٦٤٠٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لاَ يَذْكُرُ مَثَلُ الحَيِّ وَالْمَيِّتِ».

---

(١) واتە پاك و بێگەردی و ستایش بۆ خوا .

(٢) بڕوانە: سس٦٦٨٢، ٧٥٦٣سسس.

(٣) واتە: پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە، پاك و بێگەردی و ستایش بۆ خوا .

## ٦٦- باسی گەورەیی یادی خوای بەرز و بڵند

**٦٤٠٧- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نموونەی ئەو کەسەی یادی پەروەردگاری دەکات ئەو کەسەش یادی ناکات، وەك زیندوو و مردوو وان)).**

٦٤٠٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ. حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ مَلاَئِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ، يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وَجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَنَادَوْا: هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ. قَالَ: فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا. قَالَ: فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ -وَهْوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ: مَا يَقُولُ عِبَادِي؟ قَالُوا: يَقُولُونَ: يُسَبِّحُونَكَ، وَيُكَبِّرُونَكَ، وَيَحْمَدُونَكَ، وَيُمَجِّدُونَكَ. قَالَ: فَيَقُولُ: هَلْ رَأَوْنِي؟ قَالَ: فَيَقُولُونَ: لاَ وَاللَّهِ مَا رَأَوْكَ. قَالَ: فَيَقُولُ: وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً، وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيدًا، وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحًا. قَالَ: يَقُولُ: فَمَا يَسْأَلُونِي؟ قَالَ: يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ. قَالَ: يَقُولُ: وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا. قَالَ: يَقُولُ: فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصًا، وَأَشَدَّ لَهَا طَلَبًا، وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً. قَالَ: فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ؟ قَالَ: يَقُولُونَ: مِنَ النَّارِ. قَالَ: يَقُولُ: وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لاَ وَاللَّهِ مَا رَأَوْهَا. قَالَ: يَقُولُ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَارًا، وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً. قَالَ: فَيَقُولُ: فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ. قَالَ: يَقُولُ مَلَكٌ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ: فِيهِمْ فُلاَنٌ لَيْسَ مِنْهُمْ، إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ. قَالَ: هُمُ الْجُلَسَاءُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ». رَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ. وَرَوَاهُ سُهَيْلٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦٤٠٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خودا فریشتانێکی هەیە لە ڕێ و بانا دەسوڕێنەوە و بە شوێن ئەو کەسانەدا دەگەڕێن یادی خوا دەکەن، ئینجا ئەگەر کۆمەڵێکیان بینی یادی خوا دەکەن، یەکتری بانگ**

دەكەن، دەڵێن: وەرن بۆ لای كارەكەتان، [١] دەڵێ: ئەوسا ئەوانیش بە باڵیان دەوریان دەدەن تا دەگەنە ئاسمانی دونیا، دەڵێ: ئینجا پەروەردگاریان پرسیاریان لێ دەكات، كە خۆی لەوان زاناترە پێیان: بەندەكانم چی دەڵێن؟ فریشتەكانیش دەڵێن: تەسبیحاتی تۆ دەكەن و باسی گەورەیی تۆ دەكەن و سوپاس و ستایشیت دەكەن و بە شان و شكۆی تۆدا هەڵدەدەن، دەڵێ: ئینجا خوا دەفەرمووێ: ئایا منیان دیوە؟ دەڵێ: ئەوانیش دەڵێن: نەخێر نەوەڵڵا تۆیان نەدیوە، دەڵێ: جا دەفەرموێ: ئەگەر بمبینن دەبێ چۆن بن؟ دەڵێ: ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر بتبینن، ئەوسا زۆر بەندایەتیت بۆ دەكەن، وە زۆر بە شان و شكۆتدا هەڵدەدەن، وە زۆرتر تەسبیحات و ستایشت دەكەن، ئینجا دەفەرموێ: ئەی داوای چی دەكەن؟ وتی: داوای بەهەشت دەكەن، دەڵێ: دەفەرموێ: ئایا بەهەشتیان دیوە؟ دەڵێ: دەڵێن: نەوەڵڵا ئەی پەروەردگار نەیان دیوە، دەڵێ: دەفەرموێ: ئەگەر بەهەشتیان بدیایە چۆن دەبوون؟ دەڵێ: دەڵێن ئەگەر بیان بینیایە زۆرتر سوور دەبوون لەسەری، وە زۆرتر داوایان دەكرد، وە زۆرتر حەزیان لێ بوو، دەفەرموێ: ئەی پەنا لە چی دەگرن؟ دەڵێ: دەڵێن: پەنا بەخوا دەگرن لە ئاگری دۆزەخ، دەڵێ: دەفەرموێ: ئایا ئاگری دۆزەخیان دیوە؟ دەڵێ دەڵێن: نەوەڵڵا نەیان دییوە، دەڵێ (خوا) دەفەرموێ: ئەگەر بیان دیایە چۆن دەبوون؟ دەڵێ، دەڵێن: ئەگەر بیان دیایە زۆرتر ڕایان دەكرد لێی و زۆرتر دەترسان لێی، دەڵێ، جا دەفەرموێ: دەی ئەو ئێوە بە شایەت بن بێگومان من لێیان خۆش بووم، دەڵێ: فریشتەیەك لە فریشتەكان دەفەرموێ: خوایە فلان كەسیان تیایە لەوان نییە بەڵكو بۆ كارێك هاتبوو خوا دەفەرموێ: (ئەوان كەسانێكن هەر كەس لەگەڵیان دانیشێت نا ئومێد و بەدبەخت نابێ)).

---

(١) ئەمە ئەوەیە ئێوە بۆی دەگەڕێن.

-شوعبە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە ئەعمەشەوە بەڵام نەیداوەتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ (بەڵكو بەوتەی ئەبو هورەیرە ؓ هێناویەتی).
-وە سوهەیل لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە لە ئەبو هورەیرەوە ؓ ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

## ٦٧- بابُ قَوْلِ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّه

٦٤٠٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: أَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ فِي عَقَبَةٍ -أَوْ قَالَ: فِي ثَنِيَّةٍ- قَالَ: فَلَمَّا عَلاَ عَلَيْهَا رَجُلٌ نَادَى فَرَفَعَ صَوْتَهُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. قَالَ: وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى بَغْلَتِهِ قَالَ: «فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا». ثُمَّ قَالَ: «يَا أَبَا مُوسَى -أَوْ يَا عَبْدَ اللَّهِ- أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كَنْزِ الْجَنَّةِ؟». قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: «لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ»[1].

## ٦٧- باسی فەزڵی وتنی (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)

٦٤٠٩- ئەبو مووسای ئەشعەری ؓ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت ڕوو بە بەرزاییەك -یان وتی: ملە و ڕێگایەكی ناو شاخ -ئینجا پیاوێك گەشتە سەری بەرزایەكە دەنگی بەرز كردەوە و هاواری كرد وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ)[2]، دەڵێ: پێغەمبەری خواش ﷺ بەسواری ئێسترەكەیەوە بوو فەرمووی: ((دڵنیابن ئێوە هاوار لەزاتێكی كەڕ ونادیار و دوور ناكەن))، پاشان فەرمووی: ((ئەی ئەبو مووسا-یان ئەی عەبدوڵلا-ئایا وتەیەكت لە گەنجینەی بەهەشت نیشان بدەم؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)).

---

(١) بڕوانە: ٢٩٩٢.
(٢) واتە: هیچ پەرەستراوێک ڕاست نییە و خواش لە هەموو شت گەورەترە.

## ٦٨- بابٌ: لله مائَةُ اسْمٍ غَيْرَ وَاحِدَة

٦٤١٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَفِظْنَاهُ مِنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رِوَايَةً قَالَ: «لِلَّهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ اسْمًا، مِائَةٌ إِلاَّ وَاحِدًا، لاَ يَحْفَظُهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَهْوَ وَتْرٌ يُحِبُّ الْوَتْرَ»[1].

## ٦٨- باسێک: خودا سەد ناوی هەیە یەکێک نەبێ

**٦٤١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ بەگێڕانەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا نەوەد و نۆ ناوی هەیە، سەد (ناوە) جگە یەك (ناو) هەر کەس لەبەریان بکات [2] دەچێتە بەهەشتەوە، وە خوا تاك و تەنهایە شتی تاك و تەنهاشی خۆش دەوێت)).**

## ٦٩- بابُ الْمَوْعِظَةِ سَاعَةً بَعْدَ سَاعَةٍ

٦٤١١- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي شَقِيقٌ قَالَ: كُنَّا نَنْتَظِرُ عَبْدَ اللهِ، إِذْ جَاءَ يَزِيدُ بْنُ مُعَاوِيَةَ فَقُلْنَا: أَلاَ تَجْلِسُ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ أَدْخُلُ فَأُخْرِجُ إِلَيْكُمْ صَاحِبَكُمْ، وَإِلاَّ جِئْتُ أَنَا. فَجَلَسْتُ، فَخَرَجَ عَبْدُ اللهِ وَهْوَ آخِذٌ بِيَدِهِ، فَقَامَ عَلَيْنَا فَقَالَ: أَمَا إِنِّي أُخْبَرُ بِمَكَانِكُمْ، وَلَكِنَّهُ يَمْنَعُنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الأَيَّامِ؛ كَرَاهِيَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا[3].

---

(١) بڕوانە: ٢٧٣٦.

(٢) واتە: زانیاری دەربارەیان هەبێ و باوەڕی پتەوی پێیان هەبێت و کار بە ماناکانیان بکات.

(٣) بڕوانە: ٦٨.

## ٦٩- باسی ئامۆژگاری[١] ناو بە ناو[٢]

**٦٤١١- ئەعمەش دەڵێ: شەقیق بۆی گێڕامەوە وتی: ئێمە چاوەڕوانی عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوودمان) ﷺ دەکرد لە پڕ یەزیدی کوڕی موعاویە[٣] هات، ئێمەش وتمان دانانیشیت؟ وتی: نەخێر، بەڵام دەچمە ژوورەوە و هاوڕێکەتان[٤] دێنمە دەرەوە بۆ لاتان، ئەگەر نا دەهاتم دادەنیشتم (لەگەڵتان). ئینجا عەبدوڵڵا ﷺ هاتە دەرەوە و دەستی یەزیدی گرتبوو، عەبدوڵڵاش لەناوماندا وەستا و وتی: منیش ئاگادار بووم ئێوە لێرەن، بەڵام ئەوەی ڕێگرم بوو بێمە دەرەوە بۆ لاتان ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ناو بەناو ئامۆژگاری دەکردین لە ڕۆژەکاندا نەبادا بێزاربببین.**

---

(١) ئامۆژگاری مۆچیاریشی پێدەوترێت، مۆچیاری وشەیەکی کوردی پەتیە. (فەرهەنگی خاڵ: ٥٦١).

(٢) هەموو کات و بەردەوام نەبێت تا خەڵکی بێزار نەبن.

(٣) یەزیدی کوڕی موعاویەی عەبسییە تابیعینەوە لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا تەنها لەم فەرموودەیەدا ناوی هایە و بەس، هیچ فەرموودەیەکی تری لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا نییە (إرشاد الساري:١٣/٤١٠).

(٤) کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودە ﷺ .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٨١- كِتَابُ الرِّقَاقِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨١- پەڕاوی (وته) دڵنەرمکارەکان

## ١- باب مَا جَاءَ فِي الرِّقَاقِ، وَأَنْ لَا عَيْشَ إِلَّا عَيْشُ الْآخِرَةِ

٦٤١٢- حَدَّثَنَا الْمَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ -هُوَ ابْنُ أَبِي هِنْدٍ- عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ:«نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ[1] فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ».

قَالَ عَبَّاسٌ الْعَنْبَرِيُّ: حَدَّثَنَا صَفْوَانُ بْنُ عِيسَى، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ أَبِيهِ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ.

## ١- باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دڵ نەرمکارەکان، وە ژیانی ڕاستەقینە تەنها ژیانی دواڕۆژە

**٦٤١٢-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دوو بەهرە هەن زۆربەی خەڵك لە بارەیانەوە بە هەڵەدا چوون و خەڵەتاون: لەش ساغی و دەست بەتاڵی[1])).**

---

(١) ( مَغْبُونٌ) واته: خەڵەتان لە مامەڵە و کڕین و فرۆشتندا، وە بەمانای لاوازی لە ڕاو بۆچووندا دێت (إرشاد الساري:٤١٣/١٣).

-عەبدوڵڵای کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبی هیند لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسم ﷺ بیست لە پێغەمبەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە.

٦٤١٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشُ الآخِرَهْ، فَأَصْلِحِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ»[٢].

٦٤١٣- ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((خودایە ژیان (ی بەردەوام ) نییە جگە لە ژیانی دوارِۆژ، دەی کەواتە ئەنصاری و کۆچەرییەکان چاك و رێك و پێك بکە)).

٦٤١٤- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ الْمِقْدَامِ، حَدَّثَنَا الْفُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ،حَدَّثَنَا سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الخَنْدَقِ، وَهْوَ يَحْفِرُ وَنَحْنُ نَنْقُلُ التُّرَابَ وَيَمُرُّ بِنَا، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشُ الآخِرَهْ، فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ». تَابَعَهُ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[٣].

٦٣١٤- ئەبو حازیم دەڵێ: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین ﷺ لە خەندەقدا کە ئەو چاڵەکەی هەڵدەکەند، ئێمە بەکۆڵ خۆڵەکەیمان دەگواستەوە، وە پێغەمبەر ﷺ بەلاماندا دەرۆشت و فەرمووی: ((خودایە ژیانی (ی بەردەوام ) نییە جگەلە ژیانی دوارِۆژ، دەی کەواتە لە ئەنصار و کۆچەرییەکان خۆشبە)). سەهلی کوڕی سەعد وێنەی ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

---

(١) واتە: هیچ کارێک دەستی نەگرتووە و سەرقاڵ نییە.

(٢) بڕوانە: ٢٨٣٤.

(٣) بڕوانە: ٣٧٩٧.

## ٢- بابُ مَثَلِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ

وقوله تعالى: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الحديد

## ٢- باسی نموونەی دنیا بە بەراورد بە دوارۆژ

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە بزان کە بێگومان ژیانی دونیا تەنها گاڵتە و گەمە و ڕازاندنەوە و خۆهەڵکێشانە، لە نێوانیاندا و لاف لێدانە بەدارایی و منداڵی زۆرەوە وەك بارانێك وایە کە حاصلاتەکەی جوتیاران دڵخۆش بکات، پاشان وشك بێ، وە بەزەردی ببینی لە پاشان ببێت بە پووش و پەڵاش، لە ڕۆژی دوایشدا سزای توند و سەخت (هەیە بۆ دونیا پەرستان)، وە لێبوردن و ڕەزامەندییە لە لایەن خواوە (بۆ خواناسان)، وە ژیانی دونیا هیچ نییە جگە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەر)).**

٦٤١٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَوْضِعُ سَوْطٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَلَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[١].

**٦٤١٥- عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی حازیم لە باوکیەوە لە سەهلەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((شوێنی یەك قەمچی**

(١) بڕوانە: ٢٧٩٤.

له بەهەشتدا چاكتره له دونيا و هەرچی تيايەتی، چوون بۆ خەبات و جيهاد تاقی ئێوارەيەك يان تاقی بەيانيەك له دونيا و ئەوەی تێدايه چاكتره)).

## ٣- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ»

٦٤١٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَبُو الْمُنْذِرِ الطُّفَاوِيُّ، عَنْ سُلَيْمَانَ الأَعْمَشِ قَالَ: حَدَّثَنِي مُجَاهِدٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَنْكِبِي فَقَالَ: «كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ». وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: إِذَا أَمْسَيْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ، وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ الْمَسَاءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِمَرَضِكَ، وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ.

## ٣- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ :((له دنيادا وەک کەسێکی غەریب بە، یان وەک ڕێبواربە))

٦٤١٦-موجاهيد گێڕايەوه له عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوه ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شانی گرتم و فەرمووی: ((له دونيا وەك كەسێكی غەريب بە، يان وەك ڕێبوارێك بە)).

وه ئيبنو عومەر ﷺ دەيوت: ئەگەر ئێوارەت بەسەردا هات چاوەڕوانی بەيانی مەكه، وه ئەگەر ڕۆژت لێ بوويەوه چاوەڕوانی ئێواره مەكه، له لەش ساغيت بەهره وەرگره بۆ كاتی نەخۆشيت، وه له كاتی ژيانت بەهره وەرگره بۆ كاتی مردنت.

## ٤- بابٌ: فِي الأَمَلِ وَطُولِهِ

وَقَوْله ﷻ: ﴿ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ﴾ آل عمران. ﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ

﴿٣﴾ الحجر. وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: ارْتَحَلَتِ الدُّنْيَا مُدْبِرَةً، وَارْتَحَلَتِ الآخِرَةُ مُقْبِلَةً، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا بَنُونَ، فَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الآخِرَةِ، وَلَا تَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ اليَوْمَ عَمَلٌ وَلَا حِسَابَ، وَغَدًا حِسَابٌ وَلَا عَمَلَ. ﴿بِمُزَحْزِحِهِۦ ﴿٩٦﴾﴾ البقرة. بِمُبَاعِدِهِ.

## ٤- باسێک: دەربارەی هیوا و ئاوات و دوور و درێژی

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (ئینجا هەرکەس دوور خرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ و بخرێتە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە سەرکەوتووە ژیانی دونیاش هیچ شتێك نییە بێجگە لە بەهرە و ئارەزوویەکی فریودەر). (لێیان گەڕێ با بخۆن و ڕابوێرن ئومێد بێ ئاگایان بکات، جا بێگومان لەمەولا دەزانن (چۆن سزایان دەدەین) ).**

**- عەلی ﷺ دەڵێ: دونیا بارگە و بنەی پێچایەوە و پشتی هەڵکرد[1] دواڕۆژیش بارگە و بنەی پێچایەوە و هات[2].**

**وە هەر یەك لە دونیا و دواڕۆژ نەوە و کەسیان هەیە، جا ئێوە لە نەوەی دواڕۆژبن و لە نەوەی دونیا مەبن، چونکە بێگومان ئەمڕۆ کردەوە کردنە و لێپرسینەوە نییە، بەڵام سبەینێ لێپرسینەوەیە و کردەوە نییە. ﴿بِمُزَحْزِحِهِۦ ﴿٩٦﴾﴾ البقرة: بەدوور خەرەوەی.**

٦٤١٧- حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ الْفَضْلِ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ مُنْذِرٍ، عَنْ رَبِيعِ بْنِ خُثَيْمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَطَّ النَّبِيُّ ﷺ خَطًّا مُرَبَّعًا، وَخَطَّ خَطًّا فِي الْوَسَطِ خَارِجًا مِنْهُ، وَخَطَّ خُطُطًا صِغَارًا إِلَى هَذَا الَّذِي فِي الْوَسَطِ، مِنْ جَانِبِهِ الَّذِي فِي

---

(١) تەواو بوو کۆتای هات.

(٢) چونکە تەواو نەبووە دەست پێدەکات و کۆتایی نایەت.

الْوَسَطِ وَقَالَ: «هَذَا الإِنْسَانُ، وَهَذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ -أَوْ قَدْ أَحَاطَ بِهِ- وَهَذَا الَّذِي هُوَ خَارِجٌ أَمَلُهُ، وَهَذِهِ الْخُطُطُ الصِّغَارُ الأَعْرَاضُ، فَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا، وَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا».

**٦٤١٧ -عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خەتێکی چوارگۆشەی کێشا، لە ناوەڕاستی چوارگۆشەکەوە خەتێکی کێشا بۆ دەرەوەی چوارگۆشەکە، ئینجا چەند خەتێکی تری وردی کێشا لەسەر خەتەکەی ناوەوە، وە فەرمووی: ((ئەمە مرۆڤە و ئەمەش وادەی مردنیەتی چوار دەوری داوە-یان: بێگومان دەورەی داوە- ئەم خەتەشیان کە دەرچووەتە دەرەوە هیوا و ئاواتیەتی، ئەو خەتە وردانەش ئەو شتانەن (کە ڕێی پێدەگرن) [1]، ئەگەر ئەمەیان تووشی نەیەت ئەوەیان تووشی دێت، وە ئەگەر ئەمەیان ڕزگاری بێت لەوەیان ڕزگاری نابێت )).**

٦٤١٨- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: خَطَّ النَّبِيُّ ﷺ خُطُوطًا فَقَالَ: «هَذَا الأَمَلُ وَهَذَا أَجَلُهُ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ جَاءَهُ الْخَطُّ الأَقْرَبُ».

**٦٤١٨-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چەند خەتێکی کێشا و [2] فەرمووی: ((ئەمەیان هیواکانی مرۆڤە و ئەمەشیان وادەی مردنێتی، جا لە کاتێکدا مرۆڤ ئاوەها (بەشوێن هیواکانیەوە)یە، لە پڕ خەتە نزیکەکەیان (مردن) بۆی دێت)) [3]**

(١) لە نەخۆشی و بەڵا و ڕووداوە جۆرا و جۆرەکان.

(٢) لە فەرموودەکەی پێشوودا شێوەکەی باس کرد.

(٣) دەمرێ و هەموو هیواکانی دەباتە گۆڕ.

## ٥- بابٌ: مَنْ بَلَغَ سِتِّينَ سَنَةً فَقَدْ أَعْذَرَ اللَّهُ إِلَيْهِ فِي الْعُمُرِ

لِقَوْلِهِ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ﴿٣٧﴾﴾ فاطر.

يعني: الشيب.

٦٤١٩- حَدَّثَنِي عَبْدُ السَّلاَمِ بْنُ مُطَهَّرٍ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ مَعْنِ بْنِ مُحَمَّدٍ الْغِفَارِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «أَعْذَرَ اللَّهُ إِلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ حَتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً». تَابَعَهُ أَبُو حَازِمٍ وَابْنُ عَجْلاَنَ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ.

## ٥- باسێک: کەسێک تەمەنی بگاتە شەست ساڵ، ئەوە بێگومان خوا لە بارەی تەمەنەوە بیانووی نەهێشتووە

**بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێ بیر بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە وە ترسێنەرتان بۆ نەهات).**

**٦٤١٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((خوا بیانووی بۆ کەسێك نەهێشتۆتەوە وادەی مردنی دواخستبێ، هەتا تەمەنی گەیاندبێتە شەست ساڵ)).**

**-ئەبو حازیم و ئیبنو عەجلان لە مەقبوورییەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی مەعنی کوڕی موحەممەد دەکەن.**

٦٤٢٠- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا أَبُو صَفْوَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَزَالُ قَلْبُ الْكَبِيرِ شَابًّا فِي اثْنَتَيْنِ: فِي حُبِّ الدُّنْيَا، وَطُولِ الأَمَلِ». قَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ وَابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدٌ وَأَبُو سَلَمَةَ.

**٦٤٢٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: (( بەردەوام دڵی كەسی پیر لە دوو شتدا گەنجە: لە خۆشویستنی دونیا و ئومێد و هیوای درێژێدا))**

**-لەیس دەڵێ: یونس و ئیبنو وەهب لە یونسەوە گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو شیهابەوە وتی: سەعید و ئەبو سەلەمە (فەرموودەكەی پێشوویان) بۆ گێڕامەوە.**

٦٤٢١- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكْبَرُ ابْنُ آدَمَ وَيَكْبَرُ مَعَهُ اثْنَانِ: حُبُّ الْمَالِ، وَطُولُ الْعُمُرِ». رَوَاهُ شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ.

**٦٤٢١-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مرۆڤ تەمەنی درێژ و گەورە دەبێت، دوو شت لەگەڵیدا گەورە دەبن: خۆشەویستی دونیا و (هیوا) تەمەن درێژی)).**

**-شوعبەش ئەم فەرموودەی لە قەتادەوە گێڕاوەتەوە.**

## ٦- بابُ العَمَلِ الَّذي يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللهِ

فِيهِ سَعْدٌ ﷺ.

٦٤٢٢- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بْنُ الرَّبِيعِ -وَزَعَمَ مَحْمُودٌ أَنَّهُ عَقَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: وَعَقَلَ مَجَّةً مَجَّهَا مِنْ دَلْوٍ كَانَتْ فِي دَارِهِمْ[1].

---

(١) بڕوانە: ٧٧.

## ٦- باسی ئەو کار و کردەوەی مەبەست پێی ڕەزامەندی خودایە

**-لەو بارەیە فەرموودەکەی سەعد ﷺ گێڕایەوە هاتووە[١].**

**٦٤٢٢-زوهری دەڵێ: مەحمودی کوڕی ڕەبیع ﷺ بۆی گێڕامەوە و مەحموود وتی: کە ئەو پێغەمبەری ﷺ بەبیر دێت وتی: بیری دێت کە پێغەمبەر ﷺ لە دۆڵچەیەك کە لە ماڵی مەحموودا بوو (ئاوی کردە دەمیەوە، پاشان) تفییەوە و (کردی بە ڕووخساری مەحمودا).**

٦٤٢٣ - قَالَ: سَمِعْتُ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ الأَنْصَارِيَّ، ثُمَّ أَحَدَ بَنِي سَالِمٍ قَالَ: غَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «لَنْ يُوَافِيَ عَبْدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ، إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ»[٢].

**٦٤٢٣-دەڵێ: لە عیتبانی کوڕی مالیکی ئەنصاریم بیست، پاشان لە کەسێکی نەوەی سالیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەر لە بەیانیەك هات بۆ لام[٣] و فەرمووی: ((هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا نایەت و (لە دونیادا) وتبێتی: (**لا اله الا الله)[٤] **وە مەبەستی پێ ڕەزامەندی خودا بووبێت، ئیللا خودا (چوونە ئاگری دۆزەخی لێ قەدەغە دەکات)).**

٦٤٢٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمْرٍو، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: مَا لِعَبْدِي الْمُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا ثُمَّ احْتَسَبَهُ إِلاَّ الْجَنَّةُ».

---

(١) کە پێشتر لە نامەی باوەڕدا بە ژمارە: ٥٦ ڕابوورد.

(٢) بڕوانە: ٤٢٤.

(٣) ئەم فەرموودە درێژەترە بەڵام لێرەدا بەکورتی هێناویەتی.

(٤) واتە: هیچ پەرەستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوا.

**٦٤٢٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: لای من بەندەی باوەڕدارەکەم ئەگەر خۆشەویستێکی ئەوم لەخەڵکی دونیا بردەوە و گیانیم کێشا، هیچ پاداشتێکی نییە جگەلە بەهەشت)).**

## ٧- بابُ مَا يُحْذَرُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَالتَّنَافُسِ فِيهَا

٦٤٢٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: حَدَّثَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ المِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ عَوْفٍ -وَهْوَ حَلِيفٌ لِبَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ، كَانَ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺأَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ إِلَى البَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ هُوَ صَالَحَ أَهْلَ البَحْرَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَيْهِمُ الْعَلاَءَ بْنَ الحَضْرَمِيِّ، فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنَ البَحْرَيْنِ، فَسَمِعَتِ الأَنْصَارُ بِقُدُومِهِ فَوَافَتْهُ صَلاَةَ الصُّبْحِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا انْصَرَفَ تَعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ حِينَ رَآهُمْ وَقَالَ: «أَظُنُّكُمْ سَمِعْتُمْ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ، وَأَنَّهُ جَاءَ بِشَيْءٍ؟». قَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ مَا الفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنْ أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمُ الدُّنْيَا، كَمَا بُسِطَتْ على مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وَتُلْهِيَكُمْ كَمَا أَلْهَتْهُمْ»[1].

## ٧- باسی خۆپاراستن لە (ڕۆچوون خۆشەویستی) لە جوانیەکانی دنیا و ململانێ کردنی یەکتری تیایدا

**٦٤٢٥- میسوەری کوڕی مەخرەمە دەگێڕێتەوە کە عەمری کوڕی عەوف ﷺ -کە هاوپەیمانی بەنی عامیری کوڕی لوئی بوو، کە بەشداری غەزای بەدری کردبوو لە**

(١) بڕوانە: ٣١٥٨.

**خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ - بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی نارد بۆ بەحریەن تا سەرانەکەی بێنێت، وە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر ڕێکەوتنی لەگەڵ خەڵکی بەحریەن کردبوو و عەلائی کوڕی حەزرەمی کردبوو بەلێپرسراو و گەورەیان، ئەنجا ئەبو عوبەیدە ﷺ لە بەحرەینەوە ماڵ و سامانی (سەرانەی ) هێنا، ئەنصاریەکانیش بیستبوویان ئەبو عوبەیدە هاتۆتەوە، ئەوەش لە کاتی نوێژی بەیانیدا بوو لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ، جا کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکە بوویەوە چووە بۆ ماڵەوە ئەنصاریەکان ڕۆشتنە ڕێگای، پێغەمبەریش ﷺ کاتێ بینینی زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: ((وابزانم بیستووتانە کە ئەبو عوبەیدە هاتۆتەوە و شتێکی هێناوە !)) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((کەواتە مژدەتان لێ بێ و بەهیوای ئەوەبن دڵخۆشتان کات [1]، جا سوێند بەخوا من لەوە ناترسم کە هەژابن، بەڵکو لەوەتان دەترسم کەچۆن دونیا بۆ ئەوانەی کە لە پێش ئێوەدا بوون زۆر بووە [2] بۆ ئێوەش زۆر بێ، ئینجا ئێوەش لە نێوان خۆتاندا پێشبڕکێی بۆ بکەن وەك ئەوان کردیان، ئیتر لەناوتان ببات هەر چۆنێك ئەوانەی لەناو برد)).**

٦٤٢٦- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الخَيْرِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلاَتَهُ على المَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى المِنْبَرِ فَقَالَ: «إِنِّي فَرَطُكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الآنَ، وَإِنِّي قَدْ أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ -أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ- وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا»[3].

---

(١) لە ماڵ و سامانی دونیایە.

(٢) ماڵ و سامانیان زۆر بوو و دونیا ڕووی تێکردن.

(٣) بڕوانە: ١٣٤٤.

**٦٤٢٦- عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لە ماڵ دەرچوو، (ڕۆشت بۆ بەقیع) و نوێژی مردووی کرد لەسەر شەهیدەکانی ئوخود، پاشان گەڕایەوە سەر دوانگەکەی و فەرمووی: ((بێگومان من پێشەنگی ئێوەم، من شایەتی ئێوەم، وە بێگومان سوێند بەخوا من ئا ئێستا سەیری حەوزەکەم دەکەم، وە بەڕاستی کلیلی خەزێنەکانی زەویم پێدراوە - یا کلیلی زەوی — وە سوێند بەخوا من ناترسم لێتان کە دوای من هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەن، بەڵکو دەترسم لێتان لەسەر دونیا ڕکەبەرایەتی یەکتر بکەن)).**

**٦٤٢٧-** حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَكْثَرَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ مَا يُخْرِجُ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ بَرَكَاتِ الأَرْضِ». قِيلَ: وَمَا بَرَكَاتُ الأَرْضِ؟ قَالَ: «زَهْرَةُ الدُّنْيَا». فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: هَلْ يَأْتِي الخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَصَمَتَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ يُنْزَلُ عَلَيْهِ، ثُمَّ جَعَلَ يَمْسَحُ عَنْ جَبِينِهِ فَقَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ؟». قَالَ: أَنَا. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: لَقَدْ حَمِدْنَاهُ حِينَ طَلَعَ ذَلِكَ. قَالَ: «لاَ يَأْتِي الْخَيْرُ إِلاَّ بِالْخَيْرِ، إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، وَإِنَّ كُلَّ مَا أَنْبَتَ الرَّبِيعُ يَقْتُلُ حَبَطًا أَوْ يُلِمُّ، إِلاَّ آكِلَةَ الخَضِرَةِ، أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَدَّتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتِ الشَّمْسَ فَاجْتَرَّتْ وَثَلَطَتْ وَبَالَتْ، ثُمَّ عَادَتْ فَأَكَلَتْ. وَإِنَّ هَذَا الْمَالَ حُلْوَةٌ، مَنْ أَخَذَهُ بِحَقِّهِ وَوَضَعَهُ فِي حَقِّهِ فَنِعْمَ الْمَعُونَةُ هُوَ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِغَيْرِ حَقِّهِ كَانَ الَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ»[1].

**٦٤٢٧- عەتائی کوڕی یەسار لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ئەوەی زۆرتر دەترسم تووشتان بێت ئەو دەروازانەیە خوا لێتان دەکاتەوە لە فەڕ و بەرەکەتەکانی زەوی))، عەرزی کرا فەڕ و بەرەکەتەکانی زەوی چییە؟ فەرمووی: ((ڕازاوەیی و جوانیەتی دونیا))،**

---

(١) بروانە: ٩٢١.

ئەنجا پیاوێك عەرزی کرد: ئایا چاكە خراپە بەشوێن خۆیدا دێنێت؟ پێغەمبەریش ﷺ لێی بێدەنگ بوو هەتا گومانمان برد نیگای بۆ دێت، پاشان دەستی کرد بەسڕینی ئەو عەرەقەی بەڕووخساریەوە بوو[1]، ئەوسا فەرمووی: ((کوا پرسیارکەرەکە؟)) وتی: ئەمەتام، ئەبو سەعید وتی: بێگومان سوپاسی پیاوەکەمان کرد کاتێ ئەو باسەی هێنایە گۆڕ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خێر هەر خێر و چاكە دێنێ، بە ڕاستی ئەم ماڵ و سامان سەوز و جوان و شیرین و خۆشەویستە، بێگومان لەو سەوزی و جوانییەی بەهار دەیرووێنێ ئاژەڵ دەکوژێت یان نزیکە بیکوژێت، مەگەر گژ و گیای سەوز بخوات هەتا هەردوو کەلەکەی پڕ دەبێت (تێردەخوات)، ئەوسا خۆی دەداتە بەر خۆر، ئەنجا کاوێژ دەکات و دەتوڕێنێ و میز دەکات، ئەنجا دەگەڕێتەوە گژ و گیا دەخوات، وە بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە سەوز و شیرینە، جا هەر کەسێك بەحەڵاڵ و هەقی خۆی پەیدای کردبێت، بەهەق و ڕەواش خەرجی کردبێت، ئای چەند هاوکارێکی باشە ئەو سامانە، هەر کەسێکیش بە ناڕەوا پەیدای بکات، ئەوە بێگومان وەك ئەو کەسە وایە کە هەر دەخوات و تێر نابێت)).

٦٤٢٨- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جَمْرَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي زَهْدَمُ بْنُ مُضَرِّبٍ قَالَ: سَمِعْتُ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ» قَالَ عِمْرَانُ: فَمَا أَدْرِي قَالَ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ قَوْلِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلاَ يَفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ»[2].

---

(١) بەهۆی قورسی نیگاکەوە بەسەریدا هاتبوو.

(٢) بڕوانە: ٢٦٥١.

**٦٤٢٨-عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((چاکترینتان (خەڵکی) چەرخی منە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن))، عیمران وتی: نازانم ئایا پێغەمبەر ﷺ پاش فەرموودەکەی (چاکترینتان خەڵکی چەرخی منە) دوو جار یا سێ جاری فەرموو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لە پاش ئەوان کەسانێك دین کەشایەتی دەدەن بێ ئەوەی داوای شایەتی دانیان لێ کرابێت، وە خیانەت دەکەن و ئەمانەت ناپارێزن، وە نەزر دەکەن و نایبەنە سەر، وە قەڵەوبوون لەناویاندا پەیدادەبێت و دەردەکەوێت))**

.٦٤٢٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَبِيدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ مِنْ بَعْدِهِمْ قَوْمٌ تَسْبِقُ شَهَادَتُهُمْ أَيْمَانَهُمْ وَأَيْمَانُهُمْ شَهَادَتَهُمْ»[1].

**٦٤٢٩- عەبدوڵلا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((چاکترینی خەڵك خەڵکی چەرخ و سەردەمی منە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان کەسانێك دێن شایەتی دانی یەکێکیان پێش سوێند خواردنی دەکەوێت، وە سوێند خواردنی پێش شایەتی دانی دەکەوێت)).**

٦٤٣٠- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، عَنْ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ خَبَّابًا وَقَدِ اكْتَوَى يَوْمَئِذٍ سَبْعًا فِي بَطْنِهِ وَقَالَ: لَوْلاَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِالمَوْتِ، إِنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ ﷺ مَضَوْا وَلَمْ تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيَا بِشَيْءٍ، وَإِنَّا أَصَبْنَا مِنَ الدُّنْيَا مَا لاَ نَجِدُ لَهُ مَوْضِعًا إِلاَّ التُّرَابَ[2].

(١) بڕوانە: ٢٦٥٢.
(٢) بڕوانە: ٥٦٧٢.

**٦٤٣٠- قەیس دەڵێ: لە خەببابم ﷺ بیست کە بێگومان لەو ڕۆژەدا حەوت جار سکی خۆی داخ کردبوو وتی: لەبەر ئەوە نەبوایە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لێمان کە داوای مردن بکەین، داوای مردنم دەکرد، بێگومان هاوەڵانی موحەممەد ﷺ ڕۆشتن و دونیا هیچ لە پاداشتی کەم نەکردنەوە، ئێستا ئێمە ئەوەندەمان دونیا دەستکەوتووە جێمان دەست ناکەوێ تێیکەین مەگەر بیکەینە خۆڵەوە (خانوی پێبکەین).**

٦٤٣١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ قَالَ: أَتَيْتُ خَبَّابًا وَهْوَ يَبْنِى حَائِطًا لَهُ فَقَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا الَّذِينَ مَضَوْا لَمْ تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيَا شَيْئًا وَإِنَّا أَصَبْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ شَيْئًا لاَ نَجِدُ لَهُ مَوْضِعًا إِلاَّ التُّرَابَ[1].

**٦٤٣١- قەیس دەڵێ: ڕۆشتین بۆ لای خەبباب ﷺ لەو کاتەدا خانویەکی خۆی دروست دەکرد، ئینجا وتی: بێگومان هاوەڵانمان ڕۆشتن و دونیا هیچ لە پاداشتی کەم نەکردنەوە، وە بێگومان ئێمە لە دوای ئەوان ئەوەندە شتمان دەستکەوتووە جێمان دەست ناکەوێ تێیکەین، مەگەر خانوی پێبکەین.**

٦٤٣٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنْ سُفْيَانَ عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ خَبَّابٍ ﷺ قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[2].

**٦٤٣٢- ئەعمەش لە ئەبی وائیلەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە خەببابەوە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کۆچمان کرد (بۆ مەدینە)[3].**

(١) بڕوانە: ٥٦٧٢.

(٢) بڕوانە: ١٢٧٦.

(٣) ئەم وتەی خەبباب بە درێژتر باس کراوە بە ژمارە: ١٢٧٦ کە پێشتر ڕابورد.

## ٨- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾﴾ فاطر

جَمْعُهُ: سُعُرٌ، قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾﴾ فاطر. الشَّيْطَانُ.

٦٤٣٣- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا شَيْبَانُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ الْقُرَشِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُعَاذُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ ابْنَ أَبَانَ أَخْبَرَهُ قَالَ: أَتَيْتُ عُثْمَانَ بِطَهُورٍ وَهْوَ جَالِسٌ عَلَى الْمَقَاعِدِ، فَتَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ وَهْوَ فِي هَذَا الْمَجْلِسِ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ مِثْلَ هَذَا الْوُضُوءِ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ جَلَسَ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ». قَالَ: وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَغْتَرُّوا»[1].

## ٨- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی خەڵكینە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، دەی كەواتە با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، وە با شەیتان فریوتان نەدات[2]، بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە دەی كەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان ئەو (شەیتان) تاقم و كۆمەڵەكەی بانگ دەكات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ)

(السَّعِير) كۆكەی (سُعُرٌ)ە، موجاهید دەڵێ: ﴿ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾﴾ فاطر، شەیتانە.

٦٤٣٣-موعازی كوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ: ئیبنو ئەبان[3] بۆی گێڕایەوە و وتی: ئاوی دەستنوێژم بۆ عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ هێنا كە لە جێگا

---

(١) بڕوانە: ١٥٩.

(٢) بەناوی ئەوەی خوا بەزەی و لێبوردەیە.

(٣) كە ناوی حومرانی كوڕی ئەبانە بەندەی ئازاد كراوی عوسمانی كوڕی عففانە ﷺ.

دانیشتنەکاندا[1] دانیشتبوو، ئینجا دەستنوێژێکی جوان و چاکی گرت، پاشان وتی: پێغەمبەریم ﷺ بینی ئالەم شوێن دانیشتنەدا دەستنوێژی گرت جا بەجوانی دەستنوێژی گرت، لە پاشان فەرمووی: ((هەرکەسێك دەستنوێژێکی وەك ئەم دەستوێژە بگرێت، پاشان بڕوات بۆ مزگەوت و دوو ڕکات نوێژ بکات، پاشان دانیشێت، (خوا) لەو گوناهانەی کە ڕابوردوون دەبورێ و خۆش دەبێت)). عوسمان وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەڵمەخەڵەتێن و فریو مەخۆن)) [2].

## ٩- بابُ ذَهَابِ الصَّالِحِينَ

ويُقالُ: الذِّهابُ: المَطَرُ

٦٤٣٤- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ بَيَانٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ مِرْدَاسٍ الأَسْلَمِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ، وَيَبْقَى حُفَالَةٌ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ أَوِ التَّمْرِ لاَ يُبَالِيهِمُ اللَّهُ بَالَةً». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: يُقَالُ: حُفَالَةٌ وَحُثَالَةٌ[3].

## ٩- باسی ڕۆشتن و مردنی پیاو چاکان

وە دەوترێت: (الذِّهابُ) (نەرمە) بارانە.

٦٤٣٤- قەیسی کوڕی حازیم دەڵێ: لە میرداسی ئەسلەمیم رضي الله عنه بیست وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پیاو چاکان یەك لە دوای یەك دەڕۆن و دەمرن و خەڵکە بەدوو خراپەکە دەمێنێتەوە، کە وەکو جۆی بێ کەڵك و خراپ یان خورمای بێ کەڵك و خراپ وان، وە خوا هیچ نرخ و قەدرێکیان بۆ دانانێ)).

---

(١) مقاعد: چەند دوکانێک بوون لای ماڵی عوسماندا بوون، یا چەند پلە و قادرمەیەک بوون، هەندێکیش دەڵێن جێگایەک بوو نزیک مزگەوت عوسمان کردبووی بە شوێنی دانیشتن بۆ جێ بەجێ کردنی کاروباری خەڵک و دەست نوێژ گرتن.
(٢) تاوانی زۆر بکەن و بڵێن دەستنوێژ و دوو ڕکات نوێژ هەمووی دەسڕێتەوە.
(٣) بڕوانە: ٤١٥٦.

ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی ی بوخاری) دەڵێ: دەوترێت: (حُفَالَةٌ) و دەشوترێ: (حُثَالَةٌ) یەك مانایان هەیە.

## ١٠- بابُ مَا يُتَّقَى مِنْ فِتْنَةِ المَالِ

وَقَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ﴿١٥﴾ ﴾ التغابن

٦٤٣٥- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرٍ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالْقَطِيفَةِ وَالْخَمِيصَةِ[1]، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَرْضَ»[2].

## ١٠- باسی ئەوەی خۆی لێ دەپارێزێت لە فیتنەی ماڵ و سامان

**وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (بێگومان دارایی و منداڵتان هەر هۆی تاقیکردنەوەتانن)**

**٦٤٣٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سەرشۆڕ و بەد بەخت بێ بەندەی دینار و درهەم و قەیفە و قوماش، ئەگەر پێیدرا ڕازی دەبێت، وە ئەگەر پێینەدرا ڕازی نابێت)).**

٦٤٣٦- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغَى ثَالِثًا، وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ»[3].

---

(١) (الْخَمِيصَة) قوماشێكی خوری ڕەشی خەت خەتی چوارگۆشەیە، وەك كوڵەوانەی ئافرەتانی كوردەواری وایە.
(٢) بڕوانە: ٢٨٨٦.
(٣) بڕوانە: ٦٤٣٧.

**٦٤٣٦-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر ئادەمیزاد پڕ بەدوو شیو ماڵ و سامان (ئاڵتوون و زێڕ)ی هەبێت هەوڵی سێیەمیش دەدات. هیچ شتێك ناخ و دەروونی ئادەمیزاد تێر ناکات مەگەر گڵ (مردن)، هەر کەسیش پەشیمان بێتەوە خوا لێی خۆش دەبێت)).**

٦٤٣٧- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا مَخْلَدٌ، أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَوْ أَنَّ لاِبْنِ آدَمَ مِثْلَ وَادٍ مَالاً لأَحَبَّ أَنَّ لَهُ إِلَيْهِ مِثْلَهُ، وَلاَ يَمْلأُ عَيْنَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ».

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَلاَ أَدْرِي مِنَ الْقُرْآنِ هُوَ أَمْ لاَ. قَالَ: وَسَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُ ذَلِكَ عَلَى الْمِنْبَرِ[1]

**٦٤٣٧.-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەگەر لە ڕاستیدا ئادەمیزاد پر بە شیوێك سامانی هەبێت، حەز دەکات کە ئەوەندەی تریش هەبێت، جگە لە گڵ هیچ شتێکی تر چاوی ئادەمیزدا تێر ناکات، وە خواش هەر کەس پەشیمان بێتەوە لێ خۆش دەبێت)).**

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: جا نازانم ئەم فەرموودەیە قورئان بوو[2] یان نا؟ وە ئیبنو عەبباس دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕ زوبەیر ﷺ بوو ئەم فەرموودەی باس دەکرد لەسەر دوانگە (لە مەککە).**

٦٤٣٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سُلَيْمَانَ بْنِ الْغَسِيلِ، عَنْ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ عَلَى الْمِنْبَرِ بِمَكَّةَ فِي خُطْبَتِهِ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «لَوْ أَنَّ ابْنَ آدَمَ أُعْطِيَ وَادِيًا مَلأً مِنْ ذَهَبٍ أَحَبَّ إِلَيْهِ ثَانِيًا، وَلَوْ أُعْطِيَ ثَانِيًا، أَحَبَّ إِلَيْهِ ثَالِثًا، وَلاَ يَسُدُّ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ».

---

(١) بڕوانە: ٦٤٣٦.

(٢) بەڵام سڕابێتەوە و ئێستا قورئان نییە.

**٦٤٣٨- ئيبنو عەبباس لە سەهلی كوڕی سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە عەبدوڵڵای كوڕی زوبەيرم ﷺ بیست لە سەر دوانگە لە وتارەكەيدا لە مەككە دەيوت: ئەی خەڵكینە بێگومان پێغەمبەر ﷺ جاران دەيفەرموو: ئەگەر ئادەمیزاد شیوێكی پێ بدرێت پڕ بێت لە ئاڵتوون و زێڕ، حەز دەكات دووەمیشی پێ بدرێت، ئەگەر پڕ بە شیوی دووهەمیشی پێ بدرێ حەزی بە سێیەمیشە، هیچ شتێك ناخ و دەروونی ئادەمیزاد پڕ ناكات گڵ نەبێت، خواش هەر كەس تەوبە بكات لێی قەبوڵ دەكات.**

٦٤٣٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَنَّ لِابْنِ آدَمَ وَادِيًا مِنْ ذَهَبٍ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَادِيَانِ، وَلَنْ يَمْلَأَ فَاهُ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ».

**٦٤٣٩-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر بەدڵنیاییەوە ئادەمیزاد شیوێك ئاڵتوونی هەبێت، حەز دەكات دوو شیو (ئاڵتوونی) هەبێت، وە هیچ شتێك دەمی ئادەمیزاد پڕ ناكات جگە لە گڵ، خواش خۆش دەبێ لە هەر كەسێ تەوبە بكات)).**

٦٤٤٠ - وَقَالَ لَنَا أَبُو الْوَلِيدِ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أُبَيٍّ قَالَ: كُنَّا نَرَى هَذَا مِنَ الْقُرْآنِ حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾﴾ التكاثر

**٦٤٤٠-ئەنەس لە ئوبەییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە دەڵێ: ئێمە وامان دەزانی ئەم فەرمoودە[1] بەشێكە لە قورئان هەتا (سورەتی) ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾﴾ دابەزی.**

(١) كە ڕابوورد بە ژمارەكانی: ٦٤٣٦ تا ٦٤٣٩.

## ١١- بابُ قَوْلِه ﷺ: «هذا المَالُ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ»

وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴿١٤﴾ ﴾ آل عمران. وَقَالَ عُمَرُ ﷺ : اللَّهُمَّ إِنَّا لَا نَسْتَطِيعُ إِلَّا أَنْ نَفْرَحَ بِمَا زَيَّنْتَ لَنَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ أَنْ أُنْفِقَهُ فِي حَقِّهِ.

## ١١- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((ئەم ماڵ و سامانە) سەوز (جوان) و شیرینە))

**وە خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: (جوان کراوە بۆ خەڵکی (دونیا پەرست) خۆشی و ئارەزووانی نەفسی لە ئافرەتان و کوڕان و دارایی زۆری کەڵەکەکراو لە ئاڵتوون و زیو و ئەسپ و ماینانی نیشانەدار [1]، هەروەها ئاژەڵ و چوار پێیان و کشتوکاڵ، ئەمانە بەهرە و خۆشیەکانی ژیان دونیان).**

**-عومەر ﷺ وتی: خودایە ئێمە ناتوانین دڵخۆش نەبین بەو شتانەی جوان و ڕازاوەت کردوە بۆمان، خوایە من داوات لێ دەکەم (یارمەتیم بدەیت) کە لە جێی خۆی و هەقدا خەرجی بکەم.**

٦٤٤١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: «هَذَا الْمَالُ -وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ لِي: يَا حَكِيمُ، إِنَّ

---

(١) بە سپێتی ناوچاوان و هەر چوار پەلیان.

هَذَا المَالَ- خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِطِيبِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِى يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، وَالْيَدُ العُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى»[1].

**٦٤٤١- زوهری دەڵێ: عوروە و سەعیدی کوڕی موسەییەب لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ﷺ بۆیان گێرامەوە وتی: داوای (ماڵ و سامانم) لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ ئەویش پێی دام، پاشان جارێکی تر داوام کرد هەر پێی دام، پاشان داوام کرد و پێی دام، پاشان فەرمووی: ((ئەم ماڵ و سامانە- هەندێ جار سوفیان (لە گێڕانەوەکەیدا) دەڵێ: فەرمووی پێم: ((ئەی حەکیم بێگومان ئەم ماڵ و سامانە- سەوز و شیرینە [2]، جا هەر کەس بەبێ داواکردن و چاوتێبڕین وەری گرێت، ئەوە فەڕ و بەرەکەتی تێدەکەوێ بۆی، هەر کەسیش بەتەمابوون و چاوتێبڕین وەری گرێت، بەرەکەت و فەڕی تێ ناکەوێ بۆی، وەك کەسێ وایە هەر بخوات و تێر نەبێ، وە دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی ژێرەوە)).**

## ١٢- بَابُ مَا قَدَّمَ مِنْ مَالِهِ فَهْوَ لَهُ

٦٤٤٢- حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيُّكُمْ مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ؟». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ مَالُهُ أَحَبُّ إِلَيْهِ. قَالَ: «فَإِنَّ مَالَهُ مَا قَدَّمَ، وَمَالُ وَارِثِهِ مَا أَخَّرَ».

## ١٢- باسی ئەو ماڵ و سامانە هی ئەوە کەپێش خۆی خستووە [3]

**٦٤٤٢-عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کامتان ماڵ و سامانی میراتگرەکەی لە ماڵ و سامانی خۆی خۆشتر دەوێت؟**

---

(١) بڕوانە: ١٤٧٢.

(٢) لە دیمەندا وەک سەوزایی جوانە و سرنج ڕاکێشە، وە لە تامە چێژدا شیرین و بە لەزەتە. (إرشاد الساري:٤٤٢/١٣).

(٣) کردویەتی بە خێر و ناردویەتی بۆ قیامەت.

**وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا كەسمان نییە ئیللا ماڵ و سامانی خۆی خۆشەویستره لای، فەرمووی: ((دەی دڵنیابن سامان و ماڵی خۆی ئەوەیە پێش خۆی خستووە[1]، ماڵ و سامانی میراتگرەكەشی ئەوەیە لە دوای خۆی جێ هێڵاوە)).**

## ١٣- بابٌ: المُكْثِرُونَ هُمُ المُقِلُّونَ

**وَقَوْلُهُ تَعَالَى:** ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ **هود**

٦٤٤٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: خَرَجْتُ لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي وَحْدَهُ وَلَيْسَ مَعَهُ إِنْسَانٌ. قَالَ: فَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَكْرَهُ أَنْ يَمْشِيَ مَعَهُ أَحَدٌ. قَالَ: فَجَعَلْتُ أَمْشِي فِي ظِلِّ الْقَمَرِ فَالْتَفَتَ، فَرَآنِي فَقَالَ: «مَنْ هَذَا؟». قُلْتُ: أَبُو ذَرٍّ، جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاءَكَ. قَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ تَعَالَهْ». قَالَ: فَمَشَيْتُ مَعَهُ سَاعَةً، فَقَالَ: «إِنَّ الْمُكْثِرِينَ هُمُ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلاَّ مَنْ أَعْطَاهُ اللَّهُ خَيْرًا، فَنَفَحَ فِيهِ يَمِينَهُ وَشِمَالَهُ وَبَيْنَ يَدَيْهِ وَوَرَاءَهُ، وَعَمِلَ فِيهِ خَيْرًا». قَالَ: فَمَشَيْتُ مَعَهُ سَاعَةً، فَقَالَ لِي: «اجْلِسْ هَا هُنَا». قَالَ: فَأَجْلَسَنِي فِي قَاعٍ حَوْلَهُ حِجَارَةٌ، فَقَالَ لِي: «اجْلِسْ هَا هُنَا حَتَّى أَرْجِعَ إِلَيْكَ». قَالَ: فَانْطَلَقَ فِي الْحَرَّةِ حَتَّى لاَ أَرَاهُ، فَلَبِثَ عَنِّي فَأَطَالَ اللُّبْثَ، ثُمَّ إِنِّي سَمِعْتُهُ وَهْوَ مُقْبِلٌ وَهْوَ يَقُول: «وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى». قَالَ: فَلَمَّا جَاءَ لَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاءَكَ، مَنْ تُكَلِّمُ فِي جَانِبِ الحَرَّةِ؟ مَا سَمِعْتُ أَحَدًا يَرْجِعُ إِلَيْكَ شَيْئًا. قَالَ: «ذَلِكَ جِبْرِيلُ ﷺ عَرَضَ لِي فِي جَانِبِ الحَرَّةِ، قَالَ:

---

(١) بەچاكەو خێرات كردن لێ ی.

بَشِّرْ أُمَّتَكَ أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، قُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟! قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: قُلْتُ: وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟! "قَالَ: نَعَمْ، وَإِنْ شَرِبَ الْخَمْرَ».

قَالَ النَّضْرُ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، وَحَدَّثَنَا حَبِيبُ بْنُ أَبِي ثَابِتٍ وَالأَعْمَشُ وَعَبْدُ العَزِيزِ بْنُ رُفَيْعٍ، حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ بِهَذَا. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: حَدِيثُ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ مُرْسَلٌ لاَ يَصِحُّ، إِنَّمَا أَرَدْنَا لِلْمَعْرِفَةِ، وَالصَّحِيحُ حَدِيثُ أَبِي ذَرٍّ. قِيلَ لأَبِي عَبْدِ اللَّهِ: حَدِيثُ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ؟ قَالَ: مُرْسَلٌ أَيْضًا لاَ يَصِحُّ، وَالصَّحِيحُ حَدِيثُ أَبِي ذَرٍّ. وَقَالَ: اضْرِبُوا عَلَى حَدِيثِ أَبِي الدَّرْدَاءِ هَذَا. إِذَا مَاتَ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. عِنْدَ الْمَوْتِ[1].

## ١٣- باسێک: ئەوانەی سامانی زۆریان هەیە (لە دنیادا) پاداشتی کەمیان هەیە (لە قامەتدا)، وە ئەم فەرمایشتەی خوا بەرز و بڵند: (هەرکەس ژیانی دنیا و ڕازەوەیی و جوانییەکەی دەوێت ئەوە ئێمە (بەرهەمی) کردەوەکانیان بە تەواوی پێ دەدەین تیایدا، وە ئەوان لەم ژیانەدا کەم و کوڕی یان لەگەڵ ناکرێ، ئەوانە کەسانێکن بۆیان نییە لە ڕۆژی دواییدا جگە لە ئاگر، وە ئەوەی کردیان تێیدا پوچ و بێ بەرهەم بووە، وە هەرچیان کرد بەردەوام بووە بە هیچ)

٦٤٤٣-زەیدی کوڕی وەهب لە ئەبی زەڕەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە شەوێك لە شەوەكاندا چوومە دەرەوە، دەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەنها دەڕوات و كەسی لەگەڵدا نییە، (ئەبو زەڕ) دەڵێ: گومانم وابوو پێی ناخۆشە كەسی تر لە

(١) بڕوانە: ١٢٣٧.

خزمەتیدا بڕوات، دەڵێ بۆیە منیش لەو تاریکایەدا دەڕۆشتم کە مانگەشەوەکە لێی نەدەدا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لای کردەوە و منی بینی فەرمووی: ((تۆ کێی؟)) وتم: ئەبو زەڕم خودا بمکات بە فیدات، فەرمووی: ((ئەی ئەبو زەڕ وەرە))، ئەبو زەڕ دەڵێ: ماوەیەك لە خزمەتیدا ڕۆشتم، ئینجا فەرمووی: ((بێگومان ئەو کەسانەی سامانیان زۆرە (لەدونیادا) هەر ئەو کەسانە لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتیان کەمە، مەگەر کەسێك خوا ماڵ و سامانی پێ بەخشیبێت، ئەویش لەو ماڵە بەڕاست و چەپیدا بەپێش و دوایدا بیبەخشێ، وە خێر و چاکەی تیا بکات))، ئەبو زەڕ دەڵێ: ماوەیەکی تر لە خزمەتیدا ڕۆشتم، ئەنجا فەرمووی پێم: ((ئا لێرەدا دانیشە)) دەڵێ: لە جێگایەکی تەختدا داینیشاندم کە هەندێ بەردی بە چواردەوردا بوو، فەرمووی پێم: ((ئا لێرەدا دانیشە هەتا دەگەڕێمەوە بۆلات))، دەڵێ: ئینجا بە بەردەڵانە ڕەشەکەی مەدینەدا ڕۆشت هەتا لە چاوم ون بوو، ئینجا ماوەیەك دوور لە من مایەوە زۆریشی پێ چوو، پاشان کە ڕوو بەمن دەهاتەوە گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ((با دزی و زیناشی کردبێت) دەڵێ: جا کە هاتەوە خۆم پێ نەگیرا هەتا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خودا بمکات بە قوربانت: لەگەڵ کێدا قسەت دەکرد کە لای بەردەڵانە ڕەشەکە بوویت؟ گوێم لێ نەبوو کەس وەڵامت باتەوە، فەرمووی: ((ئەوە جیبریل ﷺ بوو خۆی پێشان دام لە بەشێکی بەردەڵانە ڕەشەکەدا، فەرمووی: ((مژدە بە ئوممەتەکەت بدە کە هەر کەس بمرێت و هیچ شتێك نەکات بە هاوبەشی خوا دەچێتە بەهەشتەوە، وتم: ئەی جیبریل ئەگەر دزی بکات وئەگەر زیناش بکات؟ فەرمووی: بەڵێ، دەڵێ وتم: ئەگەر دزی و زیناش بکات؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر عارەقیش بخواتەوە)).

-نەزر دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕاینەوە وتی: حەبیبی کوڕی سابیت و ئەعمەش و عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیع بۆیان گێڕاینەوە وتیان: زەیدی کوڕی وەهب ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە.

-ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەو فەرموودەی ئەبی صاڵح لە ئەبی دەرداوە ﷺ گێڕاویەتیەوە مورسەلە و[1] صەحیح نییە، تەنها بۆ زانیاری دەربارەی هێناومانە، لەم بارەیەوە ئەو فەرموودە صەحیحە كە ئەبو زەڕ گێڕاویەتیەوە.

-بە ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) وترا: فەرموودەكەی عەتا لە ئەبی دەرداوە چۆنە؟ وتی: ئەویش هەر فەرموودەیەكی مورسەلە و ڕاست و صەحیح نییە، ئەوەی كە صەحیحە فەرموودەكەی ئەبو زەڕە و بوخاری وتی: فەرموودەكەی ئەبی درداء ﷺ وەرمەگرن وازی لێ بێنن، كە ئەمەیە ((كاتێ مرد بلێ (لا إلهَ إلاَّ اللهُ) لەسەرە مەرگدا))[2].

## ١٤- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي أُحُدًا ذَهَبًا»

٦٤٤٤- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: قَالَ أَبُو ذَرٍّ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَرَّةِ الْمَدِينَةِ فَاسْتَقْبَلَنَا أُحُدٌ فَقَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «مَا يَسُرُّنِي أَنَّ عِنْدِي مِثْلَ أُحُدٍ هَذَا ذَهَبًا تَمْضِي عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ، إِلاَّ شَيْئًا أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ، إِلاَّ أَنْ أَقُولَ بِهِ فِي عِبَادِ اللَّهِ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا». عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ. ثُمَّ مَشَى فَقَالَ: «إِنَّ الأَكْثَرِينَ هُمُ الأَقَلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا -عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ- وَقَلِيلٌ مَا هُمْ». ثُمَّ قَالَ لِي: «مَكَانَكَ لاَ تَبْرَحْ حَتَّى آتِيَكَ». ثُمَّ انْطَلَقَ فِي سَوَادِ اللَّيْلِ حَتَّى تَوَارَى، فَسَمِعْتُ صَوْتًا قَدِ ارْتَفَعَ، فَتَخَوَّفْتُ أَنْ يَكُونَ قَدْ عَرَضَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَرَدْتُ أَنْ آتِيَهُ فَذَكَرْتُ

---

(١) فەرموودەی مورسەل ئەوەیە تابعین لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیگێڕێتەوە ناوی صەحابەكە نەهێنێ كە گێراویەتیەوە.

(٢) ئەم فەرموودە بەلای بوخاریەوە مورسەلە و لاوازە.

قَوْلَهُ لِي: «لاَ تَبْرَحْ حَتَّى آتِيَكَ» فَلَمْ أَبْرَحْ حَتَّى أَتَانِي، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتًا تَخَوَّفْتُ، فَذَكَرْتُ لَهُ. فَقَالَ: «وَهَلْ سَمِعْتَهُ؟». قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: «ذَاكَ جِبْرِيلُ أَتَانِي فَقَالَ: مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ». قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟! قَالَ: «وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ»[١].

## ١٤- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ:((پێم خۆش نییە [٢] بە ئەندازەی كێوی ئوحود ئاڵتوونم هەبێت))

**٦٤٤٤-زەیدی كوڕی وەهب وتی: ئەبو زەڕ ﷺ وتی:من لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ لە بەردەڵانە ڕەشەكەی مەدینە پێكەوە بەڕێگادا دەڕۆیشتین، كێوی ئوحود ڕووبەڕوومان بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەبو زەڕ)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێڕایەڵتم و لە خزمەتدام، فەرمووی: ((پێم خۆش نییە بە دڵنیاییەوە وێنەی ئەو كێوی ئوحودە ئاڵتوونم هەبێت، سێ شەو تێپەڕێ بەسەرمدا یەك دینارم لا مابێت، مەگەر شتێك داینێم بۆ قەرزێك (كە لەسەرم بێ)، هەمووی ئاوەها و ئاوەها و ئاوەها ببیەخشم بە بەندەكانی خودا))، بەلای ڕاست و بەلای چەپ و لەپشتیەوە، پاشان ڕۆشت و فەرمووی: ((بێگومان ئەوانەی زۆرترینیان هەیە كەمترین (پاداشتیان) هەیە لە ڕۆژی دواییدا، مەگەر كەسێك ئاوەها و ئاوەها و ئاوەها- بەلای ڕاست و بەلای چەپ و لە پشتیەوە - سامانەكەی ببەخشێت، ئەوانەش كەمن))، پاشان فەرمووی پێم: ((ئەبو زەڕ لە شوێنی خۆت ڕاوەستە و بەجێی نەیەڵێ هەتا دەگەڕێمەوە بۆ لات))، ئینجا لە تاریكی شەودا ڕۆشت هەتا لەچاو ون بوو، جاگوێم لێ بوو دەنگێكی گەورە هات،**

---

(١) بڕوانە: ١٢٣٧.

(٢) (مَا أُحِبُّ) واتە: پێم خۆش نییە و حەز ناكەم ئەمە مانا ڕوونەكەیەتی، دەگونجێ بەم جۆرەش مانا بكرێ: پێم خۆشە یان چەند پێم خۆشە ئیبنو حەجەر ئاماژەی بۆ ئەم دوو مانا كردوە (فتح الباری:٣١٩/١٤).

ترسام کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی بەسەرهاتبێ، بۆیە ویستم بڕۆم بۆ لای، بەڵام فەرمایشتەکەی پێغەمبەرم ﷺ بیرکەوتەوە کە فەرمووی پێم: ((شوێنی خۆت بەجێی نەیەڵێ هەتا دەگەڕێمەوە بۆ لات))، بۆیە مامەوە هەتا هاتەوە بۆ لام وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی گوێم لە دەنگێک بوو ترسام شتێکت لێ هاتبێ، ئیتر بۆم گێڕایەوە، فەرمووی((گوێت لێ بوو؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەوە جیبریل ﷺ بوو هات بۆ لام و هەواڵی پێدام کە هەر کەس لە ئوممەتەکەم بمرێت و هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی خوا، دەڕواتە بەهەشتەوە))، عەرزم کرد: ئەگەر زینا و دزیش بکات؟ فەرمووی ((ئەگەر زینا و دزیش بکات)).

٦٤٤٥- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، عَنْ يُونُسَ. وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَبًا لَسَرَّنِي أَنْ لاَ تَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاَثُ لَيَالٍ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ، إِلاَّ شَيْئًا أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ»[1].

٦٤٤٥- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر بەقەدەر کێوی ئوحود ئاڵتوونم هەبێت پێم خۆش نییە کە سێ ڕۆژم بەسەردا تێپەڕێ هیچێکیم لا مابێت، مەگەر شتێك داینێم بۆ قەرزێك (بیدەمەوە) )).

(١) بڕوانە: ٢٣٨٩.

## ١٥- بابٌ: الغِنَى غِنَى النَّفْسِ

وَقَوْلُه تَعَالى: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾ إِلَى قَوْلِه ﴿ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾ المؤمنون، قَالَ ابن عُيَيْنَةَ: لَمْ يَعْمَلُوهَا، لَا بُدَّ أَنْ يَعْمَلُوهَا.

## ١٥- باسێک: دەوڵەمەندی ئەوەیە دڵ و دەروون دەوڵەمەند بێت وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئایا ئەوانە وا دەزانن ئەوەی پێیان دەبەخشێن لە سامان و منداڵان) تا دەگاتە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: ( جیا لە کردەوەی باوەڕداران کە ئەوانەن هەمیشە ئەنجام دەریانن)

-ئیبنوعوییەنە دەڵێ: نەیان کردوە، بەڵام هەر دەبێ ئەو کردەوانە بکەن.

٦٤٤٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ».

**٦٤٤٦-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( دەوڵەمەندی بە زۆری کاڵا و کەلوپەل نییە، بەڵکو دەوڵەمەندی ئەوەیە دڵ و دەروونی دەوڵەمەند بێت)).**

## ١٦- بابُ فَضْلِ الفَقْرِ

٦٤٤٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّهُ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لِرَجُلٍ عِنْدَهُ جَالِسٍ: «مَا رَأْيُكَ

فِي هَذَا؟». فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَشْرَافِ النَّاسِ، هَذَا وَاللَّهِ حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ يُشَفَّعَ. قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ مَرَّ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا رَأْيُكَ فِي هَذَا؟». فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا رَجُلٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ، هَذَا حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لاَ يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لاَ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ لاَ يُسْمَعَ لِقَوْلِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الأَرْضِ مِثْلَ هَذَا»[1].

## ١٦- باسی فەزڵ و گەورەیی هەژاری

**٦٤٤٧- عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی حازیم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ گێڕایەوە کە ئەو وتی: پیاوێك بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕی، فەرمووی بەپیاوێکی کەلایدا دانیشتبوو: ((ڕات چییە دەربارەی ئەم پیاوە؟)) جا پیاوێك کە یەکێك بوو لە گەورەی ناو خەڵکەکە وتی: ئەوە سوێند بە خوا شیاوی ئەوەیە ئەگەر خوازبێنی ئافرەتی کرد پێی بدەیت و بۆی مارە بکەیت، وە ئەگەر تکای کرد تکای قەبوڵ کرێت، (سەهل) دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ بێدەگ بوو، پاشان پیاوێکی تر تێپەڕی، پێغەمبەر خواش ﷺ بە ئەو (پیاوەکەی لای بوو) فەرمووی: ((ڕات دەربارەی ئەم پیاوە چییە؟)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە پیاوێکە لە هەژارە مسوڵمانەکانە، ئەمە شیاوی ئەوەیە ئەگەر خوازبێنی ئافرەتی کرد پێی نەدرێت، وە ئەگەر تکای کرد تکای وەرنەگرێت، وە ئەگەر قسەی کرد گوێی بۆ قسەی نەگیرێ، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەمە (هەژارەکە) چاکترە لە پڕ بەزەوی لە ئەو (دەوڵەمەندە)ی تریان)).**

---

(١) بڕوانە: ٥٠٩١.

٦٤٤٨- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ قَالَ: عُدْنَا خَبَّابًا فَقَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ نُرِيدُ وَجْهَ اللَّهِ، فَوَقَعَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَضَى لَمْ يَأْخُذْ مِنْ أَجْرِهِ، مِنْهُمْ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ نَمِرَةً، فَإِذَا غَطَّيْنَا رَأْسَهُ بَدَتْ رِجْلَاهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا رِجْلَيْهِ بَدَا رَأْسُهُ فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نُغَطِّيَ رَأْسَهُ، وَنَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيْهِ مِنَ الإِذْخِرِ، وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ فَهْوَ يَهْدُبُهَا[١].

**٦٤٤٨- ئەعمەش دەڵێ: لە ئەبو وائیلم بیست وتی: سەردانی خەبابمان کرد (نەخۆش بوو) وتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کۆچمان کرد[٢] مەبەستمان ڕەزامەندی خوا بوو، بۆیە پاداشتمان لای خوایە (نووسراوە بۆمان)، جاهەمان بوو (مرد و) ڕۆشت هیچی لە پاداشتەکەی وەرنەگرت، یەکێك لەوانە موصعەبی کوڕی عومەیر بوو، لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا کوژرا قوماشێکی خەت خەتی لێ بەجێما، کە سەریمان بەو قوماشە دادەپۆشی هەردوو قاچی دەردەکەوت، وەکە هەردوو قاچیمان پێ داپۆشیایە سەری دەردەکەوت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین سەری داپۆشین و هەندێ ئیزخیر بدەین بەسەر قاچەکانیدا، هەشمانە بەرهەمەکەی پێگەشتووە و ئەو کەسە بەرهەمەکەی لێ دەکاتەوە و دەیڕنێت[٣].**

٦٤٤٩- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا سَلْمُ بْنُ زَرِيرٍ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ، فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ»[٤]. تَابَعَهُ أَيُّوبُ وَعَوْفٌ، وَقَالَ صَخْرٌ وَحَمَّادُ بْنُ نَجِيحٍ، عَنْ أَبِي رَجَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ.

---

(١) بڕوانە: ١٢٧٦.
(٢) مەبەستی بەفەرمانی ئەو کۆچمان کرد، چونکە تەنها ئەبو بەکر و عامیر کوڕی فوهەیرە لەگەڵیدا کۆچیان کرد.
(٣) ئەمە ئیستیعارەیە کە هەندێکمان خوا ناز و نیعمەتی زۆری دونیای ڕشتووە بەسەرماندا.
(٤) بڕوانە: ٣٢٤١.

**٦٤٤٩- عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كه فەرموویەتی: ((چاوم بەبەهەشت كەوت [1] و بینیم زۆرتری خەڵكەكەی هەژارانن. وە چاوم بە دۆزەخ كەوت و بینیم زۆرتری خەڵكەكەی ئافرەتانن)).- ئەیوب و عەوف ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی ئەبو ڕەجایان كردوە.**

**-صەخر و حەممادی كوڕی نەجیح ئەم فەرموودەیان لە ئەبی ڕەجاوە گێڕاوەتەوە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

٦٤٥٠- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمْ يَأْكُلِ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى خِوَانٍ حَتَّى مَاتَ، وَمَا أَكَلَ خُبْزًا مُرَقَّقًا حَتَّى مَاتَ[2].

**٦٤٥٠-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەتا وەفاتی كرد لەسەر مێز نانی نەخواردووە، وە هەتا وەفاتی كردوە نانی تەنك كراوی نەخواردووە.**

٦٤٥١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَمَا فِي رَفِّي مِنْ شَيءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ، إِلاَّ شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ[3].

**٦٤٥١- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد شتێك لە ڕەفەكەمدا نەبوو گیانلەبەر بیخوات، هەندێ[1] جۆ نەبێ لە ڕەفەكەمدا بوو، جا بۆماوەیەكی زۆر لێم خوارد، ئەنجا كە پێوام ئیتر تەواو بوو[2].**

---

(١) لە شەوی میعراجدا یان خەودا. بڕوانە: إرشاد الساري:٤٥٢/١٣.

(٢) بڕوانە: ٥٣٨٦.

(٣) بڕوانە: ٣٠٩٧.

## ١٧- بابٌ: كَيْفَ كَانَ عَيْشُ النَّبِيِّ ﷺ وَأَصْحَابِهِ، وَتَخَلِّيهِمْ مِنَ الدُّنْيَا

٦٤٥٢- حَدَّثَنِي أَبُو نُعَيْمٍ بِنَحْوٍ مِنْ نِصْفِ هَذَا الْحَدِيثِ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ ذَرٍّ حَدَّثَنَا مُجَاهِدٌ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يَقُولُ: اللَّهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، إِنْ كُنْتُ لأَعْتَمِدُ بِكَبِدِي عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْجُوعِ، وَإِنْ كُنْتُ لأَشُدُّ الْحَجَرَ عَلَى بَطْنِي مِنَ الْجُوعِ، وَلَقَدْ قَعَدْتُ يَوْمًا على طَرِيقِهِمُ الَّذِي يَخْرُجُونَ مِنْهُ، فَمَرَّ أَبُو بَكْرٍ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ، مَا سَأَلْتُهُ إِلاَّ لِيُشْبِعَنِي، فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ، ثُمَّ مَرَّ بِي عُمَرُ فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ، مَا سَأَلْتُهُ إِلاَّ لِيُشْبِعَنِي، فَمَرَّ فَلَمْ يَفْعَلْ، ثُمَّ مَرَّ بِي أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ فَتَبَسَّمَ حِينَ رَآنِي وَعَرَفَ مَا فِي نَفْسِي وَمَا فِي وَجْهِي، ثُمَّ قَالَ: «أَبَا هِرٍّ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «الْحَقْ». وَمَضَى فَتَبِعْتُهُ، فَدَخَلَ فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنَ لِي، فَدَخَلَ فَوَجَدَ لَبَنًا فِي قَدَحٍ فَقَالَ: «مِنْ أَيْنَ هَذَا اللَّبَنُ؟». قَالُوا: أَهْدَاهُ لَكَ -فُلاَنٌ أَوْ فُلاَنَةُ-. قَالَ: «أَبَا هِرٍّ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «الْحَقْ إِلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ فَادْعُهُمْ لِي». قَالَ: وَأَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيَافُ الإِسْلاَمِ، لاَ يَأْوُونَ إِلَى أَهْلٍ وَلاَ مَالٍ وَلاَ عَلَى أَحَدٍ، إِذَا أَتَتْهُ صَدَقَةٌ بَعَثَ بِهَا إِلَيْهِمْ، وَلَمْ يَتَنَاوَلْ مِنْهَا شَيْئًا، وَإِذَا أَتَتْهُ هَدِيَّةٌ أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ وَأَصَابَ مِنْهَا وَأَشْرَكَهُمْ فِيهَا، فَسَاءَنِي ذَلِكَ فَقُلْتُ: وَمَا هَذَا اللَّبَنُ فِي أَهْلِ الصُّفَّةِ؟ كُنْتُ أَحَقُّ أَنَا أَنْ أُصِيبَ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ شَرْبَةً أَتَقَوَّى بِهَا، فَإِذَا جَاءَ أَمَرَنِي فَكُنْتُ أَنَا أُعْطِيهِمْ، وَمَا عَسَى أَنْ يَبْلُغَنِي مِنْ هَذَا اللَّبَنِ، وَلَمْ يَكُنْ مِنْ طَاعَةِ اللَّهِ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ ﷺ بُدٌّ، فَأَتَيْتُهُمْ

---

(١) یان نیو وەسق.

(٢) سەرنج: پێشتر لە باسی کڕین و فرۆشتندا فەرموودەیەک ڕابوورد (كيلوا طعامكم يبارك لكم)، واتە: خۆراکەکانتان بپێون فەڕ و بەرەکەتی تێ دەکەوێ، لەم فەرموودە عائیشەشدا لێرە پێوانەکە بویە هۆی تەواو بوون بێ بەرەکەتی، چۆن مانای ئەم دوو فەرموودەیە ڕێکدەخرێن؟ وەڵامەکەی بەم جۆرەیە: یەکم: پێوانە و کێشانە لە کڕین و فرۆشتندا فەڕ و بەرەکەتە، بەڵام بۆ خۆراک و خواردەمەنی کە لەماڵاندا بخورێت بەرەکەت نییە. دووهەم: یان مەبەست ئەوەیە پێوانەی بکات لە کڕین و فرۆشتندا بەڵام ئەوەی مایەوە نەزانراو بێت. سێیەم: پێوانە لە کڕین و فرۆشتندا پێویستە، چونکە پەیوەندی بە کڕیار و فرۆشیارەوە هەیە و پێویستە بۆیان، بۆیە سونەتە پێوانە بکەن، بەڵان لە ماڵاندا دەبێتە هۆی ڕەزلیی و پیسکەیی بۆیە ناپەسەندە. چوارەم: هۆی تەواو بوون و بێ بەرەکەتی سەیرکردنی ڕسق و ڕۆزی بە چاوی ڕەزیلی ڕژدەیی لە کاتێکدا بە چاوی خۆی بەردەوامی دابارینی ڕسق و ڕۆزی خوا دەبینێت و شوکر و سوپاسی ناکات ( إرشاد الساري: ١٣،٤٥٣).

فَدَعَوْتُهُمْ فَأَقْبَلُوا، فَاسْتَأْذَنُوا فَأَذِنَ لَهُمْ، وَأَخَذُوا مَجَالِسَهُمْ مِنَ الْبَيْتِ. قَالَ: «يَا أَبَا هِرٍّ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «خُذْ فَأَعْطِهِمْ». قَالَ: فَأَخَذْتُ الْقَدَحَ، فَجَعَلْتُ أُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ، فَأُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ، حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ رَوِيَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ، فَأَخَذَ الْقَدَحَ فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ، فَنَظَرَ إِلَيَّ فَتَبَسَّمَ فَقَالَ: «أَبَا هِرٍّ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «بَقِيتُ أَنَا وَأَنْتَ». قُلْتُ: صَدَقْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «اقْعُدْ فَاشْرَبْ». فَقَعَدْتُ فَشَرِبْتُ. فَقَالَ: «اشْرَبْ». فَشَرِبْتُ، فَمَا زَالَ يَقُولُ: «اشْرَبْ». حَتَّى قُلْتُ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، مَا أَجِدُ لَهُ مَسْلَكًا. قَالَ: «فَأَرِنِي». فَأَعْطَيْتُهُ الْقَدَحَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَسَمَّى وَشَرِبَ الفَضْلَةَ[1].

## ١٧- باسێک: ژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی چۆن بووە، وە گوێ پێنەدانیان بە دنیا [2]

**٦٤٥٢-موجاهید دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ جاران دەیوت: سوێند بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێك نییە جگەلە ئەو، من خۆم سکم توند دەنوساند بەزەوییەوە لە برساندا، وە خۆم بەردم دەبەست بە سکمەوە لە برساندا، سوێند بەخوا ڕۆژێکیان لە ڕێگەی خەڵکەکەدا دانیشتم کە لێییەوە دەرۆشتنە دەرەوە [3] جائەبو بەکر ﷺ تێپەڕی و پرسیاری ئایەتێکی قورئانم لێ کرد، پرسیارم لێ نەکرد تەنها لەبەر ئەوە نەبێ تێرم کات لە خۆراك، ئینجا تێپەڕی هیچی نەکرد، پاشان عومەر ﷺ تێپەڕی و پرسیاری ئایەتێکی قورئانم لێ کرد، هەر بۆ ئەوە پرسیارم لێ کرد تێرم کات، ئەویش ڕۆشت و هیچی نەکرد، ئینجا ئەبا لقاسیم (پێغەمبەر ﷺ) بەلامدا تێپەڕی کە بینیمی زەردەخەنەیەکی کرد، وە**

---

(١) بڕوانە: ٥٣٧٥.

(٢) بە خۆشی و ڕابواردنەکانی دونیا و ڕۆنەچوون تیایا.

(٣) لە ماڵەکانیانەوە بۆ مزگەوت. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٣/٤٥٥.

زانی بەوەی لە دڵم دایە بەوەی لە ڕووخسارم دایە، پاشان فەرمووی: ((ئەبا هیڕ)) وتم: پەیڕەوی فەرمانتم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((بەدوامدا وەرە))، ئەو ڕۆشت و منیش شوێنی کەوتم، جا ڕۆشتە ژوورەوە، منیش مۆڵەتی چوونە ژوورەوەم خواست ئەویش مۆڵەتی دام و چوومە ژوورەوە، ئینجا (پێغەمبەر ﷺ) هەندێ شیری بینی لە جامێکدا و فەرمووی: ((ئەم شیرەتان لەکوێ بوو؟)) وتیان: فلانە پیاو- یان فلانە ژن- بەدیاری بۆ تۆی هێناوە، فەرمووی: ((ئەبا هیڕ)) وتم: بەدەنگتەوەم و هەمیشە ملکەچی فەرمانتم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((بڕۆ بۆ لای ئەو کەسانەی لە صوفەدان و بانگیان بکە بۆم))، ئەبو هوڕەیرە دەڵێ: خەڵکی صوفەش میوانانی ئیسلام بوون، نەدەڕۆشتنەوە بۆ لای کەس و کار و ماڵ و سامان و هیچ کەس[1]، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر زەکاتێکی بۆ بهاتایە دەینارد بۆ خەڵکی صوفە و خۆی هیچی لێ نەدەخوارد (و دەستی بۆ نەدەبرد)، بەڵام ئەگەر دیاری بۆ بهاتایە بۆ دەناردن و خۆشی لێ دەخوارد و هاوبەشییان دەکرد لە دیارییەکەدا، جا ئەوەم پێ ناخۆش بوو وتم: ئەم شیرە چەندێکە تا بدرێ بەخەڵکی صوفە، من خۆم لە پێشترم کە لەم شیرە کەمێ بخۆم تا هێزم تێدا بێت، جا کە هاتن فەرمان بەمن دەکات ئەبێ من پێیان بدەم، پێناچێ ئەو شیرە بگاتە من، وە لە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی چار نییە (هەر دەبێ گوێڕایەڵ بیت)، ئینجا منیش ڕۆشتم بۆ لایان و بانگم کردن و هەموویان هاتن، مۆڵەتیان خواست و مۆڵەت دران، ئیتر لە ماڵدا هەموویان لە شوێنی خۆیان دانیشتن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی ئەبوهیڕ)) وتم: ئامادەم سەرم لە ڕێتە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((شیرەکە بگرە و پێیان بدە)) دەڵێ: منیش جامەکەم لێ وەرگرت و دەستم کرد بە شیر پێدانیان، دەمدا بە پیاوێك دەیخواردەوە هەتا تێری دەخواردەوە، پاشان

(١) واتە: هەر لەمزگەوت بوون خێزان و ماڵ و هیچیان نەبوو.

جامەکەی دەدامەوە، ئینجا دەمدا بە پیاوێکی تر ئەویش دەیخواردەوە هەتا پاراو دەبوو، پاشان جامەکەی دەدامەوە، ئینجا کەسێکی تر دەیخواردەوە هەتا تێری دەخواردەوە، پاشان جامەکەی بۆم دەگێڕایەوە، (بەم جۆرە بەردەوام بووم) هەتا لەکۆتاییدا گەشتمە سەر پێغەمبەر ﷺ، پاش ئەوەی خەڵکەکە هەموویان تێریان خواردەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ جامەکەی وەرگرت خستیە سەر دەستی و سەیرێکی منی کرد زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: ((ئەبو هیڕ)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لە خزمەتدام فەرمانبەردارتم فەرمووی: ((هەر من و تۆ ماوین)) وتم: ڕاست دەکەی ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((دانیشە و بیخۆرەوە)) منیش دانیشتم و شیرم خواردەوە، هەم فەرمووی: ((بیخۆرەوە)) هەم خواردمەوە، هەر بەردەوام دەیفەرموو: ((بیخۆرەوە))، هەتا وتم ناخۆمەوە، سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی و هەق ناردوە شوێنم نەماوە تێی کەم، فەرمووی: ((ئادەی نیشانم بدە)) منیش جامەکەم دایە، ئەویش سوپاسی خوای کرد و ناوی خوای برد و ئەوەی مابوویەوە خواردیەوە.

٦٤٥٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا قَيْسٌ قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدًا يَقُولُ: إِنِّي لأَوَّلُ العَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَرَأَيْتُنَا نَغْزُو وَمَا لَنَا طَعَامٌ إِلاَّ وَرَقُ الحُبْلَةِ وَهَذَا السَّمُرُ، وَإِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ، مَا لَهُ خِلْطٌ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ تُعَزِّرُنِي عَلَى الإِسْلاَمِ، خِبْتُ إِذًا وَضَلَّ سَعْيِي[1].

٦٤٥٣- قەیس دەڵێ: لە سەعدم ﷺ بیست دەیوت: بێگومان من یەکەم عەرەبێکم بووم کە لە ڕێی خوادا تیری هاوێشتبێ، وە خۆمانم دەبینی غەزامان دەکرد جگە گەڵای دار هیچ خۆراکێکمان نەبوو، وە بێگومان کەسێکمان وەکو وشتر یان مەڕ پشقڵی ئەکرد (ئەوەندە و شك و ڕەق بوو)، پێکەوە نەدەنوسان و تێکەڵ

(١) بروانە: ٣٧٢٨.

**نەدەبوون! پاشان بەنو ئەسەد وایان لێ هاتووە لەسەر ئیسلام ڕەخنەم لێ ئەگرن و فێرم دەكەن، كەواتە من ئەبێ خەسارەتمەند بووبم و هەموو هەوڵم بەفیڕۆ چووبێت.**

٦٤٥٤- حَدَّثَنِي عُثْمَانُ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ مِنْ طَعَامِ بُرٍّ ثَلاَثَ لَيَالٍ تِبَاعًا حَتَّى قُبِضَ[1].

**٦٤٥٤- عائیشە ﵂ دەڵێ: لەو كاتەوەی موحەممەد پێغەمبەر ﷺ هاتووە بۆ مەدینە، هەتا گیانی كێشرا ئالی موحەممەد ﷺ سێ شەو لەسەر یەك لە نانی گەنم تێریان نەخواردووە.**

٦٤٥٥- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ -هُوَ الأَزْرَقُ- عَنْ مِسْعَرِ بْنِ كِدَامٍ، عَنْ هِلاَلٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا أَكَلَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ أَكْلَتَيْنِ فِي يَوْمٍ إِلاَّ إِحْدَاهُمَا تَمْرٌ.

**٦٤٥٥- عائیشە ﵂ دەڵێ: ئالی موحەممەد ﷺ لە هەر ڕۆژێكدا دوو جار نانیان خواردبێ یەكێكیان خورما بووە.**

٦٤٥٦- حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ أَبِي رَجَاءٍ، حَدَّثَنَا النَّضْرُ، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَدَمٍ، وَحَشْوُهُ مِنْ لِيفٍ.

**٦٤٥٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: نوێنی نوستنەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێستەی خۆشەكراو بوو، ناو ئاخنەكەی توێكڵ و ڕیشاڵی (دار خورما بوو).**

---

(١) بڕوانە: ٥٤١٦.

٦٤٥٧- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ قَالَ: كُنَّا نَأْتِي أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ وَخَبَّازُهُ قَائِمٌ، وَقَالَ: كُلُوا، فَمَا أَعْلَمُ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَغِيفًا مُرَقَّقًا، حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ، وَلاَ رَأَى شَاةً سَمِيطًا بِعَيْنِهِ قَطُّ[1].

**٦٤٥٧- قەتادە دەڵێ: ئێمە دەچووین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ نانەواکەی لایدا وەستابوو، ئەنەس وتی: بخۆن من ئاگادارنیم پێغەمبەر ﷺ نانێکی تەنك و نەرمی بینیبێت هەتا گەیشتەوە بە خزمەتی خوا، وە هەرگیز مەڕێکی نەبینیوە بە چاوی خۆی بە ئاوی گەرم خوریەکەی لابرابێ وبە ساقی برژێنرابێ[2].**

٦٤٥٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ يَأْتِي عَلَيْنَا الشَّهْرُ مَا نُوقِدُ فِيهِ نَارًا، إِنَّمَا هُوَ التَّمْرُ وَالْمَاءُ، إِلاَّ أَنْ نُؤْتَى بِاللُّحَيْمِ[3].

**٦٤٥٨- عائیشە ﷺ دەڵێ: جاری وا هەبوو مانگێك بەسەرماندا تێدەپەڕی ئاگرمان تیا نەدەکردەوە، بێگومان خۆراکمان خورما و ئاو بوو، مەگەر (بەدیاری) گۆشتێکی کەممان بۆ بهێنرایە.**

٦٤٥٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأُوَيْسِيُّ، حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: لِعُرْوَةَ ابْنَ أُخْتِي إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلاَلِ ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ وَمَا أُوقِدَتْ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَارٌ. فَقُلْتُ: مَا كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتِ: الأَسْوَدَانِ التَّمْرُ وَالْمَاءُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ جِيرَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ لَهُمْ مَنَائِحُ، وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَبْيَاتِهِمْ، فَيَسْقِينَاهُ[4].

---

(١) بروانە: ٥٣٨٥.

(٢) وە نەیخواردووە.

(٣) بروانە: ٢٥٦٧.

(٤) بروانە: ٢٥٦٧.

٦٤٥٩- عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە كە بەعوروەی وت: خوشكەزای خۆم ئێمە سێ مانگی یەك شەوەمان دەبینی لە دوو مانگدا، لەماڵەكانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئاگر نەكراوەتەوە، منیش وتم: ئەی بەچی دەژیان؟ عائیشە وتی: دوو خواردنە ڕەشەكە[1]: خورما و ئاو، بەڵام بەراستی پێغەمبەری خوا ﷺ چەند دراوسێیەكی ئەنصاری هەبوو ئاژەڵی شیردارییان هەبوو، لە شیری ئەو ئاژەڵانەیان ئەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دەیدا پێمان بیخۆینەوە.

٦٤٦٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَارَةَ عَنْ أَبِي زُرْعَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ ارْزُقْ آلَ مُحَمَّدٍ قُوتًا».

٦٤٦٠-ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خودایە ڕزق و ڕۆزی خانەوادەی موحەممەد ئەوەندە بدە بەسە و هەر پێی بژین و بەس)).

## ١٨- بابُ الْقَصْدِ وَالْمُدَاوَمَةِ عَلَى العَمَلِ

٦٤٦١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا أَبِي، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ أَشْعَثَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ مَسْرُوقًا قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: أَيُّ الْعَمَلِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَتِ: الدَّائِمُ. قَالَ: قُلْتُ: فَأَيَّ حِينٍ كَانَ يَقُومُ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقُومُ إِذَا سَمِعَ الصَّارِخَ[2].

## ١٨- باسی مامناوەندبوون و بەردەوامی لە كاری چاكەدا (سوننەتە)

٦٤٦١- مەسروق دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە كرد ﵂ چ كردەوەیەك بەلای پێغەمبەرەوە خۆشەویستر بوو؟ عائیشەش وتی: ئەوكردەوەی بەردەوام بێت،

(١) خورما ڕەشە و ئاو ڕەنگی نییە، بەڵام ڕەشی خورماكە بۆ هەردووكیان كراوە بەناو.
(٢) بڕوانە: ١١٣٢.

**وتم: چ كاتێ پێغەمبەر ﷺ هەڵدەسا بۆ شەونوێژ؟ عائیشە وتی: كاتێ گوێی لە خوێندنی كەڵەشێر بوایە هەڵدەسا بۆ شەونوێژ.**

٦٤٦٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ عَنْ مَالِكٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ(١).

**٦٤٦٢- عائیشە ﵂ دەڵێ: خۆشەویسترین كردەوە لای پێغەمبەری خوا ئەو كردەومیە بوو خاوەنەكەی لەسەری بەردەوام بێت.**

٦٤٦٣- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَنْ يُنَجِّيَ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ». قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِرَحْمَةٍ، سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَاغْدُوا وَرُوحُوا، وَشَيْءٌ مِنَ الدُّلْجَةِ. وَالْقَصْدَ الْقَصْدَ تَبْلُغُوا»(٢).

**٦٤٦٣- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هیچ كەس لە ئێوە كردەوەكانی ڕزگاری ناكات))، عەرزیان كرد تۆش (ڕزگار ناكات) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((منیش ڕزگار ناكات، مەگەر خوا بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی بمگرێتەوە، ڕاستە ڕێ بگرن و نزیك ببنەوە (٣) لە (چڵەپۆپە) ئەوەندەی بۆتان دەكرێ، (بەندایەتی بكەن لە) سەر لە بەیانیان و سەر لە ئێواران و بەشێك لە شەودا، مام ناوەندبن مام ناوەندبن دەگەنە مەبەست)).**

---

(١) بڕوانە: ١١٣٢.
(٢) بڕوانە: ٣٩.
(٣) ئەگەر نەتان توانی بگەنە چڵە پۆپە لە چاكەكردندا.

٦٤٦٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَاعْلَمُوا أَنْ لَنْ يُدْخِلَ أَحَدَكُمْ عَمَلُهُ الجَنَّةَ، وَأَنَّ أَحَبَّ الأَعْمَالِ أَدْوَمُهَا إِلَى اللَّهِ، وَإِنْ قَلَّ»[١].

**٦٤٦٤- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕێی ڕاست بگرن (گەرنا) نزیك ببنەوە لێی، وە بزانن هیچ كەسێكتان كردەوەكانی نایباتە بەهەشتەوە، بێگومان خۆشەویسترین كردەوەكان لای خوا بەردەوامترینیانە با كەمیش بێت)).**

٦٤٦٥- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَرْعَرَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيُّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قَالَ: «أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ». وَقَالَ: «اكْلَفُوا مِنَ الأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ»[٢].

**٦٤٦٥-ئەبو سەلەمە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا: كام كردەوانە خۆشەویسترە لای خودا؟ فەرمووی: ((بەردەوامترینیان ئەگەر كەمیش بێت))، وە فەرمووی: ((لە كارەكاندا ئەوەندە ئەرك بخەنە سەرشان خۆتان لە تواناتاندا بێت)).**

٦٤٦٦- حَدَّثَنَا عثمانُ بن أبي شَيبةَ، حَدَّثَنَا جريرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ قال: سألتُ أمَّ المؤمنين عَائِشَةَ ﵂ قلتُ:يا أمَّ المؤمنين كيفَ كان عمَلُ النبيِّ ﷺ هل كان يَخُصُّ شَيْئًا مِنَ الأَيَّامِ؟ قَالَتْ: لَا، كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يَستطيعُ مَا كَانَ النبيُّ ﷺ يَستطيعُ[٣]؟!

---

(١) بروانە: ١٩٧٠، ٦٤٦٥، ٦٤٦٧.

(٢) بروانە: ١٩٦٩.

(٣) بروانە: ١٩٨٧.

**٦٤٦٦-عەلقەمە دەڵێ: پرسیارم لە دایکی باوەڕداران عائیشە ﷺ کرد و وتم: ئەی دایکی باوەڕداران کار و بەندایەتی پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو، ئایا بەندایەتی هەبوو لە ڕۆژانێکی تایبەتدا؟ وتی: نەخێر، بەندایەتی و کاری ئەو بەردەوام و هەمیشەیی بوو، کێ لە ئێوە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی دەتوانێ بیکات (لە بەندایەتی).**

٦٤٦٧- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الزِّبْرِقَانِ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يُدْخِلُ أَحَدًا الْجَنَّةَ عَمَلُهُ». قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِمَغْفِرَةٍ وَرَحْمَةٍ». قَالَ: أَظُنُّهُ عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ.
وَقَالَ عَفَّانُ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «سَدِّدُوا وَأَبْشِرُوا». وَقَالَ مُجَاهِدٌ: سَدَادًا ﴿سَدِيدًا ۝٩﴾ النساء، وَسَدَادًا صِدْقًا[1].

**٦٤٦٧- ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ڕێی ڕاست بگرن و (گەرنا) نزیك ببنەوە لێی، دڵخۆش بن (بەپاداشتی کردەوەکانتان)، چونکە دڵنیابن هیچ کەسێك کردەوەکانی نایباتە بەهەشتەوە))، عەرزیان کرد تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((نەخێر منیش (ناباتە بەهەشتەوە)، مەگەر خوا بە لێخۆشبون و میهرەبانی خۆی بمگرێتەوە)).**
**(عەلی کوڕی مەدینی) دەڵێ: وا گومان دەبەم (ڕشتەکەی بەم جۆرەیە)، لە ئەبی نەزرەوە لە ئەبی سەلەمەوە لە عائیشەوە ﷺ.**

(١) بڕوانە: ٦٤٦٤.

-عەففان دەڵێ: وەهەیب بۆی گێڕاینەوە لە مووسای کوڕی عوقبەوە، وتی: لە ئەبی سەلەمەم بیست لە عائیشەوە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((ڕێی ڕاست بگرن و مژدە دەربن)).

-موجاهید دەڵێ: وتەیەکی دادگەرانە لە مانای ﴿ سَدِيدًا ﴿٩﴾ ﴾ النساء: وە ڕاستگۆیانە[1].

٦٤٦٨- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى لَنَا يَوْمًا الصَّلاَةَ، ثُمَّ رَقِيَ الْمِنْبَرَ فَأَشَارَ بِيَدِهِ قِبَلَ قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَقَالَ: «قَدْ أُرِيتُ الآنَ -مُنْذُ صَلَّيْتُ لَكُمُ الصَّلاَةَ- الجَنَّةَ وَالنَّارَ مُمَثَّلَتَيْنِ فِي قُبُلِ هَذَا الْجِدَارِ، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الخَيْرِ وَالشَّرِّ، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الخَيْرِ وَالشَّرِّ»[2].

٦٤٦٨- هیلالی کوڕی عەلی دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان پێشنوێژی بۆ کردین، پاشان چووە سەر دوانگە و بەدەستی ئاماژەی کرد بەرەو ڕووگەی مزگەوت و فەرمووی: ((سوێند بەخوا بێگومان هەر ئێستا- لەو کاتەوە پێش نوێژیم کرد بۆتان - وێنەی بەهەشت و دۆزەخم نیشان درا لە بەردەم ئەو دیوارەدا، جا هیچ کات لە چاکە و خراپەدا ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە، جا هیچ کات لە چاکە و خراپەدا ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە)).

(١) ئەم مانایەیان: (ڕاستگۆیانە) ڕوون نییە وتەی موجاهیدە یان کەسێکی ترە.
(٢) بڕوانە: ٩٣.

## ١٩- بَابُ الرَّجَاءِ مَعَ الْخَوْفِ

وَقَالَ سُفْيَانُ: مَا فِي القُرْآنِ آيَةٌ أَشَدُّ عَلَيَّ مِنْ ﴿لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ﴿٦٨﴾﴾ المائدة.

٦٤٦٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الرَّحْمَةَ يَوْمَ خَلَقَهَا مِائَةَ رَحْمَةٍ، فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعًا وَتِسْعِينَ رَحْمَةً، وَأَرْسَلَ فِي خَلْقِهِ كُلِّهِمْ رَحْمَةً وَاحِدَةً، فَلَوْ يَعْلَمُ الكَافِرُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِ لَمْ يَيْأَسْ مِنَ الجَنَّةِ، وَلَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْعَذَابِ لَمْ يَأْمَنْ مِنَ النَّارِ»[١].

## ١٩- باسی هیوا و ئومێد بوون لەگەڵ ترسدا (سوننەتە)

**-سوفیان دەڵێ: لە هەموو قورئاندا هیچ ئایەتێك نییە بە ئەندازەی ئەم ئایەتە لەسەر من توند و سەخت بێت: (ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین هەتا بەرپێك و راستی پەیرەوی تەورات و ئینجیل نەكەن، هەروەها ئەو قورئانەی كە هێنراوەتە خوارەوە بۆتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە)**

**٦٤٦٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بەڕاستی لەو ڕۆژەوەی خوا بەزەیی و سۆزی دروست كرد بەسەد بەش دروستی كرد، ئینجا نەوەد و نۆ بەشی لای خۆی هێشتۆتەوە[٢]، یەك بەشی بەزەییشی ناردوە بۆ ناو دروستكراوەكان هەموویان، بۆیە ئەگەر بێ باوەڕ ئاگادار بوایە بەو هەموو بەزەییەی لای خودایە، بێ هیوا نەدەبوو لە بەهەشت، وە ئەگەر بڕواداریش ئاگادار بوایە بەو هەموو سزاییەی لای خودایە، دڵنیانە دەبوو لە (نەچوونە) دۆزەخ)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٠٠٠.

(٢) هەڵی گرتووە بۆ قیامەت لەوێ بەكاری دێنێ.

## ٢٠- بابُ الصَّبْرِ عَنْ مَحَارِمِ اللَّهِ ﷻ

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾ الزمر

وَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَجَدْنَا خَيْرَ عَيْشِنَا بِالصَّبْرِ.

## ٢٠- باسی دان بە خۆدا گرتن لە (نەكردنی) قەدەغە كراوەكانی خودا ﷻ

**وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان ئارام گران بە بێ شمار پاداشت دەدرێنەوە).**

**-عومەر ﷺ دەڵێ: بینیمان باشترین ژیانمان بە ئارامگرتنەوەیە.**

٦٤٧٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ أُنَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يَسْأَلْهُ أَحَدٌ مِنْهُمْ إِلاَّ أَعْطَاهُ، حَتَّى نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، فَقَالَ لَهُمْ حِينَ نَفِدَ كُلُّ شَيْءٍ أَنْفَقَ بِيَدَيْهِ: «مَا يَكُنْ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ لاَ أَدَّخِرْهُ عَنْكُمْ، وَإِنَّهُ مَنْ يَسْتَعِفَّ يُعِفُّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَلَنْ تُعْطَوْا عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ»[١].

**٦٤٧٠- عەتای كوڕی یەزید دەگێڕێتەوە كە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بۆی گێڕایەوە كە خەڵكانێكی ئەنصاری داوایماڵیان لە پێغەمبەری خوا كرد ﷺ، ئەویش هەر كەسێكیان داوای كرد پێیدا هەتا هەموو ئەو سامانەی لای بوو تەواو بوو، جا كاتێ هەرچی لابوو بەخشی و تەواو بوو، فەرمووی پێیان: ((هەر ماڵێكم لابێت نایگرمەوە لێتان و پێتان دەدەم، وە بێگومان هەر كەس خۆی**

(١) بڕوانە: ١٤٦٩.

**بەدوور بگرێ لە سواڵ و داواکردن خواش دەیپارێزێ، هەر کەسیش خۆگربێ خواش ئارامی پێ دەبەخشێ، هەر کەسیش خۆی بێنیاز بکات خواش دەوڵەمەند و بێ نیازی دەکات، هیچ بەخششێکتان پێ نادرێ چاکتر و فراوانتربێت لە ئارامگرتن و دان بەخۆداگرتن))**

٦٤٧١. حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، حَدَّثَنَا زِيَادُ بْنُ عِلاَقَةَ قَالَ: سَمِعْتُ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي حَتَّى تَرِمَ -أَوْ تَنْتَفِخَ- قَدَمَاهُ، فَيُقَالُ لَهُ، فَيَقُولُ: «أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا؟»[1].

**٦٤٧١- موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە شەونوێژی دەکرد هەتا پێیەکانی یان لاقەکانی دەئاوسان، بۆیە پێیان دەوت (بۆ ئەوەندە ئەزیەتی خۆت دەدەی)، ئەویش دەیفەرموو: ((دەی ئایا من بەندەیەکی شوکرانە بژێری خوا نەبم)).**

## ٢١- بابٌ: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۝٣﴾ الطلاق

قَالَ الرَّبِيعُ بْنُ خُثَيْمٍ: فِي كُلِّ مَا ضَاقَ عَلَى النَّاسِ.

**٦٤٧٢-** حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: سَمِعْتُ حُصَيْنَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: كُنْتُ قَاعِدًا عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ، هُمُ الَّذِينَ لاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ»[2].

---

(١) بڕوانە: ١١٣٠.

(٢) بڕوانە: ٣٤١٠.

## ٢١- باسێک: (هەر کەسێ پشت بە خوا ببەستێ ئەوە خوای بەسە)

**-ڕەبیعی کوڕی خوسەیم دەڵێ: لە هەموو تەنگانەیەك كە بەسەر خەڵكدا دێت.**

**٦٤٧٢- شوعبە دەڵێ: لە حوصەینی کوڕی عەبدوڕحمانم بیست وتی: لای سەعیدی کوڕی جوبەیر دانیشتبوم، لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((حەفتا هەزار كەس لە ئوممەتم بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە، ئەوانە ئەو كەسانەن كە داوای نوشتە ناكەن، ڕەشبینی ناکەن[1]، تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن)).**

## ٢٢- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنْ قِيلَ وَقَالَ

٦٤٧٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَخْبَرَنَا غَيْرُ وَاحِدٍ مِنْهُمْ مُغِيرَةُ وَفُلاَنٌ وَرَجُلٌ ثَالِثٌ أَيْضًا، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ وَرَّادٍ كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ أَنَّ مُعَاوِيَةَ كَتَبَ إِلَى الْمُغِيرَةِ أَنِ اكْتُبْ إِلَيَّ بِحَدِيثٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيْهِ الْمُغِيرَةُ: أَنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ عِنْدَ انْصِرَافِهِ مِنَ الصَّلاَةِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ». ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. قَالَ: وَكَانَ يَنْهَى عَنْ قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةِ الْمَالِ، وَمَنْعٍ وَهَاتِ، وَعُقُوقِ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدِ الْبَنَاتِ.

وَعَنْ هُشَيْمٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ وَرَّادًا يُحَدِّثُ هَذَا الحَدِيثَ، عَنِ المُغِيرَةِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

---

(١) بەهۆی فڕینی باڵندەوە.

(٢) بڕوانە: ٨٤٤.

## ٢٢- باسی ئەوەی كە ناپەسندە لە وتی وتی [١]

٦٤٧٣-شەعبی لە وەڕادەوە گێڕایەوە كە نوسەر موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ بوو، كە موعاویە نامەیەكی نووسی بۆ موغیرە: كە فەرموودەیەكم بۆ بنووسە كە لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستبێت، (وەڕاد) وتی: موغیرەش ﷺ بۆی نووسی[٢] خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیست كە تەواو دەبوو لە نوێژ سێ جار دەیفەرموو: ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)) واتە: هیچ پەرستراوێك ڕاست نییە جگە لە خوای تاك و تەنها، هیچ هاوبەشێكی نییە، هەموو دەسەڵات و ستایش هەر بۆ ئەوە، وە ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە))، (موغیرە) دەڵێ: وە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری دەكرد لە وتی وتی، زۆر پرسیار كردن و ماڵ بەفیڕۆان و دەست قوجاوی و هەڵپەكردن و سەرپێچی دایكان و زیندە بەچاڵ كردنی كچۆڵەكان.

هوشەیم دەڵێ: عبدولەلیكی كوڕی عومەیر بۆی گێڕاینەوە وتی: لە وەڕادم بیست ئەم فەرموودەی لە موغیرەوە ﷺ دەگێڕایەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە.

## ٢٣- بابُ حِفْظِ اللِّسَانِ و((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ)) وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾﴾ ق

٦٤٧٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الْمُقَدَّمِيُّ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ، سَمِعَ أَبَا حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ»[٣].

---

(١) بەكوردی وا دەوترێ، بەڵام وەک خۆی مانا بكرێ بەم جۆرەیە: وتراوە وتی.

(٢) فەرمانی كرد وەڕراد بۆی نووسی.

(٣) بڕوانە: ٦٨٠٧.

# ٢٣- باسی پارێزگاری کردنی زمان و ((هەر کەسێک باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی ئەوە باچاک بڵێ یان بێدەنگ بێت))

وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هەر وتەیەك لە دەمی دەرچێ چاودێرێکی بەسەرەوەیە دەینوسێ ).

**٦٤٧٤-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێ زامنی زمانی و زامنی داوێنی[1] خۆیم بۆ بکات، منیش زامنی بەهەشتی بۆ دەکەم)).**

٦٤٧٥- حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ»[2].

**٦٤٧٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هەرکەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوای با چاکە بڵێ یان بێدەنگ بێ، هەرکەسێك باوەڕی هەیە بە خوا و بەڕۆژی دوای بائازاری دراوسێکەی نەدات، وە هەرکەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوای با ڕێزی میوانەکەی بگرێ)).**

٦٤٧٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا لَيْثٌ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ قَالَ: سَمِعَ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ جَائِزَتُهُ». قِيلَ: مَا جَائِزَتُهُ؟

---

(١) دەقی فەرموودەکە دەفەرموێ زامنی ئەوەی لە نێوان دوو شەویلگەی و زامنی ئەوەی لە نێوان هەردوو ڕانی دایە بیکات. کە مەبەست بە هەردووکیان زمان و داوێنە.

(٢) بڕوانە: ٥١٨٥.

قَالَ: «يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ»[١].

**٦٤٧٦- ئەبو شورەیحی خوزاعی ﷺ دەڵێ: بەهەردوو گوێم بیستم و بەدڵم وەرم گرت و لەبەرم کرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((میوانداری سێ (شەو و) ڕۆژە، وە با بەخششەکەی بدات، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەخششەکەی چییە؟ فەرمووی: (بەخششەکەی) شەو و ڕۆژێکە، هەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوای با ڕێزی میوانەکەی بگرێت، وە هەر کەسێك باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوای هەیە باقسەی چاك بكات، یان بێدەنگ بێت)).**

٦٤٧٧- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ يَزِيدَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مَا يَتَبَيَّنُ فِيهَا، يَزِلُّ بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ مِمَّا بَيْنَ الْمَشْرِقِ»[٢].

**٦٤٧٧-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان بەندە (مسوڵمان) وشەیەك دەڵێ و بیری لێ ناكاتەوە، بەهۆیەوە بەندازەی دوورتر لە نێوان خۆرهەڵات[٣] دەچێتە خوارەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ)).**

٦٤٧٨- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُنِيرٍ، سَمِعَ أَبَا النَّضْرِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ -يَعْنِي: ابْنَ دِينَارٍ - عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺقَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ لاَ يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَرْفَعُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَاتٍ، وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لاَ يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ»[٤].

---

(١) بڕوانە: ٦٠١٩.

(٢) بڕوانە: ٦٤٧٨.

(٣) لە گێڕانەوەی موسلم دەفەرموێ لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا (إرشاد الساري: ١٣/٤٧٦).

(٤) بڕوانە: ٦٤٧٧.

٦٤٧٨-ئەبو هورەیرە ﷺله پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بەڕاستی بەندەی (مسوڵمان) وتیەیەك لە ڕەزامەندی خوا دەڵێ، هیچ بایەخێكی بۆ دانانێ، خودا چەند پلە بەهۆیەوە بەرزی دەكاتەوە، بێگومان بەندە وتەیەك دەڵێ لە توڕەیی ڕقی خودا هیچ بایەخێكی بۆ دانانێ، بەهۆیەوە (چەند پلە) دەچێتە خوارەوە بۆ ناو دۆزەخ)).

## ٢٤- بابُ البُكَاءِ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ

٦٤٧٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، قَالَ: حَدَّثَنِي خُبَيْبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ: رَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ»[1].

## ٢٤- باسی (گەورەیی) گریان لە ترسی خودا

٦٤٧٩-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((حەوت (كۆمەڵ خەڵك) خودا دەیان خاتە ژێر سێبەری خۆیەوە: (یەكێكیان) پیاوێكە یادی خوا بكات چاوەكانی فرمێسكیان پێدا بێتە خوارەوە)).

## ٢٥- بابُ الخَوْفِ مِنَ اللَّهِ ﷻ

٦٤٨٠- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ رِبْعِيٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ يُسِيءُ الظَّنَّ بِعَمَلِهِ، فَقَالَ لأَهْلِهِ إِذَا أَنَا مُتُّ فَخُذُونِي فَذَرُّونِي فِي الْبَحْرِ فِي يَوْمٍ صَائِفٍ، فَفَعَلُوا بِهِ، فَجَمَعَهُ اللَّهُ ثُمَّ قَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى الَّذِي صَنَعْتَ؟ قَالَ: مَا حَمَلَنِي إِلاَّ مَخَافَتُكَ. فَغَفَرَ لَهُ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٦٠.

(٢) بڕوانە: ٣٤٥٢.

## ٢٥- باسی (فەزڵی) ترسان لە خوا ﷻ

**٦٤٨٠- حوزەیفە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پیاوێك هەبوو لە گەلانی پێش ئێوەدا گومانی خراپی بەکردەوەکانی خۆی دەبرد، بەکەس و کارەکەی خۆی وت: کاتێ من مردم بمبەن (دوا سوتان و بوون بە خۆڵەمیش) بمکەنە ناو دەریاوە[١] لە ڕۆژێکی گەرمدا، ئەوانیش بەو جۆرەیان لێ کرد[٢]، ئینجا خوای گەورە کۆی کردەوە (و دروستی کردەوە)، پاشان فەرمووی: چی وای لێکردی ئەوە بکەیت؟ وتی: تەنها ترسی (سزای) تۆ پاڵی پێوە نام، بۆیە (خوا) لێی خۆش بوو)).**

٦٤٨١- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ: سَمِعْتُ أَبِي، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَبْدِ الغَافِرِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ذَكَرَ رَجُلاً فِيمَنْ كَانَ سَلَفَ أَوْ قَبْلَكُمْ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً وَوَلَدًا -يَعْنِي: أَعْطَاهُ- قَالَ: "فَلَمَّا حُضِرَ قَالَ لِبَنِيهِ: أَيَّ أَبٍ كُنْتُ؟ قَالُوا: خَيْرَ أَبٍ. قَالَ: فَإِنَّهُ لَمْ يَبْتَئِرْ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرًا -فَسَّرَهَا قَتَادَةُ: لَمْ يَدَّخِرْ- وَإِنْ يَقْدَمْ عَلَى اللَّهِ يُعَذِّبْهُ فَانْظُرُوا، فَإِذَا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي، حَتَّى إِذَا صِرْتُ فَحْمًا فَاسْحَقُونِي -أَوْ قَالَ: فَاسْهَكُونِي- ثُمَّ إِذَا كَانَ رِيحٌ عَاصِفٌ فَأَذْرُونِي فِيهَا. فَأَخَذَ مَوَاثِيقَهُمْ عَلَى ذَلِكَ وَرَبِّي فَفَعَلُوا، فَقَالَ اللَّهُ كُنْ. فَإِذَا رَجُلٌ قَائِمٌ، ثُمَّ قَالَ: أَيْ عَبْدِي، مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا فَعَلْتَ؟ قَالَ: مَخَافَتُكَ -أَوْ فَرَقٌ مِنْكَ- فَمَا تَلَافَاهُ أَنْ رَحِمَهُ اللَّهُ». فَحَدَّثْتُ أَبَا عُثْمَانَ فَقَالَ: سَمِعْتُ سَلْمَانَ غَيْرَ أَنَّهُ زَادَ "فَأَذْرُونِي فِي الْبَحْرِ". أَوْ كَمَا حَدَّثَ.وَقَالَ مُعَاذٌ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، سَمِعْتُ عُقْبَةَ، سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٣].

---

(١) واتە خۆڵەمێشەکەی بکەنە ناو دەریاوە.

(٢) کە خۆی وتبووی وەسێتی کردبوو.

(٣) بڕوانە: ٣٤٧٨.

٦٤٨١-ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە باسی پیاوێکی کرد و فەرمووی: ((لەگەلانی ڕابردوو بوو-یان لەگەلانی پێش ئێوە دابوو -خودا سامان و منداڵی پێ بەخشی بوو -واتە پێی دابوو - فەرمووی: جا کاتێ لەسەر مەرگدابوو بە کوڕەکانی وت:من چۆن باوکێك بووم (بۆتان)؟ وتیان: چاکترین باوك بوویت، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڵام هیچ چاکەیەکی پێش خۆی نەخستبوو بۆ لای خوا- قەتادە (لَمْ يَبْتَئِرْ)ی بە: پێش خۆی نەخستبووی مانای کردبوو -وە ئەگەر بڕواتەوە بۆلای خودا سزای دەدات، جا سەرنج بدەن کە گیانم کێشرا و مردم لاشەکەم بسوتێنن هەتا دەبمە خەڵوز، ئینجا چاك بمهاڕن-یان وتی بمهاڕن-لە پاشان کە بایەکی توند بوو بمدنە بەدەم باکەوە، ئنجا لەسەر ئەوە بەڵێن و پەیمانی لە کوڕەکانی وەرگرت، (وتی: بلێن) بەخوا (وا دەکەین) ئەوانیش وایان لێ کرد (کە وتی)، ئینجا خوای گەورە فەرمووی: ببە دەست بەجێ بۆیە پیاوێکی ڕاوەستاو، پاشان فەرمووی: ئەی بەندەکەم، چی وای لێکردی کە ئاوات کرد؟ وتی: ترسام لە (سزای) تۆ -یان ترسی تۆ - جا خوا بەرەحمەتی خۆی فریای کەوت (و لێی خۆش بوو) )).

(سولەیمانی تەیمی دەڵێ): ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ ئەبو عوسمان ئەویش وتی: (ئەم فەرموودەیم) لەسەلمان بیست بەڵام ئەم زیادە هەبوو((بە پرژ و بلاوی بمکەنە ناو دەریاوە))، یا وەکو ئەو گێڕایەوە.

-موعاز دەڵێ: شوعبە لە قەتادەوە بۆی گێڕاینەوە وتی: لە عوقبەم بیست وتی: لە ئەبو سەعیدم ﷺ بیست ئەویش لە پێغەمبەرەوە گێڕایەوە.

## ٢٦- بابُ الانْتِهَاءِ عَنِ المَعَاصِي

٦٤٨٢- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلِي وَمَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى

قَوْمًا فَقَالَ: رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ، وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ، فَالنَّجَا النَّجَاءَ. فَأَطَاعَتْهُ طَائِفَةٌ فَأَدْلَجُوا عَلَى مَهْلِهِمْ فَنَجَوْا، وَكَذَّبَتْهُ طَائِفَةٌ فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ فَاجْتَاحَهُمْ»[1].

## ٢٦- باسی دەست هەڵگرتن و وازهێنان لەتاوانەکان (واجبە)

**٦٤٨٢-ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نموونەی من ئەو پەیامە خودا منی پێ ناردووە، وەك پیاوێك وایە چووەتە لای گەلێك و پێی وتوون: من بەهەردوو چاوی خۆم لەشکرەکەم بینی و بەڕاستی من هاوار بەدەمی ڕووت و قوتم [2]، فریای خۆتان کەون فریای خۆتان کەون. ئینجا کۆمەڵێکیان بەگوێی بکەن و لە سەرەتای شەوەوە بکەونە ڕێ و بەلەسەرخۆیی و هێواشی ڕزگاریان ببێ، کۆمەڵێکی (تریان) باوەڕی پێ نەکەن و لەگەڵ بەیاندا لەشەکرەکە بدات بەسەریاندا، لەناویان ببات لە بێخیان بێنێت)).**

٦٤٨٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ النَّاسِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا، فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ جَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذِهِ الدَّوَابُّ الَّتِي تَقَعُ فِي النَّارِ يَقَعْنَ فِيهَا، فَجَعَلَ يَنْزِعُهُنَّ وَيَغْلِبْنَهُ فَيَقْتَحِمْنَ فِيهَا، فَأَنَا آخُذُ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، وَهُمْ يَقْتَحِمُونَ فِيهَا»[3].

**٦٤٨٣-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست دەیەرموو: ((نموونەی من و نموونەی خەڵکی وەك پیاوێك وایە ئاگرێکی**

(١) بروانە: ٣٤٧٨.

(٢) مانای (النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ) واتە: ترسێنەری ڕووت و قوتم وتەیەکی عەرەبی لە کاتی ترس کوت و پردا بەکاری دێنن، کەسێکە خۆی ڕووت دەکاتەوە و هەواڵی هاتنی دوژمن بەڕووت و ڕەجاڵی دێنێ، بۆ ئەوەی خەڵک خۆیان ئامادەکەن بۆ جەنگ یان بۆ ڕاکردن. بروانە: إرشاد الساري:٤٨١/١٣.

(٣) بروانە: ٣٤٢٦.

كردبێتەوە، جا كاتێ چواردەوری خۆی ڕۆشن كردەوە، ئەو پەپولە و جانەورانەی كە دەكەونە ئاگرەوە تێی بكەوت، پیاوەكەش زوو زوو دووریان بخاتەوە لە ئاگرەكە، بەڵام ئەوان زۆری بۆ دەهێنن و ئەكەونە ناویەوە، جا من كەمەرتان دەگرم بەزۆر دوورتان دەخەمەوە لە ئاگرەكە، بەڵام ئەوان[1] بەزۆر خۆیان لە دەستم ڕادەپسكێنن و خۆیانی تێ فڕێ دەدەن)).

٦٤٨٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ، عَنْ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ»[2].

٦٤٨٤- عامیر دەڵێ: لە عەبدوڵلای كوڕی عەمرم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مسوڵمان (ی ڕاستەقینە) ئەو كەسەیە مسوڵمانان لە زمان و دەستی پارێزراو بن، كۆچەریش ئەو كەسەیە ئەوەی خوا قەدەغەی كردوە وازی لێ هێنابێت)).

## ٢٧- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: « لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا »

٦٤٨٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»[1].

(١) (بەڵام ئێوە بەزۆر خۆتان لە دەستم ڕادەپسكێنن و خۆتانی تێ فڕێ دەدەن)، لە هەندێ نوسخەی بوخاریدا بەم جۆرە نوسراوە.
(٢) بڕوانە: ١٠.

## ٢٧- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە كەم پێدەكەنین و زۆر دەگریان))

٦٤٨٥-سەعیدی كوڕی موسەییەب گێڕایەوە كە ئەبو هورەیرە ﷺ هەمیشە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە كەم پێ دەكنین و زۆر دەگریان)).

٦٤٨٦- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُوسَى بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً»[٢].

٦٤٨٦- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (( ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە كەم پێ دەكەنین و زۆر دەگریان)).

## ٢٨- بابٌ: حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ

٦٤٨٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ، وَحُجِبَتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ».

## ٢٨- باسێک: ئاگری دۆزەخ بە ئارەزووەكان چواردەوری گیراوە

٦٤٨٧-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئاگری دۆزەخ بە ئارەزووەكان چواردەوری گیراوە، بەهەشتیش بەناخۆشیەكان چواردەوری گیراوە)).

---

(١) بڕوانە: ٦٦٣٧.

(٢) بڕوانە: ٩٣.

## ٢٩- بابٌ: «الْجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ، وَالنَّارُ مِثْلُ ذَلِكَ»

٦٤٨٨- حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ مَسْعُودٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ وَالأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ، وَالنَّارُ مِثْلُ ذَلِكَ».

## ٢٩- باسێک: ((بەهەشت لە ئاوزەنگی نەعلی هەر کەسێکتانەوە نزیکترە لێی، دۆزەخیش بە هەمان شێوە))

**٦٤٨٨ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((بەهەشت لە ئاوزەنگی نەعلی هەرکەسێکتانەوە نزیکترە لێی، دۆزەخیش بەهەمان شێوە)).**

٦٤٨٩- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَصْدَقُ بَيْتٍ قَالَهُ الشَّاعِرُ: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللَّهَ بَاطِلُ»[1].

**٦٤٨٩- ئەبی سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕایەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((ڕاسترین دێڕە هەڵبەستێك كە شاعیر وتوویەتی ئەمەیە: ئاگاداربن هەموو شت جگە لە خوا بەتاڵ و بێ هودەیە)).**

## ٣٠- بابٌ: لِيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ، وَلاَ يَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَهُ

٦٤٩٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ».

---

(١) بڕوانە: ٣٨٤١.

## ٣٠- باسێک: با ئادەمیزاد سەیری کەسێک بکات کە لە ئەو نزمترە وە سەیری کەسێک نەکات کە لە سەروی ئەوەوەیە[1]

٦٤٩٠-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئەگەر كەسێكتان سەیری كەسێكی كرد لەو زۆرتر سامان و جوانی (لاشەی) پێ درابوو، ئەوە با سەیری كەسێك بكات لەو نزمترە و كەمتری پێ دراوە)).

## ٣١- بَابُ مَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ أَوْ بِسَيِّئَةٍ

٦٤٩١- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا جَعْدٌ أَبُو عُثْمَانَ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ الْعُطَارِدِيُّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ ﷻ قَالَ: قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً».

## ٣١- باسی کەسێک هات بە خەیاڵیدا چاکەیەک یان خراپەیەک بکات

٦٤٩١-ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، لەوەی پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاریەوە ﷻ دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بێگومان خوا هەموو چاكەكان و هەموو خراپەكانی دیاری كردوە و بڕیاری داوە[2]، پاشان ئەوەی ڕوون كردۆتەوە جا هەر كەسی هات بە خەیاڵیدا چاكەیەك بكات، بەڵام نەیكرد،

(١) دەربارەی ژیانی دونیا و خۆشیەكانی.

(٢) یان فەرمانی كردوە بە فریشتەكان كە نووسەری كردەوەی مرۆڤەكانن بە نووسینی چاكەكان و خراپەكان.

خوا لای خۆیەوە چاكەیەكی تەواوی بۆ دەنوسێت، خۆ ئەگەر هات بەخەیاڵیدا چاكەیەك بكات و چاكەكەی كرد، ئەوە خوا لای خۆی دە چاكە تا حەوت سەد و چەندەها و چەندانی بۆ دەنوسێت، وە هەر كەس هات بەخەیاڵیدا خراپەیەك بكات خراپەكەی نەكرد، ئەوە خوا لای خۆی چاكەیەكی تەواوی بۆ دەنوسێت، بەڵام ئەگەر هات بەخەیاڵیدا خراپەیەك بكات، خراپەكەی كرد، ئەوا تەنها یەك خراپەی بۆ دەنوسرێت)).

## ٣٢- بَابُ مَا يُتَّقَى مِنْ مُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ

٦٤٩٢- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا مَهْدِيٌّ، عَنْ غَيْلَانَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ ، قَالَ: إِنَّكُمْ لَتَعْمَلُونَ أَعْمَالاً هِيَ أَدَقُّ فِي أَعْيُنِكُمْ مِنَ الشَّعَرِ، إِنْ كُنَّا نَعُدُّهَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ الْمُوبِقَاتِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: يَعْنِي بِذَلِكَ الْمُهْلِكَاتِ.

## ٣٢- باسی ئەوەی خۆ لێ دەپارێزێ لە گوناهانی بەكەم و بێ بایەخ دانراو[1]

٦٤٩٢-غەیلان لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە وتی: بێگومان ئێوە كردەوانێك دەكەن لەبەر چاوی خۆتان ئەو كردارانە لە موو باریكترە، كە ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە تاوانە فەوتێنەرەكانمان دەژمارد و دادەنا. ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: مەبەستی بە (الْمُوبِقَاتِ) فەوتێنەر و لە ناوبەرەكانە.

(١) مەبەست پێی ئەو گوناهانەیە بكەرەكەی بە بچووك و بێ بایەخ دایدەنێ و سەیری دەكات.

## ٣٣- بابٌ: الأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ وَمَا يُخَافُ مِنْهَا

٦٤٩٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَيَّاشٍ، حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: نَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى رَجُلٍ يُقَاتِلُ -الْمُشْرِكِينَ، وَكَانَ مِنْ أَعْظَمِ الْمُسْلِمِينَ غَنَاءً عَنْهُمْ- فَقَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا». فَتَبِعَهُ رَجُلٌ فَلَمْ يَزَلْ على ذَلِكَ حَتَّى جُرِحَ، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ. فَقَالَ بِذُبَابَةِ سَيْفِهِ فَوَضَعَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، فَتَحَامَلَ عَلَيْهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْ بَيْنِ كَتِفَيْهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ- فِيمَا يَرَى النَّاسُ- عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّهُ لَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَيَعْمَلُ -فِيمَا يَرَى النَّاسُ- عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ وَهْوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّمَا الأَعْمَالُ بِخَوَاتِيمِهَا»[1].

## ٣٣- باسێک: کردەوەکان بە کۆتایی یانەوە پەیوەستن، وە ئەوەی لە کردەوەکانی مەترسی لێ دەکرێت

**٦٤٩٣-سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەیری پیاوێکی کرد لە دژی بتپەرستان دەجەنگا، لە ناو مسوڵمانانددا کەسیان بە ئەندازەی ئەو قازانجیان نەگەیاند بەمسوڵمانان، کەچی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێ حەز دەکات سەیری پیاوێکی دۆزەخی بکات، با سەیری ئەو پیاوە بکات))، ئینجا پیاوێك[2] شوێنی کەوت و هەر بە شوێنیەوە بوو هەتا بریندار بوو، ئیتر بە پەلە خۆی کوشت، جا نووکی شمشێرەکەی خۆی خستە نێوان هەردوو مەمکیەوە و خۆیدا بە سەریدا هەتا شمێشرەکە لە نێوان هەردوو شانیەوە هاتە دەرەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان بەندە هەیە-ئەوەندەی لە خەڵکەوە دیارە -کار دەکات بەکار و کردەوەی بەهەشتیانە لەڕاستیشدا دۆزەخییە،**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٩٨.

(٢) لە هاوەڵانی شوێنی کەوت.

(بەندەش هەیە) ئەوەندەی لە خەڵکەوە دیارە کار دەکات بە کار و کردەوەی دۆزەخیانە، لە ڕاستیشدا بەهەشتییە، وە بێگومان کردەوەکان بە کۆتاییانەوە پەیوەستن)).

## ٣٤- بَابٌ: العُزْلَةُ رَاحَةٌ مِنْ خُلَّاطِ السُّوءِ

٦٤٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ حَدَّثَهُ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ. وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ: حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «رَجُلٌ جَاهَدَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، وَرَجُلٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَعْبُدُ رَبَّهُ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ».

تَابَعَهُ الزُّبَيْدِيُّ وَسُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ وَالنُّعْمَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ - عَطَاءٍ أَوْ عُبَيْدِ اللَّهِ- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَقَالَ يُونُسُ وَابْنُ مُسَافِرٍ وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

## ٣٤- باسێک: گۆشەگیری ڕزگار بوونە لە تێکەڵاویە خراپەکان

**٦٤٩٤- (ئیمامی بوخاری دەڵێ: ) ئەبو لیەمان بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعەیب بۆی گێڕاینەوە لە زوهریە و وتی: عەتائی کوڕی یەزیدی بۆی گێڕامەوە وتی: کە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە وتی: ووترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.**

**وە موحەممەدی کوڕی یوسف وتی: ئەوزاعی بۆی گێڕاینەوە وتی: زوهری بۆی گێڕاینەوە لە عەتائی کوڕی یەزیدی لەیسییەوە لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ﷺ وتی: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی**

(١) بڕوانە: ٢٧٨٦.

**پێغەمبەری خوا چ كەسێ لە هەمووان گەورەتر و بەڕێزترە؟ فەرمووی: ((پیاوێك (باوەڕدارێك) بە گیان و سامانی خۆی لە ڕێی خوادا تێبكۆشێت، پیاوێكیش لە شیوێك لە شیوەكاندا بەندایەتی پەروەردگاری بكات و خراپە و زیانی بۆ خەڵكی نەبێت)).**

**-هەریەكە لە زوبەیدی و سولەیمانی كوڕی كەسیر لە زوهرییەوە گێڕاویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی شوعەیبیان كردوە.**

**-وە مەعمەر لە زوهریەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە عەتا یان عوبەیدوڵلاوە گێڕاویانەتەوە لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

**-وەهەر یەك لە یونس و ئیبنو موسافیر و یەحیای كوڕی سەعید لە زوهرییەوە گێڕاویانەتەوە، ئەویش لە عەتاوە لە كەسێكەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

٦٤٩٥- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا الْمَاجِشُونُ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ خَيْرُ مَالِ الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ الْغَنَمُ، يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ»[1].

**٦٤٩٥- عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو صەعصەعە لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ لێی بیستووە و گێڕاویەتیەوە دەیوت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ((ڕۆژگارێك دێت بەسەر خەڵكیدا مێگەل باشترین سامانی مسوڵمان دەبێت، دەیداتە بەر بۆ لوتكەی شاخەكان لەو شوێنانەی بارانی لێ دەبارێ بەهۆی ئایینەكەیەوە هەڵدێ و دوور دەكەوێتەوە لە ئاشوب و ئاژاوە)).**

(١) بروانە: ١٩.

## ٣٥- بَابُ رَفْعِ الأَمَانَةِ

٦٤٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ، حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا هِلاَلُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ». قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «إِذَا أُسْنِدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»[1].

## ٣٥- باسی نەمانی سپاردە و ئەمانەتداری

**٦٤٩٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کات سپاردە زایە کرا و پارێزگاری لێ نەکرا، ئەوسا چاوەڕوانی هاتنی دواڕۆژ بکە))، کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زایە کردنی سپاردە چۆنە؟ فەرمووی: ((هەر کات کار و باری خەڵك درایە دەستی کەسی نەشیاو بۆ ئەو کارە، ئەوسا چاوەڕوانی هاتنی دوارۆژ بکە)).**

٦٤٩٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ، حَدَّثَنَا حُذَيْفَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدِيثَيْنِ، رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الآخَرَ، حَدَّثَنَا: «أَنَّ الأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ». وَحَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِهَا قَالَ: «يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ أَثَرِ الْوَكْتِ، ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ، فَيَبْقَى أَثَرُهَا مِثْلَ الْمَجْلِ، كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ على رِجْلِكَ فَنَفِطَ، فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ، فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ، فَلاَ يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الأَمَانَةَ، فَيُقَالُ: إِنَّ فِي بَنِي فُلاَنٍ رَجُلاً أَمِينًا. وَيُقَالُ لِلرَّجُلِ: مَا أَعْقَلَهُ، وَمَا أَظْرَفَهُ، وَمَا أَجْلَدَهُ. وَمَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ". وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ، وَمَا أُبَالِي أَيَّكُمْ بَايَعْتُ لَئِنْ كَانَ

---

(١) بروانە: ٥٩.

مُسْلِمًا رَدَّهُ الإِسْلَامُ، وَإِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا رَدَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ أُبَايِعُ إِلاَّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا. قَالَ الْفِرَبْرِيُّ: قَالَ أَبُو جَعْفَرٍ: حَدَّثْتُ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ فَقَالَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ عَاصِمٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا عُبَيْدٍ يَقُولُ: قَالَ الأَصْمَعِيُّ وَأَبُو عَمْرٍو وَغَيْرُهُمَا: جَذْرُ قُلُوبِ الرِّجَالِ، الْجَذْرُ: الأَصْلُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ، وَالْوَكْتُ: أَثَرُ الشَّيْءِ الْيَسِيرُ مِنْهُ، وَالْمَجْلُ: أَثَرُ الْعَمَلِ فِي الْكَفِّ إِذَا غَلُظَ[1].

**٦٤٩٧-حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو فەرمایشتی فەرمووو بۆمان، یەكێكیانم دی (هاتەدی) و من چاوەڕوانی ئەوی كەشیان[2] دەكەم، فەرمووی پێمان: ((بێگومان سەرەتا ڕاسپاردە[3]، دابەزیە ناخی دڵی پیاو چاكانەوە، ئینجا قورئان (دابەزی و) فێر بوون پاشان لە سوننەتیش فێربوون))، پاشان دەربارەی نەمانی سپاردە بۆمان دوا و فەرمووی: ((پیاو سەرخەوێك دەشكێنێت ئەوسا سپاردە لە دڵی دەردەهێنرێت، ئینجا شوێنەكەی وەك خاڵێكی بچووك دەمێنێتەوە (لە دڵیدا)، پاشان سەرخەوێكی تر دەشكێنێت، ئیتر سپاردە (لە دڵیدا) دەردەهێنرێت، ئینجا شوێنەكەی وەك تلۆقێكی لێ دێت، وەك پشكۆیەك خلكەیتەوە بە سەر قاچتدا و تلۆق بكات، جا دەیبینی هەڵاوساوە و هیچیشی تێدا نییە، ئینجا خەڵكی كڕین و فرۆشتن دەكەن، جاوای لێ دێت كەس نەبێت سپاردە بەجێ بێنێ، (و بیپارێزێت)، ئەوسا دەوترێت: لە نەوەی فڵانە كەسدا پیاوێكی سپاردە پارێز هەیە، (وای لێ دێت) بەپیاوێك دەوترێت: ئای چەند زیرە ئای چەند ناسك ون ازدارە ئای چەند ئازایە، كەچی بە ئەندازەی دەنكە خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدا نییە))، (حوزەیفە دەڵێ): سوێند بەخوا ڕۆژگارێكم بەسەردا تێپەڕی لام گرنگ نەبوو كڕین و فرۆشتنم لەگەڵ هەر كامتان بكردایە، چونكە ئەگەر مسوڵمان بوایە ئیسلام ڕێگری لێ دەكرد (گزی و ناپاكیم لێ بكات)، وە ئەگەر گاوور بوایە سەركارەكەی سەری**

---

(١) بڕوانە: ٧٠٨٦، ٧٢٧٦.

(٢) كە نەمانی ئەمانەتە.

(٣) ئەمانەت.

رێگری لێ دەکرد (گزیم لێ بکات)، بەڵام ئەمڕۆ من کڕین و فرۆشتن ناکەم لەگەڵ فلان کەس و فلانە کەسدا نەبێت، فیرە بری دەڵێ: ئەبو جەعفەر وتی: بۆ ئەبو عەبدوڵلا (ئیمامی بوخاری)م گێڕایەوە، ئەویش وتی: لە ئەحمەدی کوڕی عاصیمم بیست دەیوت: لە ئەبا عوبەیدەم بیست دەیوت: ئەصمەعی و ئەبو عەمر و جگە لەوانیش دەڵێن:(جُذْرُ قلوب الرجل) وشەی: الجِذْر: ئەسڵ و بنچینەی هەموو شتێکە، وە (الوَكْتُ) ئاسەواری کەمێ هەرشتێکە. وە (المَجْلُ) ئاسەواری کارکردنە لە دەستی و ناو لەبی مرۆڤدا کە ئەستور دەبێت.

٦٤٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا النَّاسُ كَالإِبِلِ الْمِائَةُ لاَ تَكَادُ تَجِدُ فِيهَا رَاحِلَةً».

٦٤٩٨-عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە ڕاستیدا خەڵکی (لەمتمانە پێ نەکردندا) وەك چۆن لە سەد وشتردا، وشترێکی ڕەسەنت دەست ناکەوێ بۆ سواری بشێت)).

## ٣٦- بابُ الرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ

٦٤٩٩- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، حَدَّثَنِي سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ. وَحَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ جُنْدَبًا يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺوَلَمْ أَسْمَعْ- أَحَدًا يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ غَيْرَهُ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ، وَمَنْ يُرَائِي يُرَائِي اللَّهُ بِهِ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٧١٥٢.

## ٣٦- باسی ڕیایی و ناوبانگ[1]

٦٤٩٩-سوفیان لە سەلەمەوە گێڕاویەتیەوە وتی: لە جوندەبم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە كەسی ترم نەبیست جگەلە جوندەب بڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، ئنجا نزیك بوومەوەو گوێم لێ بوو دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر كەسێك بۆ ناوبانگ كار بكات خوا ناوی دەزڕێنێت، كەسێكیش بۆ ڕیایی و بەرچاویی كار بكات، خوا لە پێش چاوی خەڵكی ئابڕووی دەبات)).

## ٣٧- بابُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي طَاعَةِ اللَّهِ تعالى

٦٥٠٠- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ ﷺ لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ إِلاَّ آخِرَةُ الرَّحْلِ فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذُ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ؟». قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «حَقُّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا». ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ». قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ إِذَا فَعَلُوهُ؟». قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: «حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ»[2].

---

(١) واتە: كەسێک كارێک بكات بۆ ڕیایی بێت، یان بۆ ئەوەی خەڵک ببینن و باسی بكەن.

(٢) بڕوانە: ٢٨٥٦.

## ٣٧- باسی (گەورەیی) کەسێک خۆی ماندوو بکات لە بەندایەتی خوای بەرز و بڵنددا

٦٥٠٠- ئەنەسی کوڕی مالیك لە موعازی کوڕی جەبەلەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە کاتێکدا من لە پاشکۆی پێغەمبەردا ﷺ بووم لە نێوان من و ئەودا تەنها کۆتای کورتان (ی وشتر)ەکە هەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی موعاز))، وتم: لە خزمەتام گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش نوودی تۆ بەدەست دێنم، پاشان ماوەیەك ڕۆشت ئینجا فەرمووی: ((ئەی موعاز))، وتم: لە خزمەتام گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش نوودی تۆ بەدەست دێنم، پاشان فەرمووی: ((ئەی موعازی کوڕی جەبەل))، وتم: لە خزمەتام گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش نوودی تۆ بەدەست دێنم، فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی خوا چییە لەسەر بەندەکانی؟)) وتم: خوا و پێغەمبەرە ﷺ کەی زاناترن، فەرمووی: ((مافی خوا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە بیپەرستن و هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی))، لە پاشان ماوەیەك ڕۆشت، لە پاشان فەرمووی: ((ئەی موعازی کوڕی جەبەل)) وتم: فەرمان بەردارتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش نودی تۆ بەدەست دێنم، فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی بەندەکان لەسەر خوا چییە؟ ئەگەر مافی خوایان ئەنجامدا؟)) وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: ((مافی بەندەکان لەسەر خوا ئەوەیە کە سزایان نەدات)).

## ٣٨- بَابُ التَّوَاضُعِ

٦٥٠١-حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ عَنْ أَنَسٍ ﷺ كَانَ لِلنَّبِيِّ نَاقَةٌ.

## ٣٨- باسی (فەزڵی) خۆبەکەم زانین

٦٥٠١- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مێ حوشترێکی هەبوو.

٦٥٠١م- قَالَ وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ أَخْبَرَنَا الْفَزَارِيُّ وَأَبُو خَالِدٍ الأَحْمَرُ عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ عَنْ أَنَسٍ قَالَ كَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَاقَةٌ تُسَمَّى الْعَضْبَاءَ، وَكَانَتْ لاَ تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ لَهُ فَسَبَقَهَا، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ وَقَالُوا سُبِقَتِ الْعَضْبَاءُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِنَّ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ لاَ يَرْفَعَ شَيْئاً مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ وَضَعَهُ».

**٦٥٠١م- ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مێ حوشترێکی هەبوو ناوی عەزبا بوو، هیچ وشترێك پێشی نەدەکەوت، عەرەبیەکی دەشتەکی بەسواری وشترێکی بەربار هات هی خۆی بوو پێشی عەزبای دایەوە، ئەو پێشکەوتنە لەسەر دڵی مسوڵمانان گران بوو، وتیان: عەزبا پێشی درایەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان ڕەوایە و بەڵێنە لەسەر خوا هەر شتێك لەم دونیایە بەرزکاتەوە نزمی دەکاتەوە)).**

٦٥٠٢- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ حَدَّثَنِي شَرِيكُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ عَنْ عَطَاءٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم «إِنَّ اللَّهَ قَالَ مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطُشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ، وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنَا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ نَفْسِ الْمُؤْمِنِ، يَكْرَهُ الْمَوْتَ وَأَنَا أَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ».

**٦٥٠٢-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوا فەرموویەتی: هەر کەسێك دوژمنایەتی دۆستێکی من بکات، ئەوە بەدڵنیاییەوە جەنگ لە دژی ڕادەگەیەنم، وە بەندەکەم بە هیچ شتێك نزیك نابێتەوە لێم خۆشەویستر بێ لام لەو شتانەی فەرزم کردوە لەسەری[1]، هەروەها بە بەردەوامی بەندەکەم بەکردنی سوننەتەکان نزیك دەبێتەوە لێم، هەتا (وای لێ**

---

(١) واتە: چاکترین شت بەندە پێی نزیک بێتەوە لە خوا کردنی فەرزەکانە.

دێت) خۆشم دەوێ، جا كە خۆشم ویست من ئەو گوێیەی پێی دەبیستێ و ئەو چاوەی پێی دەبینێ و ئەو دەستەی زەبری پێ دەوەشێنێ و ئەو قاچەی پێی دەڕوا بەڕێگادا، (هەر هەموویان وا لێ دەكەم) فەرمان بەرداربن وتاوان نەكەن، وە ئەگەر هەر داوایەكم لێ بكات بە دڵنیاییەوە پێی دەبەخشم، وە ئەگەر پەنام پێ بگرێ (لە هەرشتێ) بێگومان پەنای دەدەم، وە من لە كردنی هیچ شتێكدا دوو دڵ نیم[1] كە بیكەم، وەك دوو دڵیم لە گیان كێشانی بڕوادار، كە حەزی لە مردن نییە، منیش حەزم لە بێ دڵی ئەو نییە)).

## ٣٩- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ»

﴿وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾﴾ النحل.

## ٣٩- باسی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ: ((من و قیامەت وەک ئەم دووانە[2] نێردراوین))

(وە هاتنی ڕۆژی دوایی (بەلای خواوە) هەر وەكو چاوتروكانێك وایە یان نزیكتر، بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە).

٦٥٠٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ عَنْ سَهْلٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ هَكَذَا». وَيُشِيرُ بِإِصْبَعَيْهِ فَيَمُدُّ بِهِمَا[3].

---

(١) دوودڵی خوای گەورە لە گیانی كێشانی بڕواداردا نەک دوو دڵی بەڕەهایی، چونكە دروست نییە بۆ خوا بەكاربێت، چونكە دوو دڵی لە گومان لە دەسەڵات بوون یان گومان لە بەرژەوەندی پەیدا دەبێت كە خوا وانیە، دوو دڵیەكە لە نێوان گیان كێشانی باوەڕدار بەزەیی و خۆشەویستنی دا كە حەزی لەمردن نییە.

(٢) مەبەست لەو دووانە: پەنجەی شایەتوومان و پەنجەی ناوەڕاستە.

(٣) بڕوانە: ٤٩٣٦، ٥٣٠١.

**٦٥٠٣-سەهل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من و ڕۆژی دوایی ئاوەها نێردراوین))، وە بەهەردوو پەنجەی (ناوەڕاست و شایەتمان)ی ئاماژەی كرد و هەردووكیانی درێژكرد.**

٦٥٠٤- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ - هُوَ الْجُعْفِيُّ - حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ وَأَبِي التَّيَّاحِ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ».

**٦٥٠٤-ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((من و قیامەت وەك ئەم دوانە پێكەوە نێردراوین)).**

٦٥٠٥- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ يُوسُفَ أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرٍ عَنْ أَبِي حَصِينٍ عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ». يَعْنِي إِصْبَعَيْنِ. تَابَعَهُ إِسْرَائِيلُ عَنْ أَبِي حَصِينٍ.

**٦٥٠٥- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((من و ڕۆژی دوایی وەك ئەم دووانە پێكەوە نێردراوین)) مەبەست لەو دووانە: دوو پەنجەیە. ئیسرائیل لە ئەبی حەصینەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی ئەبو بەكری كردوە.**

## ٤٠- بابٌ

٦٥٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضى الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ فَرَآهَا النَّاسُ آمَنُوا أَجْمَعُونَ، فَذَلِكَ حِينَ لاَ يَنْفَعُ نَفْساً إِيمَانُهَا، لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْراً، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلاَنِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا فَلاَ

يَتَبَايَعَانِهِ وَلاَ يَطْوِيَانِهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ فَلاَ يَطْعَمُهُ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَهْوَ يَلِيطُ حَوْضَهُ فَلاَ يَسْقِى فِيهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلاَ يَطْعَمُهَا»[1].

## ٤٠- باسێک[2]

**٦٥٠٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قیامەت بەرپا نابێ هەتا خۆر لە خۆرئاوا بوونیەوە هەڵنەیەت، ئەنجا کە هەڵهات خەڵکی بینیان هەموویان باوەڕ دێنن، ئەوە ئەو کاتەیە کە باوەڕهێنان سوود بەهیچ کەس ناگەیەنێت کە پێشتر بڕوای نەهێنابێ، یان هیچ خێر و چاکەیەکی نەکرد بێت لەگەڵ باوەڕەکەیدا، وە بێگومان قیامەت بەرپا دەبێت لە کاتێکدا دوو پیاو پۆشاکەکەیان لە نێواندا بڵاوکردۆتەوە، نەمامەڵەکەیان تەواو دەکەن نەپۆشاکەکە دەپێچنەوە، وە بێگومان قیامەت بەرپا دەبێت لە کاتێکدا کەسێك شیری مێ حوشترەکەی لەگەڵ خۆی بردۆتەوە، بەڵام (فریای خواردنی ناکەوێ و) نایخوات، وە بێگومان قیامەت بەرپا دەبێت لە کاتێکدا کەسێك حەوزەکەی سواق دەدات، بەڵام ئاوی لێ ناخواتەوە، وە بێگومان قیامەت بەرپادەبێت لە کاتێکدا کەسێك پاروەکەی بردووە بۆ دەمی بەڵام نایخوات (و قیامەت بەرپا دەبێت) )).**

## ٤١- بابٌ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ

٦٥٠٧- حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ عَنْ أَنَسٍ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ». قَالَتْ عَائِشَةُ أَوْ بَعْضُ أَزْوَاجِهِ إِنَّا لَنَكْرَهُ الْمَوْتَ. قَالَ «لَيْسَ ذَاكِ، وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا حَضَرَهُ

---

(١) بڕوانە: ٨٥.

(٢) لە هەندێ نوسخەی صحیحی بوخاریدا نوسراوە: باسی هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە.

الْمَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوَانِ اللَّهِ وَكَرَامَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَأَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ وَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا حُضِرَ بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ وَعُقُوبَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَهَ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ». اخْتَصَرَهُ أَبُو دَاوُدَ وَعَمْرٌو عَنْ شُعْبَةَ. وَقَالَ سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ زُرَارَةَ عَنْ سَعْدٍ عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

## ٤١- باسێک: هەرکەس حەز بکات بە خزمەتی خوای گەورە بکات، خواش حەز دەکات بەو کەسە بگات

**٦٥٠٧-عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك پێی خۆشبێ بەدیداری خوا بگات، خواش دیداری ئەوی پێ خۆشە، هەر کەسێکیش دیداری خوای پێ خۆش نەبێت، خواش دیداری ئەوی پێ خۆش نییە))، عائیشە ﷺ - یان یەکێك لە هاوسەرەکانی- وتی: لە ڕاستیدا ئێمە مردنمان پێ خۆش نییە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مەبەست ئەوە نییە، بەڵکو بڕوادار کە لە سەرمەرگدا موژدەی پێدەدرێت بەڕەزامەندی خوا و بەهەشتەکەی، ئیتر هیچ شتێك بەقەدەر ئەوەی لەبەردەمی دایە (مردن) خۆشەویستر نییە لای، بۆیە حەز بە دیداری خوا دەکات و خواش حەز بە دیداری ئەو دەکات، وە بێگومان کافریش کە دەگاتە سەرەمەرگ مژدەی سزای خوا و تۆڵەی ئەوی پێ دەدرێت، ئیتر هیچ بەقەدەر ئەوەی لەبەردەمی دایە (مردن) ناخۆشتر نییە لای، بۆیە حەز بە دیداری خوا ناکات و خواش حەز بە دیداری ئەو ناکات)).**

**-ئەبو داوود و عەمر لە شوعبەوە ئەم فەرموودەیان بە کورتتر هێناوە و گێڕاویانەتەوە.**

**-وە سەعید لە قەتادەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە زورارەوە لە سەعدەوە لە عائیشەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

٦٥٠٨- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ عَنْ بُرَيْدٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ».

**٦٥٠٨-ئەبو مووسا ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس حەز بە دیداری خوا بکات، خواش حەز بە دیداری ئەو دەکات، هەر کەسیش حەز بە دیداری خوا نەکات، خواش حەز بە دیداری ئەو ناکات)).**

٦٥٠٩- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُقَيْلٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ فِي رِجَالٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ وَهْوَ صَحِيحٌ «إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ ثُمَّ يُخَيَّرُ». فَلَمَّا نَزَلَ بِهِ، وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي، غُشِيَ عَلَيْهِ سَاعَةً، ثُمَّ أَفَاقَ، فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى السَّقْفِ ثُمَّ قَالَ «اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى». قُلْتُ إِذاً لاَ يَخْتَارُنَا، وَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَدِيثُ الَّذِي كَانَ يُحَدِّثُنَا بِهِ - قَالَتْ - فَكَانَتْ تِلْكَ آخِرَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ قَوْلُهُ «اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى»[1].

**٦٥٠٩- ئیبنو شیهاب دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەییەب و عوروەی کوڕی زوبەیر لە ناو چەند پیاوێکی زانادا بۆیان گێڕامەوە کە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ کە لەشی ساغ بوو دەیفەرموو: ((بێگومان هیچ پێغەمبەرێك گیانی نەکێشراوە هەتا جێگای خۆی لە بەهەشتدا نەدیبێ، لە پاشان سەرپشك کراوە[2]))، جا کاتێ مردنی نزیك بوویەوە سەری لەسەر ڕانم بوو، لە هۆشی خۆی چوو، پاشان هۆشی کردەوە و چاوی بڕییە بنمیچی ژوورەکە، لە پاشان فەرمووی: ((خوای بمگەیەنە بە هاوڕێ هەرەبەرزەکانم[3]))،**

(١) بڕوانە: ٤٤٣٥.

(٢) لە نێوان مانەوە لە ژیاندا یا مردن.

(٣) کە فریشتەکان و پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدو پیاو چاکەکانن: بڕوانە: إرشاد الساري: ٥١٣/١٣.

منیش وتم: کەواتە پێغەمبەر ﷺ ئێمە هەڵنابژێرێ[1]، وە زانیم ئەمە ئەو فەرموودەیە کە پێشتر (لە کاتی لەش ساغیدا) بۆی باس دەکردین.

عائیشە ﵂ دەڵێ: جا کۆتا قسەیەك کە پێغەمبەر ﷺ کردی ئەمە بوو: ((خوایە بمگەیەنە بە هاوڕێکانم لە بەهەشتی هەرە باڵادا)).

## ٤٢- بَابُ سَكَرَاتِ الْمَوْتِ

٦٥١٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ مَيْمُونٍ حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ عَنْ عُمَرَ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّ أَبَا عَمْرٍو ذَكْوَانَ مَوْلَى عَائِشَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ كَانَتْ تَقُولُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ - أَوْ عُلْبَةٌ - فِيهَا مَاءٌ - يَشُكُّ عُمَرُ - فَجَعَلَ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي الْمَاءِ، فَيَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ وَيَقُولُ «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ». ثُمَّ نَصَبَ يَدَهُ فَجَعَلَ يَقُولُ «فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى». حَتَّى قُبِضَ وَمَالَتْ يَدُهُ[2].

## ٤٢- باسی سەختیەکانی مردن (گیانەڵا)

٦٥١٠- عومەری کوڕی سەعید دەڵێ: ئیبنو ئەبی مولەیکە بۆی گێڕامەوە کە ئەبو عەمر زەکوانی ئازاد کراوی عائیشە بۆی گێڕاوەتەوە کە عائیشە ﵂ دەڵێ: لە بەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ جەوەنەیەکی چەرمی بچووك- یان قاپێکی گەورەی دارین هەبوو- ئاوی تێدا بوو -عومەر گومانی بردووە - جا زوو زوو دەستەکانی دەخستە ناو ئاوەکە و دەیهێنان بە دەموچاویدا و دەیفەرموو: ((هیچ پەرستراوێکی بەڕاست نییە جگە لە خوا، بێگومان مردن و (گیانەڵا) سەخت و زەحمەتە))، پاشان دەستی ڕێك ڕاگرتبوو هەر دەیفەرموو: ((خوایە بمگەیەنە بە

---

(١) مردن هەڵدەبژێرێ.

(٢) بڕوانە: ٨٩٠.

**هاوڕێ هەرە بەرزەکانم))، هەتا گیانی کێشراو دەستی شل بوو لار بووەوە (وەفاتی کرد).**

٦٥١١- حَدَّثَنِي صَدَقَةُ أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الأَعْرَابِ جُفَاةً يَأْتُونَ النَّبِيَّ ﷺ فَيَسْأَلُونَهُ مَتَى السَّاعَةُ؟ فَكَانَ يَنْظُرُ إِلَى أَصْغَرِهِمْ فَيَقُولُ «إِنْ يَعِشْ هَذَا لاَ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ». قَالَ هِشَامٌ يَعْنِي مَوْتَهُمْ.

**٦٥١١-هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: پیاوانێك لە عەرەبی دەشتەکی زبری پێخاوس دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پرسیاریان لێ دەکرد: کەی قیامەت دەبێ؟ پێغەمبەریش ﷺ سەیری بچووکترینیانی دەکرد لە تەمەندا و دەیفەرموو ((ئەگەر ئەمە بژی پیر نابێت هەتا قیامەتتان لەسەر هەڵدەێت))، هیشام دەڵێ: مەبەستی مردنی هەموویان بوو[1].**

٦٥١٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ عَنْ مَعْبَدِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ الأَنْصَارِيِّ أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُرَّ عَلَيْهِ بِجِنَازَةٍ فَقَالَ «مُسْتَرِيحٌ، وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ». قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْمُسْتَرِيحُ وَالْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ قَالَ «الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَأَذَاهَا إِلَى رَحْمَةِ اللَّهِ، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلاَدُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ»[2].

**٦٥١٢-ئەبو قەتادەی کوڕی ڕیبیعی ئەنصاری ﵁ گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنازەیەك بە لایدا برا، فەرمووی: ((ئەوە ئاسوودەیە و ئاسودەن لە دەستی))، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاسوودەیە و ئاسوودەن لە**

(١) واتە: کە دەفەرموێ قیامەت بەرپادەبێ یا هەڵدەستێت واتە: ئەم منداڵە پیر نابێ هەمووتان دەمرن نەک قیامەت بەرپا دەبێت.
(٢) بڕوانە: ٦٥١٣.

**دەستی یانی چی؟ فەرمووی: ((بەندەی باوەڕدار لە دەست ماندوویەتی و ئازاری دونیا ڕزگاری دەبێت و دەگاتە ڕەحمەتی خوا، بەندەی خراپەكاریش مرۆڤەكان و وڵات و دار و درەخت و ئاژەڵ و گیان لەبەر لەدەستی ئاسوودە دەبن)).**

٦٥١٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ حَدَّثَنِى ابْنُ كَعْبٍ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مُسْتَرِيحٌ، وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ، الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ»[1].

**٦٥١٣-ئەبو قەتادە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئاسوودەو ئاسوودە بوون لە دەستی، باوەڕدار ئاسوودە دەبێت)).**

٦٥١٤- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ «يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثَةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ، يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ، وَيَبْقَى عَمَلُهُ».

**٦٥١٤-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سێ شت شوێن مردوو دەكەوێت، دوانیان دەگەڕێنەوە یەكێكیان لەگەڵیدا دەمێنێتەوە، كەسوكاری و سامانەكەی و كردەوەكانی شوێنی دەكەون، كەس و كار و سامانەكەی دەگەڕێنەوە، وە كردەوەكانی دەمێنێتەوە)).**

٦٥١٥- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ - رضى الله عنهما - قَالَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ «إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمْ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ غُدْوَةً وَعَشِيًّا، إِمَّا النَّارُ وَإِمَّا الْجَنَّةُ، فَيُقَالُ هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى تُبْعَثَ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٥١٢.

(٢) بڕوانە: ١٣٧٩.

**٦٥١٥-عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر كەسێكتان مرد شوێنەكەی بە بەیانیان و ئێواراندا نیشان دەدرێت، جا یا جێگاكەی دۆزەخە یان بەهەشتە، ئەنجا پێی دەوترێت ئائەوە شوێنەكەتە هەتا زیندوو دەكرێیتەوە)).**

٦٥١٦- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْجَعْدِ أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ مُجَاهِدٍ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا»[1].

**٦٥١٦- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جنێو بە مردووان مەدەن، چونكە بێگومان گەشتوون بە (پاداشتی) ئەو كردەوانەی پێش خۆیان ناردوویانە)).**

## ٤٣- بابُ نَفْخِ الصُّورِ

وقَالَ مُجَاهِدٌ: الصُّورُ كَهَيْئَةِ البُوقِ. ﴿ زَجْرَةٌ ﴿١٩﴾ ﴾ الصافات، صَيْحَةٌ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: النَّاقُورُ: الصُّورُ.﴿ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ ﴾ النازعات: النَّفْخَةُ الأُولَى. ﴿ ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ ﴾ النازعات: النَّفْخَةُ الثَّانِيَةُ.

## ٤٣- باسی فووكردن بە شەیبوردا

**-موجاهید دەڵێ:** (الصُّورُ): **وەك كەڕنا وایە.** ﴿ زَجْرَةٌ ﴿١٩﴾ ﴾ الصافات: **دەنگ و هاوارێكە (تێخوڕینێكە).**

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ:** (النَّاقُورُ): **شەیپورە.** ﴿ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ ﴾ النازعات: **فووكردنی یەكەم بە شەیپوردا.** ﴿ ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ ﴾ النازعات: **فووكردنی دووەمە.**

---

(١) بڕوانە: ١٣٩٣.

٦٥١٧- حَدَّثَنِى عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ حَدَّثَنِى إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ أَبِى سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَالأَعْرَجِ أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ اسْتَبَّ رَجُلاَنِ، رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَرَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ الْمُسْلِمُ وَالَّذِى اصْطَفَى مُحَمَّداً عَلَى الْعَالَمِينَ. فَقَالَ الْيَهُودِىُّ وَالَّذِى اصْطَفَى مُوسَى عَلَى الْعَالَمِينَ، قَالَ فَغَضِبَ الْمُسْلِمُ عِنْدَ ذَلِكَ، فَلَطَمَ وَجْهَ الْيَهُودِىِّ، فَذَهَبَ الْيَهُودِىُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِمَا كَانَ مِنْ أَمْرِهِ وَأَمْرِ الْمُسْلِمِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لاَ تُخَيِّرُونِى عَلَى مُوسَى، فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَكُونُ فِى أَوَّلِ مَنْ يُفِيقُ، فَإِذَا مُوسَى بَاطِشٌ بِجَانِبِ الْعَرْشِ، فَلاَ أَدْرِى أَكَانَ مُوسَى فِيمَنْ صَعِقَ فَأَفَاقَ قَبْلِى، أَوْ كَانَ مِمَّنِ اسْتَثْنَى اللَّهُ»[1].

**٦٥١٧- ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێ: دوو پیاو جنێویاندا بەیەکتری، پیاوێکیان مسوڵمان بوو پیاوێکیان جوولەکە بوو، مسوڵمانەکەیان وتی: سوێند بەو زاتە موحەممەدی ﷺ بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردووە، جوولەکەکەش وتی: سوێند بەو زاتەی مووسای ﷺ بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردووە، وتی: جا لەو کاتەدا مسوڵمانەکە دەستی بەرزکردەوە و زلەیەکی دا لە دەموچاوی جوولەکەکە، جوولەکەکەش ڕۆشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺو ئەوەی بوو بوو لە نێوان خۆی و مسوڵمانەکەدا بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((من بە چاکتر دامەنێن بەسەر مووسادا ﷺ، چونکە بێگومان خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا بێ هۆش دەکەون، ئەنجا من یەکەم کەس دەبم هۆش دەکەمەوە، یەکسەر مووسا ﷺ دەبینم توند دەستی گرتووە بە سوچێکی عەرشەوە، جا نازانم ئاخۆ لەو کەسانە بووە بێ هۆش کەوتووە و پێش من بەهۆش هاتۆتەوە، یاخود لەو کەسانە بووە خوا جیای کردوەتەوە (بێ هۆش نەکەوتووە).**

(١) بڕوانە: ٢٤١١.

٦٥١٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «يَصْعَقُ النَّاسُ حِينَ يَصْعَقُونَ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ قَامَ، فَإِذَا مُوسَى آخِذٌ بِالْعَرْشِ، فَمَا أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ». رَوَاهُ أَبُو سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٦٥١٨-ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((خەڵکی لە کاتی بێهۆش کەوتندا بێهۆش دەکەون، ئەوسا منیش یەکەم کەسم (هۆش دەکەمەوە و) هەڵدەسمەوە، جا دەبینم مووسا عليه السلام دەستی گرتووە بەعەرشەوە، جا نازانم ئایا ئەویش لەو کەسانەبووە بێهۆش بووە (یا نا)؟)). ئەبو سەعیدیش رضي الله عنه ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.**

## ٤٤- بَابٌ: يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ

رَوَاهُ نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

٦٥١٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا يُونُسُ عَنِ الزُّهْرِيِّ حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ؟»[2].

## ٤٤- باسێک: (لە ڕۆژی قیامەتدا) خودا بە چنگی زەوی دەگرێت[3]

**٦٥١٩-ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوا (لە ڕۆژی قیامەتدا زەوی بەچنگی دەگرێت و بەدەستی ڕاستیشی ئاسمان دەپێچێتەوە، پاشان دەفەرموێ: من پادشام، کوان پادشایانی دونیا؟)).**

(١) بڕوانە: ٢٤١١.

(٢) بڕوانە: ٤٨١٢.

(٣) ئێمە باوەڕمان بەو سیفەتە هەیە بەو شێوەی شیاوی خودا بێت بە بێ چواندن بە دروستکراوەکان یان پەکخستنی ماناکەی.

٦٥٢٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ خَالِدٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخَدْرِيِّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «تَكُونُ الأَرْضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُبْزَةً وَاحِدَةً، يَتَكَفَّؤُهَا الْجَبَّارُ بِيَدِهِ، كَمَا يَكْفَأُ أَحَدُكُمْ خُبْزَتَهُ فِي السَّفَرِ، نُزُلاً لأَهْلِ الْجَنَّةِ». فَأَتَى رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ بَارَكَ الرَّحْمَنُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، أَلاَ أُخْبِرُكَ بِنُزُلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ «بَلَى». قَالَ تَكُونُ الأَرْضُ خُبْزَةً وَاحِدَةً كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيْنَا، ثُمَّ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ ثُمَّ قَالَ أَلاَ أُخْبِرُكَ بِإِدَامِهِمْ قَالَ إِدَامُهُمْ بَالاَمٌ وَنُونٌ. قَالُوا وَمَا هَذَا قَالَ ثَوْرٌ وَنُونٌ يَأْكُلُ مِنْ زَائِدَةِ كَبِدِهِمَا سَبْعُونَ أَلْفاً.

**٦٥٢٠- ئەبو سەعيد خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((زەوی لە ڕۆژی دواییدا وەك یەك نانی لێدێت خوای باڵا دەست و بەتوانا بەدەستی خۆی ئەمدیو ئەودیوی پێ دەكات، وەك چۆن كەسێكتان لە سەفەردا نانەكەی ئەمدیو ئەودیو پێ دەكات، پێشوازی بەهەشتیەكانی پێ دەكات))، جاپیاوێكی جوولەكە هات وتی: فەڕ و بەرەكەتی خوای بەبەزەیی بڕژێت بەسەرتدا ئەی ئەبا لقاسیم هەواڵت پێ بدەم، پێشوازی بەهەشتیەكان بە چی دەكرێت لە ڕۆژی دواییدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتی: زەوی دەبێتە یەك نان وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، ئینجا پێغەمبەر ﷺ سەیرێكی كردین و پێكەنی هەتا ددانەكانی پێشەوەی دەركەوتن، لە پاشان فەرمووی: ((پێت بڵێم پێخۆری بەهەشتیەكان چییە؟ وتی: بالام و نونە، هاوەڵان وتیان: ئەوە** (بَالاَمٌ وَنُونٌ) **چییە؟ وتی: گاو نەهەنگە حەفتا هەزار بەهەشتی لە پارچە زیادەكەی جگەری گا و نەهەنگەكە دەخۆن.**

٦٥٢١- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ قَالَ سَمِعْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ». قَالَ سَهْلٌ أَوْ غَيْرُهُ لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ.

**٦٥٢١-ئەبو حازیم دەڵێ سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو((خەڵكی لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر زەوییەكی سپی مەیلە و سوور**

كۆدەكرێنەوە، وەك نانێك وایە لە ئاردێكی بێژراوەی بێ سۆس و كەپەك دروست كرابێت)). سەهل یا كەسێكی تر دەڵێ: زەوییەی تەختە هیچ نیشانە و ئاسەوارێكی تیا نییە بۆ كەس.

## ٤٥- بابُ كَيْفَ الحَشْرُ؟

٦٥٢٢- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلاَثِ طَرَائِقَ، رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلاَثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ وَيَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا،وَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، تُمْسِى مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا».

## ٤٥- باسی كۆكردنەوە(ی خەڵكی لە قیامەتدا) چۆنە؟

٦٥٢٢-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((خەڵكی لەسەر سێ شێوە كۆدەكرێنەوە: دڵخۆشان (بەدیداری خوا) و ترساوان (لە ڕابردوو) دووان بەسوار وشترێكەوە، سیان بەسواری وشترێكەوە، چوار بەسواری وشترێكەوە، دەكەس بەسواری وشترێكەوە، ئینجا ئەوانەی تریان ئاگر كۆیان دەكاتەوە، نیوەڕۆ خەویان لەگەڵ دەكات و لە هەر كوێ نیوەڕۆ خەو بكەن، شەویان لەگەڵ دەكاتەوە لە هەر كوێ شەو بكەنەوە، وە بەیانی دەكاتەوە لەگەڵیان لە هەر كوێ بەیانی بكەنەوە، وە ئێوارە دەكاتەوە لەگەڵیان لە هەر كوێ ئێوارە بكەنەوە )).

٦٥٢٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْبَغْدَادِيُّ حَدَّثَنَا شَيْبَانُ عَنْ قَتَادَةَ حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ - رضى الله عنه أَنَّ رَجُلاً قَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ

عَلَى وَجْهِهِ قَالَ «أَلَيْسَ الَّذِى أَمْشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِى الدُّنْيَا قَادِراً عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». قَالَ قَتَادَةُ بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا[1].

**٦٥٢٣-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دواییدا چۆن بێ باوەڕ لەسەر ڕووخساری دەبرێت بۆ مەحشەر؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا ئەو زاتەی کە لە دونیادا لەسەر دوو قاچ دەیبرد بەڕێگادا، ناتوانێ لە ڕۆژی دواییدا لەسەر ڕووخساری بیبات بەڕێگادا)).قەتادە دەڵێ: بەڵێ دەتوانێ سوێند بەگەورەیی پەروەردگارمان.**

٦٥٢٤- حَدَّثَنَا عَلِىٌّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ عَمْرٌو سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ سَمِعْتُ النَّبِىَّ ﷺ يَقُولُ «إِنَّكُمْ مُلاَقُو اللَّهِ حُفَاةً عُرَاةً مُشَاةً غُرْلاً». قَالَ سُفْيَانُ هَذَا مِمَّا نَعُدُّ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ سَمِعَهُ مِنَ النَّبِىِّ ﷺ[2].

**٦٥٢٤-سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: لە ئیبنو عەبباسم ﷺ بیست وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان ئێوە بەدیداری خوا دەگەن بە پێخاوسی و ڕووتی بە پیادەیی و خەتەنە نەکراوی)).**

**سوفیان دەڵێ: ئەم فەرموودەیە ئێمە لەو فەرموودانەی دەژمێرین کە ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە (ڕاستەوخۆ).**

٦٥٢٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ عَمْرٍو عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ «إِنَّكُمْ مُلاَقُو اللَّهِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً»[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٧٦٠.

(٢) بڕوانە: ٣٣٤٩.

(٣) بڕوانە: ٣٣٤٩.

**٦٥٢٥-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست لەسەر دوانگە وتاری دەدا و دەیفەرموو: ((بەدڵنیاییەوە ئێوە بەدیداری خوا دەگەن بە پێخاوسی و ڕووت و قوتی و خەتەنە نەکراوی)).**

٦٥٢٦- حَدَّثَنِى مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ النُّعْمَانِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَامَ فِينَا النَّبِىُّ ﷺ يَخْطُبُ فَقَالَ: «إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ حُفَاةً عُرَاةً ﴿ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴿١٠٤﴾ ﴾ الأنبياء، الآية. وَإِنَّ أَوَّلَ الْخَلاَئِقِ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ، وَإِنَّهُ سَيُجَاءُ بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِى، فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ. فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُصَيْحَابِى. فَيَقُولُ إِنَّكَ لاَ تَدْرِى مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ. فَأَقُولُ كَمَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ ﴿ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ المائدة. قَالَ فَيُقَالُ إِنَّهُمْ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ»[1].

**٦٥٢٦- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوماندا هەستایەوە و وتارێکیدا و فەرمووی: ((بێگومان ئێوە (لە ڕۆژی دواییدا) بە پێی پێ خاوس و ڕووت و خەتەنە نەکراوی کۆ دەکرێنەوە[2]، (یەکەم جار چۆن دروستمان کردن بە (ڕووت و قووتی) ئەو (دروست کردنە) دووبارە دەکەینەوە، ئەوە بەڵێنێکە (جێبەجێ کردنی) لەسەر ئێمەیە، بێگومان ئەو (بەڵێنە) بەدی دێنین). وە یەکەم کەسێك کە پۆشاکی لەبەر دەکرێت لە ڕۆژی دواییدا ئیبراهیمە ﷺ، وە بێگومان کەسانێك لە ئوممەتم بۆ لای چەپ دەبرێن، منیش دەڵێم ئەوانە**

(١) بڕوانە: ٣٣٤٩.

(٢) لە مەحشەردا.

هاوەڵانی منن، خواش دەفەرمووێ: بێگومان تۆ نازانی ئەوانە لەو كاتەوە تۆ بەجێت هێشتوون چی شتی خراپیان داهێناوە، ئیتر منیش وەك پیاو چاكەكە دەڵێم: ((وە من شایەت و چاودێر بووم بەسەریانەوە تا لەناویاندا بووم، ئینجا كاتێ تۆ منت بردەوە و (بەرزت كردمەوە بۆ ئاسمان) هەر خۆت چاودێر بووی بە سەریانەوە، وە خۆت ئاگادار و شایەتی بەسەر هەموو شتێكەوە، ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن، وە ئەگەر لێشیان خۆش ببی ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بە دەسەڵاتی كار دروست)، دەڵێ: جا دەوترێت بێگومان ئەوانە بەردەوام پاشگەز بوونەتەوە و لە ئاین وەرگەڕاوون)).

٦٥٢٧- حَدَّثَنَا قَيْسُ بْنُ حَفْصٍ حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الْحَارِثِ حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ أَبِي صَغِيرَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ حَدَّثَنِى الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً» قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟. فَقَالَ «الأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يُهِمَّهُمْ ذَاكِ».

٦٥٢٧- قاسیمی كوڕی موحەممەدی كوڕی ئەبی بەكر وتی: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئێوە بەپێخاوسی و ڕووت و قوتی و خەتەنە نەكراوی كۆدەكرێنەوە (لە قیامەتدا)، عائیشە ﵂ وتی: منیش وتم: ئەی پپێغەمبەری خوا پیاوان و ئافرەتان سەیری یەكتر دەكەن؟ فەرمووی: ((كارەكە لەوە سەخترە بایەخ بەوە بدەن و لایان گرنگ بێت)).

٦٥٢٨- حَدَّثَنِى مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي قُبَّةٍ فَقَالَ «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ «تَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ «وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنِّى لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا

نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَذَلِكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إِلاَّ كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمَرِ»[1].

**٦٥٢٨ ـعەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەریدا ﷺ بووین لە چادرێکی وەك و گومەزدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا ڕازی دەبن چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن؟)) وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ((ڕازی دەبن سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن؟)) وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئایا ڕازی دەبن نیوەی خەڵکی بەهەست بن؟)) وتمان بەڵێ، فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، من ئومێد دەکەم نیوەی خەڵکی بەهەشت بن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە ئەوەی مسوڵمان نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە، وە ئێوە لە چاو خەڵکی هاوبەش دانەردا وەك تاڵە موویەکی سپی وان لە پێستی گایەکی ڕەشدا یان وەك تاڵە موویەکی ڕەش وان لە پێستی گایەکی سووردا)).**

٦٥٢٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ حَدَّثَنِي أَخِي عَنْ سُلَيْمَانَ عَنْ ثَوْرٍ عَنْ أَبِي الْغَيْثِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ «أَوَّلُ مَنْ يُدْعَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ آدَمُ، فَتَرَاءَى ذُرِّيَّتُهُ فَيُقَالُ هَذَا أَبُوكُمْ آدَمُ. فَيَقُولُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ. فَيَقُولُ أَخْرِجْ بَعْثَ جَهَنَّمَ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ. فَيَقُولُ يَا رَبِّ كَمْ أُخْرِجُ فَيَقُولُ أَخْرِجْ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ». فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا أُخِذَ مِنَّا مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، فَمَاذَا يَبْقَى مِنَّا قَالَ «إِنَّ أُمَّتِي فِي الأُمَمِ كَالشَّعَرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي الثَّوْرِ الأَسْوَدِ».

**٦٥٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەکەم کەسێك کە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێت ئادەمە ﷺ لەگەڵ نەوەکانیدا یەکتری دەبینن، ئینجا (بە نەوەکانی) دەوترێت: ئەوە ئادەمی باوکتانە،**

---

(١) بڕوانە: ٦٦٤٢.

ئادەمیش ﷺ دەڵێ: ئامادەی فەرمانتم و خۆشنودی تۆ بەدەست دێنم، (خوا پێی) دەفەرموێ: ئەوانەی شیاوی ناردنن بۆ دۆزەخ لە نەوەكانت دەریان بێنە (و بیان نێرە)، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چەند دەربێنم (و جیاكەمەوە)؟ خواش دەفەرموێ: لە هەموو سەد كەسێك نەوەد و نۆیان بنێرە))، هاوەڵانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە هەر سەد كەسێك نەوەد و نۆمان بنێرێت ئیتر جێمان دەمێنێتەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((لە ڕاستیدا ئوممەتی من لە چاو ئوممەتانی دیكە وەك موویەكی سپی وایە لە گایەكی ڕەشدا)).

## ٤٦- بابُ قوله ﷻ: ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ۝١﴾ الحج ﴿أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ ۝٥٧﴾ النجم. ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١﴾ القمر

٦٥٣٠- حَدَّثَنِي يُوسُفُ بْنُ مُوسَى حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَقُولُ اللَّهُ يَا آدَمُ. فَيَقُولُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ. قَالَ يَقُولُ أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ. قَالَ وَمَا بَعْثُ النَّارِ قَالَ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ. فَذَاكَ حِينَ يَشِيبُ الصَّغِيرُ، وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا، وَتَرَى النَّاسَ سَكْرَى وَمَا هُمْ بِسَكْرَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ». فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّنَا الرَّجُلُ قَالَ «أَبْشِرُوا، فَإِنَّ مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفٌ وَمِنْكُمْ رَجُلٌ - ثُمَّ قَالَ - وَالَّذِي نَفْسِي فِي يَدِهِ إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». قَالَ فَحَمِدْنَا اللَّهَ وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ «وَالَّذِي نَفْسِي فِي يَدِهِ إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، إِنَّ مَثَلَكُمْ فِي الأُمَمِ كَمَثَلِ الشَّعَرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ أَوِ الرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الْحِمَارِ»[1].

(١) بروانە: ٣٣٤٨.

## ٤٦- باسى ئەم فەرمايشتەى خوا ﷻ: (بەڕاستى بومەلەرزەى قيامەت هەستان شتێكى زۆر گەورەيە) (ڕۆژى دوايى زۆر نزيک بووەتەوە) (ڕۆژى دوايى نزيک بويەوە)

**٦٥٣٠- ئەبو سەعيد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: ((خواى گەورە دەفەرمووێ: ئەى ئادەم، ئادەميش دەڵێ: فەرمان بەردارتم[١] وە خۆشنودى تۆ بە دەست دێنم، هەموو چاكە و خێرێك لە دەستى تۆدايە، دەڵێ: (خواى گەورە) دەفەرمووێ: ئەوانەى دەنێردرێن بۆ دۆزەخ دەريان بێنە (لە ناو خەڵكدا)، ئادەميش دەڵێ: نێردراوانى دۆزەخ ژمارەيان چەندە؟ دەفەرمووێ: لە هەر هەزارێك نۆسەد و نەوەد و نۆيان، جا لەو كاتەدا منداڵى ساوا سەرى سپى دەبێت، (وە هەموو ئافرەتێكى دوو گيان سكەكەى فڕێ دەدات، خەڵكى دەبينى (دەڵێى) سەرخۆشن بەڵام سەرخۆشيش نين، بەڵكو سزاى سەخت و بەتينى خوايە (واى لێ كردوون) )، جا ئەوە بەلاى هاوەڵانەوە قورس بوو بۆيە وتيان: ئەى پێغەمبەرى خوا جاكێمان ئەو پياوەين[٢]، فەرمووى: ((مژدەتان لێ بێت دڵنيابن چونكە هەزار لە يەئجوج و مەئجوجە و يەكێك لە ئێوەيە))، پاشان فەرمووى: ((وە سوێند بەو زاتەى گيانى منى بە دەستە، من ئومێدەوارم كە ئێوە سێ يەكى خەڵكى بەهەشت بن))، بۆيە سوپاسى خوا و ئەڵلاهو ئەكبەرمان كرد، پاشان فەرمووى: ((وە سوێند بەو زاتەى گيانى منى بە دەستە، من ئومێدەوارم كە ئێوە نيوەى خەڵكى بەهەشت بن، بێگومان ئێوە لە ناو خەڵكيدا (لە مەحشەردا) وەك موويەكى ڕەش وان لە پێستى گايەكى سپيدا، يان وەك پەڵەيەكى سپى وان لە دەستى گوێدرێژيكدا)).**

---

(١) گوێڕايەڵتم و لە خزمەتتدام هەر فەرمانێكت هەيە جێبەجێى دەكەم.

(٢) كە ڕزگارى دەبێت لە ناو هەزار كەسدا.

## ٤٧- بابُ قولِ اللّٰه تعالى ﴿ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾ المطففين، وقالَ ابن عبَّاسٍ ﵄: ﴿ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ ﴾ البقرة. قالَ الوُصُلاتُ في الدُّنْيا

## ٤٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئایا ئەوانە نازانن کە بەدڵنیاییەوە زیندوو دەکرێنەوە، لە ڕۆژێکی گەورەدا، ڕۆژێک کە خەڵک لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا دەوەستن)، ئیبنو عەبباس ﵄ دەربارەی: ﴿ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ ﴾ البقرة[1] دەڵێ: هەموو پەیوەندیەکانی دنیا (دەبچڕێت لە نێوانیاندا).

٦٥٣١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبَانَ حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾ المطففين: قَالَ «يَقُومُ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ»[2].

**٦٥٣١-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: (لە مانای ئەم ئایەتەدا): ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾ المطففين. واتە: (ڕۆژێك کە هەموو خەڵك لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا ڕادەوەستن). فەرمووی (ئەوەندە گەرمە) کەسی وایان هەیە تا نیوەی گوێیەکانی لە ئارەقی خۆیدا نوقم دەبێت)).**

---

(١) واتە: هەموو پەیوەندی یەکیان بچڕایەوە.

(٢) بڕوانە: ٤٩٣٨.

٦٥٣٢- حَدَّثَنِي عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ عَنْ أَبِي الْغَيْثِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «يَعْرَقُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَذْهَبَ عَرَقُهُمْ فِي الأَرْضِ سَبْعِينَ ذِرَاعاً، وَيُلْجِمُهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ آذَانَهُمْ».

**٦٥٣٢-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لە ڕۆژی هەستانەوەدا خەڵكی ئەوەندە ئارەق دەكەن، هەتا ئارەقیان حەفتا باڵ بەناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە، وە ئارەق دەگاتە لا لغاویان[1]، هەتا (هەندێ جار) دەگاتە گوێیەكانیان)).**

## ٤٨- بابُ القِصَاصِ يَوْمَ القِيَامَةِ

وَهْيَ الحَاقَّةُ لأَنَّ فِيهَا الثَّوَابَ وَحَوَاقَّ الأُمُورِ، الحَقَّةُ وَالْحَاقَّةُ وَاحِدٌ، وَالْقَارِعَةُ، وَالْغَاشِيَةُ، وَالصَّاخَّةُ، وَالتَّغَابُنُ غَبْنُ أَهْلِ الجَنَّةِ أَهْلَ النَّارِ.

٦٥٣٣- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ حَدَّثَنَا أَبِي حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ حَدَّثَنِي شَقِيقٌ سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ ﷺ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ بِالدِّمَاءِ»[2].

## ٤٨- باسی (چۆنیەتی) تۆڵەكردنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا

**قیامەت هەروەها ناوی** (الْحَاقَّةُ)**یە، چونكە پاداشت دانەوەی تیایە، وە ئەو كار و بارانەی تیایە كە ڕوودانیان ڕاستە**[3]. (الحَقَّةُ) و (الْحَاقَّةُ) **یەك مانایان هەیە، وە هەر یەك لە:** (الْقَارِعَةُ) و (الْغَاشِيَةُ) و (الصَّاخَّةُ) و (التَّغَابُنُ) **واتە: خەڵەتاندنی بەهەشتیەكان بۆ دۆزەخیەكان (ئەو ناوانە هەموویان ناوی ڕۆژی دوایی و قیامەتن).**

---

(١) دەگاتە دەمیان كە شوێنی لەغاو كردن و لەوڵاخدا، (يلجمهم) بەكوردی یانی ئاوەكە لە غاویان دەكات.

(٢) بڕوانە: ٦٨٦٤.

(٣) (وَحَوَاقُّ الأُمُورِ) بەدوو جۆری تریش مانا كراوە: ئەو ڕۆژەیە ڕاستی و حەقیقەتی كار و بارەكان دەزانرێت، یان كار و بارە ڕاستەكان كە موحاسەبە و سزا و پاداشتە ڕوو دەدەن. إرشاد الساري:٥٣٦/١٣

**٦٥٣٣-شەقیق دەڵێ: لە عەبدوڵلام ﷺ بیست وتی: پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((یەکەم شتێك لە نێوان خەڵکدا (لە قیامەتدا) دادگای تیادا دەکرێت ئەو خوێنانەیە)) (لە دونیادا ڕژێنراون دامەزراوە و نەگۆڕەکانی تیایە).**

٦٥٣٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِى مَالِكٌ عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِىِّ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلَمَةٌ لأَخِيهِ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهَا، فَإِنَّهُ لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُؤْخَذَ لأَخِيهِ مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ أَخِيهِ، فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ»[1].

**٦٥٣٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر یەك ستەم و ناهەقییەکی لە برایەکی مسوڵمانی کردبێت، ئەوە باگەردنی خۆی پێ ئازاد بکات لێی، چونکە بێگومان لەوێ نەدینار هەیە نەدرهەم، پێش ئەوەی لە چاکەکانی ببرێ بۆ براکەی، ئەگەر چاکەی نەبوو لە گوناهی براکەی وەردەگیرێت و دەدرێت بەکۆڵیدا)).**

٦٥٣٥- حَدَّثَنِى الصَّلْتُ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ﴿٤٧﴾ ﴾ الحجر. قَالَ حَدَّثَنَا سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَبِى الْمُتَوَكِّلِ النَّاجِىِّ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِىَّ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَخْلُصُ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَيُحْبَسُونَ عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقَصُّ لِبَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ، مَظَالِمُ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ، فَوَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لأَحَدُهُمْ أَهْدَى بِمَنْزِلِهِ فِي الْجَنَّةِ مِنْهُ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا»[2].

**٦٥٣٥- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) صەلتی کوڕی موحەممەد بۆی گێڕاینەوە وتی: یەزیدی کوڕی زورەیع دەربارەی ئەم ئایەتە: (هەر ڕق و کینەیەك لە سنگ و**

(١) بروانە: ٢٤٤٩.

(٢) بروانە: ٢٤٤٠.

دڵەكانیاندا بووبێت دەرمان هێناوە)، بۆی گێڕاینەوە وتی: سەعید لە قەتادەوە بۆی گێڕاینەوە لە ئەبی موتەوەكیلی ناجییەوە گێڕایەوە كە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((باوەڕداران لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێت ئینجا لە پردێكدا لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیرێن، وە تۆڵەی ئەو ستەمكارییانەی لە دونیادا بووە بۆ هەندێكیان دەسەنرێت لە هەندێكی تریان، هەتا پاك و خاوێن و پوخت دەكرێنەوە و ڕێگەیان پێ دەدرێت بە چوونە بەهەشت، جا سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، هەر یەك لەو بەهەشتیانە شارەزاترە بە ماڵەكەی لە بەهەشتدا لەو ماڵەی كە هەیبووە لە دونیادا)).

## ٤٩- بابٌ: مَن نُوقِشَ الحِسابَ عُذِّبَ

٦٥٣٦- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسْوَدِ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ عُذِّبَ». قَالَتْ قُلْتُ أَلَيْسَ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى ﴿ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾ الانشقاق. قَالَ «ذَلِكِ العَرْضُ».و حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسْوَدِ سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ مِثْلَهُ[1].

وَتَابَعَهُ ابْنُ جُرَيْجٍ وَمُحَمَّدُ بْنُ سُلَيْمٍ وَأَيُّوبُ وَصَالِحُ بْنُ رُسْتُمٍ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

---

(١) بروانە: ١٠٣.

## ٤٩- باسێک: هەر کەس لێپرسینەوەی وردی لەگەڵدا کرابێت سزا دراوە

٦٥٣٦- ئیبنو ئەبی مولەیکە دەڵێ: عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس لێپرسینەوەی وردی لەگەڵدا کرابێت ئەوە سزا دراوە))، عائیشە ﵂ دەڵێ وتم: ئەی خوای گەورە نافەرمووێ: ﴿ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۝٨ ﴾ الانشقاق. واتە: (ئەوسا پرسینەوەیەکی سووك و ئاسانی لەگەڵ دەکرێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە تەنها (کاتی) نیشاندانی (کردەوەکانە بەکەسەکە).

- (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) عەمری کوڕی عەلی بۆی گێڕامەوە وتی: یەحیا بۆی گێڕاینەوە لە عوسمانی کوڕی ئەسوەدەوە وتی: لە ئیبنو ئەبی مولەیکەم بیستووە وتی: لە عائیشەم ﵂ بیستووە وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە جا وێنەی فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە.

-ئیبنو جورەیج و موحەممەدی کوڕی سولەیم و صالحی کوڕی ڕۆستوم گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە، ئەویش لە عائیشەوە ﵂ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست (هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە).

٦٥٣٧- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ حَدَّثَنَا حَاتِمُ بْنُ أَبِي صَغِيرَةَ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ حَدَّثَنِي الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «لَيْسَ أَحَدٌ يُحَاسَبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ هَلَكَ». فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ۝٧ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۝٨ ﴾ الانشقاق. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ «إِنَّمَا ذَلِكِ الْعَرْضُ، وَلَيْسَ أَحَدٌ يُنَاقَشُ الْحِسَابَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ عُذِّبَ»[1].

(١) بروانە: ١٠٣.

**٦٥٣٧- ئیبنو ئەبی مولەیكە لە قاسیمەوە ئەویش لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر كەسێ لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكرێ تیادەچێ))، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خوای بەرز و بڵند نافەرمووێ: (ئینجا ئەو كەسەی كە نامەی (كردەوەی) درایە دەستی ڕاستی، جا دوای ئەوە پرسینەوەیەكی سووك و ئاسانی لەگەڵ دەكرێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەوە هەر پیشاندانە، هەر كەس لە ڕۆژی قیامەتدا لێكۆڵینەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكرێ، ئەوە سزا دەدرێت)).**

٦٥٣٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ حَدَّثَنِى أَبِى عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِىِّ. وَحَدَّثَنِى مُحَمَّدُ بْنُ مَعْمَرٍ حَدَّثَنَا رَوْحُ بْنُ عُبَادَةَ حَدَّثَنَا سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﵁ أَنَّ نَبِىَّ اللَّهِ كَانَ يَقُولُ «يُجَاءُ بِالْكَافِرِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ لَهُ أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ مِلْءُ الأَرْضِ ذَهَباً أَكُنْتَ تَفْتَدِى بِهِ فَيَقُولُ نَعَمْ. فَيُقَالُ لَهُ قَدْ كُنْتَ سُئِلْتَ مَا هُوَ أَيْسَرُ مِنْ ذَلِكَ»[1].

**٦٥٣٨-ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((لە ڕۆژی دواییدا بێ باوەڕ دەهێنرێت و پێی دەوترێت: پێم بڵێ ئەگەر پڕی زەوی ئاڵتوونت هەبوایە ئایا دەت دا لە بریتی خۆتدا؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، جا پێی دەوترێت بێگومان لەوە كەمتر و ئاسانترت لێ داوا كرا (بەڵام نەتكرد) )).**

٦٥٣٩- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ حَدَّثَنَا أَبِى قَالَ حَدَّثَنِى الأَعْمَشُ قَالَ حَدَّثَنِى خَيْثَمَةُ عَنْ عَدِىِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ قَالَ النَّبِىُّ ﷺ «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَسَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لَيْسَ بَيْنَ اللَّهِ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ، ثُمَّ يَنْظُرُ فَلاَ يَرَى شَيْئاً قُدَّامَهُ، ثُمَّ يَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِىَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ»[2].

---

(١) بڕوانە: ٣٣٣٤.

(٢) بڕوانە: ١٤١٣.

**٦٥٣٩- عەدیی كوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر كام لە ئێوە بە دڵنیاییەوە خودا لە ڕۆژی دواییدا قسەی لەگەڵ دەكات، لە نێوان خودا و ئەودا وەرگێڕ نییە، لە پاشان سەیر دەكات لە پێشەوە هیچ شتێك نابینێت، پاشان سەیری بەردەمی خۆی دەكات دۆزەخ لە بەرامبەری دایە، جا هەر كەس لە ئێوە توانی خۆی لە دۆزەخ بپارێزێت (با خۆی بپارێزێ) با بە لەتە خورمایەكیش بێت)).**

٦٥٤٠ - قَالَ الأَعْمَشُ حَدَّثَنِي عَمْرٌو عَنْ خَيْثَمَةَ عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «اتَّقُوا النَّارَ». ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ، ثُمَّ قَالَ «اتَّقُوا النَّارَ». ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ ثَلاَثاً، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[1].

**٦٥٤٠-عەدی كوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن))، پاشان ڕووی وەرچەرخاند و لێی بە پارێز بوو بە لێبڕاوی لێی دەدوا و پاشان فەرمووی: ((خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن))، لە پاشان ڕووی وەرچەرخان لێی بە پارێز بوو بە لێبڕاوی لێی دەدوا- سێ جار ئەمەی دووبارە كردەوە - هەتا وامان گومان كرد كە تەماشای دۆزەخ دەكات، لە پاشان فەرمووی: ((خۆتان باپرێزن لە ئاگری دۆزەخ با بەلەتە خورمایەكیش بێت، ئینجا ئەگەر ئەوەیش نەبوو با بەوتەیەكی جوان (خۆی لە دۆزەخ بپارێزێت) )).**

## ٥٠- بابٌ: يَدْخُلُ الجَنَّةَ سَبعُونَ أَلفًا بِغَيرِ حِسَابٍ

٦٥٤١- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ حَدَّثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ. وَحَدَّثَنِي أَسِيدُ بْنُ زَيْدٍ حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ عَنْ حُصَيْنٍ قَالَ كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ حَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَ

---

(١) بڕوانە: ١٤١٣.

النَّبِيُّ ﷺ «عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ، فَأَخَذَ النَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ الأُمَّةُ، وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ النَّفَرُ، وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ الْعَشَرَةُ، وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ مَعَهُ الْخَمْسَةُ، وَالنَّبِيُّ يَمُرُّ وَحْدَهُ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ كَثِيرٌ قُلْتُ يَا جِبْرِيلُ هَؤُلاَءِ أُمَّتِي؟ قَالَ لاَ وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الأُفُقِ. فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ كَثِيرٌ. قَالَ هَؤُلاَءِ أُمَّتُكَ، وَهَؤُلاَءِ سَبْعُونَ أَلْفاً قُدَّامَهُمْ، لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ وَلاَ عَذَابَ. قُلْتُ وَلِمَ؟ قَالَ كَانُوا لاَ يَكْتَوُونَ، وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَتَطَيَّرُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ». فَقَامَ إِلَيْهِ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ». ثُمَّ قَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ آخَرُ قَالَ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ «سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ»[(١)].

## ٥٠- باسێک: حەفتا هەزار کەس بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە

**٦٥٤١- هوشەیم لەحوصەینەوە گێڕایەوە وتی: من لای سەعیدی کوڕی جوبەیر بووم وتی: ئیبنو عەبباس ﷺ بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئوممەتەکانم نیشان درا، ئینجا پێغەمبەر هەبوو دەڕۆشت و کۆمەڵێ خەڵکی لەگەڵدابوو، وە پێغەمبەر هەبوو دەڕۆشت و چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەریش هەبوو دەڕۆشت و دە کەسی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەریش هەبوو دەڕۆشت و پێنج کەسی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەری واش هەبووبە تەنها خۆی دەڕۆشت، ئینجا ڕوانیم خەڵکێکی زۆرم بینی، وتم: ئەی جیبریل ئائەوانە ئوممەتی منن؟ وتی: نەخێر بەڵام سەیری ئەو ئاسۆ و کەنارە بکە، منیش سەیرم کرد خەڵکێکی زۆرم بینی، فەرمووی ئائەوانە ئوممەتەکەی تۆن، وە ئائەوانە حەفتا هەزار لە پێشیانەوەن، نە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، نە سزا دەدرێن، وتم بۆچی؟ فەرمووی: ((ئەوانە ئەو کەسانەن کە خۆیان داغ ناکەن،**

(١) بڕوانە: ٣٤١٠.

داوای نوشتە ناکەن، ڕەشبینی ناکەن [١]، تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن))، ئینجا عوکاشەی کوڕی میحصەن ﷺ هەستا و ڕۆشت بۆ لای و وتی: لە خوا بپاڕێرەوە کە من بە یەکێك لەوانە دانێت، فەرمووی: ((خوایە بیکە بە یەکێك لەوانە))، ئینجا پیاوێکی تر هەستا و ڕۆشت بۆ لای ووتی: لە خوا بپاڕێرەوە کە من بە یەکێك لەوانە دانێت، فەرمووی: ((عوکاشە پێشت کەوت بەو پاڕانەوەیە)).

٦٥٤٢- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا يُونُسُ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ حَدَّثَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَهُ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ:«يَدْخُلُ مِنْ أُمَّتِي زُمْرَةٌ هُمْ سَبْعُونَ أَلْفاً، تُضِيءُ وُجُوهُهُمْ إِضَاءَةَ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ». وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ الأَسَدِيُّ يَرْفَعُ نَمِرَةً عَلَيْهِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. قَالَ «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ». ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَقَالَ «سَبَقَكَ عُكَّاشَةُ»[٢].

٦٥٤٢- سەعیدی کوڕی موسەییەب دەگێڕێتەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((لە ئوممەتی من کۆمەڵێك دەچنە بەهەشتەوە کە حەفتا هەزارن، ڕووخساریان شەوقێك دەداتەوە وەك شەوقی مانگی شەوی چواردە))، ئەبو هوڕەیرە ﷺ وتی: ئینجا عوکاشەی کوڕی میحصەنی ئەسەدی هەستا و ئەو شاڵ و عابایەی بەسەر سەریەوە بوو بەرزی کردەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆم بپاڕێرەوە لە خوا بمکات بەیەکێك لەوانە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((خودایە بیکە بە یەکێك

---

(١) بەهۆی فڕینی باڵندەوە.

(٢) بڕوانە: ٥٨١١.

**لەوانە))، پاشان پیاوێكی تری ئەنصاری هەستا و وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ: دوعاش بۆ من بكە لای خوا یەكێك بم لەوانە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((عوكاشە پێشت كەوت)).**

٦٥٤٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفاً أَوْ سَبْعُمِائَةِ أَلْفٍ - شَكَّ فِي أَحَدِهِمَا - مُتَمَاسِكِينَ، آخِذٌ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ، حَتَّى يَدْخُلَ أَوَّلُهُمْ وَآخِرُهُمُ الْجَنَّةَ، وَوُجُوهُهُمْ عَلَى ضَوْءِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ»[1].

**٦٥٤٣- سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان حەفتا هەزار یان حەو سەد هەزار-گومانی هەبووە لە ژمارەیەكیان-لەئوممەتم دەچنە (بەهەشت)، هەندێكیان دەستیان گرتووە بە هەندێكی تریانەوە، هەتا سەرەتا و كۆتایی یان پێكەوە بڕۆنە بەهەشتەوە، ڕووخساریان وەك ڕووناكی مانگی شەوی چواردەیە (لە جوانیدا) )).**

٦٥٤٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ صَالِحٍ حَدَّثَنَا نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَ أَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُومُ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ يَا أَهْلَ النَّارِ لاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لاَ مَوْتَ، خُلُودٌ»[2].

**٦٥٤٤-ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((كاتێ بەهەشتیەكان چوونە بەهەشتەوە و دۆزەخیەكانیش چوونە دۆزەخەوە، پاشان جاڕ دەرێك لە نێوانیاندا هەڵدەسێتەوە و دەڵێ: ئەی خەڵكی دۆزەخ مردن نییە، وە ئەی خەڵكی بەهەشت مردنی نییە، مانەوەی هەمیشەیی و هەتا هەتاییە)).**

(١) بروانە: ٣٢٤٧.
(٢) بروانە: ٦٥٤٨.

٦٥٤٥- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «يُقَالُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ خُلُودٌ لاَ مَوْتَ. وَلأَهْلِ النَّارِ يَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ لاَ مَوْتَ».

**٦٥٤٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەخەڵكی بەهەشت دەوترێت: هەتا هەتا دەمێنن ئیتر مردن نییە، وە بەدۆزەخیەكانیش دەوترێت: ئەی دۆزەخیەكان هەتا هەتا دەبن مردن نییە)).**

## ٥١- بابُ صِفَةِ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ

وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ زِيَادَةُ كَبِدِ حُوتٍ». عَدْنٌ خُلْدٌ، عَدَنْتُ بِأَرْضٍ أَقَمْتُ، وَمِنْهُ الْمَعْدِنُ، فِي مَعْدِنِ صِدْقٍ، فِي مَنْبِتِ صِدْقٍ.

## ٥١- باسی چۆنیەتی بەهەشت و دۆزەخ

**ـئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی((یەكەم خواردنێك بەهەشتیەكان دەیخۆن زیادەی جگەری نەهەنگە)).**(عَدْنٌ) **هەمیشەی هەتا هەتای، دەوترێت** (عَدَنْتُ بِأَرْضٍ) **نیشتەجێ بووم تیایدا، وە** (الْمَعْدِنُ) **كانزا لەو مانایە، چونكە لە شوێنی خۆیدا ماوەتەوە،** (فِي مَعْدِنِ صِدْقٍ) **لە بنەچە و ئەسڵێكی چاك و ڕاست.**

٦٥٤٦- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ حَدَّثَنَا عَوْفٌ عَنْ أَبِي رَجَاءٍ عَنْ عِمْرَانَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ»[1].

**٦٥٤٦- عیمران ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە فەرموویەتی: ((چاوم بە بەهەشت كەوت[1] جا بینیم زۆرتری خەڵكەكەی هەژارانن. وە چاوم بە دۆزەخ كەوت جا بینیم زۆرتری خەڵكەكەی ئافرەتانن)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٤١.

٦٥٤٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ أَخْبَرَنَا سُلَيْمَانُ التَّيْمِيُّ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ عَنْ أُسَامَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَكَانَ عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينَ، وَأَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ، غَيْرَ أَنَّ أَصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ، وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ»[٢].

**٦٥٤٧- ئوسامە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((لەبەر دەرگای بەهەشتدا وەستام، سەرنجمدا زۆربەی ئەوانەی چوو بوونە ناو بەهەشتەوە هەژار و نەدارەکان بوون، بەڵام خاوەن ماڵ و سامانداره‌کان ڕاگیرابوون [٣]، دۆزەخییەکان نەبێ کە بێگومان فەرمان درابوو کە ببرێن بۆ دۆزەخ، وە لەبەر دەرگای دۆزەخیشدا وەستام و سەرنجم دا زۆربەی ئەوانەی چوو بوونە ناو دۆزەخەوە ژنان بوون)).**

٦٥٤٨- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا عُمَرُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ حَدَّثَهُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ، وَأَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ، جِيءَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، ثُمَّ يُذْبَحُ، ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لاَ مَوْتَ، يَا أَهْلَ النَّارِ لاَ مَوْتَ، فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحاً إِلَى فَرَحِهِمْ. وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْناً إِلَى حُزْنِهِمْ»[٤].

**٦٥٤٨-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((کاتێ بەهەشتیەکان چوونە بەهەشتەوە، دۆزەخیەکانیش چوونە دۆزەخەوە مردن دەهێنرێت هەتا لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیرێت، لە پاشان سەر**

(١) لە شەوی میعراجدا یان خەودا.

(٢) بڕوانە: ٥١٩٦.

(٣) بۆ لێپرسینەوەی ماڵ و سامانەکەیان .

(٤) بڕوانە: ٦٥٤٤.

**دەبڕدرێت، پاشان جاڕ دەرێك جاڕ دەدات دەڵێ: ئەی خەڵكی بەهەشت ئیتر مردن نەما، ئەی خەڵكی دۆزەخ ئیتر مردن نەما، ئینجا بەهەشتیەكان ئەم خۆشیەش زیاد دەبێ بۆ خۆشیەكەیان، دۆزەخیەكانیش ئەم خەم و خەفەتەش زیاد دەبێ بۆ غەم و خەفەتەكەیان)).**

٦٥٤٩- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ. يَقُولُونَ لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ. فَيَقُولُ هَلْ رَضِيتُمْ فَيَقُولُونَ وَمَا لَنَا لاَ نَرْضَى وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ. فَيَقُولُ أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ. قَالُوا يَا رَبِّ وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَداً»[1].

**٦٥٤٩- ئەبو سەعید خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان خوای گەورە بەبەهەشتیەكان دەفەرمووێ: ئەی بەهەشتیەكان، ئەوانیش دەڵێن: فەرمان بەردارین پەروەردگارمان خۆشنوودی تۆ دەخوازین، دەفەرموێ ئایا ڕازی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: بۆچی ڕازی نابین لە كاتێكدا ئەوەی بەنێمەت داوە بە هیچ كەس لە دروستكراوەكانی خۆتت نەداوە؟ ئەویش دەفەرمووێ: من لەوە گەورەترتان دەدەمێ، وتیان: ئەی پەروەردگار چ شتێك لەمە چاكتر و گەورەترە؟ ئەویش دەفەرموێ: ڕەزامەندی خۆم دەبەخشم پێتان، ئیتر پاش ئەوە هەرگیز لێتان توڕە نابم)).**

٦٥٥٠- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ عَمْرٍو حَدَّثَنَا أَبُو إِسْحَاقَ عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ سَمِعْتُ أَنَساً يَقُولُ أُصِيبَ حَارِثَةُ يَوْمَ بَدْرٍ وَهْوَ غُلاَمٌ، فَجَاءَتْ أُمُّهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ عَرَفْتَ مَنْزِلَةَ حَارِثَةَ مِنِّي، فَإِنْ يَكُ فِي الْجَنَّةِ أَصْبِرْ وَأَحْتَسِبْ، وَإِنْ

(١) بڕوانە: ٧٥١٨.

تَكُنِ الأُخْرَى تَرَى مَا أَصْنَعُ. فَقَالَ «وَيْحَكِ - أَوَهَبِلْتِ - أَوَجَنَّةٌ وَاحِدَةٌ هِيَ جِنَانٌ كَثِيرَةٌ، وَإِنَّهُ لَفِى جَنَّةِ الْفِرْدَوْسِ»[1].

**٦٥٥٠- حومەید دەڵێ: لە ئەنەسم ﷺ بیست دەیوت: حاریسە كە غوڵامێك بوو لە ڕۆژی (غەزای) بەدردا پێكرا (بەتیرێك و مرد)، ئەنجا دایكی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان خۆت دەزانی حاریسە پلە و خۆشەویستی چەندە لای من، جا ئەگەر لە بەهەشتدا بێت ئەوە ئارام دەگرم و چاوەڕوانی پاداشتی خوام، خۆ ئەگەر دیوەكەی تر بێت دەبینی چی دەكەم[2]، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((هاوار بۆ تۆ- یان ئەوە شێت بووی- (بەمردنی كوڕەكەت) وا دەزانی یەك بەهەشتە؟ بێگومان چەند بەهەشتێكی زۆرە، وە دڵنیابە كوڕەكەت ئەوەتا لە بەهەشتی فیردەوس دایە)).**

٦٥٥١- حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ أَسَدٍ أَخْبَرَنَا الْفَضْلُ بْنُ مُوسَى أَخْبَرَنَا الْفُضَيْلُ عَنْ أَبِي حَازِمٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَا بَيْنَ مَنْكِبَيِ الْكَافِرِ مَسِيرَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ لِلرَّاكِبِ الْمُسْرِعِ».

**٦٥٥١-ئەبو هوڕەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((نێوان هەردوو شانی كافر سێ ڕۆژ ڕێگایە[3] بۆ وڵاخ سوارێكی خێرا)).**

٦٥٥٢ - وَقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ أَخْبَرَنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ سَلَمَةَ حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ عَنْ أَبِي حَازِمٍ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ، لاَ يَقْطَعُهَا».

**٦٥٥٢-سەهلی كوڕی سەعد ﷺ لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((بێگومان لە بەهەشتدا درەختێك هەیە، سوار سەد ساڵ دەڕوات بە ژێر سێبەرەكەیدا نایبڕێت)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٨٠٩.

(٢) لە گریان و شین و زاری بۆی .

(٣) سەرنج: بۆیە خوای گەورە لاشەی دۆزەخیەكان گەورە دەكات تا دۆزەخیان لێ پڕ بكات، وە بۆ ئەوەی زۆرتر سزا بچێژن. إرشاد الساري:٥٥٣/١٣.

٦٥٥٣ - قَالَ أَبُو حَازِمٍ فَحَدَّثْتُ بِهِ النُّعْمَانَ بْنَ أَبِي عَيَّاشٍ فَقَالَ حَدَّثَنِي أَبُو سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ الْجَوَادَ الْمُضَمَّرَ السَّرِيعَ مِائَةَ عَامٍ، مَا يَقْطَعُهَا».

**٦٥٥٣-ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((بەڕاستی لە بەهەشتدا درەختێك هەیە ئەسپ سوار چوست و چالاکی خێرا سەد ساڵ دەڕوات نایبڕێت)).**

٦٥٥٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ عَنْ أَبِي حَازِمٍ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَوْ سَبْعُمِائَةِ أَلْفٍ - لاَ يَدْرِي أَبُو حَازِمٍ أَيُّهُمَا قَالَ - مُتَمَاسِكُونَ، آخِذٌ بَعْضُهُمْ بَعْضاً، لاَ يَدْخُلُ أَوَّلُهُمْ حَتَّى يَدْخُلَ آخِرُهُمْ، وُجُوهُهُمْ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ»[1].

**٦٥٥٤- سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بێگومان حەفتا هەزار یان حەو سەد هەزار- ئەبو حازیم نازانێ کام ژمارەیان بووە- لە ئوممەتم دەچنە بەهەشت، هەندێکیان دەستیان گرتووە بە هەندێکی تریانەوە، یەکەمینەکەیان ناڕواتە بەهەشتەوە هەتا کۆتاهەمینەکەیان نەڕواتە بەهەشتەوە، ڕووخساریان وەك ڕووناکی مانگی شەوی چواردەیە (لە جوانیدا) )).**

٦٥٥٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ سَهْلٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ الْغُرَفَ فِي الْجَنَّةِ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ فِي السَّمَاءِ».

**٦٥٥٥- سەهل ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان بەهەشتیەکان کۆشکە بەرزەکان لە بەهەشتدا دەبینن (و پیشانی یەکتری دەدەن)، چۆن ئێوە ئەستێرە دەبینن لە ئاسماندا)).**

---

(١) بڕوانە: ٣٢٤٧.

٦٥٥٦ - قَالَ أَبِي فَحَدَّثْتُ النُّعْمَانَ بْنَ أَبِي عَيَّاشٍ فَقَالَ أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ يُحَدِّثُ وَيَزِيدُ فِيهِ «كَمَا تَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الْغَارِبَ فِي الأُفُقِ الشَّرْقِيِّ وَالْغَرْبِيِّ»[1].

**٦٥٥٦- (عەبدولعەزیز) دەڵێ: باوکم وتی: ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ نوعمانی کوڕی ئەبی عەییاش، نوعمانیش وتی: شایەتی ئەدەم کە ئەبو سەعید ئەم فەرموودەی گێڕایەوە و ئەم زیادەیەشی تیا بوو: ((وەك چۆن ئەستێرەی گەشی زۆر دوور لە ئاسۆدا لە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژ ئاوادا دەبینن ))**

٦٥٥٧. - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي عِمْرَانَ قَالَ سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى لأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَوْ أَنَّ لَكَ مَا فِي الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ أَكُنْتَ تَفْتَدِي بِهِ فَيَقُولُ نَعَمْ. فَيَقُولُ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هَذَا وَأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ أَنْ لاَ تُشْرِكَ بِي شَيْئاً فَأَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تُشْرِكَ بِي»[2].

**٦٥٥٧- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە[3] کە فەرموویەتی: ((خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێ [4] بەو کەسەی لە دۆزەخیاندا سزای لە هەمووان سووکترە: ئەگەر هەرچی شت هەیە لە دونیادا هی تۆ بوایە تۆ دەتکردە بریتی خۆت (تا ڕزگارت بێ)؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، خواش دەفەرمووی: من لەوە ئاسانتر و کەمترم لێ داوا کردیت، لە کاتێکدا تۆ لە پشتی ئادەم دا بوویت، (کە بریتی بوو لەوەی) کە هاوبەشم بۆ بڕیار نەدەیت، بەڵام بە گوێت نەکردم هەر هاوبەشت بڕیاریدا)).**

---

(١) بروانە: ٣٢٥٦.

(٢) بروانە: ٣٣٣٤.

(٣) وە بە فەرمایشتی ئەو دەیگێڕێتەوە (برفعه) واتە: ئەنەس ئەم فەرموودەیە دەباتە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ.

(٤) واتە فەرموودەکە قودسیە واتە فەرمایشتی خودایە.

٦٥٥٨- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ عَمْرٍو عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ «يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ بِالشَّفَاعَةِ كَأَنَّهُمُ الثَّعَارِيرُ». قُلْتُ مَا الثَّعَارِيرُ قَالَ الضَّغَابِيسُ. وَكَانَ قَدْ سَقَطَ فَمُهُ فَقُلْتُ لِعَمْرِو بْنِ دِينَارٍ أَبَا مُحَمَّدٍ سَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «يَخْرُجُ بِالشَّفَاعَةِ مِنَ النَّارِ» قَالَ نَعَم.

**٦٥٥٨-جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( (كەسانێك) بە شەفاعەت لە دۆزەخ دێنە دەرەوە وەك ترۆزی بچوك وان)).**

**(حەمماد دەڵێ) وتم (الثَّعَارِيرُ) چیە؟ (عەمر) وتی: ترۆزی بچووكە، عەمر دانەكانی كەوتبوو[1].**

**(عەبدولەزید دەڵێ): بە عەمری كوڕی دینارم وت: ئەبو محەممەد: لە جابیری كوڕی عەبدوڵلاَت بیست بڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: (( (كەسانێك) بە شەفاعەت لە دۆزەخ دێنە دەرەوە؟)) وتی: بەڵێ (بیستوومە ئەوەی وتووە).**

٦٥٥٩- حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ بَعْدَ مَا مَسَّهُمْ مِنْهَا سَفْعٌ، فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، فَيُسَمِّيهِمْ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَهَنَّمِيِّينَ»[2].

**٦٥٥٩- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((كەسانێك لە ئاگری دۆزەخ دێنە دەرەوە پاش ئەوە گڕی ئاگرەكە لێیداون ڕەش هەڵگەڕان، ئینجا دەڕۆنە بەهەشتەوە و خەڵكی بەهەشت پێیان دەڵێن دۆزەخییەكان)) .**

٦٥٦٠- حَدَّثَنَا مُوسَى حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ «إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ يَقُولُ اللَّهُ

---

(١) سینی (الضَّغَابِيسُ) بەشین دەخوێندەوە.

(٢) بڕوانە: ٧٤٥٠.

مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرَجُونَ قَدِ امْتُحِشُوا وَعَادُوا حُمَماً، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الْحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ - أَوْ قَالَ - حَمِيَّةِ السَّيْلِ». وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلَمْ تَرَوْا أَنَّهَا تَنْبُتُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً»[1].

**٦٥٦٠- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((کاتێ بەهەشتیەکان ڕۆشتنە بەهەشتەوە، دۆزەخیەکانیش ڕۆشتنە دۆزەخەوە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەوەی بە ئەندازەی تۆوە خەرتەلەیەك ئیمان لە دڵی دایە لە دۆزەخ دەری بێنن، جا خەڵکانێك لە دۆزەخ دەردەهێنرێن کە ڕەش بوونەتەوە و بوون بە خەڵووز، ئینجا فڕێ دەدرێنە ڕووباری ژیانەوە (کە ئاوێکە هەر چی بخرێتە ناویەوە زیندووی دەکاتەوە)، ئەنجا لاشەیان درووست دەبێتەوە هەرچۆنێك تۆوێك لافاو هێناویەتی- یان فەرمووی: لەگەڵ لافاوی زۆر و بەهێزدا هاتووە- سەوز دەبێت))، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا نابینی چۆن دەڕوێ و زەرد دەبێ و کەروێشکە[2] دەکات؟.**

٦٥٦١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا إِسْحَاقَ قَالَ سَمِعْتُ النُّعْمَانَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَرَجُلٌ تُوضَعُ فِي أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَةٌ يَغْلِي مِنْهَا دِمَاغُهُ»[3].

**٦٥٦١-ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە نوعمانم بیست ﷺ وتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: ((بێگومان سوکترین سزای خەڵکی دۆزەخ لە ڕۆژی قیامەتدا سزای پیاوێکە پشکۆیەك خراوەتە سینگی پێیەکانی، مۆخی سەری پێیانەوە دەکوڵێت)).**

(١) بڕوانە: ٢٢.
(٢) با لێی دەدات و دەیجوڵێنێ و دیمەنێکی جوانی دەبێت.
(٣) بڕوانە: ٦٥٦٢.

٦٥٦٢- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَجَاءٍ حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ رَجُلٌ عَلَى أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَتَانِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ، كَمَا يَغْلِي الْمِرْجَلُ وَالْقُمْقُمُ [1]»[2].

**٦٥٦٢-نوعمان كوڕى بەشير ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بيست دەيفەرموو: ((بێگومان سووكترين سزاى خەڵكى دۆزەخ لە ڕۆژى قيامەتدا سزاى پياوێكە دوو بشكۆ لە سەر سنگى پێيەكانێتى، مۆخى پێيانەوە دەكوڵێ چۆن مەنجەڵ و حەوجۆشى سەر ئاگر دەكوڵێ)).**

٦٥٦٣- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَمْرٍو عَنْ خَيْثَمَةَ عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ذَكَرَ النَّارَ فَأَشَاحَ بِوَجْهِهِ فَتَعَوَّذَ مِنْهَا، ثُمَّ ذَكَرَ النَّارَ فَأَشَاحَ بِوَجْهِهِ فَتَعَوَّذَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[3].

**٦٥٦٣- عەديى كوڕى حاتيم ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ باسى دۆزەخى كرد و ڕووى وەرچەرخان و پەناى بەخوا گرت لێى، پاشان (جارێكى تر) باسى دۆزەخى كرد و ڕووى وەرچەرخان و پەناى بەخوا گرت لێى، لە پاشان فەرمووى: ((خۆتان لە دۆزەخ بپارێزن با بەلەتە خورمايەكيش بێت، جائەگەر كەسێك ئەوەشى نەبوو ئەوە با بەوتەيەكى جوان (خۆى بپارێزێ) )).**

٦٥٦٤- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ حَمْزَةَ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي حَازِمٍ وَالدَّرَاوَرْدِيُّ عَنْ يَزِيدَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَبَّابٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَذُكِرَ

---

(١) (الْمِرْجَلُ وَالْقُمْقُمُ): جياوازى هەيە لە نێوان (الْمِرْجَلُ) لەگەڵ (الْقُمْقُمُ)ـدا چونكە (الْمِرْجَلُ) واتە مەنجەڵ لە مس بێت يان لە غەيرى مس بێت، بەڵام (الْقُمْقُمُ) بەم مانايانە دێ: كۆزيە، قاپێكە مل باريكە لە مس ئاوى تيا گەرم دەكرێت، قاپى عەتار، گومگومە (فارسيە) واتە: گوڵاو پرژێن كە گوڵاو بەسەر ميواناندا پێ دەپرژێنرێت، إرشاد الساري: ٥٥٩/١٣، ئەلمونجيد بەكوردى: ١٩٠/٤.

(٢) بڕوانە: ٦٥٦١.

(٣) بڕوانە: ١٤١٣.

عِنْدَهُ عَمُّهُ أَبُو طَالِبٍ فَقَالَ «لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِى يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُجْعَلُ فِى ضَحْضَاحٍ مِنَ النَّارِ، يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ، يَغْلِى مِنْهُ أُمُّ دِمَاغِهِ»(١).

**٦٥٦٤- ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەو لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیست لە کاتێکدا لە خزمەتیدا باسی ئەبو تالیبی مامەی کرا، ئەویش فەرمووی: ((ئومێد وایە لە ڕۆژی دواییدا تکای من سوودی پێ بگەیەنێت و بخرێتە ئاگرێکی کەمەوە بگاتە قولە پێیەکانی، بەو ئاگرە مۆخی سەری بکوڵێت)).**

٦٥٦٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُونَ لَوِ اسْتَشْفَعْنَا عَلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا. فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ أَنْتَ الَّذِى خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، فَاشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّنَا. فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ وَيَقُولُ - ائْتُوا نُوحاً أَوَّلَ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ. فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ - ائْتُوا إِبْرَاهِيمَ الَّذِى اتَّخَذَهُ اللَّهُ خَلِيلاً. فَيَأْتُونَهُ، فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ - ائْتُوا مُوسَى الَّذِى كَلَّمَهُ اللَّهُ فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ، فَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ - ائْتُوا عِيسَى فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ، ائْتُوا مُحَمَّداً ﷺ فَقَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ فَيَأْتُونِى فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّى، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِداً، فَيَدَعُنِى مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ يُقَالُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَرْفَعُ رَأْسِى، فَأَحْمَدُ رَبِّى بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِى، ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِى حَدًّا، ثُمَّ أُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ، وَأُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ أَعُودُ فَأَقَعُ سَاجِداً مِثْلَهُ فِى الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ حَتَّى مَا بَقِىَ فِى النَّارِ إِلاَّ مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ». وَكَانَ قَتَادَةُ يَقُولُ عِنْدَ هَذَا أَىْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْخُلُودُ(٢).

**٦٥٦٥-ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی کۆدەکاتەوە، ئینجا خەڵکەکە دەڵێن: خۆزگە داوای یارمەتی و**

(١) بڕوانە: ٣٨٨٥.

(٢) بڕوانە: ٤٤.

هاوکاریمان له پەروەردگارمان بکردایه [1] تا ڕزگارمان بکات لەم جێگایەی تیایداین، جا دەچن بۆ لای ئادەم ﷺ و پێی دەڵێن: تۆ ئەو کەسەی خودا بەدەستی خۆی دروستی کردی، وە له ڕووحی خۆی گیانی کرد بەبەرتدا، وە فەرمانی کرد به فریشتەکان و سوژدەیان بۆ بردی، دەی لای پەروەردگارمان تکامان بۆ بکە، ئادەمیش دەڵێ: من لەو ئاستەدا نیم ئێوە گومانم پێ دەبەن، ئنجا باسی تاوانەکەی خۆی دەکات و دەڵێ بڕۆن بۆ لای نووح ﷺ که یەکەم پێغەمبەرە خوا ناردبێتی، ئەوانیش دەڕۆن بۆ لای نووح ﷺ ئەویش دەڵێ: من لەو ئاست و پلەیە دانیم ئێوە گومانم پێ دەبەن، ئەوسا باسی تاوانەکەی خۆی دەکات. (دەڵێ) بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم ﷺ که خودا کردوویەتی به دۆست و خۆشەویستی خۆی، ئەوانیش دەچن بۆ لای، ئەویش دەڵێ: من لەو ئاست و پلەیەدا دانیم ئێوە بۆم دەڕوانن، وە باسی تاوانەکەی خۆی دەکات، دەڵێ: بڕۆن بۆلای مووسا ﷺ که خودا (ڕاستەوخۆی) قسەی لەگەڵدا کردوە، ئەوانیش دەڕۆن بۆ لای مووسا ﷺ، ئەویش دەڵێ: من لەو پله و ئاستەدا نیم ئێوە گومانم پێ دەبەن، ئینجا باسی تاوانەکەی خۆی دەکات (دەڵێ) بڕۆن بۆلای عیسا ﷺ، ئەوانیش دەڕۆن بۆ لای ئەویش دەڵێ: من لەو پله و ئاستەدا نیم ئێوە گومانم پێ دەبەن، (دەڵێ) بڕۆن بۆ لای موحەممەد ﷺ بەڕاستی خوا له گوناهی ڕابردوو و داهاتووی خۆش بووە، ئیتر ئەوانیش دێن بۆ لای من، منیش مۆڵەت له پەروەردگارم دەخوازم، جا که پەروەردگارم بینی دەکەوم به ڕوودا بەسوژدە بردنەوە، جا (له سوژدەدا) وازم لێ دێنێ ئەوەندەی خوا حەز بکات، پاشان دەوترێت: سەرت بەرزکەرەوە، داوا بکە پێت دەدرێت، قسە بکە دەبیسترێت و تکا بکە تکات وەردەگیرێ، منیش سەرم بەرزدەکەمەوە و ستایشی پەروەردگارم دەکەم بەستایشێك خوا فێرم دەکات، له پاشان تکا دەکەم جا سنورێکم بۆ دیاری

(١) بەم جۆرەش مانا بکرێت ڕاستە: ئەگەر کەسێکمان بکردایە بە تکاکار لای پەروەردگارمان.

دەكرێ، لە پاشان لە ئاگر دەریان دەهێنم و دەیانخەمە بەهەشتەوە، پاشان دەگەڕێمەوە دەڕۆم بۆ سوژدە وەك جاری یەكەم لە سێیەم جاردا -یان لە چوارەم جاردا- هەتا (دەڵێم پەروەردگارم): كەس نەماوە لە دۆزەخدا جگە لەوانەی بەفەرمانی قورئان ماونەتەوە لە دۆزەخدا)).

وە قەتادە دەڵێ: لە كاتی ئەم بڕگەیەدا (بەفەرمانی قورئان ماوەتەوە)، واتە مانەوەی هەتا هەتایی لەسەر نووسراوە.

٦٥٦٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنِ الْحَسَنِ بْنِ ذَكْوَانَ حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ ﷺ فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، يُسَمَّوْنَ الْجَهَنَّمِيِّينَ».

**٦٥٦٦- عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ((كەسانێك بە تكای موحەممەد ﷺ لە ئاگری دۆزەخ دێنە دەرەوە و دەچنە بەهەشتەوە، پێیان دەوترێت[1] دۆزەخیەكان)).**

٦٥٦٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ عَنْ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أُمَّ حَارِثَةَ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ هَلَكَ حَارِثَةُ يَوْمَ بَدْرٍ، أَصَابَهُ غَرْبُ سَهْمٍ. فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ عَلِمْتَ مَوْقِعَ حَارِثَةَ مِنْ قَلْبِي، فَإِنْ كَانَ فِي الْجَنَّةِ لَمْ أَبْكِ عَلَيْهِ، وَإِلاَّ سَوْفَ تَرَى مَا أَصْنَعُ. فَقَالَ لَهَا «هَبِلْتِ، أَجَنَّةٌ وَاحِدَةٌ هِيَ إِنَّهَا جِنَانٌ كَثِيرَةٌ، وَإِنَّهُ فِي الْفِرْدَوْسِ الأَعْلَى»[2].

**٦٥٦٧- حومەید دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ كە ئوممو حاریسە هات بۆ خزمەتی پیغەمبەری خوا ﷺ لە كاتێكدا حاریسە لە ڕۆژی غەزای بەدردا**

(١) ناودەبرێت.

(٢) بروانە: ٢٨٠٩.

تیاچوو و مرد، تیرێكی وێڵی بەركەوتبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان خۆت دەزانی حاریسە پلە و خۆشەویستی چەندە لە دڵمدا، جا ئەگەر لە بەهەشتدا بێت ئەوە ناگریم بۆی، ئەگەر نا لەمەولا دەبینی چی دەكەم[1]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((شێت بووی (بە مردنی كوڕەكەت) وا دەزانی یەك بەهەشتە؟ بێگومان چەند بەهەشتێكی زۆرە، وە دڵنیابە كوڕەكەت ئەوەتا لە بەهەشتی فیردەوسدا)).

٦٥٦٨ - وَقَالَ «غَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَلَقَابُ قَوْسِ أَحَدِكُمْ أَوْ مَوْضِعُ قَدَمٍ مِنَ الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَلَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى الأَرْضِ، لأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا، وَلَمَلأَتْ مَا بَيْنَهُمَا رِيحاً، وَلَنَصِيفُهَا - يَعْنِي الْخِمَارَ - خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[2].

٦٥٦٨- ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمووێ: ((تاقی ئێوارەیەك جیهاد لە ڕێی خوادا یان تاقی بەیانیەك لە دونیا و هەموو ئەوەی تێیدایە چاكترە، وە بەئەندازەی كەوانێك كەسێكتان لە بەهەشتدا یان بەقەدەر شوێنی پێیەك لە دونیادا هەموو ئەوەی تێیدایە چاكترە، وە ئەگەر ئافرەتێك لە ئافرەتانی بەهەشت[3] خۆی نیشانی زەوی بدات، بێگومان نێوانی ئاسمان و زەوی ڕووناك دەكردەوە و نێوانیانی پڕی دەكرد لە بۆنی خۆش، وە سەرپۆشەكەی- واتە لەچكەكەی - بەسەریەوەیە لە دونیا و هەرچی تیایەتی چاكترە)).

---

(١) لە گریان و شین و زاری بۆی.

(٢) بڕوانە: ٢٧٩٢.

(٣) لەو ئافرەتانەی ئامادەكراوە بۆ پیاوە بەهەشتیەكان كاتێ دەچنە بەهەشتەوە.

٦٥٦٩- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لاَ يَدْخُلُ أَحَدٌ الْجَنَّةَ إِلاَّ أُرِىَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، لَوْ أَسَاءَ، لِيَزْدَادَ شُكْراً، وَلاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ إِلاَّ أُرِىَ مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، لَوْ أَحْسَنَ، لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً».

**٦٥٦٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هیچ كەسێك ناڕواتە بەهەشتەوە تا جێگاكەی نیشان نەدرێت لە ئاگری دۆزەخ، ئەگەر تاوانی بكردایە، بۆ ئەوەی زیاتر سوپاسی خوا بكات، هەر كەسیش بڕواتە ئاگری دۆزەخەوە جێگاكەی نیشان دەدرێت لە بەهەشتدا، ئەگەر چاكەی بكردایە بۆ ئەوەی ببێتە داخ و پەژارە لە دڵیدا)).**

٦٥٧٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ عَنْ عَمْرٍو عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَقَالَ «لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لاَ يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. خَالِصاً مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ»[1].

**٦٥٧٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كێ بەختەوەرترین كەسە بە تكا و شەفاعەتی تۆ لە ڕۆژی دواییدا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی خۆشم گومانم وابوو ئەی ئەبو هورەیرە كە كەس پێش تۆ ئەو پرسیارەم لێ ناكات، لەبەر ئەوەی دەزانم تۆ زۆر سووری لەسەر (زانینی) فەرموودەكانم، بەختەوەرترین كەس بە (بەركەوتنی) شەفاعەتی من لە ڕۆژی دواییدا ئەو كەسەیە بەدڵێكی پاك و ساف بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) واتە: هیچ پەرستراوێكی ڕاست نییە جگە لە خوا)).**

(١) بڕوانە: ٩٩.

٦٥٧١- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ عَبِيدَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجاً مِنْهَا، وَآخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ كَبْواً، فَيَقُولُ اللَّهُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ. فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى، فَيَقُولُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ. فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى. فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى، فَيَقُولُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ، فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا وَعَشَرَةَ أَمْثَالِهَا. أَوْ إِنَّ لَكَ مِثْلَ عَشَرَةِ أَمْثَالِ الدُّنْيَا. فَيَقُولُ تَسْخَرُ مِنِّي، أَوْ تَضْحَكُ مِنِّي وَأَنْتَ الْمَلِكُ؟!». فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، وَكَانَ يُقَالُ ذَلِكَ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلَةً[1].

**٦٥٧١ -عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێگومان من دەزانم كێیە دواین كەس لە دۆزەخیەكان دێتە دەرەوە لە دۆزەخ و دواین كەس لە بەهەشتیەكان كە دەڕواتە بەهەشتەوە، پیاوێكە بە گاڵۆڵكێ لە دۆزەخ دێتە دەرەوە، خوای گەورەش پێی دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشتەوە، ئەویش دەڕوات وا دەزانێ بەهەشت پڕ پڕە بۆیە دەگەڕێتە و دەڵێ: ئەی پەروەردگار بینیم پڕێتی لە خەڵك، خواش دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشتەوە، ئەمجارەش دەڕوا و دەڵێ پڕە خەڵك، بۆیە دەگەڕێتەوە و دەڵێ: ئەی پەروەردگار بینیم پڕێتی لە خەڵك، ئەوسا خوداش دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشتەوە، وە دڵنیابە بەقەدەر دونیا و دە ئەوەندەی دونیاش بۆ تۆ بێت -یان بێگومان دە ئەوەندەی دونیا بۆ تۆ بێ - پیاوەكە دەڵێ: گاڵتەم پێ دەكەیت- یان پێم پێدەكەنی — لە كاتێكدا تۆ پادشا و دەسەڵات داری؟)).**

**(عەبدوڵلا دەڵێ) جا سوێند بەخوا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پێكەنی هەتا ددانەكانی پێشەوەی دەركەوتن، وە دەوترا ((ئەو كەسە نزمترین پلەی هەیە لە ناو بەهەشتیەكاندا)).**

---

(١) بڕوانە: ٧٥١١.

٦٥٧٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ عَنِ الْعَبَّاسِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ هَلْ نَفَعْتَ أَبَا طَالِبٍ بِشَيْءٍ؟[1].

**٦٥٧٢- عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد، ئایا بە هیچ شتێك سوودت گەیاند بە ئەبو تالیب؟ [2].**

## ٥٢- بابٌ: الصِّرَاطُ جِسْرُ جَهَنَّمَ

٦٥٧٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ أَخْبَرَنِي سَعِيدٌ وَعَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَحَدَّثَنِي مَحْمُودٌ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ أُنَاسٌ يَا رَسُولَ اللهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَقَالَ «هَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ، لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ». قَالُوا لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ «هَلْ تُضَارُّونَ فِي الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ». قَالُوا لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ «فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ، يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ فَيَقُولُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئاً فَلْيَتَّبِعْهُ، فَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ، وَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ، وَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هَذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي غَيْرِ الصُّورَةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا أَتَانَا رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي الصُّورَةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ أَنْتَ رَبُّنَا، فَيَتْبَعُونَهُ وَيُضْرَبُ جِسْرُ جَهَنَّمَ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُ، وَدُعَاءُ الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، وَبِهِ كَلاَلِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، أَمَا رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ». قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ «فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهَا لاَ يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلاَّ اللَّهُ، فَتَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، مِنْهُمُ الْمُوبَقُ، بِعَمَلِهِ وَمِنْهُمُ الْمُخَرْدَلُ، ثُمَّ يَنْجُو، حَتَّى إِذَا

(١) بڕوانە: ٣٨٨٣.

(٢) وەڵامەکەی باس نەکردوە لە (كِتابُ الأَدَبِ) بە فەرموودەی ژمارە: (٣٨٨٣) باس کراوە و وەڵامی داوەتەوە.

فَرَغَ اللَّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ عِبَادِهِ، وَأَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ مِنَ النَّارِ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ، مِمَّنْ كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوهُمْ، فَيَعْرِفُونَهُمْ بِعَلاَمَةِ آثَارِ السُّجُودِ، وَحَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ مِنِ ابْنِ آدَمَ أَثَرَ السُّجُودِ، فَيُخْرِجُونَهُمْ قَدِ امْتُحِشُوا، فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءٌ يُقَالُ لَهُ مَاءُ الْحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الْحِبَّةِ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ، وَيَبْقَى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّارِ فَيَقُولُ يَا رَبِّ قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا، فَاصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو اللَّهَ. فَيَقُولُ لَعَلَّكَ إِنْ أَعْطَيْتُكَ أَنْ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ. فَيَقُولُ لاَ وَعِزَّتِكَ لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ. فَيَصْرِفُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ، ثُمَّ يَقُولُ بَعْدَ ذَلِكَ يَا رَبِّ قَرِّبْنِي إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ. فَيَقُولُ أَلَيْسَ قَدْ زَعَمْتَ أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، وَيْلَكَ ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ. فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو. فَيَقُولُ لَعَلِّي إِنْ أَعْطَيْتُكَ ذَلِكَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ. فَيَقُولُ لاَ وَعِزَّتِكَ لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ. فَيُعْطِي اللَّهَ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهُ، فَيُقَرِّبُهُ إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا رَأَى مَا فِيهَا سَكَتَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ، ثُمَّ يَقُولُ رَبِّ أَدْخِلْنِي الْجَنَّةَ. ثُمَّ يَقُولُ أَوَلَيْسَ قَدْ زَعَمْتَ أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ فَيَقُولُ يَا رَبِّ لاَ تَجْعَلْنِي أَشْقَى خَلْقِكَ. فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو حَتَّى يَضْحَكَ، فَإِذَا ضَحِكَ مِنْهُ أَذِنَ لَهُ بِالدُّخُولِ فِيهَا، فَإِذَا دَخَلَ فِيهَا قِيلَ تَمَنَّ مِنْ كَذَا. فَيَتَمَنَّى، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ تَمَنَّ مِنْ كَذَا. فَيَتَمَنَّى حَتَّى تَنْقَطِعَ بِهِ الأَمَانِيُّ فَيَقُولُ لَهُ هَذَا لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ وَذَلِكَ الرَّجُلُ آخِرُ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً(١).

## ٥٢- باسێک: (صراط) پردێکە بەسەر دۆزەخەوەیە

**٦٥٧٣-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کەسانێك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگارمان دەبینین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئایا لە بینینی خۆردا (لە ڕۆژێکدا) هەور بەری نەگرتبێت یەکتری سەغڵەت دەکەن؟)) وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((ئایا لە بینینی مانگی چواردەدا یەکتری سەغڵەت دەکەن؟)) وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ،**

---

(١) بڕوانە: ٨٠٦.

فەرمووی: ((دەی دڵنیابن ئێوەش ئاوها لە ڕۆژی قیامەتدا خودا دەبینن، خودا هەموو خەڵك كۆدەكاتەوە دەفەرمووێ: هەر کەس شتێکی پەرستووە با شوێنی بکەوێت، ئینجا هەر کەس خۆری پەرستووە شوێن خۆر دەکەوێ، هەر کەس مانگی پەرستووە شوێن مانگ دەکەوێ، هەر کەسیش ملهوڕانی پەرستووە شوێن ملهوڕان دەکەوێ، ئەم ئوممەتە دەمێنێتەوە دوو ڕووەکانیشی تێدایە، ئینجا خوای گەورە لە شێوەیەکدا کە نایناسنەوە خۆیان نیشان دەدات و دەفەرمووێ: منی پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: پەنا دەگرین بە خودا لە تۆ، ئەمە شوێنمانە هەتا پەروەردگارمان دێ بۆ لامان، ئینجا ئەگەر پەروەردگارمان هات بۆ لامان دەیناسین، ئەوسا خودا لەو شێوەدا دەیناسنەوە دێت بۆ لایان و دەفەرمووێت منی پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: تۆ پەروەردگارمانی ئەوسا شوێنی دەکەون، ئینجا پردی دۆزەخ دادەنرێت))، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((جا من یەکەم کەسم کە لێی دەپەڕمەوە دوعای پێغەمبەرانیش ﷺ لەو ڕۆژەدا (ئەمەی): خوایە سەلامەتمان بکە خوایە سەلامەتمان بکە، پردەکەش قولاپی پێوەیە دەڵێ دڕکی سەعدانە، ئایا دڕکی سەعدانتان بینیوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((بێگومان ئەو قولاپانە وەکو دڕکی سەعدان وایە، بەڵام لە ڕاستیدا کەس ئەندازەی گەورەییەکەی نازانێت جگە لە خودا، ئینجا بە پێی کردەوەکانیان خەڵکەکە دەڕفێنێت [١]، هەیانە بەهۆی کردەوەکانیانەوە تیا دەچێت، بریندار دەکرێ و سزا دەدرێت[٢] و پاشان ڕزگاری دەبێت، هەتا کاتێ لە دادگایی نێوان بەندەکانی دەبێتەوە، دەیەوێ ئەوەی خۆی مەبەستێتی لە ئاگری دۆزەخ دەری بێنێ، لەوانەی لە دونیادا شایەتیان داوە کە

---

(١) بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.
(٢) (المُخَرذَل) واتە موسڵمانی تاوانبار، فێ لێ هاتوو یان وردی دەکات دەیخاتە دۆزەخەوە، وە بە (المجردَل) یش هاتووە، بەمانای ئەوەی خەریکە بکەوێتە دۆزەخەوە.

هیچ بەرەستراوێکی ڕاست نییە جگەلە خوا، فەرمان دەکات بە فریشتەکانی دەریان بێنن، جا نیشانەی شوێنەواری سوژدەیاندا دەیان ناسننەوە، وە خوا حەرامی کردوە لەسەر ئاگری دۆزەخ کە شوێنەواری سوژدە لە لاشەی ئادەمیزاد بسوتێنێ، ئینجا دەریان دەهێنن (لە دۆزەخ)، لە کاتێکدا سوتاوون و بونەتە خەڵوز، ئینجا ئاوێکیان پیا دەکەن، پێی دەوترێت:ئاوی ژیان، ئەوسا سەوز دەبنەوە [1] هەر وەك تۆوێك لافاو هێنابێتی (لە قەراغی شیوەکەدا) سەوز بوو بێت، (لە کۆتایی دادگایی بەندەکاندا) پیاوێك دەمێنێتەوە ڕووی لە ئاگری دۆزەخە، ئینجا دەڵێ: ئەی پەرەوەردگارم گەرمییەکە ئازاری داوم بڵێسەکەش سووتاندومی، کەواتە ڕووم لە ئاگری دۆزەخ وەرگێرە، ئیتر بەردەوام دەپاڕێتەوە لە خوا، خواش دەفەرموێ: لەوانەیە ئەو داوایەت پێ بدەم داوای ترم لێ بکەیت، ئەویش دەڵێ: نە بەعیزەتی تۆ سوێندبێ داوای ترت لێ ناکەم، ئینجا ڕووی لە ئاگری دۆزەخ وەردەچەرخێنێ، لە پاشان دوا ئەوە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم نزیکم کەرەوە لە دەرگای بەهەشت، خواش دەفەرموێ: ئایا تۆ نەتوت کە داوای ترم لێ ناکەیت؟ هاوار بۆ تۆ نەوەی ئادەم چەند ستەمکاریت. ئیتر بەردەوام دەپاڕێتەوە، جا خوا دەفەرمووێ: لەوانەیە ئەگەر ئەوەشت پێ بدەم داوای ترم لێ بکەیت، ئەویش دەڵێ: نە بەگەورەیی تۆ سوێندبێ داوای ترت لێ ناکەم، ئەویش هەرچی بەڵێن و پەیمانە دەیدات بە خوا کە داوای هیچی تر نەکات، خواش نزیکی دەخاتەوە لە دەرگای بەهەشت، ئینجا ئەوەی بینی لە بەهەشت دایە ئەوەندەی خوا حەز بکات بێدەنگ دەبێت، لە پاشان دەڵێ: پەروەردگارم بمخەرە بەهەشتەوە، پاشان خوا دەفەرموێ: ئایا تۆ نەتوت داوای هیچ ترت لێ ناکەم؟ هاوار بۆ تۆ ئەی نەوەی ئادەم چەند ستەمکاریت، ئەویش دەڵێ: ئەی

---

(١) لاشەیان گۆشت دێنێتەوە و چاک دەبنەوە.

پەروەردگارم مەمکەرە بەدبەخترین دروستکراوت، ئیتر بەردەوام دەپاڕێتەوە هەتا خوا پێدەکەنێت[1]، کە پێی پێکەنی ڕێگەی دەدات بڕواتە بەهەشتەوە، ئینجا کە چووە ژوورەوە، پێی دەوترێت ئاواتی ئەو جۆرە شتانە بخوازە، ئەویش ئاوات دەخوازێ، پاشان پێی دەوترێت، ئاواتی ئەو جۆرە شتانە بخوازە، ئەویش ئاواتیان پێ دەخوازێ هەتا ئاواتەکانی تەواو دەبن و کۆتاییان دێت، ئینجا خوا دەفەرمووێ پێی: ئەوە بۆ تۆ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت)).

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: ئەو پیاوە دواهەمین کەسە دەچێتە بەهەشتەوە.

٦٥٧٤ - قَالَ وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ جَالِسٌ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ، لاَ يُغَيِّرُ عَلَيْهِ شَيْئاً مِنْ حَدِيثِهِ حَتَّى انْتَهَى إِلَى قَوْلِهِ «هَذَا لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ «هَذَا لَكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ حَفِظْتُ «مِثْلُهُ مَعَهُ»[2].

٦٥٧٤- (عەتای کوڕی یەزید) دەڵێ: ئەبو سەعیدی خودری دانیشتبوو لەگەڵ ئەبو هوڕەیرەدا ﷺ هیچ ڕەخنەیەکی لە گێڕانەوەکەی ئەبو هوڕەیرە نەبوو، هەتا گەشتە ئەم بەشەی فەرموودەکە: ((ئەوە بۆ تۆ ئەوەندەی تریش لەگەڵدا بێت))، ئەبو سەعید وتی: لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئەوە بۆ تۆ دە ئەوەندەی تریش))، ئەبو هوڕەیرە وتی:من بە (ئەوەندەی تریش) لەبەرم کردوە (لە پێغەمبەرەوە ﷺ).

---

(١) باوەڕمان پێیەتی بەو شێوەی شایستەی خوا بێت.

(٢) بڕوانە: ٢٢.

## ٥٣- بابٌ: فِي الحَوْضِ وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١﴾ الكوثر، وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زيدٍ ﷺ : قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "اصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الحَوْضِ"[1].

٦٥٧٥- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ سُلَيْمَانَ عَنْ شَقِيقٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ»[2].

## ٥٣- باسێک: دەربارەی حەوز[3]. وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بێگومان ئێمە شتێکی زۆر گەورە و بەفەڕە (کە ڕووباری کەوسەرە) بەخشیمان بە تۆ)، عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ((ئارام بگرن[4] هەتا لەسەر حەوزەکە[5] بە من دەگەن))

**٦٥٧٥-شەقیق لە عەبدوڵڵاوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((بێگومان من پێشکەوتەی ئێوەم بۆ سەر حەوزەکە)).**

٦٥٧٦ - وَحَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنِ الْمُغِيرَةِ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، وَلَيُرْفَعَنَّ رِجَالٌ مِنْكُمْ ثُمَّ لَيُخْتَلَجُنَّ دُونِي فَأَقُولُ يَا رَبِّ أَصْحَابِي. فَيُقَالُ إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ». تَابَعَهُ عَاصِمٌ عَنْ أَبِي وَائِلٍ. وَقَالَ حُصَيْنٌ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ حُذَيْفَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

**٦٥٧٦-عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە**

---

(١) بڕوانە: ٤٣٣٠.

(٢) بڕوانە: ٦٥٧٦، ٧٠٤٩.

(٣) حەوزێکە تایبەتە بە پێغەمبەرمان ﷺ لە ڕۆژی دواییدا.

(٤) لەسەر خۆ خۆی کە دوای من پەیدا دەبێت.

(٥) حەوزی کەوسەر چونکە لە ڕووباری کەوسەرەوە ئاوی بۆ دێت.

**ڕاستیدا من پێشکەوتەی ئێوەم لەسەر حەوزەکە، وە بێگومان پیاوانێك لە ئێوە نیشانی من دەدرێن، پاشان (لە حەوزەکە) لا دەدرێن و لە من دوور دەخرێنەوە، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵانی[٢] منن؟ دەوترێت پێم: بێگومان تۆ نازانیت پاش تۆ ئەوان چییان داهێناوە و کردوە)).**

**-عاصیم لە ئەبی وائیلەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئەعمەش کردوە.**

**-حوصەین لە ئەبی وائیلەوە دەگێڕێتەوە و ئەویش لە حوزەیفەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

٦٥٧٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ حَدَّثَنِى نَافِعٌ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِىِّ ﷺ قَالَ «أَمَامَكُمْ حَوْضٌ كَمَا بَيْنَ جَرْبَاءَ وَأَذْرُحَ».

**٦٥٧٧-ئیبنو عومەر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((حەوزەکە (ی من) لە پێشتانەوەیە وەکو نێوان جەربا و ئەزروحە[٣])).**

٦٥٧٨- حَدَّثَنِى عَمْرُو بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ أَخْبَرَنَا أَبُو بِشْرٍ وَعَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ الْكَوْثَرُ الْخَيْرُ الْكَثِيرُ الَّذِى أَعْطَاهُ اللَّهُ إِيَّاهُ. قَالَ أَبُو بِشْرٍ قُلْتُ لِسَعِيدٍ إِنَّ أُنَاساً يَزْعُمُونَ أَنَّهُ نَهَرٌ فِى الْجَنَّةِ. فَقَالَ سَعِيدٌ النَّهَرُ الَّذِى فِى الْجَنَّةِ مِنَ الْخَيْرِ الَّذِى أَعْطَاهُ اللَّهُ إِيَّاهُ[٤].

**٦٥٧٨- ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: کەوسەر ئەو خێر و چاکە زۆرەیە خوا داویەتی بە پێغەمبەر ﷺ.**

---

(١) بڕوانە: ٦٥٧٥.

(٢) مەبەستی لە ئوممەتی ئەو نەک هاوەڵانی سەردەمی خۆی، چونکە ئیبنو حەجەر دەڵێ، کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پاشگەز نەبۆتەوە لە پاش خۆی.

(٣) جیاوازیەکی زۆر باس دەکرێ لەسەر مانای مەبەستی ئەم فەرموودەیە، چونکە لە چەند فەرموودەی تردا هەمان مەبەست باسکراوە جیاوازیشیان هەیە. بڕوانە: (فتح الباري: ١٤/ ٥٧٣ - ٥٧٤) و (إرشاد الساري: ١٣/ ٥٨٠).

(٤) بڕوانە: ٤٩٦٦.

**ئەبو بیشر دەڵێ: بە سەعیدم وت: بێگومان کەسانێك لایان وایە کەوسەر ڕووبارێکە لە بەهەشتدا، سەعیدیش وتی: ئەو ڕووبارەی لە بەهەشت دایە یەکێکە لەو چاکانەی کە خوا داوێتی بە پێغەمبەر ﷺ.**

٦٥٧٩- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ حَدَّثَنَا نَافِعُ بْنُ عُمَرَ عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «حَوْضِى مَسِيرَةُ شَهْرٍ، مَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ اللَّبَنِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهَا فَلاَ يَظْمَأُ أَبَداً».

**٦٥٧٩-عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((حەوزەکەی من[1] مانگە ڕێیەکە (لەگەورەییدا)، ئاوەکەی لە شیر سپیترە، بۆنی لە بۆنی میسك خۆشترە، گۆزەڵە و جامۆڵکەکانی وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان وان[2] هەرکەس لێی[3] بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت)).**

٦٥٨٠- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ حَدَّثَنِى ابْنُ وَهْبٍ عَنْ يُونُسَ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ حَدَّثَنِى أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «إِنَّ قَدْرَ حَوْضِى كَمَا بَيْنَ أَيْلَةَ وَصَنْعَاءَ مِنَ الْيَمَنِ، وَإِنَّ فِيهِ مِنَ الأَبَارِيقِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ».

**٦٥٨٠-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان ئەندازەی حەوزەکەی من (لە بەهەشتدا) وەکو ئەندازەی نێوان ئەیلە و صەنعایە لەیەمەن، وە لە ڕاستیدا بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان سوراحی و پەرداخی لەسەرە)).**

---

(١) لە بەهەشتدا.

(٢) لە بریقە و ژمارەیاندا.

(٣) لەو حەوەزە یان لەو گۆزەڵانەدا ئاو بخواتەوە.

٦٥٨١- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَحَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «بَيْنَمَا أَنَا أَسِيرُ فِي الْجَنَّةِ إِذَا أَنَا بِنَهَرٍ حَافَتَاهُ قِبَابُ الدُّرِّ الْمُجَوَّفِ قُلْتُ مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ قَالَ هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِى أَعْطَاكَ رَبُّكَ. فَإِذَا طِينُهُ - أَوْ طِيبُهُ - مِسْكٌ أَذْفَرُ». شَكَّ هُدْبَةُ[1].

**٦٥٨١-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لە کاتێکدا من لە بەهەشتدا دەڕۆشتم لەوکاتەدا ڕووبارێکم بینی قەراغ و تەنیشتەکانی لە مرواری ناو بۆش بوو، وتم: ئەمە چییە جیبریل ﷺ؟ فەرمووی: ئەمە ئەو ڕووباری کەوسەرەیە کە پەروەردگارت پێی بەخشیوویت، جا دەبینم قوڕەکەی-یان بۆنە خۆشەکەی-میسکێکی زۆر بۆن خۆشە))، گومان بردنەکە [2] لە هودبەوەیە.**

٦٥٨٢- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «لَيَرِدَنَّ عَلَيَّ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِي الْحَوْضَ، حَتَّى عَرَفْتُهُمُ اخْتُلِجُوا دُونِي، فَأَقُولُ أَصْحَابِي. فَيَقُولُ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ»

**٦٥٨٢-ئەنەس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((کەسانێك لە هاوڕێیانم دێن بۆ لام لە لای حەوزەکەدا (نزیك دەبنەوە)، تا دەیانناسم (بەزۆر) دوور دەخرێنەوە لە من، منیش دەڵێم: ئەوانە هاوڕێی منن، دەوترێت: تۆ نازانی لە پاش تۆ ئەوان چییان داهێناوە)).**

٦٥٨٣- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُطَرِّفٍ حَدَّثَنِى أَبُو حَازِمٍ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «إِنِّي فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، مَنْ مَرَّ عَلَيَّ شَرِبَ، وَمَنْ شَرِبَ لَمْ

---

(١) بڕوانە: ٣٥٧٠.

(٢) لە نێوان: (طينة) و (طيبُهُ) قوڕەکەی یان بۆ نەخۆشەکەی.

يَظْمَأُ أَبَداً، لَيَرِدَنَّ عَلَيَّ أَقْوَامٌ أَعْرِفُهُمْ وَيَعْرِفُونِي، ثُمَّ يُحَالُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ»[1].

**٦٥٨٣-سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من پێشەنگی ئێوەم لەسەر حەوزەکە، هەر کەسێك بەلامدا بڕوات لێی دەخواتەوە، هەر کەسیش لێی خواردەوە هەرگیز تینووی نابێت، لە ڕاستیدا کەسانێك دێن بۆ لام من ئەوان دەناسم و ئەوانیش من دەناسن، لە پاشان من و ئەوان لەیەکتری جیا دەکرێینەوە)).**

٦٥٨٤ - قَالَ أَبُو حَازِمٍ فَسَمِعَنِى النُّعْمَانُ بْنُ أَبِي عَيَّاشٍ فَقَالَ هَكَذَا سَمِعْتَ مِنْ سَهْلٍ؟ فَقُلْتُ نَعَمْ. فَقَالَ أَشْهَدُ عَلَى أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ لَسَمِعْتُهُ وَهْوَ يَزِيدُ فِيهَا «فَأَقُولُ إِنَّهُمْ مِنِّى. فَيُقَالُ إِنَّكَ لاَ تَدْرِى مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ. فَأَقُولُ سُحْقاً سُحْقاً لِمَنْ غَيَّرَ بَعْدِى». وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ سُحْقاً بُعْداً، يُقَالُ سَحِيقٌ بَعِيدٌ، وَأَسْحَقَهُ أَبْعَدَهُ[2].

**٦٥٨٤-ئەبو حازیم دەڵێ: نوعمانی کوڕی ئەبی عەییاش (ئەم فەرموودەی) لە من بیست وتی: تۆ ئا بەم جۆرە لە سەهلت بیستووە؟ منیش وتم: بەڵێ، جا (ئەبو عەییاش) وتی: شایەتی دەدەم لەسەر ئەبی سەعد کە لێم بیست و ئەمەی لە فەرموودەکە زیاد کرد: (پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ): ((جا منیش دەڵێم: بێگومان ئەوانە لە (ئوممەتی) منن، ئینجا دەوترێت: تۆ نازانیت لە پاش تۆ چییان داهێناوە، منیش دەڵێم: دووربن دووربن ئەوانەی پاش من ئایینیان گۆڕی )).**
**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (سُحْقاً): دووربن، دەوترێت: (سَحِيقٌ) واتە: دوور (أَسْحَقَهُ): دووری خستەوە.**

٦٥٨٥ - وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبِ بْنِ سَعِيدٍ الْحَبَطِيُّ حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ يُونُسَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «يَرِدُ عَلَيَّ

---

(١) بڕوانە: ٧٠٥٠.
(٢) بڕوانە: ٧٠٥١.

يَوْمَ الْقِيَامَةِ رَهْطٌ مِنْ أَصْحَابِي فَيُحَلَّئُونَ عَنِ الْحَوْضِ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أَصْحَابِي. فَيَقُولُ إِنَّكَ لاَ عِلْمَ لَكَ بِمَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى»[1].

**٦٥٨٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵێ لە هاوەڵانم دێنە لام، بەڵام دەردەکرێن لە (هاتن بۆ سەر) حەوزەکە، منیش دەڵێم: پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵانی من، خوداش دەفەرموێ: بێگومان تۆ زانیاریت نییە کە ئەوانە لە پاش تۆ چییان داهێناوە (لە ئیسلامدا)، بێگومان ئەوانە پاشگەز بوونەتەوە پاشە و پاش گەڕاونەتەوە (لە ئیسلام) )).**

٦٥٨٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ أَخْبَرَنِي يُونُسُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ عَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ «يَرِدُ عَلَى الْحَوْضِ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِي فَيُحَلَّئُونَ عَنْهُ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أَصْحَابِي. فَيَقُولُ إِنَّكَ لاَ عِلْمَ لَكَ بِمَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى»[2].

وَقَالَ شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَيُجْلَوْنَ. وَقَالَ عُقَيْلٌ فَيُحَلَّئُونَ. وَقَالَ الزُّبَيْدِيُّ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦٥٨٦- ئیبنو شیهاب لە ئیبنو موسەییەبەوە گێڕایەوە کە ئەویش لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوانێك لە هاوەڵانم دێن بۆ لای حەوزەکەم، بەڵام دەردەکرێن لە (هاتن بۆ سەر) حەوزەکە، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئەوانە هاوەڵانی منن، خوداش دەفەرموێ: بەراستی تۆ زانیاریت نییە کە ئەوانە لە پاش تۆ**

(١) بروانە: ٦٥٨٦.

(٢) بروانە: ٦٥٨٥.

**چییان داهێناوە (لە ئیسلامدا)، بێگومان ئەوانە پاشگەزبوونەتەوە پاشە و پاشی خۆیان گەڕاونەتەوە (لە ئیسلام) )).**

**-شوعەیب لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕایەوە بە: ((فَيُجْلَوْنَ)) [1] لەشوێنی: ((فَيُحَلَّئُونَ)).**

**-وە عەقیل (لە زوهرییەوە) لە گێڕانەوەکەیدا بە: ((فَيُحَلَّئُونَ)) هێناویەتی.**

**-زوبەیدی لە زوهرییەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە موحەممەدی کوڕی عەلییەوە لە عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕافیعەوە لە ئەبی هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە.**

٦٥٨٧- حَدَّثَنِى إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُلَيْحٍ حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ حَدَّثَنِى هِلاَلٌ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «بَيْنَا أَنَا قَائِمٌ إِذَا زُمْرَةٌ، حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِى وَبَيْنِهِمْ فَقَالَ هَلُمَّ. فَقُلْتُ أَيْنَ قَالَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهِ. قُلْتُ وَمَا شَأْنُهُمْ قَالَ إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى. ثُمَّ إِذَا زُمْرَةٌ حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِى وَبَيْنِهِمْ فَقَالَ هَلُمَّ. قُلْتُ أَيْنَ قَالَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهِ. قُلْتُ مَا شَأْنُهُمْ قَالَ إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى. فَلاَ أُرَاهُ يَخْلُصُ مِنْهُمْ إِلاَّ مِثْلُ هَمَلِ النَّعَمِ».

**٦٥٨٧-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((لە کاتێکدا من (لەسەر حەوزەکە) وەستابووم[2]. لەوکاتەدا کۆمەڵێکم دی کە (نزیک بوونەوە و) ناسیمن، پیاوێك[3] لە نێوان من و ئەواندا پەیدا بوو وتی: وەرن بۆ ئێرە، منیش وتم (دەیان بەیت) بۆ کوێ؟ وتی: وەڵڵاهی بۆ دۆزەخ، وتم: چییانە (تا ببرێن بۆ دۆزەخ)؟ وتی: بێگومان ئەمانە لە پاش تۆ پاشە و پاش پاشگەزبوونەتەوە**

---

(١) کە هەردوو وشەکە یەک مانایان هەیە واتە: دەر دەکرێن.

(٢) لە گێڕانەوەیەکی تری ئیمامی بوخاریدا بەم جۆرەیە: (بَينا أنا نائمٌ إذا): واتە: لە کاتێکدا من لە خەودا بووم.

(٣) فریشتەیەک لە شێوەی پیاوێکدا.

**لە ئیسلام، پاش ئەو کۆمەڵێکی ترم بینی (هات) هەتا ناسیمنەوە پیاوێك لە نێوان من و ئەواندا پەیدا بوو وتی: وەرن بۆئێرە، منیش وتم بۆ کوێ؟ وتی: وەڵڵاهی بۆ دۆزەخ، وتم: چییانە (دەبرێن بۆ دۆزەخ)؟ وتی: بێگومان ئەوانە لە دوای تۆ پاشە و پاش لە ئیسلام پاشگەز بوونەتەوە، جا وا نازانم کەس لەوانە ڕزگاری ببێت مەگەر وەك ئاژەڵێکی ونبوو یان بێ شوان[1] (لێیان ڕزگاری بێت).**

٦٥٨٨- حَدَّثَنِی إِبْرَاهِیمُ بْنُ الْمُنْذِرِ حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِیَاضٍ عَنْ عُبَیْدِ اللَّهِ عَنْ خُبَیْبٍ عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «مَا بَیْنَ بَیْتِی وَمِنْبَرِی رَوْضَةٌ مِنْ رِیَاضِ الْجَنَّةِ، وَمِنْبَرِی عَلَى حَوْضِی»[2].

**٦٥٨٨-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئەوەی لە نێوان ماڵی من و دوانگەکەم دایە باغێکە لە باغەکانی بەهەشت، وە دوانگەکەم لەسەر حەوزەکەمە)).**

٦٥٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ أَخْبَرَنِی أَبِی عَنْ شُعْبَةَ عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ قَالَ سَمِعْتُ جُنْدَباً قَالَ سَمِعْتُ النَّبِیَّ ﷺ یَقُولُ «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ».

**٦٥٨٩-جوندەب ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((من پێشکەوتەی ئێوەم لەسەر حەوزەکە)).**

٦٥٩٠- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ حَدَّثَنَا اللَّیْثُ عَنْ یَزِیدَ عَنْ أَبِی الْخَیْرِ عَنْ عُقْبَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِیَّ ﷺ خَرَجَ یَوْماً فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلاَتَهُ عَلَى الْمَیِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ

---

(١) واتە: زۆر بەکەمی تیاندا ڕزگاری دەبێ وەک ئاژەڵێک ونبووبێ و لە مەڕەکان جیابووبێتەوە، یان بێ شوان بێت چەند ژمارەیان کەمە، ئەوانیش ئاوا کەمیان ڕزگاری دەبێت هەموویان دەبرێن بۆ دۆزەخ.

(٢) بڕوانە: ١١٩٦.

«إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الآنَ، وَإِنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ - أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ - وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا»[1].

**٦٥٩٠- ئەبی لخەیر لە عوقبەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لە ماڵ دەرچوو (ڕۆشت بۆبەقیع) و نوێژی مردووی كرد لەسەر شەهیدەكانی ئوحود، پاشان گەڕایەوە سەر دوانگەكەیی و فەرمووی: ((بێگومان من پێشەنگی ئێوەم، من شایەتیدەرم بۆ ئێوە، وە بێگومان سوێند بەخوا من تا ئێستا سەیری حەوزەكەم دەكەم، وە بەڕاستی كلیلی خەزێنەكانی زەوی - یا كلیلەكانی زەوی - م پێدراوە، وە سوێند بەخوا من ناترسم لێتان كە دوای من هاوبەش بۆ خوا پەیدا بكەن، بەڵكو دەترسم لێتان لەسەر دونیا ڕكابەرایەتی یەكتر بكەن)).**

٦٥٩١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا حَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ مَعْبَدِ بْنِ خَالِدٍ أَنَّهُ سَمِعَ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَذَكَرَ الْحَوْضَ فَقَالَ: «كَمَا بَيْنَ الْمَدِينَةِ وَصَنْعَاءَ».

**٦٥٩١-حارسەی كوڕی وەهبی ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ باسی حەوزەكەی كرد و فەرمووی: (( (حەوزەكە لە فراوانیدا) وەك نێوانی مەدینە و صەنعا وایە)).**

٦٥٩٢ - وَزَادَ ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ عَنْ شُعْبَةَ عَنْ مَعْبَدِ بْنِ خَالِدٍ عَنْ حَارِثَةَ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ قَوْلَهُ حَوْضُهُ مَا بَيْنَ صَنْعَاءَ وَالْمَدِينَةِ. فَقَالَ لَهُ الْمُسْتَوْرِدُ أَلَمْ تَسْمَعْهُ قَالَ الأَوَانِي. قَالَ لاَ. قَالَ الْمُسْتَوْرِدُ تُرَى فِيهِ الآنِيَةُ مِثْلَ الْكَوَاكِبِ.

**٦٥٩٢-مەعبەدی كوڕی خالید لە حاریسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم فەرموودەی بیستووە: ((حەوزەكەی ئەو بەقەد نێوان صەنعا و**

---

(١) بروانە: ١٣٤٤.

مەدینەیە)) موستەورید پێی وت: ئایا گوێت لێ نەبوو باسی جام و كاسە بكات؟ وتی: نەخێر، مستەورید وتی: ((جام و كاسەی تیا دەبینی وەكو ئەستێرەكانی ئاسمان)).

٦٥٩٣ - حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ:«إِنِّي عَلَى الْحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرَ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، وَسَيُؤْخَذُ نَاسٌ دُونِي فَأَقُولُ يَا رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي. فَيُقَالُ هَلْ شَعَرْتَ مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ وَاللَّهِ مَا بَرِحُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ». فَكَانَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نَرْجِعَ عَلَى أَعْقَابِنَا أَوْ نُفْتَنَ عَنْ دِينِنَا. ﴿ أَعْقَـٰبِكُمْ نَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾ المؤمنون. تَرْجِعُونَ عَلَى الْعَقِبِ.

٦٥٩٣- ئەسمائی كچی ئەبو بەكر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من (لە ڕۆژی قیامەتدا) لەسەر حەوزەكە دەبم، هەتا سەرەنج دەدەم كام لە ئێوە دێت بۆ لام، وە بێگومان كەسانێك ڕێگەیان پێ نادرێت بگەنە لای من دەبرێن، منیش دەڵێم ئەی پەروەردگارم ئەوانە لە منن و لە ئوممەتی منن، ئەوسا پێم دەوترێ ئایا زانیوتە ئەوانە پاش تۆ چییان كردوە؟ سوێند بە خوا بەردەوام پاشگەز بوونەتەوە (لە ئیسلام) )).

جا ئیبنو ئەبی مولیەكە دەڵێ: خودایە ئێمە پەنا بە تۆ دەگرین كە پاش گەز ببینەوە لە ئیسلام یان دەربارەی ئاینەكەمان تووشی فیتنە و تاقیكردنەوە ببین. ﴿ أَعْقَـٰبِكُمْ نَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾ المؤمنون. واتە: بەدوای خۆتاندا پاشە و پاش دەگەڕانەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٨٢- كِتابُ القدر

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨٢- پەڕاوی چارەنووس

## ١- بابٌ: في القَدَر

٦٥٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ هِشَامُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ أَنْبَأَنِي سُلَيْمَانُ الأَعْمَشُ قَالَ سَمِعْتُ زَيْدَ بْنَ وَهْبٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ قَالَ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً، ثُمَّ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكاً فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعٍ بِرِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَشَقِيٌّ، أَوْ سَعِيدٌ، فَوَاللَّهِ إِنَّ أَحَدَكُمْ - أَوِ الرَّجُلَ - يَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا غَيْرُ بَاعٍ أَوْ ذِرَاعٍ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا غَيْرُ ذِرَاعٍ أَوْ ذِرَاعَيْنِ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، فَيَدْخُلُهَا». قَالَ آدَمُ إِلاَّ ذِرَاعٌ[1].

## ١- باسێک: دەربارەی چارەنووس و بڕیاردراو

**٦٥٩٤- عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە ڕاستگۆی باوەڕ پێکراوە بۆی گێڕاینەوە و فەرمووی: ((بێگومان هەر یەك لە ئێوە لە ماوەی چل ڕۆژدا لە سکی دایکیدا دروست دەکرێ و کۆدەکرێتەوە، پاشان**

(١) بروانە: ٣٢٠٨.

به ئەوەندەی تر (چل ڕۆژ) دەبێتە خوێنێکی بەستوو، پاشان به ئەوەندەی تر دەبێتە پارچە گۆشتێك (بەئەندازەی پارویەك)، پاشان خوا فریشتەیەکی (تایبەت) دەنێرێت و فەرمانی پێدەکرێت به (نووسینی) چوار شت: ڕزق و ڕۆزی و تەمەنی و بەدبەختە یان بەختەوەر، ئینجا سوێند بەخوا بەڕاستی کەسێکتان - یان پیاوێك - کاردەکات بەکاری دۆزەخیانە، هەتا له نێوان ئەو و دۆزەخدا تەنها باڵێك -یان: گەزێك- دەمێنێت، یەکسەر نووسراوەکەی [1] پێش دەکەوێت ئیتر کاری دەکات بەکاری بەهەشتیانە و دەڕواتە بەهەشتەوە، وە بێگومان پیاو هەیە کار دەکات بەکاری بەهەشتیانە، هەتا له نێوان ئەو و بەهەشتدا تەنها گەزێك -یان: دوو گەز- دەمێنێت یەکسەر نووسراوەکە پێش دەکەوێت، ئیتر کاری دەکات به کاری دۆزەخیانە و دەڕواتە دۆزەخەوە)).
-ئادەم له گێڕانەوەکەیدا بەم شێوە گێڕاویەتیەوە: ((جگە له گەزێك)) [2].

(١) کە فریشتەکە له سکی دایکیدا بۆی نووسیوە.
(٢) ئەمە ئادەم تەنها بەم شێوە و بەبێ گومان و دوو دڵی گێڕاویەتیەوە.

٦٥٩٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «وَكَّلَ اللَّهُ بِالرَّحِمِ مَلَكاً فَيَقُولُ أَيْ رَبِّ نُطْفَةٌ، أَيْ رَبِّ عَلَقَةٌ، أَيْ رَبِّ مُضْغَةٌ. فَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهَا قَالَ أَيْ رَبِّ ذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ أَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا الرِّزْقُ فَمَا الأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ كَذَلِكَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ»[1].

**٦٥٩٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ له پێغەمبەرەوه ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((خوای گەورە منداڵدانی ئافرەتی سپاردووه بە فریشتەیەك، ئینجا (فریشتەکە) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەمە نوتفەیە، ئەی پەروەردگارم ئەمە خوێن پارەیە، ئەی پەروەردگارم ئەمە گۆشت پارەیە، جا ئەگەر خوا بیەوێ بڕیاری دروست کردنی بدات (فریشتەکە) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم نێر بێ یان مێ؟ بەدبەختەبێ یان بەختەوەرە؟ ئەی ڕۆزی چەندە و مردنی کەیە؟ ئیتر ئەمانە بەو جۆرە دەنوسرێ کە لە سکی دایکی دایە)).**

## ٢- بابٌ: جَفَّ القَلَمُ عَلَى عِلْمِ اللهِ ﷻ

وقوله تعالى: ﴿ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الجاثية، وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ : قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: "جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لَاقٍ"[2]. قَالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ المؤمنون. سَبَقَتْ لَهُمُ السَّعَادَةُ.

## ٢- باسێک: پێنوس کۆتای هێنا بە حوکمەکانی خوا ﷻ[3]

**وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا بەرز و بڵند: (خواش بەزانایی[1] گومڕای کرد).**

---

(١) بڕوانە: ٣١٨.

(٢) بڕوانە: ٥٠٧٦.

(٣) واتە: مرەکەبی پێنوس وشک بوویەوە، مەبەست پێی ئەو بڕیارانەی خوای گەورە دەیدات بۆ دروست کراوەکانی کۆتاییان هاتووە و نووسراون.

-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ((مەرەكەبی پێنووس بە نووسینی ئەوەی توشی تۆ دەبێت وشك بۆتەوە[٢])).

-ئیبنو عەبباس ﷺ: ﴿ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ المؤمنون: بەختەوەریان پێشتر بۆ نووسراوە و بڕیار دراوە.

٦٥٩٦- حَدَّثَنَا آدَمُ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ حَدَّثَنَا يَزِيدُ الرِّشْكُ قَالَ سَمِعْتُ مُطَرِّفَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ يُحَدِّثُ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللهِ أَيُعْرَفُ أَهْلُ الْجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ قَالَ «نَعَمْ». قَالَ فَلِمَ يَعْمَلُ الْعَامِلُونَ قَالَ «كُلٌّ يَعْمَلُ لِمَا خُلِقَ لَهُ - أَوْ لِمَا يُسِّرَ لَهُ -»[٣].

٦٥٩٦-عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا كەسی بەهەشتی لە كەسی دۆزەخی جیا دەكرێتەوە و دەناسرێ؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، وتی: دەی كەواتە خەڵكەكە بۆچی كار دەكەن؟ فەرمووی: ((هەر كەس بۆ ئەوە كاردەكات كە بۆی دروست بووە))، یان ((بۆ ئەوەی شاراوەتەوە بۆی[٤]))

## ٣- بابٌ: اللهُ أعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ

٦٥٩٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي بِشْرٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ أَوْلَادِ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: «اللهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[٥].

---

(١) واتە: ئەو كەسە سەرای شارەزایی و ئاگادار بوون و بەرچاو ڕوونی گومرا بووە.

(٢) واتە: لەسەرت نووسراوە.

(٣) بڕوانە: ٧٥٥١.

(٤) ئیبنو حەجەر دەڵێ: ((إعملوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ) زاد شُعبَةُ: ((لِما خُلِقَ لهُ، أمَّا أهلُ السعادةِ فَيُيَسَّرونَ لعَمَلِ السَّعادة)). واتە: كار بكەن چونكە هەر كەس ئەوەی بۆ ئاسان كراوە كە بۆی دروست بووە، جا ئەوی لە بەختەوەران بێت كاری بەختەوەرانیان بۆ ئاسان دەكرێت. فتح الباري:٦٠٨/١٤.

(٥) بڕوانە: ١٣٨٣.

## ٣- باسێک: خوا زاناترە بەوەی ئەوان (منداڵی بتپەرەستان) چییان دەکرد

**٦٥٩٧- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی منداڵی بتپەرستان؟ ئەویش فەرمووی: ((خوا چاك دەزانێ (ئەگەر گەورەبوونایە) چییان دەکرد)).**

٦٥٩٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ يُونُسَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ وَأَخْبَرَنِي عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَرَارِيِّ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ «اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[1].

**٦٥٩٨- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا ﷺ دەربارەی منداڵی بتپەرستان؟ ئەویش فەرمووی: ((خوا چاك دەزانێ (ئەگەر تەمەنیان بکردایە) چییان دەکرد)).**

٦٥٩٩- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ، كَمَا تُنْتِجُونَ الْبَهِيمَةَ، هَلْ تَجِدُونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ حَتَّى تَكُونُوا أَنْتُمْ تَجْدَعُونَهَا؟!»[2].

**٦٥٩٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ منداڵێك نییە ئیللا لەسەر دینداری لە دایك دەبێ جا دایك و باوکی دەیکەن بە جوولەکە و بەگاوور، هەر چۆنێك بەچکەی ئاژەڵێك بەتەواوی و بێ نوقسانی لە دایك دەبێ، ئایا بەچکەیەك دەبینن لوتی یا گوێی بڕابێ نەبڕن؟! هەتا ئێوە خۆتان لووت و گوێی بۆ دەبڕن)).**

---

(١) بڕوانە: ١٣٨٤.

(٢) بڕوانە: ١٣٥٨.

٦٦٠٠- قَالُوا يَارَسُولَ اللَّهِ أَفَرَأَيْتَ مَنْ يَمُوتُ وَهْوَ صَغِيرٌ؟ قَالَ«اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ»[١].

**٦٦٠٠-هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا هەواڵمان پێ بدە دەربارەی ئەوەی دەمرێت و منداڵە؟ فەرمووی: ((خوا زاناترە بەوەی چیان دەکرد)).**

## ٤- بابٌ: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾﴾ الأحزاب

٦٦٠١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ أَبِي الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لاَ تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا، وَلْتَنْكِحْ، فَإِنَّ لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا»[٢].

## ٤- باسێک: (وە فەرمانی خودا بڕیارێکی بڕیاردراوە)

**٦٦٠١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((نابێ ئافرەت[٣] داوای تەڵاقی خوشکەکەی (هەوێیەکەی) بکات، بۆ ئەوەی دەفرەکەی خاڵی بکات[٤]، تا خۆی شووی پێ بکات، چونکە بێگومان ئەوەی بۆی بڕیاردراوە بۆی دەبێت)).**

٦٦٠٢- حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ عَنْ عَاصِمٍ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ عَنْ أُسَامَةَ قَالَ كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ جَاءَهُ رَسُولُ إِحْدَى بَنَاتِهِ وَعِنْدَهُ سَعْدٌ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ وَمُعَاذٌ أَنَّ ابْنَهَا يَجُودُ بِنَفْسِهِ. فَبَعَثَ إِلَيْهَا «لِلَّهِ مَا أَخَذَ، وَلِلَّهِ مَا أَعْطَى، كُلٌّ بِأَجَلٍ، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ»[٥].

**٦٦٠٢- ئەبو عوسمان گێڕایەوە لە ئوسامەوە ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووم کە نێردراوی یەکێك لە کچەکانی هات بۆ خزمەتی - لەو کاتەدا سەعد و**

---

(١) بروانە: ١٣٨٤.
(٢) بروانە: ٢١٤٠.
(٣) کاتێ پیاوێکی خێزاندار خوازبێنی دەکات.
(٤) واتە پیاوەکە بۆ خۆی یەکلا بکاتەوە و ژنەکەی تر تەلاق بدات.
(٥) بروانە: ١٢٨٤.

ئوبەی کوڕی کەعب و موعاز لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوون- کە کوڕێکی لە گیان دەرچوونایە، پێغەمبەریش ﷺ کەسێکی نارد بۆ لای (و پێی بڵێ): ((ئەوەی دەیباتەوە هی خودایە، و ئەوەشی داویەتی هی خودایە، هەموو شتێکیش بۆ ماوەیەکی دیاری کراوە، جا با ئارام بگرێ، وە با چاوەڕوانی پاداشتی لای خوا بێت)).

٦٦٠٣- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا يُونُسُ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَيْرِيزٍ الْجُمَحِيُّ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نُصِيبُ سَبْياً وَنُحِبُّ الْمَالَ، كَيْفَ تَرَى فِي الْعَزْلِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَوَإِنَّكُمْ تَفْعَلُونَ ذَلِكَ، لاَ عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا، فَإِنَّهُ لَيْسَتْ نَسَمَةٌ كَتَبَ اللَّهُ أَنْ تَخْرُجَ إِلاَّ هِيَ كَائِنَةٌ»[1].

٦٦٠٣ -زوهری دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی موحەیریزی جومەحیی بۆی گێڕامەوە کە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بۆی گێڕایەوە وتی: لە کاتێکدا ئەو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبوو پیاوێکی ئەنصاری هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە کەنیزەکمان بەردەکەوێ (لە جەنگدا گرتومانن)، وە حەزمان لە نرخەکەیانە، جا تۆ ڕات چۆنە دەربارەی (عزل)[2]؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئایا ئێوە ئەو کارە دەکەن؟ هیچتان لەسەر نییە ئەگەر ئەو کارە نەکەن، چونکە دڵنیابن منداڵێك نییە خوا نووسیبێتی پەیدا ببێ، ئیللا پەیدا دەبێت)).

٦٦٠٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ مَسْعُودٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ لَقَدْ خَطَبَنَا النَّبِيُّ ﷺ خُطْبَةً، مَا تَرَكَ فِيهَا شَيْئاً إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ ذَكَرَهُ، عَلِمَهُ مَنْ

---

(١) بڕوانە: ٢٢٢٩.

(٢) واتە: لە کاتی جووت بووندا پیاو ئاوی خۆی بگرێتەوە و نەهێڵێ بڕژێتە منداڵدانی ئافرەتەکەوە.

عَلِمَهُ، وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ، إِنْ كُنْتُ لأَرَى الشَّيْءَ قَدْ نَسِيتُ، فَأَعْرِفُ مَا يَعْرِفُ الرَّجُلُ إِذَا غَابَ عَنْهُ فَرَآهُ فَعَرَفَهُ.

**٦٦٠٤- حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتارێکی بۆ داین هیچ شتێکی لە بیر نەکرد تا ڕۆژی هەستانی قیامەت (ڕووی دابێ و ڕوو بدات) باسی نەکردبێت، ئەوەی زانیبێتی و لە بیری ماوە زانیویەتی و لە بیری ماوە، ئەوەشی لە بیری نەمابێ لە بیری نەماوە، جار وا هەیە شتێك دەبینم لە بیرم چووەتەوە[1] بەڵام کە ڕوو دەدات بیرم دەکەوێتەوە وەك چۆن مۆرۆڤ پیاوێك دەناسێت کە ماوەیە لە بەر چاوی نامێنێت، ئینجا دەیبینێتەوە و دەیناسێتەوە)).**

٦٦٠٥- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ عَنْ أَبِي حَمْزَةَ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ كُنَّا جُلُوساً مَعَ النَّبِيِّ وَمَعَهُ عُودٌ يَنْكُتُ فِي الأَرْضِ وَقَالَ «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ قَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ أَوْ مِنَ الْجَنَّةِ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ أَلاَ نَتَّكِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «لاَ اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ» ثُمَّ قَرَأَ ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ ﴾ الآية. الليل[2].

**٦٦٠٥- سەعدی کوڕی عوبەیدە لە ئەبی عەبدوڕەحمانی سولەمیەوە گێڕایەوە لە عەلیەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین (لەگەڵ مردوویەکدا لە قەبرسان بووین)، وە پێغەمبەر ﷺ چیلکەیەکی پێ بوو زەویەکەی هەڵدەکۆڵی و فەرمووی: ((بێگومان هەر کەس لە ئێوە شوێنەکەی لە بەهەشت یان لە دۆزەخدا نوسراوە))، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەی بۆچی پشت بەو (نووسینە) نەبەستین؟ فەرمووی: ((هەوڵبدەن و کار بکەن، هەموو کەسێ ئامادەکراوە (بۆ ئەوەی بۆی دروست**

---

(١) کە پێغەمبەر ﷺ لە وتاردا باسی کردوە.
(٢) بڕوانە: ١٣٦٢.

کراوە)، وە ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: (ئینجا ئەو کەسەی (ماڵ و سامان) ببەخشێ و لە خوا بترسێ و پارێزگار بێت، وە بڕوای بێ بەوەی زۆر چاکە)، تا کۆتایی ئایەتەکە.

## ٥- بَابٌ: الْعَمَلُ بِالْخَوَاتِيمِ

٦٦٠٦- حَدَّثَنَا حِبَّانُ بْنُ مُوسَى أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ شَهِدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم خَيْبَرَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِرَجُلٍ مِمَّنْ مَعَهُ يَدَّعِي الإِسْلاَمَ: «هَذَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ». فَلَمَّا حَضَرَ الْقِتَالُ قَاتَلَ الرَّجُلُ مِنْ أَشَدِّ الْقِتَالِ، وَكَثُرَتْ بِهِ الْجِرَاحُ فَأَثْبَتَتْهُ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ الَّذِي تَحَدَّثْتَ أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ قَدْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مِنْ أَشَدِّ الْقِتَالِ، فَكَثُرَتْ بِهِ الْجِرَاحُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ». فَكَادَ بَعْضُ الْمُسْلِمِينَ يَرْتَابُ فَبَيْنَمَا هُوَ عَلَى ذَلِكَ إِذْ وَجَدَ الرَّجُلُ أَلَمَ الْجِرَاحِ فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى كِنَانَتِهِ، فَانْتَزَعَ مِنْهَا سَهْماً فَانْتَحَرَ بِهَا، فَاشْتَدَّ رِجَالٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ صَدَّقَ اللَّهُ حَدِيثَكَ، قَدِ انْتَحَرَ فُلاَنٌ فَقَتَلَ نَفْسَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَا بِلاَلُ قُمْ فَأَذِّنْ، لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَإِنَّ اللَّهَ لَيُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ»[1].

## ٥- باسێک: کردەوەکان بە ئەنجام و کۆتاییەکەیەوە بەندن

٦٦٠٦-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی (غەزای) خەیبەر بووین، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەپیاوێکی فەرموو لەوانەی لە گەڵیدا بوون، وای نیشان دەدا کە مسوڵمانە: ((ئەم پیاوە کەسێکی دۆزەخییە))، جا کە جەنگ دەستی پێ کرد پیاوەکە بە سەختترین شێوە جەنگا، تا زۆر شوێنی بریندار بوو جوڵەی لێ بڕی، ئینجا پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هات وتی: ئەی پێغەمبەری

(١) بڕوانە: ٣٠٦٢.

خوا ئايا دەزانى ئەو كەسەى كە جەنابت فەرمووت ئەو كەسێكى دۆزەخييە، بێگومان لە ڕێى خوادا جەنگا بە سەختترين شێوە جەنگان، بۆيە زۆر بريندار بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ((ئەوسا دڵنيابن ئەو كەسێكى دۆزەخييە))، بۆيە خەريك بوو هەندێ مسوڵمان گومان پەيدا كەن (لە ڕاستى فەرموودەكەى پێغەمبەر ﷺ)، ئينجا لە كاتێكدا لەو حاڵەتەدا بوو، پياوەكە هەستى بە ئازارى برينەكانى كرد و (ناڕەحەت بوو)، جا دەستى برد بۆ تيردانەكەى و تيرێكى لێ دەرهێنا و خۆى پێ كوشت، جا چەند پياوێكى مسوڵمان بە پەلە هاتن بۆ خزمەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ وتيان: ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ خوا ڕاستى فەرمايشتەكەى تۆى دەرخست، فلان كەس خۆى كوشت، پێغەمبەريش ﷺ فەرمووى: ((ئەى بيلال هەڵسە و جاڕ بدە و ڕايگەيەنە، كە جگەلە باوەڕدار ناچێتە بەهەشتەوە، وە بە ڕاستى خوا پشتيوانى لەم ئايينە دەكات و سەرى دەخات بە پياوى خراپ)).

٦٦٠٧- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ حَدَّثَنِي أَبُو حَازِمٍ عَنْ سَهْلٍ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَعْظَمِ الْمُسْلِمِينَ غَنَاءً عَنِ الْمُسْلِمِينَ فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَظَرَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى الرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا». فَاتَّبَعَهُ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، وَهْوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ عَلَى الْمُشْرِكِينَ، حَتَّى جُرِحَ فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَجَعَلَ ذُبَابَةَ سَيْفِهِ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْ بَيْنِ كَتِفَيْهِ فَأَقْبَلَ الرَّجُلُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ مُسْرِعاً فَقَالَ أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ. فَقَالَ «وَمَا ذَاكَ». قَالَ قُلْتَ لِفُلاَنٍ «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَلْيَنْظُرْ إِلَيْهِ». وَكَانَ مِنْ أَعْظَمِنَا غَنَاءً عَنِ الْمُسْلِمِينَ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ لاَ يَمُوتُ عَلَى ذَلِكَ فَلَمَّا جُرِحَ اسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَقَتَلَ نَفْسَهُ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ «إِنَّ الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ»[1].

(١) بڕوانە: ٢٨٩٨.

٦٦٠٧- ئەبو حازیم لە سەهلەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە مسوڵمانان گەورەترین سوودی بۆ مسوڵمانان هەبوو لە غەزایەکدا کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کردی، ئینجا پێغەمبەر ﷺ سەیری پیاوێکەی کرد و فەرمووی: ((هەر کەسێ حەز دەکات سەیری پیاوێکی دۆزەخی بکات با سەیری ئەو پیاوە بکات))، ئینجا پیاوێك [(١)] لە خەڵکەکە شوێنی کەوت، پیاوەکە لەو حاڵەتەدا لە هەموو کەس بەهێزتر بوو دژ بە بتپەرستان، هەتا بریندار کرا ئیتر بە پەلە خۆی کوشت، جا نووکی شمشێرەکەی خۆی خستە نێوان هەردوو مەمکیەوە (و خۆی دا بە سەریدا)، هەتا شمێشرەکە لە نێوان هەردوو شانیەوە هاتە دەرەوە، ئینجا پیاوێك بە پەلە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: شایەتی دەدەم کە بێگومان تۆ پێغەمبەری خوای، ئەویش فەرمووی: ((بێگومان بەندە هەیە کار دەکات بە کار و کردەوەی دۆزەخیانە، کە بێگومان لە بەهەشتیانە، (بەندەش هەیە) کار دەکات بەکار و کردەوەی بەهەشتیانە لەڕاستیشدا لە دۆزەخیانە، وە بێگومان کردەوەکان بە کۆتاییانەوە پەیوەستن)).

## ٦- بابُ إِلْقَاءِ النَّذْرِ العبْدَ إِلى القَدَرِ

٦٦٠٨- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ النَّذْرِ قَالَ «إِنَّهُ لاَ يَرُدُّ شَيْئاً، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»[(٢)].

## ٦- باسی نەزر بەندە دەبات بۆ ئەو چارەنووسەی بۆی دیاری کراوە

٦٦٠٨-ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەزر کردنی قەدەغە کرد و فەرمووی: ((بێگومان نەزر کردن هیچ شتێك (ی بڕیاردراو) ناگێڕێتەوە، تەنها ئەوەندە بە هۆیەوە ماڵی پێ دەردەهێنرێت لە کەسی ڕەزیل و ڕژدە)) [(٣)].

---

(١) لە هاوەڵانی شوێنی کەوت.

(٢) بڕوانە: ٦٦٩٢، ٦٦٩٣.

(٣) تەنها ڕژدە و ڕەزیل بەو هۆیە پارە دەکات بەخێر، ئەگەر ئەوە نەبێت هەرگیز خێر ناکات.

٦٦٠٩- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «لاَ يَأْتِي ابْنَ آدَمَ النَّذْرُ بِشَيْءٍ لَمْ يَكُنْ قَدْ قَدَّرْتُهُ، وَلَكِنْ يُلْقِيهِ الْقَدَرُ وَقَدْ قَدَّرْتُهُ لَهُ، أَسْتَخْرِجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»[١].

**٦٦٠٩-ئەبو هورەیرە ﷛ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی (خوا دەفەرموێ): ((نەزرکردن هیچ شتێك بۆ ئادەمیزاد ناهێنێ، کە من لە چارەیم نەنووسیبێ، بەڵام چارەنووس پاڵی پێوە دەنێت (نەزر بکات)، لە کاتێکدا من ئەو شتەم لە چارەی نووسیوە، ماڵ و سامانی لەکەسی چروك و ڕژدە پێ دەردەهێنم)).**

## ٧- بابُ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ

٦٦١٠- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا خَالِدٌ الْحَذَّاءُ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزَاةٍ فَجَعَلْنَا لاَ نَصْعَدُ شَرَفاً، وَلاَ نَعْلُو شَرَفاً، وَلاَ نَهْبِطُ فِي وَادٍ، إِلاَّ رَفَعْنَا أَصْوَاتَنَا بِالتَّكْبِيرِ - قَالَ - فَدَنَا مِنَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ «يَا أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِباً إِنَّمَا تَدْعُونَ سَمِيعاً بَصِيراً». ثُمَّ قَالَ «يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ، أَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلِمَةً هِيَ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ»[٢].

## ٧- باسی (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)[٣]

**٦٦١٠- ئەبو مووسا ﷛ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە غەزایەکدا، جا هەر سەرکەوتینایە بۆ بەرزاییەك یان بڕۆیشتینایە سەر**

---

(١) بڕوانە: ٦٦٩٤.

(٢) بڕوانە: ٢٩٩٢.

(٣) واتە: هیچ گۆڕان و هێز و توانایەک نییە مەگەر بەخوای گەورە.

**بەرزاییەك و دابەزینایە بۆ هەر شیوو دۆڵێك بە ئەڵڵاهو ئەكبەر دەنگمان بەرز دەكردەوە، دەڵێ: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لێمان نزیك بوویەوە و فەرمووی: ((ئەی خەڵكینە بەزەییتان بەخۆتاندا بێتەوە (بەهێواشی هاوار بكەن)، چونكە بێگومان ئێوە نەهاوار لە كەڕێك دەكەن و نە هاوار لە كەسێكی نادیاری دوور دەكەن، بەڵكو ئێوە داوا لە زاتێكی بیسەری بینا دەكەن))، پاشان فەرمووی: ((ئەی عەبدوڵڵای كوڕی قەیس ئایا وتەیەكت پێ بڵێم كە لە گەنجینەكانی بەهەشتە؟ ئەویش:** لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ**)) (واتە: هیچ گۆڕان و هێز و توانایەك نییە مەگەر بەخوای گەورە).**

## ٨- بابٌ: الْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ

عَاصِمٌ مَانِعٌ، قَالَ مُجَاهِدٌ سُداً عَنِ الْحَقِّ :يَتَرَدَّدُونَ فِي الضَّلاَلَةِ (دَسَّاهَا) أَغْوَاهَا.

٦٦١١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا يُونُسُ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَا اسْتُخْلِفَ خَلِيفَةٌ إِلاَّ لَهُ بِطَانَتَانِ بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْخَيْرِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ»[1].

## ٨- باسێك: پارێزراو[2] ئەو كەسەیە خودا پاراستبێتی

(عَاصِمٌ): **ڕێگر و بەربەست.**

**موجاهید دەڵێ:** (سُداً عَنِ الْحَقِّ) **:(ڕێگر لە ڕاستی) واتە: لە گومڕایدا دەسوڕێنەوە.** (دَسَّاهَا): **(نەفسی خۆی) تاوانبار و گومڕا كرد.٦٦١١- ئەبو سەعید خودری** ﷺ **لە پێغەمبەرەوە** ﷺ **دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((هەر**

(١) بڕوانە: ٧١٩٨.

(٢) مەبەستی پارێزراوە لە تیاچوون و ئەوەی سەری لە تیا چوونەوە دەردەچێت، وەک تاوان و گوناهە گەورەکان.

جێنشینێك كرابێ به جێنشین دوو جۆر دەستو پێوەندی هەبووە: دەست و پێوەندێكیان فەرمانی پێ دەكات بەچاكە و هانی دەدات لەسەری، دەست و پێوەندێكی تریان فەرمانی پێدەكات به خراپه و هانی دەدات لەسەری، پارێزراویش كەسێكە كە خودا بیپارێزێت)).

**٩- بابٌ: ﴿ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾ الأنبياء وقوله:**

**﴿ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ ﴿٣٦﴾ ﴾ هود. ﴿ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ ﴾ نوح**

وَقَالَ مَنْصُورُ بْنُ النُّعْمَانِ عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَحِرْمٌ بِالْحَبَشِيَّةِ وَجَبَ.

٦٦١٢- حَدَّثَنِى مَحْمُودُ بْنُ غَيْلاَنَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ مَا رَأَيْتُ شَيْئاً أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِىِّ ﷺ «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا، أَدْرَكَ ذَلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ، وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِى، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ، وَيُكَذِّبُهُ»[1].

## ٩- باسێک: ((گەڕانەوە) بۆ خەڵکی شارێک کە لە ناومان بردوون حەرامە و ناشێ، بێگومان ئەوانە جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ دونیا )، (بێگومان کەس لە گەلەکەت بڕوا ناهێنێت بێجگە لەوەی پێشتر بڕوای هێناوە ) (وە منداڵیان نابێت جگە لە منداڵی تاوەنباری سپڵە و سوپاس نەکەر)

مەنصوری كوڕی نوعمان له عیكریمەوە دەگێڕێتەوە ئەویش له ئیبنو عەبباسەوە ﵄ دەڵێ: (حِرْمٌ): بەزمانی حەبەشی واتە: واجب بوو.

(١) بڕوانە: ٦٢٤٣.

**٦٦١٢- ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: هیچ شتێكم نەدیوە بە ئەندازەی ئەم وتەیەی ئەبو هورەیرە ﵁ لە (اللَّمَمِ)[1] بچێت كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((بێگومان هەموو ئادەمیزادێك خوا بەشی خۆی داوێن پیسی لە چارەی نووسیوە، هەر دەبێ ئەوەی تووش ببێت، جا داوێن پیسی چاو سەیركردن (ی نامەحرەمە)، وە داوێن پیسی زمان قسەكردن (ی حەرامە)، دەروونیش ئاواتی بۆ دەخوازێت و حەزی لێ دەكات، داوێنیش ئەوە پشتڕاست دەكاتەوە و ئەنجامی دەدات، وە بەدرۆی دەخات یا ئەنجامی نادات)).**

٦٦١٢م- وَقَالَ شَبَابَةُ حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

**٦٦١٢م- شەبابە دەڵێ: وەرقا بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو تاووسەوە لە باوكیەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە (هەمان فەرموودەی پێشوو).**

## ١٠- بابٌ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ ﴿٦٠﴾﴾ الإسراء

**٦٦١٣-** حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا عَمْرٌو، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ ﴿٦٠﴾﴾ الإسراء. قَالَ: هِيَ رُؤْيَا عَيْنٍ أُرِيهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ. قَالَ: ﴿وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ﴿٦٠﴾﴾ الإسراء. قَالَ: هِيَ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ[2].

(١) (اللَّمم) واتە: گوناهی بچووك.

(٢) بڕوانە: ٣٨٨٨، ٤٧١٦.

## ١٠- باسێک: (وە ئەو خەو بینینەی کە پیشانی تۆماندا (لەو شەو ڕەویەدا) هەر لەبەر تاقی کردنەوەی خەڵکی بوو )

**٦٦١٣- عیکریمە دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ لەبارەی ئەم ئایەتەوە:** ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَـٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ ﴿٦٠﴾ ﴾ الإسراء[1]: **دەڵێ: ئەمە بینینی چاوە کە پیشانی پێغەمبەری خوا ﷺ دراوە لەو شەوەی شەوڕەوی پێکراوە (لە کەعبەوە) بۆ بەیتولمقەدیس، وە دەڵێ: مەبەستیش لە:** ﴿ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ﴿٦٠﴾ ﴾ الإسراء[2]: **درەختی زەقومە.**

## ١١- بابٌ: تَحَاجَّ آدَمُ وَمُوسَى عِنْدَ اللَّهِ

٦٦١٤- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ حَفِظْنَاهُ مِنْ عَمْرٍو عَنْ طَاوُسٍ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فَقَالَ لَهُ مُوسَى يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وَ أَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ. قَالَ لَهُ آدَمُ يَا مُوسَى اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً. فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى» ثَلَاثًا[3].

## ١١- باسێک: ئادەم و موسا ﷺ لای خودا بەڵگەیان بۆ یەکتری هێنایەوە

**٦٦١٤- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ئادەم و موسا ﷺ بەلگەیان لە بەرانبەری یەکتردا هێنایەوە، ئینجا موسا**

---

(١) واتە:کە ئەو خەو بینینەی کە پیشانی تۆماندا (لەو شەو ڕەویەدا).

(٢) واتە: وە درەختی نەفرین لێکراو.

(٣) بڕوانە: ٣٤٠٩.

ﷺ فەرمووی: ئەی ئادەم تۆ باوكی ئێمەی نائومێد و بێ بەشت كردین، وە لە بەهەشت دەرتكردین، ئادەمیش ﷺ پێی فەرموو: ئەی موسا خوا تۆی هەڵیبژارد و فەرمایشتی خۆی پێدایت، وە خوا بەدەستی خۆی (ئەلواحەكانی) بۆ نووسیت، ئایا سەرزەنشتی من دەكەیت لەسەر (كردنی) كارێك كە خوا لەسەری نووسیوم پێش ئەوەی دروستم بكات بەچل ساڵ؟ بۆیە ئادەم ﷺ بە بەڵگە زاڵ بوو بەسەر موسادا ﷺ)). ( پێغەمبەر ﷺ ئەم بەشەی كۆتایی فەرموودەكەی) سێ جار دووبارە كردەوە.

٦٦١٤م- قَالَ سُفْيَانُ حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[1].

٦٦١٤- سوفیان دەڵێ: ئەبو زیناد بۆی گێڕاینەوە لە ئەعرەجەوە لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ وێنەی فەرموودەكەی پێشووی گێڕایەوە.

## ١٢- بابٌ: لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَى اللَّهُ

٦٦١٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِنَانٍ حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بْنُ أَبِي لُبَابَةَ عَنْ وَرَّادٍ مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ كَتَبَ مُعَاوِيَةُ إِلَى الْمُغِيرَةِ اكْتُبْ إِلَيَّ مَا سَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ خَلْفَ الصَّلاَةِ. فَأَمْلَى عَلَيَّ الْمُغِيرَةُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ خَلْفَ الصَّلاَةِ «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»[2].

وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ أَخْبَرَنِي عَبْدَةُ أَنَّ وَرَّاداً أَخْبَرَهُ بِهَذَا. ثُمَّ وَفَدْتُ بَعْدُ إِلَى مُعَاوِيَةَ فَسَمِعْتُهُ يَأْمُرُ النَّاسَ بِذَلِكَ الْقَوْلِ.

---

(١) بڕوانە: ٣٤٠٩.

(٢) بڕوانە: ٨٤٤.

## ١٢- باسێک: هیچ ڕێگرێک نیه بۆ ئەوەی خودا دەیبەخشێت (بەکەسێک)

٦٦١٥- وەڕاد - کە ئازاد کراوی موغیرەی کوڕی شوعبە بوو -دەڵێ: موعاویە ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ ، ئەو دوعایەی بیستووتە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە پاش نوێژ دەیفەرموو بۆم بنووسە، وەڕاد دەڵێ: جا موغیرە پێی وتم بنووسم لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دوای هەموو نوێژە (فەرزەکان) دەیفەرموو: ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ)) واتە: هیچ بەرستراوێکی ڕاست نییە جگە لە خوا کە هاوەڵی نییە، هەموو دەسەڵات و ستایشی هەر بۆ ئەوە، وە ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، خوایە ئەوەی تۆ بیبەخشی ڕێگری بۆ نییە، ئەوەش تۆ ڕێگری بیت کەس ناتوانێ بیدات، دەوڵەمەندی دارایی هیچ سوودێکی نییە، دەوڵەمەندی تەنها لای تۆیە.

-ئیبنو جورەیج دەڵێ: عەبدە بۆی گێڕامەوە کە وەڕاد ئەم فەرموودەی بۆ گێڕاومەتەوە، وە عەبدە وتی: لە پاشان دواتر بەنوێنەرایەتی ڕۆشتم بۆ لای موعاویە لێم بیست فەرمانی دەکرد بە خەڵکی بەو وتەیە[1].

## ١٣- بابُ مَنْ تَعَوَّذَ بِاللَّهِ مِنْ دَرَكِ الشَّقَاءِ وَسُوءِ القَضَاءِ وَقَوْلِهِ ﷻ:

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾﴾ الفلق

٦٦١٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ سُمَيٍّ عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ»[1].

---

(١) کە (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ .... وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ).

## ١٣- باسی کەسێ پەنا بگرێت بەخوا لە تووشبوونی بەدبەختی و لە چارە ڕەشی، وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: پەنا دەگرم بە دروست کەری بوونەوەر[٢]، لە زیانی ئەوەی دروستی کردوە )

٦٦١٦- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پەنا بگرن بەخوا لە بەڵای بڕسبڕ و لە تووشبوونی نەگبەتی و لە چارەنوسی خراپ و لە پێخۆشبوونی دوژمنان)).

## ١٤- بابٌ: ﴿ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال

٦٦١٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ عَنْ سَالِمٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كَثِيراً مِمَّا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَحْلِفُ «لاَ وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ»[٣].

## ١٤- باسێک: ( (خوا) دەبێتە بەربەست لە نێوان ئادەمی و دڵیدا) [٤]

٦٦١٧ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: زۆر کات لەو وتانەی پێغەمبەر ﷺ سوێندی پێ دەخوارد: ((نا (ئەوکارە ناکەم یا واز لەو شتە ناهێنم)، سوێند بە هەڵسوڕێنەری دڵان)).

٦٦١٨- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حَفْصٍ وَبِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالاَ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ سَالِمٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لاِبْنِ صَيَّادٍ «خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئاً».

---

(١) بڕوانە: ٦٣٤٧.

(٢) یان بەرە بەیان.

(٣) بڕوانە: ٦٦٢٨، ٧٣٩١.

(٤) واتە: ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەیە بەسەر دڵی بەندەکانیدا.

قَالَ الدُّخُّ. قَالَ «اخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ». قَالَ عُمَرُ ائْذَنْ لِي فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ. قَالَ «دَعْهُ، إِنْ يَكُنْ هُوَ فَلاَ تُطِيقُهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ هُوَ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ»[1].

**٦٦١٨- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیبنو صەییادی[2] فەرمووو: ((من شتێکم لە دڵمدا شاردۆتەوە بۆت چییە؟))، ئیبنو صەییاد وتی:** (الدُّخُّ)، **پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بێدەنگبە تۆ لە پلەی خۆت (کە فاڵچیەتیە) تێپەڕ ناکەیت (ئەوەی پەنهانە نایزانیت) ))، عومەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتم بدە با بدەم لە گەردنی، فەرمووی: ((ئەگەر (دەججال) خۆی بێت ئەوە تۆ ناتوانی بیکوژی، وە ئەگەر ئەویش نەبێ کەڵکێك لە کوشتنیدا نییە)).**

## ١٥- بابٌ: ﴿ لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ﴿٥١﴾ ﴾ التوبة. قضى

قَالَ مُجَاهِدٌ ﴿ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ ﴾ الصافات: بِمُضِلِّينَ، إِلاَّ مَنْ كَتَبَ اللَّهُ أَنَّهُ يَصْلَى الْجَحِيمَ. ﴿ قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ الأعلى: قَدَّرَ الشَّقَاءَ وَالسَّعَادَةَ، وَهَدَى الأَنْعَامَ لِمَرَاتِعِهَا.

## ١٥- باسێک: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: هیچمان تووش نابێت بێجگە لەوەی کە خوا نووسیویەتی بۆمان)

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:)** ﴿ كَتَبَ ﴾ **واتە: نووسیویەتی و بڕیاری داوە.**

**-موجاهید دەڵێ:** ﴿ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ ﴾ الصافات: **گومڕاکەر (ی کەس) بن.** ﴿ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ﴿٥١﴾ ﴾ التوبة: **مەگەر کەسێك خوا نووسیبێتی کە دەڕواتە دۆزەخەوە.**

(١) بڕوانە: ١٣٥٤.

(٢) ئیبنو صەییاد: منداڵێکی جولەکە بوو، وە هەندێ دەڵێن: لە هۆزی نەجارە.

﴿ قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ الأعلى: بەدبەختی و ئاسوودەیی بڕیار داوه و دیاری کردوه، وه ڕێی به ئاژەڵان نیشان داوه بۆ ڕۆشتنیان بۆ لەوەڕگاكانیان.

٦٦١٩- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الْحَنْظَلِيُّ أَخْبَرَنَا النَّضْرُ حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي الْفُرَاتِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الطَّاعُونِ فَقَالَ «كَانَ عَذَاباً يَبْعَثُهُ اللَّهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ، فَجَعَلَهُ اللَّهُ رَحْمَةً لِلْمُؤْمِنِينَ، مَا مِنْ عَبْدٍ يَكُونُ فِي بَلَدٍ يَكُونُ فِيهِ، وَيَمْكُثُ فِيهِ، لاَ يَخْرُجُ مِنَ الْبَلَدِ، صَابِراً مُحْتَسِباً، يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ يُصِيبُهُ إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ، إِلاَّ كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ شَهِيدٍ»[1].

**٦٦١٩- یەحیای كوڕی یەعمەر گێڕایەوه كه عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوه وتی: كه ئەو پرسیاری له پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی چاوه قوڵه (تاعون)، ئەویش فەرمووی: ((چاوه قوڵه سزایەكی خوای گەورەیه خودا دەینێرێت بۆ هەركەسێك خۆی بیەوێ، ئیجا خوای گەوره چاوه قوڵه (تاعون) گێڕاوه بەرەحمەت و بەزەیی بۆ باوەڕداران، هیچ كەسێك نییه كه له شارێكدا بێت چاوه قوڵەی (تاعون) تێدا بێت و بمێنێتەوه لێی دەرنەچێت به ئارام گرتن و چاوەڕوانی پاداشتی خوا و دڵنیابێت هیچ زیانێكی تووش نابێت، جگه لەوەی خوا بۆی نووسیوه ئەوه ئەو كەسه پاداشتی وەك شەهید وایه)).**

## ١٦- باب: ﴿ وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴿٤٣﴾ ﴾ الأعراف

﴿ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الزمر

٦٦٢٠- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ - هُوَ ابْنُ حَازِمٍ - عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ الْخَنْدَقِ يَنْقُلُ مَعَنَا التُّرَابَ وَهْوَ يَقُولُ:

---

(١) بڕوانه: ٣٤٧٤.

وَاللَّهِ لَوْلاَ اللَّهُ مَا اهْتَدَيْنَا وَلاَ صُمْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا

فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا

وَالْمُشْرِكُونَ قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا[1].

## ١٦- باسێک: (وە ئێمە هەرگیز ڕێبازی ڕاست شارەزا نەدەبووین ئەگەر خوا ڕێنموونی نەکردینایە)، (ئەگەر خوا ڕێنموونی بکردمایە ئەوە بێگومان لە پارێزکاران دەبووم)

٦٦٢٠- ئەبو ئیسحاق لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەگەڵ ئێمەدا گڵی (خەندەقەکەی) دەگواستەوە و لەو کاتەدا دەیفەرموو: ((وەڵڵاهی گەر خوا نەبوایە ڕێگای ڕاستمان نەدەگرت و ڕۆژوومان نەدەگرت و نوێژمان نەدەکرد، دەی کەواتە ئارامی و دڵنیایی دابارێنە بەسەرماندا، پێیەکانیشمان دامەزراو بکە کاتێ ڕووبەڕوویان بووینەوە، بێگومان بتپەرستان دەستدرێژی دەکەنە سەرمان، ئەگەر ئەوانە بیانەوێ فیتنە و ئاشوب بنێنەوە ئێمە ڕێگەنادەین و ناهێڵین)).

(١) بڕوانە: ٢٨٣٦.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# ٨٣- كِتَابُ الأَيْمَانِ وَالنُّذُورِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨٣- پەڕاوی سوێن و نەزرکردن

## ١- بابٌ: قَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى

﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة

## ١- باسێک: وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند

(ئەو سوێندانەتان کە نیازی دڵی لەگەڵدا نییە خوا لێتان ناگرێ، بەڵام بە (شکاندنی) ئەو سوێندانەی بەنیازی دڵ داتان بەستبێت دەتان گرێ[1]، جا کەفارەتی[2] ئەو سوێندانە خۆراك دانی دە هەژارە، لە خۆراکێ مام ناوەندی کە دەرخواردی منداڵ و خێزانی خۆتانی دەدەن، یا پۆشاکی دە هەژارە یا ئازادکردنی بەندەیەك، ئینجا ئەوەی هیچ کام لەمانەی دەست نەکەوت، ئەوە با

(١) بە گوناهبارتان دادەنێ.

(٢) سڕینەوەی شکاندنەکەی.

**سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، ئەوە (ی باسکرا) کەفارەتی سوێندەکانتانە کاتێ کە سوێندتان خوارد (و شکانتان) وە سوێندەکانتان بپارێزن، بەو جۆرە خوا ئایەتەکانی خۆی بە ڕوونی باس دەکات بۆتان بۆ ئەوەی سوپاسی بکەن).**

٦٦٢١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَحْنَثُ فِي يَمِينٍ قَطُّ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ كَفَّارَةَ الْيَمِينِ وَقَالَ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتُ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَكَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي[1].

**٦٦٢١- عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەبو بەکر ﷺ هەرگیز لە سوێند خواردندا سوێندی نەدەشکاند، تاخوا بریتی سوێندی دابەزاند، جا ئەبو بەکر ﷺ وتی: سوێند ناخۆم لەسەر هیچ شتێك وە دەبینم پێچەوانەی سوێند لەسەر خوراوەکە چاکترە لە سوێند لەسەر خوراوەکە، ئیللا ئەومیان دەکەم چاکترە و بریتی سوێندەکەم دەدەم.**

٦٦٢٢- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ مُحَمَّدُ بْنُ الْفَضْلِ حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ حَدَّثَنَا الْحَسَنُ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُوتِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُوتِيتَهَا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ، وَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ»[2].

**٦٦٢٢-عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمورە داوای فەرمان ڕەوایی مەکە، چونکە بەڕاستی ئەگەر لەسەر داواکردنی خۆت پێت بدرێ وازت لێ دەهێنرێ بۆ خۆت و کارەکەت، بەڵام ئەگەر بەبێ داوای خۆت پێت درا پشتیوانی دەکرێیت، وە ئەگەر**

---

(١) بروانە: ٤٦١٤.

(٢) بروانە: ٦٧٢٢، ٧١٤٦، ٧١٤٧.

**سوێندت خوارد لەسەر شتێك، ئینجا غەیر ئەوەی سوێندت لەسەر خواردووە بە چاکتر زانی، ئەوە کەفارەتی سوێندەکەت بدە و ئەوە بکە کە چاکترە)).**

٦٦٢٣- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ جَرِيرٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ أَسْتَحْمِلُهُ فَقَالَ «وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ، وَمَا عِنْدِى مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ». قَالَ ثُمَّ لَبِثْنَا مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ نَلْبَثَ، ثُمَّ أُتِيَ بِثَلاَثِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى فَحَمَلَنَا عَلَيْهَا فَلَمَّا انْطَلَقْنَا قُلْنَا أَوْ قَالَ بَعْضُنَا وَاللَّهِ لاَ يُبَارَكُ لَنَا، أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ نَسْتَحْمِلُهُ، فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَحْمِلَنَا ثُمَّ حَمَلَنَا، فَارْجِعُوا بِنَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَنُذَكِّرُهُ، فَأَتَيْنَاهُ فَقَالَ «مَا أَنَا حَمَلْتُكُمْ، بَلِ اللَّهُ حَمَلَكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، إِلاَّ كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي، وَأَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ». أَوْ «أَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ وَكَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي»[1].

**٦٦٢٣- ئەبو بوردە لە باوکیەوە گێڕایەوە وتی: من لەگەڵ چەند کەسێکی ئەشعەریدا ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوامان لێ کرد وڵاخمان باتێ سواری بین (بۆ غەزا)، ئەویش فەرمووی: ((سوێند بەخوا وڵاختان پێنادەم سواری بن و هیچ وڵاخێکم لا نییە پێتان بەم سواری بن))، دەڵێ: پاشان ئەوەندەی خوا ویستی ماینەوە، پاشان سێ وشتری چوارپەل سپی کۆپارە داری بۆ هێنرا، پێی داین سواریان بین، جا کە ڕۆشتین وتمان یان کەسێکمان وتی: سوێند بەخوا بەرەکەتی تێ ناکەوێ بۆمان، ڕۆشتینە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای وڵاخی سواریمان لێ کرد، سوێندی خوارد وڵاخی سواریمان پێ نەدات، پاشان وڵاخی سواری پێدایـن، با بگەڕێینەوە بۆ خزمەتی بیری بخەینەوە، ئینجا ڕۆشتینە خزمەتی (باسەکەمان بۆ گێڕایەوە)، ئەویش فەرمووی: ((من وڵاخم نەداوە بە ئێوە سواری بن، بەڵکو خوا وڵاخی پێدان سواری بن، وە بێگومان من ئەگەر خوا ویستی سوێند بخۆم لەسەر هەر شتێك و بزانم**

(١) بڕوانە: ٣١٣٣.

**پێچەوانەکەی چاکترە لەوەی سوێندم لەسەر خواردووە، ئیللا بریتی سوێندەکەم دەدەم و ئەوەیان دەکەم کە چاکترە))، یان فەرمووی: ((ئەویان دەکەم چاکترەو و بریتی (کەفارەت) سوێندەکەم دەدەم))**

.٦٦٢٤- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ أَخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامِ بْنِ مُنَبِّهٍ قَالَ هَذَا مَا حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

**٦٦٢٤- هەممامی کوڕی مونەببیە دەڵێ: ئەمە ئەو فەرموودەیە کە ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕاینەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((ئێمە (ی ئوممەتی ئیسلام) کۆتا ئوممەتین لە دونیادا، پێشکەوتووترین ئوممەتین لە ڕۆژی دواییدا)).**

٦٦٢٥ - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «وَاللَّهِ لأَنْ يَلِجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيْهِ»[2].

**٦٦٢٥-پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سوێند بە خوا ئەگەر کەسێکتان سوور بێت و پێداگیری بکات لەسەر سوێندەکەی (لەسەر شتێك) سوێندی لە کەس و کارەکەی خواردووە، لای خودا گوناهبار ترە لەوەی (سوێندەکەی بشکێنێ و) کەفارەتەکەی بدات کە خودا پێویستی کردوە لەسەری)).**

٦٦٢٦- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ يَعْنِي ابْنَ إِبْرَاهِيمَ حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ عَنْ يَحْيَى عَنْ عِكْرِمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنِ اسْتَلَجَّ فِي أَهْلِهِ بِيَمِينٍ فَهْوَ أَعْظَمُ إِثْماً، لِيَبَرَّ». يَعْنِي الْكَفَّارَةَ[3].

(١) بڕوانە: ٢٣٨.

(٢) بڕوانە: ٦٦٢٦.

(٣) بڕوانە: ٦٦٢٥.

٦٦٢٦-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس موکوڕ بێت لەسەر سوێندێك کە دەربارەی (کارێکی پەیوەست بە) کەسوکاری، ئەوە تاوانەکەی زۆر گەورەترە (لە شکاندنی سوێندەکە با بیشکێنێ و) کەفارەتی بدات))

(لِيَبَرَّ) مەبەست پێی با پابەندی کەفارەتەکەی بێت.

## ٢- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ ((وَايْمُ اللَّهِ))

٦٦٢٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ جَعْفَرٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْثاً وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَطَعَنَ بَعْضُ النَّاسِ فِي إِمْرَتِهِ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ «إِنْ كُنْتُمْ تَطْعَنُونَ فِي إِمْرَتِهِ فَقَدْ كُنْتُمْ تَطْعَنُونَ، فِي إِمْرَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلُ، وَايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لَخَلِيقاً لِلإِمَارَةِ، وَإِنْ كَانَ لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذَا لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ»[1].

## ٢- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((وَايْمُ اللّٰهِ))

٦٦٢٧- عەبدوڵڵای کوڕی عوممەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستەیە لە هاوەڵانی نارد (بۆ شوێنێ) ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ کرد بە فەرماندەیان، ئینجا هەندێ کەس ڕەخنەیان لە فەرماندەیەکەی گرت[2]، پێغەمبەری خواش ﷺ هەستایەوە و فەرمووی: ((ئەگەر ئێوە ڕەخنە بگرن لە فەرماندەیەتی ئەو (ئوسامە)، ئەوە بێگومان پێشتریش ڕەخنەتان دەگرت لە فەرماندەیەتی باوکی، سا سوێند بەخوا ئەو (زەید) شیاو بوو بۆ فەرماندەیەتی، وە بەڕاستی (زەید) خۆشەویسترین کەسە لای من، وە بێگومان ئەم (ئوسامە)ش دوای ئەو (زەید) خۆشەویسترین کەسە لای من)).

---

(١) بڕوانە: ٣٧٣٠.

(٢) ووتیان چۆن دەبێ کۆیلەیەکی ئازاد کراو فەرماندەی کەسانی ئازاد بێ.

## ٣- بابٌ: كَيْفَ كَانَتْ يَمِينُ النَّبِيِّ ﷺ؟

وَقَالَ سَعْدٌ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ». وَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ لاَهَا اللَّهِ إِذاً. يُقَالُ وَاللَّهِ وَبِاللَّهِ وَتَاللَّهِ.

٦٦٢٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ عَنْ سُفْيَانَ عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ عَنْ سَالِمٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ كَانَتْ يَمِينُ النَّبِيِّ ﷺ «لاَ وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ»[١].

## ٣- باسێک: سوێند خواردنی پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە؟

**سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە)).**

**ئەبو قەتادە دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وتی: نا وەڵڵاهی ئەوە نابێ[٢]، وە دەوترێت: وەڵڵاهی وەبیللاهی وەتەڵڵاهی[٣].**

**٦٦٢٨- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: هەمیشە سوێند خواردنی پێغەمبەر ﷺ (ئەمە بوو): ((نا (ئەو کارە ناکەم یان واز لەو شتە ناهێنم)، سوێند بە هەڵسوڕێنەری دڵان)).**

٦٦٢٩- حَدَّثَنَا مُوسَى حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «إِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٤].

**٦٦٢٩- جابیری کوڕی سەمورە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: ((ئەگەر قەیصەر مرد و لەناوچوو ئیتر قەیصەرێکی تر لە دوای ئەو**

---

(١) بڕوانە: ٦٦١٧.

(٢) سەیری فەرموودەی: (٣١٤٢) بکە هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە بە درێژی هاتووە.

(٣) هەر سێ وشەکە بۆ سوێند خواردن بەکار دێت.

(٤) بڕوانە: ٣١٢١.

**نابێتەوە، وە ئەگەر کیسرا مرد و لەناوچوو، ئیتر لە دوای ئەو کیسرایەکی تر نابێتەوە، وە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، دڵنیابن گەنجینە و سامانی هەردووکیان لە پێناوی خوا (بۆ جیهاد) خەرج دەکەن).**

٦٦٣٠- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلاَ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلاَ قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[1].

**٦٦٣٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر کیسرا مرد و لەناوچوو، ئیتر لەدوا ئەو کیسرایەکی تر نابێتەوە، وە ئەگەر قەیصەر مرد و لەناوچوو، ئیتر قەیصەرێکی تر لەدوای ئەو نابێتەوە، وە سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، دڵنیابن گەنجینە و سامانی هەردووکیان لە پێناوی خوا (بۆ جیهاد) خەرج دەکەن).**

٦٦٣١- حَدَّثَنِي مُحَمَّدٌ أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ «يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَبَكَيْتُمْ كَثِيراً، وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً»[2].

**٦٦٣١- عائیشە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە بەڕێزی فەرموویەتی: ((ئەی ئوممەتی موحەممەد ﷺ سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە، بێگومان زۆر دەگریان و کەم پێدەکەنین)).**

٦٦٣٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ أَخْبَرَنِي حَيْوَةُ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو عَقِيلٍ زُهْرَةُ بْنُ مَعْبَدٍ أَنَّهُ سَمِعَ جَدَّهُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ هِشَامٍ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم

(١) بڕوانە: ٣٠٢٧.
(٢) بڕوانە: ١٠٤٤.

وَهْوَ آخِذٌ بِيَدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إِلاَّ مِنْ نَفْسِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لاَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ». فَقَالَ لَهُ عُمَرُ فَإِنَّهُ الآنَ وَاللَّهِ لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «الآنَ يَا عُمَرُ»(١).

**٦٦٣٢-عەبدوڵڵای کوڕی هیشام ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین کە دەستی عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ گرتبوو، عومەریش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی تۆ لە هەموو شت لام خۆشەویستری جگەلە خۆم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نەخێر (باوەڕت تەواو نییە)، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە هەتا خۆشەویستر نەبم لە لات لە خۆشت))، ئینجا عومەر ﷺ عەرزی کرد، تا ئێستا وەڵڵاهی تۆ لە خۆم خۆشەویستری لام لە خودی خۆم، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئا ئێستا (باوەڕکەت تەواوە) ئەی عومەر)).**

٦٦٣٣ - ٦٦٣٤- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ أَنَّهُمَا أَخْبَرَاهُ أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ أَحَدُهُمَا اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ. وَقَالَ الآخَرُ وَهْوَ أَفْقَهُهُمَا أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، وَائْذَنْ لِي أَنْ أَتَكَلَّمَ. قَالَ: «تَكَلَّمْ». قَالَ إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفاً عَلَى هَذَا - قَالَ مَالِكٌ وَالْعَسِيفُ الأَجِيرُ - زَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَأَخْبَرُونِي أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَجَارِيَةٍ لِي، ثُمَّ إِنِّي سَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي أَنَّ مَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَإِنَّمَا الرَّجْمُ عَلَى امْرَأَتِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، أَمَّا غَنَمُكَ وَجَارِيَتُكَ فَرَدٌّ عَلَيْكَ». وَجَلَدَ ابْنَهُ مِائَةً وَغَرَّبَهُ عَاماً، وَأُمِرَ أُنَيْسٌ الأَسْلَمِيُّ أَنْ يَأْتِيَ امْرَأَةَ الآخَرِ، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ رَجَمَهَا، فَاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَهَا(٢).

---

(١) بروانە: ٣٦٩٤.

(٢) بروانە: ٢٣١٤، ٢٣١٥.

**٦٦٣٣-٦٦٣٤- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود لە ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: هەردووکیان بۆیان گێڕاوەتەوە وتیان: کە دوو پیاو ناکۆکیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا یەکێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەکتێبەکەی خوا بڕیاربدە لە نێوانماندا، ئەوی کەشیان کە تێگەشتووترینیان بوو وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بەکتێبەکەی خوا بڕیاربدە لە نێوانماندا، وە مۆڵەتی من بدە قسە بکەم، فەرمووی: ((قسەبکە)) وتی: لە ڕاستیدا کوڕەکەی من کرێکار بووە لای ئەم پیاوە - مالیك دەڵێ: (عَسِيف) واتە:کرێکار، ڕەنجبەر - وە لەگەڵ خێزانەکەیدا زینای کردوە، ئینجا بەمنیان وت: کوڕەکەی من بەردباران کردنی لەسەرە، منیش سەد سەرمەڕ و کەنیزەکێکی خۆم بریتیمدا (کوڕەکەم ڕەجم نەکرێ)، پاشان پرسیارم لەزانایان کرد ئەوانیش پێیان وتم: ئەوەی لەسەر کوڕەکەمە سەد شەلاق و یەك ساڵ دوورخستنەوە، بەڵام بەردباران کردن لەسەر ژنەکەی ئەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە بەدڵنیاییەوە بەکتێبەکەی خوا بڕیار دەدەم لە نێوانتاندا، جا مەڕەکان و کەنیزەکەکەت ئەوە دەگەڕێتەوە بۆت))، سەد شەلاقی دا لە کوڕەکەی و یەك ساڵ دووری خستەوە، وە فەرمانیش بە ئونەیسی ئەسلەمیش کرا بڕوات بۆلای ژنی پیاوەکەی تر، ئەگەر پێی نا لە زیناکەی بەردبارانی بکات، ژنەکەش دانی نا بە زیناکەیدا ئونەسیش بەردبارانی کرد.**

**٦٦٣٥-** حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا وَهْبٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي يَعْقُوبَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ أَسْلَمُ وَغِفَارُ وَمُزَيْنَةُ وَجُهَيْنَةُ خَيْراً مِنْ تَمِيمٍ وَعَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ وَغَطَفَانَ وَ أَسَدٍ، خَابُوا وَخَسِرُوا». قَالُوا نَعَمْ. فَقَالَ «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ»[1].

---

(١) بڕوانە: ٣٥١٥، ٣٥١٦.

٦٦٣٥- عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە ﷺ گێڕایەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((پێم بڵێن ئەگەر ئەسلەم و غیفار و موزەینە جوهەینە، چاکترن لە (نەوەی) تەمیم و عامیری کوڕی صەعصەعە و غەتەفان و ئەسەد نائومێد و زەرەرمەند بوون))، وتیان: بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، بێگومان ئەوان [1] لەمان [2] چاکترن)).

٦٦٣٦- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَعْمَلَ عَامِلاً فَجَاءَهُ الْعَامِلُ حِينَ فَرَغَ مِنْ عَمَلِهِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا لَكُمْ، وَهَذَا أُهْدِيَ لِي. فَقَالَ لَهُ «أَفَلاَ قَعَدْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ فَنَظَرْتَ أَيُهْدَى لَكَ أَمْ لاَ». ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشِيَّةً بَعْدَ الصَّلاَةِ فَتَشَهَّدَ وَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ «أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ الْعَامِلِ نَسْتَعْمِلُهُ، فَيَأْتِينَا فَيَقُولُ هَذَا مِنْ عَمَلِكُمْ، وَهَذَا أُهْدِيَ لِي. أَفَلاَ قَعَدَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ فَنَظَرَ هَلْ يُهْدَى لَهُ أَمْ لاَ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لاَ يَغُلُّ أَحَدُكُمْ مِنْهَا شَيْئاً، إِلاَّ جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى عُنُقِهِ، إِنْ كَانَ بَعِيراً جَاءَ بِهِ لَهُ رُغَاءٌ، وَإِنْ كَانَتْ بَقَرَةً جَاءَ بِهَا لَهَا خُوَارٌ، وَإِنْ كَانَتْ شَاةً جَاءَ بِهَا تَيْعَرُ، فَقَدْ بَلَّغْتُ». فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ ثُمَّ رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ حَتَّى إِنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى عُفْرَةِ إِبْطَيْهِ. قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ وَقَدْ سَمِعَ ذَلِكَ مَعِي زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ فَسَلُوهُ[3].

٦٦٣٦-عوروە لە ئەبی حومەیدی ساعیدیەوە ﷺ گێڕایەوە کە ئەبو حومەیدە بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی کردە سەرپەرشتیار (ی زەکات کۆکردنەوە)، ئینجا سەرپەرشتیارەکە هاتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە کارەکەی تەواو بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بۆ ئێوە و ئەوەش

---

(١) لە ئەسلەمەوە تا جوهەینە.

(٢) لە تەمیمەوە تا غەتەفان.

(٣) بڕوانە: ٩٢٥.

**دیاریە بە خۆم دراوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی بۆ لە ماڵی دایك و باوکت دانەنیشتیت سەیرت بکردایە ئایا دیاریت بۆ دەهێنرا یان نا؟)) پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ عیشایەك دوای نوێژ هەستایەوە و شایەتومانی هێنا و سوپاس و ستایشی خوای کرد بەو جۆرەی کە شیاوێتی، لە پاشان فەرمووی: ((جا پاش ئەوە ئەوە چییە سەرپەرشتیارێ ئێمە کارێکی پێ دەسپێرین، ئینجا دێتەوە و دەڵێ ئەوە هی کارەکەی ئێوەیە و ئەمەش بە دیاری بە خۆم دراوە، دەی بۆ لە ماڵی دایك و باوکی دانەنیشێت و سەیری بکردایە، ئایە دیاری بۆدەهێنرێت یان نا؟ جا سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە هەر کەسێکتان شتێك خیانەت بکات لەو زەکاتە[1] لە ڕۆژی قیامەتدا دێت، ئەو شتە بەسەر ملیەوە هەڵی دەگرێت ئەگەر وشترێك بوو دەهێنێ (بەسەر ملیەوە هەڵی گرتووە و) بارە بارِی دێ، وە ئەگەر مانگایەك بوو دەهێنێ (بەسەر ملیەوە هەڵی گرتووە و) قۆڕە قۆڕی دێ، وە ئەگەر مەڕێك بوو دەهێنێ (بەسەر ملیەوە هەڵی گرتووە) باعە باعی دێ، ئەوە بەڕاستی من گەیاندم))، ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەرز کردەوە، هەتا ئێمەی سەیری سپێتی هەردووبن هەنگڵیمان دەکردئەبو حومەید وتی: زەیدی کوڕی سابیتیش (ئەم فەرموودەی) لەگەڵ مندا لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستوە و پرسیاریشی لێ بکەن.**

٦٦٣٧- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى أَخْبَرَنَا هِشَامٌ - هُوَ ابْنُ يُوسُفَ - عَنْ مَعْمَرٍ عَنْ هَمَّامٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَبَكَيْتُمْ كَثِيراً، وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً»[2].

**٦٦٣٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبولقاسیم ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە، بێگومان زۆر دەگریان و کەم پێدەکەنین)).**

---

(١) شتێک بازۆر کەمیش بێت بەخیانەت و ناپاکی بیبات.

(٢) بروانە: ٦٤٨٥.

٦٦٣٨- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ حَدَّثَنَا أَبِي حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ عَنِ الْمَعْرُورِ عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ انْتَهَيْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ يَقُولُ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ «هُمُ الأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، هُمُ الأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ» قُلْتُ مَا شَأْنِي أَيُرَى فِيَّ شَيْءٌ مَا شَأْنِي فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ وَهْوَ يَقُولُ، فَمَا اسْتَطَعْتُ أَنْ أَسْكُتَ، وَتَغَشَّانِي مَا شَاءَ اللَّهُ، فَقُلْتُ مَنْ هُمْ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «الأَكْثَرُونَ أَمْوَالاً، إِلاَّ مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا»[1]

**.٦٦٣٨-ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسێبەری کەعبەدا بوو گەشتمە خزمەتی، لەو کاتەدا دەیفەرموو: ((سوێند بە پەروەردگاری کەعبە زەرەرمەندترین کەس خۆیانن، سوێند بەپەروەردگاری کەعبە زەرەرمەنترین کەس خۆیانن)، (ئەبو زەڕ دەڵێ:) منیش وتم: پەیوەندی چییە بە منەوە بڵێی شتێکی وا لە مندا بینرابێ، ئەی من چیمە؟ کە لە خزمەتیدا دانیشتم، هەروەها دەیفەرموو لەبەر ئەوە نەمتوانی بێ دەنگ بم، هەندێ خەیاڵ دایگرتم لەوەی کە ویستی بوو دامگرێ[2]، جا عەرزیم کرد ئەو کەسانە کێن بەباوك و دایکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((ئەوانەن ماڵ و سامانیان زۆر زۆرە، (وە نایبەخشن) مەگەر ئەوەی ئاوا و ئاوا و ئاوا (بیبەخشێ) )).**

٦٦٣٩- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «قَالَ سُلَيْمَانُ لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى تِسْعِينَ امْرَأَةً، كُلُّهُنَّ تَأْتِي بِفَارِسٍ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. فَلَمْ يَقُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. فَطَافَ عَلَيْهِنَّ جَمِيعاً، فَلَمْ تَحْمِلْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ، جَاءَتْ بِشِقِّ رَجُلٍ، وَايْمُ الَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. لَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فُرْسَاناً أَجْمَعُونَ»[3].

**٦٦٣٩-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سولەیمان ﷺ فەرمووی سوێند بێ ئەم شەو بگەڕێم بەسەر نەوەد ئافرەتدا (سەرجێ بیان**

(١) بڕوانە: ٥٦٧١.

(٢) واتە: هەندێ خەیاڵی خراپ کە دەبێ گوناهی وام کردبێ تا پێغەمبەر ﷺ ئاوەها بفەرموێ پێم.

(٣) بڕوانە: ٢٨١٩.

**لەگەڵ بکەم) هەرهەموویان، یەکی سوارێکیان ببێت لە ڕێی خوادا جیهاد بکات، جا فریشتەکەی هاوڕێی پێی فەرموو: ئەگەر خوا ویستی، بەڵام ئەو نەیووت: ئەگەر خوا ویستی، ئینجا گەڕا بەسەر هەموو ئافرەتەکاندا بەڵام هیچیان سکی پڕنەبوو جگە لە ئافرەتێکیان، ئەویش لەتە کوڕێکی بوو، جا سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر بیووتایە: ئەگەر خوا ویستی، هەموویان (سوارچاك دەبوون) لە ڕێی خوادا جیهادیان دەکرد)).**

٦٦٤٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ أُهْدِيَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ سَرَقَةٌ مِنْ حَرِيرٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَتَدَاوَلُونَهَا بَيْنَهُمْ، وَيَعْجَبُونَ مِنْ حُسْنِهَا وَلِينِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَتَعْجَبُونَ مِنْهَا». قَالُوا نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَمَنَادِيلُ سَعْدٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْهَا»[1]. لَمْ يَقُلْ شُعْبَةُ[2]، وَإِسْرَائِيلُ[3]، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ».

**٦٦٤٠- ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە بەڕائی کوڕی عازیبم ﷺ بیست دەیوت: پۆشاکێکی ئاوریشم بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا خەڵکی لە نێوان خۆیاندا دەستا و دەستیان پێ دەکرد، وە بە جوانی و نەرم و شلی ئەو پۆشاکە سەرسام بوون، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((بەو پۆشاکە سەرسامن؟)) عەرزیان کرد: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، بێگومان دەستەسڕەکانی سەعد لەمە چاکترە)).-شوعبە و ئیسرائیل لە ئەبی ئیسحاقەوە گێڕایانەوە و لە فەرموودەکەدا ئەم بەشەی تیا نەبوو: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ))** [4].

---

(١) بڕوانە: ٣٢٤٩.

(٢) بڕوانە: ٣٨٠٢.

(٣) بڕوانە: ٥٨٣٦.

(٤) واتە: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە.

**٦٦٤١-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ يُونُسَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ حَدَّثَنِى عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ إِنَّ هِنْدَ بِنْتَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا كَانَ مِمَّا عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ أَخْبَاءٍ - أَوْ خِبَاءٍ - أَحَبَّ إِلَىَّ أَنْ يَذِلُّوا مِنْ أَهْلِ أَخْبَائِكَ - أَوْ خِبَائِكَ، شَكَّ يَحْيَى - ثُمَّ مَا أَصْبَحَ الْيَوْمَ أَهْلُ أَخْبَاءٍ - أَوْ خِبَاءٍ - أَحَبَّ إِلَىَّ مِنْ أَنْ يَعِزُّوا مِنْ أَهْلِ أَخْبَائِكَ أَوْ خِبَائِكَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «وَأَيْضاً وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ». قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ، فَهَلْ عَلَىَّ حَرَجٌ أَنْ أُطْعِمَ مِنَ الَّذِى لَهُ قَالَ «لاَ إِلاَّ بِالْمَعْرُوفِ»[1].

**٦٦٤١- عائیشە ﷺ دەڵێ: هیندی كچی عوتبەی[2] كوڕی ڕەبیعە هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ڕووی زەوی خاوەن ڕەشماڵانێك - یان خاوەن ڕەشماڵێك[3] - نەبوو بەئەندازەی خاوەن ڕەشماڵانەكەی تۆ - یان خاوەن ڕەشماڵەكەی تۆ- حەز بكەم زەلیل و داماو ببن، یەحیا گومانی بردووە[4] پاشان ئەمڕۆ لەسەر ڕووی زەوی هیچ خاوەن ڕەشماڵانێك - یان خاوەن ڕەشماڵێك- نییە بەئەندازەی خاوەن ڕەشماڵانەكەی تۆ - یان خاوەن ڕەشماڵەكەی تۆ- حەز بكەم سەر بەرز و سەروەر بن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((هەروەها سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، وردە وردە زیاتر ئیسلامت لا خۆشەویست دەبێت) ))، هیند وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەبو سوفیان پیاوێكی ڕەزیلی دەس قوچاوە، ئایا گوناهم دەگات لەو سامانەی هی ئەو خۆراك بدەم (بەماڵ و منداڵەكانم)؟، فەرمووی: ((گوناهت ناگات ئەگەر بەپێی پێویست و عورف بێت)).**

---

(١) بروانە: ٢٢١١.

(٢) دوای مسوڵمان بوونی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.

(٣) واتە: بنەماڵەیەک یان خێزانێک. لە فەرموودەکەدا: ( أَهْلُ أَخْبَاءٍ - أَوْ خِبَاءٍ -) واتە: خاوەن دەوار و ڕەشماڵ، جا ڕاویەکە گومانی هەبوو لە نێوان: ( أَهْلُ أَخْبَاءٍ) واتە: خاوەن چەند ڕەشماڵ یان: (- أَوْ خِبَاءٍ -) واتە: یان خاوەن ڕەشماڵێک.

(٤) لە نێوان ئەو دوو وشەیەدا.

٦٦٤٢- حَدَّثَنِى أَحْمَدُ بْنُ عُثْمَانَ حَدَّثَنَا شُرَيْحُ بْنُ مَسْلَمَةَ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِى إِسْحَاقَ سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ مَيْمُونٍ قَالَ حَدَّثَنِى عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ مُضِيفٌ ظَهْرَهُ إِلَى قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ يَمَانٍ إِذْ قَالَ لأَصْحَابِهِ «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». قَالُوا بَلَى. قَالَ «أَفَلَمْ تَرْضَوْا أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». قَالُوا بَلَى. قَالَ «فَوَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، إِنِّى لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ»[1].

**٦٦٤٢- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵی دابوو بە چادرێکی گومەزی چەرمی یەمانییەوە، کەبە هاوەڵانی فەرموو: ((ئایا ڕازی دەبن چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن؟)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئەی ڕازی نەبوون سێ یەکی خەڵکی بەهەشت بن؟)) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((ئایا ڕازی دەبن نیوەی خەڵکی بەهەشت بن؟)) وتمان بەڵێ، فەرمووی: ((جا سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، بە دڵنیاییەوە ئومێد دەکەم ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن)).**

٦٦٤٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْلَمَةَ عَنْ مَالِكٍ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ الإخلاص. يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا فَقَالَ رَسُولُ اللهِ «وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ»[2].

**٦٦٤٣- ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك گوێی لە پیاوێکی تر بوو ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە، ئینجا کە ڕۆژ بوویەوە پیاوەکە هات بۆ خزمەتی پێغەبەری خوا ﷺ و ئەو (ڕووداو)ەی بۆ گێڕایەوە،**

---

(١) بڕوانە: ٦٥٢٨.

(٢) بڕوانە: ٥٠١٣.

**پێدەچوو پیاوەکە ئەوە بەکەم بزانێ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، بەڕاستی ئەو سورەتە بە ئەندازەی سێیەکی قورئانە)).**

٦٦٤٤- حَدَّثَنِى إِسْحَاقُ أَخْبَرَنَا حَبَّانُ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِىَّ ﷺ يَقُولُ «أَتِمُّوا الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، فَوَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنِّى لأَرَاكُمْ مِنْ بَعْدِ ظَهْرِى إِذَا مَا رَكَعْتُمْ وَإِذَا مَا سَجَدْتُمْ»[1].

**٦٦٤٤- ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری ﷺ بیست دەیفەرموو: ((کڕنووش و سوژدە بەڕێك و پێکی ببەن، سا سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە دڵنیابن من لە پشتی خۆمەوە ئێوە دەبینم کاتێ کڕنووش دەبەن وە کاتێ سوژدە دەبەن)).**

٦٦٤٥- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ أَتَتِ النَّبِىَّ ﷺ مَعَهَا أَوْلاَدٌ لَهَا فَقَالَ النَّبِىُّ ﷺ «وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لأَحَبُّ النَّاسِ إِلَىَّ». قَالَهَا ثَلاَثَ مِرَارٍ[2].

**٦٦٤٥- ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە ئافرەتێکی ئەنصاری هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و چەند منداڵێکی خۆشی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بەڕاستی ئێوە (ی ئەنصاریەکان) خۆشەویسترین کەسن بە لامەوە))، سێ جار ئەم فەرموودەی دووبارە کردەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٤١٩.

(٢) بڕوانە: ٣٧٨٦.

## ٤- بَابٌ: لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ

٦٦٤٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ عَنْ مَالِكٍ عَنْ نَافِعٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭬ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ وَهْوَ يَسِيرُ فِي رَكْبٍ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ فَقَالَ «أَلاَ إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، مَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ»[1].

## ٤- باسێک: بە باوکتان[2] سوێند مەخۆن

**٦٦٤٦- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭬ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەشت بە عومەری کوڕی خەتتاب ﭬ لە کاروانێکدا دەڕۆشت عومەر بەسەری باوکی سوێندی دەخوارد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((ئاگاداربن بێگومان خوا قەدەغەی کردوە لێتان کە سوێند بخۆن بەسەری باوکتان، بۆیە هەر کەس سوێندی خوارد ئەوە با تەنها سوێند بە خوا بخوات، یان با بێدەنگ بێت)).**

٦٦٤٧- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ عَنْ يُونُسَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ قَالَ سَالِمٌ قَالَ ابْنُ عُمَرَ سَمِعْتُ عُمَرَ يَقُولُ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ». قَالَ عُمَرُ فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا مُنْذُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ ذَاكِراً وَلاَ آثِراً.
قَالَ مُجَاهِدٌ: (أَوْ أَثَرَةٍ مِنْ عِلْمٍ) يَأْثُرُ عِلْماً. تَابَعَهُ عُقَيْلٌ وَالزُّبَيْدِيُّ وَإِسْحَاقُ الْكَلْبِيُّ عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَقَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ وَمَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ سَالِمٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ عُمَرَ.

**٦٦٤٧-ئیبنو عومەر ﭬ دەڵێ: لە عومەرەم ﭬ بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێم: ((بێگومان خوای گەورە ڕێگریتان لێ دەکات کە بەباوکتان**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٧٩.

(٢) بەسەری باوکتان یان بە گیانی باوکتان.

**سوێند بخۆن)) عومەر ﷺ دەڵێ: جا سوێند بەخوا لەو کاتەوەی ئەو فەرموودەم لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە خۆم سوێندم نەخواردوە (بەباوکم) و لە خەڵکیشەوە نەمگێڕاوتەوە.**

**-موجاهید دەڵێ (أَوْ أَثَرَةٍ مِنْ عِلْمٍ) زانست و زانیاری لە پاش خۆی بەجێ دێڵێت.**

**-عوقەیل و زوبەیدیی و ئیسحاقی کەلبی لە زوهریەوە گێڕاویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی یونسیان کردوە.**

**-ئیبنو عویەینە و مەعمەر لە زوهریەوە گێڕایانەوە ئەویش لە سالیمەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ لە عومەری بیست (سوێند دەخوات بە باوکی).**

٦٦٤٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُسْلِمٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ»[1].

**٦٦٤٨-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بەباوکتان سوێند مەخۆن))**

٦٦٤٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ وَالْقَاسِمِ التَّمِيمِيِّ عَنْ زَهْدَمٍ قَالَ كَانَ بَيْنَ هَذَا الْحَىِّ مِنْ جَرْمٍ وَبَيْنَ الأَشْعَرِيِّينَ وُدٌّ وَإِخَاءٌ، فَكُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ طَعَامٌ فِيهِ لَحْمُ دَجَاجٍ وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ أَحْمَرُ كَأَنَّهُ مِنَ الْمَوَالِي، فَدَعَاهُ إِلَى الطَّعَامِ فَقَالَ إِنِّي رَأَيْتُهُ يَأْكُلُ شَيْئاً فَقَذِرْتُهُ، فَحَلَفْتُ أَنْ لاَ آكُلَهُ. فَقَالَ قُمْ فَلأُحَدِّثَنَّكَ عَنْ ذَاكَ، إِنِّي أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ فَقَالَ

---

(١) بڕوانە: ٢٦٧٩.

«وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ، وَمَا عِنْدِى مَا أَحْمِلُكُمْ». فَأُتِىَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم بِنَهْبِ إِبِلٍ فَسَأَلَ عَنَّا. فَقَالَ «أَيْنَ النَّفَرُ الأَشْعَرِيُّونَ». فَأَمَرَ لَنَا بِخَمْسِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا قُلْنَا مَا صَنَعْنَا حَلَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لاَ يَحْمِلُنَا وَمَا عِنْدَهُ مَا يَحْمِلُنَا ثُمَّ حَمَلَنَا، تَغَفَّلْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمِينَهُ، وَاللَّهِ لاَ نُفْلِحُ أَبَداً، فَرَجَعْنَا إِلَيْهِ فَقُلْنَا لَهُ إِنَّا أَتَيْنَاكَ لِتَحْمِلَنَا فَحَلَفْتَ أَنْ لاَ تَحْمِلَنَا، وَمَا عِنْدَكَ مَا تَحْمِلُنَا. فَقَالَ «إِنِّى لَسْتُ أَنَا حَمَلْتُكُمْ، وَلَكِنَّ اللَّهَ حَمَلَكُمْ، وَاللَّهِ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ وَتَحَلَّلْتُهَا»[1].

**٦٦٤٩- ٦٦٤٩- ئەبو قیلابە و قاسیمی تەمیمی لە زەهدەمەوە دەگێڕنەوە کە وتی: لە ڕابردوودا لە نێوان ئەم هۆزە جەرم و ئەشعەرییەکاندا دۆستایەتی و برایەتی هەبوو، جا ئێمەی لای ئەبی مووسای ئەشعەری بووین خواردنێکی بۆهێنرا گۆشتی مریشکی تیابوو، پیاوێکی سوری لابوو لە بەنی تەیمی الله، وەك غەیرە عەرەب وابوو، ئەبو مووسا بانگی کرد بۆ سەر خواردنەکە، پیاوەکەش وتی: مریشکەکەم دیوە شتێکی دەخوارد ئیتر بێزم لێی هاتەوە، بۆیە سوێندم خوارد کە نەیخۆم، ئەبو مووسا ﷺ وتی: هەستە سوێند بەخوا دەربارەی ئەوە فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە، من ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ چەند کەسێکی ئەشعەریدا، داوای وڵاغی سواریمان لێ کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سوێند بە خوا وڵاغی سواریتان پێ نادەم هیچ وڵاغێکم لا نییە پێتان بدەم سواری بن))، ئینجا وشتری تاڵانی هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ جا پرسیاری ئێمەی کردبوو فەرموو بووی: ((کەسە ئەشعەرییەکان لە کوێن؟)) جا فەرمانیدا بە پێنج وشتری چوار پەل سپی کۆپارە بەرز بۆمان، ئینجا کە ڕۆشتین لە ناو خۆماندا وتمان چیمان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد**

---

(١) بڕوانە: ٣١٣٣.

ولاغی سواریمان پێنەدا، هیچ ولاغێکی سواری لا نەبوو کەپێمان بدات سواری بین، پاشان ولاغی سواری پێداین، سوێند خواردنەکەیمان بیر نەخستەوە، وەللاهی هەرگیز سەرکەوتوو نابین، بۆیە گەڕاینەوە بۆ خزمەتی و عەرزمان کرد: بێگومان ئێمە هاتینە خزمەتت تا ولاغی سواریمان پێبدەیت، تۆش سوێندت خوارد کە ولاغی سواریمان پێنەدەیت، وە ولاغی سواریشت لانەبوو پێمان بدەیت سواری بین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((دڵنیابن من ولاغی سواریم بە ئێوە نەداوە، بەڵکو خوا ولاغی سواری بە ئێوە داوە، وەللاهی من هیچ سوێندێك ناخۆم غەیر ئەو شتە بەچاکتر بزانم لە سوێند لەسەر خوراوەکە، ئیللا ئەوەیان دەکەم کە چاکترە و کەفارەتی سوێندەکەم ئەدەم)).

## ٥- بابٌ: لاَ يُحْلَفُ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى وَلاَ بِالطَّوَاغِيتِ

٦٦٥٠- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى. فَلْيَقُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ تَعَالَ أُقَامِرْكَ. فَلْيَتَصَدَّقْ». أطرافه[1].

## ٥- باسێک: سوێند بە لات و عوززا و تاغوتەکان ناخورێت

٦٦٥٠- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس سوێندی خوارد و لە سوێندەکەیدا وتی: سوێند بەلات و عوززا ئەوە با بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، هەر کەسیش بە هاورێکەی وت: وەرە قومارت لەگەڵ بکەم، ئەوا باخێرێك بکات)).

(١) بروانە: ٤٨٦٠.

## ٦- بابُ مَنْ حَلَفَ عَلى الشَّيْءِ وَإِنْ لَمْ يُحَلَّفْ

٦٦٥١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ وَكَانَ يَلْبَسُهُ، فَيَجْعَلُ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّهِ، فَصَنَعَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَنَزَعَهُ، فَقَالَ «إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتِمَ وَأَجْعَلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ». فَرَمَى بِهِ ثُمَّ قَالَ «وَاللَّهِ لاَ أَلْبَسُهُ أَبَدًا». فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ[1].

## ٦- باسی کەسێک سوێند لەسەر شتێک بخوات با سوێندیش نەدرابێت

**٦٦٥١- ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ موستیلەیەکی ئاڵتوونی دروست کرد و دەیکردە پەنجەی، وە نقێمەکەی دەکردە لای بەری دەستی، ئینجا خەڵکیش[2] ئەموستیلەیان دروست کرد، لە پاشان پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە دانیشت و ئەموستیلەکەی فڕێدا و فەرمووی: ((بێگومان من پێشتر ئەم موستیلەیەم لە پەنجەم دەکرد و نقێمەکەیم دەکردە بەری دەستم)) ئینجا فڕێیدا، پاشان فەرمووی: ((سوێند بەخوا هەرگیز لە پەنجەمی ناکەم))، ئەوسا خەڵکەکەش ئەموستیلەکانیان فڕێدا.**

## ٧- بابُ مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ سِوَى مِلَّةِ الإِسْلاَمِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مَنْ حَلَفَ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ»[3]. وَلَمْ يَنْسُبْهُ إِلَى الْكُفْرِ.

٦٦٥٢- حَدَّثَنَا مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ مِلَّةِ الإِسْلاَمِ فَهْوَ كَمَا قَالَ - قَالَ - وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، وَلَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ رَمَى مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهْوَ كَقَتْلِهِ»[4].

---

(١) بڕوانە: ٥٨٦٥.

(٢) هاوەڵان ﷺ.

(٣) بڕوانە: ٤٨٦٠.

(٤) بڕوانە: ١٣٦٣.

## ٧- باسی کەسێک سوێند بە ئایینێکی غەیری ئاینی ئیسلام بخوات

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەرکەس سوێندی خوارد بە لات و عوززا ئەو با بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) )) واتە: هیچ پەرستراوێك ڕاست نییە جگە لە خوا. نەیفەرموو بەم وتەیەی کافر بووە.٦٦٥٢-ئەبو قیلابە لە سابیتی کوڕی زەححاکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەسێك سوێند بخوات بەئاینێك جگەلە ئیسلام ئەوە بەو جۆرەیە کە وتوویەتی[١]، هەر کەسێکیش بەشتێك خۆی بکوژێت لە دۆزەخدا بەو شتە سزا دەدرێت، نەفرین کردنی باوەڕداریش وەك کوشتنی وایە، هەر کەسێکیش باوەڕدارێك کافر بکات، ئەوە وەك کوشتنی وایە)).

## ٨- بابٌ: لاَ يَقُولُ مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، وَهَلْ يَقُولُ أَنَا بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ

٦٦٥٣ - وَقَالَ عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «إِنَّ ثَلاَثَةً فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ، فَبَعَثَ مَلَكاً فَأَتَى الأَبْرَصَ فَقَالَ تَقَطَّعَتْ بِي الْحِبَالُ، فَلاَ بَلاَغَ لِي إِلاَّ بِاللَّهِ، ثُمَّ بِكَ». فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[٢].

## ٨- باسێک: کەسێک نەڵێت ئەوەی خوا و تۆ ویستان لێی بێ[٣]، وە ئایا (دروستە) بڵێ: من ئومێدم بە خوایە پاشان بە تۆ؟

٦٦٥٣-عەبدوڕەحمان کوڕی ئەبی عەمرە دەڵێ کە ئەبی هوڕەیرە ﷺ بۆی گێڕایەوە کە لە پێغەمبەری ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان سێ کەس لە بەنی

---

(١) واتە: ئەو کەسە وتەکەی خۆی بەسەریدا دەچەسپێ ئەگەر وتەکەی ڕاست نەبوو، وە ئەگەر ڕاستی کرد، ئەوە بەسەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ سەر ئاینی ئیسلام.

(٢) بڕوانە: ٣٤٦٤.

(٣) خوا و تۆ بتانەوێ و حەزی بکەن.

ئیسرائیل خوا ویستی تاقیان بکاتەوە، ئینجا فریشتەیەکی نارد و هات بۆ لای کەچەڵەکەیان و فەرمووی: هۆکار و پێویستی سەفەرم لێ بڕاوە، جا ناگەمەوە (شوێنی خۆم)، مەگەر بەپشتیوانی خوا پاشان (یارمەتی) تۆ)) ئینجا فەرموودەکە دەگێڕێتەوە.

## ٩- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ﴿١٠٩﴾ ﴾ الأنعام

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَوَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَتُحَدِّثَنِّي بِالَّذِي أَخْطَأْتُ فِي الرُّؤْيَا. قَالَ: «لاَ تُقْسِمْ»[1].

## ٩- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (بەگشت هێز و توانایانەوە سوێند دەخۆن)

-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ وتی: دەی سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەم پێ دەڵێیت لە مانای خەوەکەدا هەڵەم کرد تیایدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((سوێند مەخۆ)).

٦٦٥٤- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ أَشْعَثَ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ عَنِ الْبَرَاءِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَشْعَثَ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ أَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ بِإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ[2].

٦٦٥٤-بەڕا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین بەپارێزگاری لە سوێندی سوێند خۆرەکە و نەخستنی.

(١) بروانە: ٧٠٤٦.
(٢) بروانە: ١٢٣٩.

٦٦٥٥- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ أَخْبَرَنَا عَاصِمٌ الأَحْوَلُ سَمِعْتُ أَبَا عُثْمَانَ يُحَدِّثُ عَنْ أُسَامَةَ أَنَّ ابْنَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِ وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَسَعْدٌ وَأُبَيٌّ أَنَّ ابْنِى قَدِ احْتُضِرَ فَاشْهَدْنَا. فَأَرْسَلَ يَقْرَأُ السَّلاَمَ وَيَقُولُ «إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَمَا أَعْطَى وَكُلُّ شَىْءٍ عِنْدَهُ مُسَمًّى فَلْتَصْبِرْ وَتَحْتَسِبْ». فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ، فَقَامَ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَلَمَّا قَعَدَ رُفِعَ إِلَيْهِ، فَأَقْعَدَهُ فِى حَجْرِهِ وَنَفْسُ الصَّبِىِّ تَقَعْقَعُ، فَفَاضَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ سَعْدٌ مَا هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «هَذَا رَحْمَةٌ يَضَعُهَا اللَّهُ فِى قُلُوبِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ»[1].

**٦٦٥٥- ئەبو عوسمان گێڕایەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە کچێکی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی نارد بۆ خزمەتی، لە کاتێکدا ئوسامەی کوڕی زەید و سەعد و ئوبەی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوون، وتی: کە کوڕێکم لە گیان دەرچوونایە وەرە (بۆ ماڵمان) و ئامادەبە لامان، پێغەمبەریش ﷺ کەسێکی نارد کە سەلامی لێ بکات و پێی بڵێ: ((بێگومان ئەوەی دەیباتەوە و ئەوەی دەیدات هەر هی خۆیەتی، هەموو شتێکیش لای خوا (بۆ ماوەیەکی) دیاری کراوە، جا با ئارام بگرێ و چاوەڕوانی پاداشتی لای خوا بێت)) ئینجا کچەکەی ناردی بۆلای پێغەمبەر ﷺو سوێندی لێ خوارد کە دەبێت بڕوات بۆ ماڵیان)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەستا و ئێمەش (لە خزمەتیدا) هەستاین[2]، ئینجا کاتێ دانیشت منداڵەکەی بۆ هێنرا و خستیە کۆشیەوە بەئەستەم هەناسەی دەدا، بۆیە چاوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسکیان پیا دەهاتە خوارەوە، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چییە؟ فەرمووی: ((ئەمە بەزەییەکە خوا لە دڵی هەرکام لە بەندەکانیدا بیەوێ دایناوە، وە بێگومان خوای گەورە لەناو بەندەکانیدا تەنها ڕەحم بەوانەیان دەکات کەبەبەزەیی و میهرەبانن)).**

---

(١) بڕوانە: ١٢٨٤.

(٢) ڕۆشتین تا چوینە ماڵیان.

٦٦٥٦- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِى مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «لاَ يَمُوتُ لأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، تَمَسُّهُ النَّارُ، إِلاَّ تَحِلَّةَ الْقَسَمِ»[١].

**٦٦٥٦- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ كەسێك لە مسوڵمانان نییە سێ منداڵی بمرێت، ئاگری دۆزەخی بەركەوێ و بڕواتە ناوی، مەگەر بەخاتری سوێندەكەی[٢] پەروەردگار)).**

٦٦٥٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى حَدَّثَنِى غُنْدَرٌ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ مَعْبَدِ بْنِ خَالِدٍ سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ الْجَنَّةِ؟، كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعَّفٍ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ، وَأَهْلِ النَّارِ كُلُّ جَوَّاظٍ عُتُلٍّ مُسْتَكْبِرٍ»[٣].

**٦٦٥٧- حاریسەی كوڕی وەهب ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئایا كەسێكی بەهەشتیتان نیشان بدەم؟ هەموو هەژار و لاوازێكی خۆ بەكەم زانە (خەڵك بەكەم و لاوازی بزانن)، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات بۆی دێنێتە جێ (سوێندەكەی ناخات)، ئایا كەسێكی دۆزەخیتان نیشان بدەم؟ هەموو قەڵەوێكی بەفیزی دڵ ڕەقی كەللە شەقی خۆ بەزل زانە)).**

## ١٠- بابٌ: إِذَا قَالَ أَشْهَدُ بِاللَّهِ، أَوْ شَهِدْتُ بِاللَّهِ

٦٦٥٨- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ حَدَّثَنَا شَيْبَانُ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ عَبِيدَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ أَىُّ النَّاسِ خَيْرٌ قَالَ «قَرْنِى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ

---

(١) بڕوانە: ١٢٥١.

(٢) بەڕاست دەرچونی سوێندەكەی پەروەردگار.

(٣) بڕوانە: ٤٩١٨.

يَجِيءُ قَوْمٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ». قَالَ إِبْرَاهِيمُ وَكَانَ أَصْحَابُنَا يَنْهَوْنَا وَنَحْنُ غِلْمَانٌ أَنْ نَحْلِفَ بِالشَّهَادَةِ وَالْعَهْدِ[1].

## ١٠- باسێك: ئەگەر كەسێك وتی: شایەتی دەدەم بە خوا، یان شایەتیمدا بەخوا

**٦٦٥٨- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا چ کەسێك چاکترە؟ فەرمووی: ((خەڵکی چەرخ و سەردەمی من، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان کەسانێك دێن شایەتی دانی یەکێکیان پێش سوێند خواردنی دەکەوێت، وە سوێند خواردنی پێش شایەتی دانی دەکەوێت[2]))، ئیبراهیم دەڵێ: لە ڕابردوودا کە ئێمە مێرد منداڵ بووین، مامۆستاکانمان ڕێگریان لێ دەکردین لەوەی سوێند بخۆین لەسەر شایەتی دان وپەیمان[3].**

## ١١- بابُ عَهْدِ اللَّهِ ﷻ

٦٦٥٩- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ عَنْ شُعْبَةَ عَنْ سُلَيْمَانَ وَمَنْصُورٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبَةٍ، لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَوْ قَالَ أَخِيهِ لَقِيَ اللَّهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَصْدِيقَهُ (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ)[4].

## ١١- باسی پەیمانی خودا ﷻ[5]

**٦٦٥٩- عەبدوڵڵا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس سوێند بخوات لەسەر سوێند لەسەر خوراوێك بەدرۆ بۆ ئەوەی ماڵ و**

---

(١) بڕوانە: ٢٦٥٢.

(٢) سەرنج: مەبەست ئەوەیە کە زۆر بەپەلە لەسەر شتەکان سوێند دەخۆن و شایەتی دەدەن.

(٣) بۆ ئەوەی بەدرۆ شایەتی نەدەین.

(٤) بڕوانە: ٢٣٥٦.

(٥) واتە: سوێند خواردن بە پەیمانی خودا.

سامانی پیاوێکی مسوڵمانی- یان وتی: براکەی - پێ ببچڕێت (بۆ خۆی)، کە دەگات بە خوا (لە ڕۆژی دواییدا) خوا زۆر لێی توڕەیە))، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا دەفرۆشن) وەك پشت ڕاستکردنەوەی ئەم فەرموودەیە.

٦٦٦٠ - قَالَ سُلَيْمَانُ فِي حَدِيثِهِ فَمَرَّ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ فَقَالَ مَا يُحَدِّثُكُمْ عَبْدُ اللَّهِ قَالُوا لَهُ فَقَالَ الأَشْعَثُ نَزَلَتْ فِيَّ، وَفِي صَاحِبٍ لِي، فِي بِئْرٍ كَانَتْ بَيْنَنَا[1].

٦٦٦٠-سولەیمان لە گێڕانەوەی فەرموودەکەیدا دەڵێ: ئینجا ئەشعەسی کوڕی قەیس بەویدا ڕۆیشت وتی: عەبدوڵلا چیتان بۆ دەگێڕێتەوە؟ ئەوانیش پێیان وت: ئەشعەسیش وتی: ئەو ئایەتە دەربارەی من و هاوڕێکەم دابەزی سەبارەت بە بیرێك لە نێوان من و ئەودا بوو.

## ١٢- بابُ الْحَلِفِ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَصِفَاتِهِ وَكَلِمَاتِهِ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ «أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ»[2]. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «يَبْقَى رَجُلٌ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ فَيَقُولُ يَا رَبِّ اصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ، لاَ وَعِزَّتِكَ لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهَا»[3]. وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «قَالَ اللَّهُ لَكَ ذَلِكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ»[4]. وَقَالَ أَيُّوبُ وَعِزَّتِكَ لاَ غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِكَ[5].

(١) بڕوانە: ٢٣٥٧.
(٢) بڕوانە: ٧٣٨٣.
(٣) بڕوانە: ٨٠٦.
(٤) بڕوانە: ٨٠٦.
(٥) بڕوانە: ٢٧٩.

## ١٢- باسی سوێند خواردن بە گەورەی خوا سیفاتەکانی و وتەکانی

-ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جاران دەیوت: ((خوایە پەنا دەگرم بە گەورەیی و دەسەڵاتت)).

-ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پیاوێك لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دەمێنێتەوە، ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ڕووم وەرگێڕە لە ئاگری دۆزەخ نە سوێند بەگەورەیی تۆ داوای هیچی ترت لێ ناکەم)).

-ئەبو سەعید رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((خوا دەفەرمووێ: ئەوە بۆ تۆ بێت دە ئەوەندەی تریش)).

-ئەیوب دەڵێ: ((بەگەورەیی تۆ سوێند بێت من بێ ناز نیم لە فەڕ و بەرەکەتی تۆ)).

٦٦٦١- حَدَّثَنَا آدَمُ حَدَّثَنَا شَيْبَانُ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لاَ تَزَالُ جَهَنَّمُ تَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ فَتَقُولُ قَطْ قَطْ وَعِزَّتِكَ. وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ»[1]. رَوَاهُ شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ[2][3].

**٦٦٦١-ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەردەوام دۆزەخ دەڵێ ئایا هی تر ماوە، هەتا خوای گەورە پێی خۆی پیا دەنێ، ئەوسا دەڵێ: بەسە بەسە بە گەورەیت سوێند، ئیتر هەندێکی دەچێتە پاڵ هەندێکی (پێکەوە کۆدەبنەوە) )). شوعبە لە قەتادەوە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.**

---

(١) بڕوانە: ٤٨٤٨.

(٢) بڕوانە: ٤٨٤٨.

(٣) ئەم ژمارەیە کە بۆ فەرموودەکە و بۆ گێڕانەوەکەی شوعبەش لە قەتادەوە هێناویەتی، چونکە ئەو فەرموودە بەو ژمارەیە و لەوێدا سەنەدەکەی شوعبە گێڕاویەتیەوە لە قەتادەوە لە ئەنەسەوە، فەرموودەکەش جیاوازی هەیە و کورتتریشە و بەم جۆرەیە: ((يُلقى في النارِ وتَقول: هَل مِن مَزيدٍ، حتى يضَعَ قَدَمَهُ فتَقول: قَطِ قَطِ)).

## ١٣- بابُ قَوْلِ الرَّجُلِ لَعَمْرُ اللَّهِ

-قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﴿ لَعَمْرُكَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الحجر. لَعَيْشُكَ

٦٦٦٢- حَدَّثَنَا الأُوَيْسِيُّ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ عَنْ صَالِحٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ح وَحَدَّثَنَا حَجَّاجٌ حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ النُّمَيْرِيُّ حَدَّثَنَا يُونُسُ قَالَ سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ قَالَ سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَعَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ وَعُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَبَرَّأَهَا اللَّهُ، وَكُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ الْحَدِيثِ - فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَاسْتَعْذَرَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ، فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ فَقَالَ لِسَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ لَعَمْرُ اللَّهِ لَنَقْتُلَنَّهُ[1].

## ١٣- باسی کەسێک بڵێ: (لَعَمْرُ اللّهِ[2]) سوێند بەمانەوە و بەردەوامی خودا

**ئیبنو عەبباس ﵄ ﴿ لَعَمْرُكَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الحجر: سوێند بە ژیانت.**

**٦٦٦٢- زوهری دەڵێ: لە هەریەك لە عوروەی کوڕی زوبەیر و سەعدی کوڕی موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاص و عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵام بیست دەربارەی فەرموودەکەی عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ، کاتێك بوهتانچیەکان ئەو قسە و قسەڵۆکەیان دەربارەی وت، ئینجا خواش پاکێتی عائیشەی ﵂ دەرخست، هەر یەك لەو کەسانە بەشێك لە فەرموودەکەی بۆگێڕاومەتەوە (لەو فەرموودەیەدا دەڵێ:) جا پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە و داوای**

---

(١) بروانە: ٢٥٩٣.

(٢) ئیبنو نەسیر دەڵێ: ﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ ﴿٧٢﴾ ﴾ الحجر. سوێند خواردنە بە مانەوەی خودا و بەردەوام بوونی، ئەو ڕستەیە موبتەدایە خەبەرەکەی مەحزوفە و باس نەکراوە، تەقدیرەکەی (لَعَمرُ اللهِ قَسَمي) یان (لَعَمرُ اللهِ ما أُقسِمُ بِهِ). النهاية في غريب الحديث والأثر، لإبن الأثير:٢/٢٥٤.

کرد پۆزشی بۆ بهێنرێتەوە لە بەرامبەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییدا (ئەگەر پێغەمبەر ﷺ سزایدا)، ئینجا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر هەستا و وتی بە سەعدی کوڕی عوبادە: سوێند بەمانەوە و بەردەوامی خودا بەدڵنیاییەوە دەیکوژین.

## ١٤- بابٌ: قول الله ﷻ: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَـٰنِكُمْ وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾﴾ البقرة

٦٦٦٣- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَـٰنِكُمْ ﴿٢٢٥﴾﴾ البقرة. قَالَ: قَالَتْ: أُنْزِلَتْ فِي قَوْلِهِ: لَا وَاللَّهِ، وَبَلَى وَاللَّهِ[1].

## ١٤- باسێک: وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (خوا سوێندی بێ هوودە (لە دەم دەرچوون) تان لێ ناگرێ، بەڵام سوێندێکتان لێ دەگرێت بە دڵ بتانەوێ، وە خوا لێخۆشبووی لەسەر خۆیە)

٦٦٦٣- عائیشە رضي الله عنها دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَـٰنِكُمْ ﴿٢٢٥﴾﴾[2] دەڵێ: لە وتەی کەسێکدا دابەزێنرا کە دەڵێ: نەوەڵڵا بەرێ وەڵڵا[3].

---

(١) بڕوانە: ٤٦١٣.

(٢) واتە: ئەو سوێندانەتان کە نیازی دڵی لەگەڵدا نییە لێتان ناگرێ.

(٣) مەبەست پێی ئەو سوێندانەیە کە نییەت و نیازی لەگەڵدا نییە، تەنها سەر زارەکی دێت بەسەر زماندا.

## ١٥- بابٌ: إِذَا حَنِثَ نَاسِيًا فِي الْأَيْمَانِ وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ ﴿٥﴾﴾ الأحزاب. وَقَالَ: ﴿لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ ﴿٧٣﴾﴾ الكهف

٦٦٦٤- حَدَّثَنَا خَلَّادُ بْنُ يَحْيَى حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا زُرَارَةُ بْنُ أَوْفَى عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَرْفَعُهُ قَالَ «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا وَسْوَسَتْ أَوْ حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ بِهِ أَوْ تَكَلَّمْ»[1].

## ١٥- باسێک: ئەگەر کەسێک بە لە بیر چوون سوێندەکەی کەوت دەربارەی سوێند خواردن (ئایا کەفارەتی لەسەرە یان نا؟) وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە کە بە نەزانین کردبێتتان[2]) (لێم ببورە لەبەر ئەوەی (ئەو مەرجەی دامان نابوو) لە بیرم چوو)

**٦٦٦٤- ئەبو هورەیرە ﷺ دەیباتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((بێگومان خوای گەورە چاوپۆشی لە ئوممەتەکەم کردوە لەو دالغانەی بەدڵیاندا هاتووە (و دێت)، یان لە دڵی خۆیدا وتوویەتی هەتا بەکردەوە نەیکات یا بەگوفتار نەیڵێت)).**

٦٦٦٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ أَوْ مُحَمَّدٌ عَنْهُ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ سَمِعْتُ ابْنَ شِهَابٍ يَقُولُ حَدَّثَنِي عِيسَى بْنُ طَلْحَةَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم بَيْنَمَا هُوَ يَخْطُبُ يَوْمَ النَّحْرِ إِذْ قَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ كُنْتُ أَحْسِبُ يَا رَسُولَ

---

(١) بڕوانە: ٢٥٢٨.

(٢) بەنەزانین بانگی ئەو کەسانە بکەن کە کراون بە کوڕی کەسانێک کە کوڕیان نین.

اللهِ كَذَا وَكَذَا قَبْلَ كَذَا وَكَذَا. ثُمَّ قَامَ آخَرُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللهِ كُنْتُ أَحْسِبُ كَذَا وَكَذَا لِهَؤُلاَءِ الثَّلاَثِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ» لَهُنَّ كُلِّهِنَّ يَوْمَئِذٍ، فَمَا سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ قَالَ «افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ»[1].

**٦٦٦٥- عیسای کوڕی تەڵحە دەڵێ: کە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ بۆی گێڕایەوە، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانـدا وتاری دەدا، جا پیاوێك هەستا و ڕۆشتە خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من گومانم وابوو ئەوە و ئەوە لە پێش ئەوە و ئەوەوەیە، پاشان کەسێکی تر هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا منیش گومانم وابوو کە ئەوە و ئەوە هی ئائەو سیانەن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بیکە و زیانی نییە))، لەبەر ئەوەی ئەو سیانە هەموویان لەو ڕۆژەدا (دروستن)، جا لەو ڕۆژەدا پرسیاری هەرشتێکی لێ بکرایە دەیفەرموو: ((بیکە قەیناکات و زیانی نییە)).**

٦٦٦٦- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ عَنْ عَطَاءٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ زُرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ. قَالَ «لاَ حَرَجَ». قَالَ آخَرُ حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ. قَالَ «لاَ حَرَجَ». قَالَ آخَرُ ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ. قَالَ «لاَ حَرَجَ»[2].

**٦٦٦٦- عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و وتی: تەواف کەعبەم کردوە پێش ئەوەی ڕەجمی شەیتان بکەم؟ فەرمووی: ((قەیناکات))، کەسێکی تر وتی: سەرم تاشی بەر لەوەی ئاژەڵ سەربرِم؟ فەرمووی: ((قەیناکات)) کەسێکی تر وتی: ئاژەڵم سەربڕی پێش ئەوەی ڕەجمی شەیتان بکەم؟ فەرمووی: ((قەیناکات)).**

---

(١) بڕوانە: ٨٣.
(٢) بڕوانە: ٨٤.

٦٦٦٧- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ يُصَلِّي وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، فَجَاءَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَقَالَ لَهُ «ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». فَرَجَعَ فَصَلَّى، ثُمَّ سَلَّمَ فَقَالَ «وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ». قَالَ فِي الثَّالِثَةِ فَأَعْلِمْنِي. قَالَ «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ، وَاقْرَأْ بِمَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعاً، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِماً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ وَتَطْمَئِنَّ جَالِساً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ قَائِماً، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا»[1].

**٦٦٦٧- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت نوێژی کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ لە جێگایەکی مزگەوتدا دانیشتبوو، ئینجا پیاوەکە (نوێژی کرد و) هات و سەلامی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی پێی: ((بگەڕێرەوە و نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە بەڕاستی نوێژت نەکردوە))، ئەویش گەڕایەوە و نوێژەکەی کردەوە پاشان هاتەوە و سەلامی کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((وَعَلَيْكَ بگەڕێرەوە و نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە بێگومان نوێژت نەکردوە))، لە جاری سێیەمدا پیاوەکە وتی: فێرم بکە- پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((کاتێ هەستای بۆ نوێژکردن جوان دەست نوێژ بگرە، پاشان ڕوو بکەرە قیبلە و بڵێ: (الله أکبر)، وە ئەوەی ئاسانە بەلاتەوە و لەبەرتە لە قورئان بیخوێنە، پاشان کڕنووش ببە، (بوەستە) هەتا لە کڕنووشدا لەجوڵە دەکەویت، پاشان سەرت بەرزکەرەوە تا بەتەواوی ڕاست دەبیتەوە. پاشان سوژدە ببە (بوەستە) هەتا لە سوژدەدا لە جوڵە دەکەویت، لە پاشان بەرز بەرەوە (لە سوژدە) هەتا ڕێك دەبیتەوە، بەدانیشتوویی لە جوڵە دەکەویت، پاشان**

---

(١) بڕوانە: ٧٥٧.

(جارێکی تر) سوژده ببه (بوەستە) هەتا لە سوژدەدا لە جوڵە دەکەویت، پاشان بەرزبەرەوە هەتا بەدانیشتنەوە لە جوڵە دەکەویت، پاشان ئەم بکە لە هەموو (ڕکاتێکی) نوێژەکەتدا)).

٦٦٦٨- حَدَّثَنَا فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ هُزِمَ الْمُشْرِكُونَ يَوْمَ أُحُدٍ هَزِيمَةً تُعْرَفُ فِيهِمْ، فَصَرَخَ إِبْلِيسُ أَيْ عِبَادَ اللَّهِ أُخْرَاكُمْ، فَرَجَعَتْ أُولاَهُمْ فَاجْتَلَدَتْ هِيَ وَأُخْرَاهُمْ، فَنَظَرَ حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ فَإِذَا هُوَ بِأَبِيهِ فَقَالَ أَبِي أَبِي. قَالَتْ فَوَاللَّهِ مَا انْحَجَزُوا حَتَّى قَتَلُوهُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ غَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ. قَالَ عُرْوَةُ فَوَاللَّهِ مَا زَالَتْ فِي حُذَيْفَةَ مِنْهَا بَقِيَّةٌ حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ[1].

٦٦٦٨- عائیشە ﵂ دەڵێ: لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا بتپەرستەکان شکێنران، بەشکانێکی وا پیاندا دیاربوو دەزانرا، بۆیە ئیبلیس هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا ئاگاداری دواوەی خۆتان بن، ئەنجا ئەو (مسوڵمان)انەی لە پێشەوە بوون گەڕانەوە لەگەڵ ئەو (مسوڵمان)انەی لە دواوە بوون بە جەنگ هاتن[2]، ئەنجا حوزەیفەی کوڕی یەمانیش سەرنجیدا لەوکاتەدا باوکی بینی (مسوڵمانان دەیکوژن)[3]، حوزەیفە وتی: ئەوە باوکمە ئەوە باوکمە، عائیشە دەڵێ: بەڵام سوێند بەخوا وازیان لێ نەهێنا هەتا کوشتیان، حوزەیفەش وتی: خوا لێتان خۆش بێ، عوروە وتی: جا بەردەوام حوزەیفە لەو کوشتنەی باوکیدا (داوای لێخۆشبوونی دەکرد بۆ بکوژانی باوکی)، بۆیە بەشێ چاکە و خێری هەبوو تا مرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری.

---

(١) بڕوانە: ٣٢٩٠.

(٢) گومانیان وابوو ئەوانەی دواوە بتپەرستەکانن.

(٣) بە بتپەرستیان زانی بوو.

٦٦٦٩- حَدَّثَنِى يُوسُفُ بْنُ مُوسَى حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ حَدَّثَنِى عَوْفٌ عَنْ خِلاَسٍ وَمُحَمَّدٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مَنْ أَكَلَ نَاسِياً وَهْوَ صَائِمٌ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ»[1].

**٦٦٦٩- ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێ لە بیری نەبوو خواردنی خوارد و بە ڕۆژوو بوو، ئەوە با ڕۆژووەکەی تەواو کات، چونکە بێگومان خوا خواردن و خواردنەوەی پێ داوە)).**

٦٦٧٠- حَدَّثَنَا آدَمُ بْنُ أَبِي إِيَاسٍ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ قَالَ صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ، فَمَضَى فِي صَلاَتِهِ، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ انْتَظَرَ النَّاسُ تَسْلِيمَهُ، وَسَجَدَ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَسَلَّمَ[2].

**٦٦٧٠-عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی بۆ کردین و لە دوو ڕکاتی یەکەمدا هەستایەوە پێش ئەوەی دابنیشێت، جا بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، ئینجا کە نوێژەکەی تەواو کرد خەڵکەکە چاوەڕوانی سەلام دانەوەی بوون، ئەڵڵاهو ئەکبەری کرد و پێش سەلام دانەوە سوجدەی برد، پاشان سەری بەرز کردەوە و پاشان ئەڵڵاهو ئەکبەرێکی تری کرد و سوژدەی برد، پاشان سەری بەرز کردەوە و سەلامی دایەوە.**

٦٦٧١ -َدَّثَنِى إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ سَمِعَ عَبْدَ الْعَزِيزِ بْنَ عَبْدِ الصَّمَدِ حَدَّثَنَا مَنْصُورٌ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ عَلْقَمَةَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ - رضى الله عنه أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِهِمْ صَلاَةَ الظُّهْرِ، فَزَادَ أَوْ نَقَصَ مِنْهَا - قَالَ مَنْصُورٌ لاَ أَدْرِى إِبْرَاهِيمُ وَهِمَ أَمْ عَلْقَمَةُ - قَالَ قِيلَ يَا

---

(١) بڕوانە: ١٩٣٣.

(٢) بڕوانە: ٨٢٩.

رَسُولَ اللَّهِ أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ أَمْ نَسِيتَ قَالَ «وَمَا ذَاكَ». قَالُوا صَلَّيْتَ كَذَا وَكَذَا. قَالَ فَسَجَدَ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ قَالَ «هَاتَانِ السَّجْدَتَانِ لِمَنْ لاَ يَدْرِي، زَادَ فِي صَلاَتِهِ أَمْ نَقَصَ، فَيَتَحَرَّى الصَّوَابَ، فَيُتِمُّ مَا بَقِيَ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ»[١].

**٦٦٧١- عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوسەمەد دەڵێ: مەنصور لە ئیبراهیمەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عەلقەمەوە لە ئیبنو مەسعوودەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن و لە نوێژەکەدا زیاد یان کەمی کرد -مەنصور دەڵێ: نازانم گومان بردنەکە[٢] لە ئیبراهیمەوە یان لە عەلقەمەوە دەڵێ: وترا ئەی پێغەمبەری خودا ئایا نوێژ کورت بووەتەوە یان بیرت چوو؟ فەرمووی: ((چی بووە؟)) وتیان: ئاوا و ئاوا نوێژت کرد، دەڵێ ئینجا دوو سوژدەی پێ بردن، لە پاشان فەرمووی: ((ئەم دوو سوژدەیە بۆ کەسێکە نەزانێ لە نوێژەکەی زیادی کردوە یان کەم، ئینجا بەدوای ڕاستیدا بگەڕێ[٣] و ئەوەی ماوە (لە نوێژەکەی) تەواوی بکات، پاشان دوو سوژدە ببات)).**

٦٦٧٢- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ قَالَ قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ حَدَّثَنَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ﴿ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾ الكهف. قَالَ «كَانَتِ الأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَاناً»[٤].

**٦٦٧٢- سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: بە ئیبنو عەبباسم ﷺ وت[٥]، ئەویش وتی: ئوبەیی کوڕی کەعب ﷺ بۆی گێڕاینەوە کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ**

---

(١) بروانە: ٤٠١.
(٢) لە نێوان زیاد کردن لە نوێژەکەی یان کەمی کرد بوو.
(٣) کەمترین دانێت بۆی ئەگەر لە نێوان سێ ڕکاتدا گومانی بوو سێ دانێت و نوێژەکەی تەواو بکات
(٤) بروانە: ٧٤.
(٥) ئەوەی پێی وتووە لێرەدا نەیهێناوە بە کورتی فەرموودەکەی هێناوە.

**بیست (ئەم ئایەتەی خوێندەوە)** ﴿ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾ الكهف. **(موسا ﷺ وتی: لێم ببورە لەبەر ئەوەی (ئەو مەرجەی دامان نابوو) لە بیرم چوو، وە ئەم زانیاری فێربوونەم لەسەر قورس مەکە)، وە فەرمووی: ((یەکەمجار[1] لە لایەن موساوە ﷺ بە لەبیر چوون بوو)).**

٦٦٧٣- قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ كَتَبَ إِلَيَّ مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ مُعَاذٍ حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ قَالَ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ وَكَانَ عِنْدَهُمْ ضَيْفٌ لَهُمْ فَأَمَرَ أَهْلَهُ أَنْ يَذْبَحُوا قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ، لِيَأْكُلَ ضَيْفُهُمْ، فَذَبَحُوا قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ الذَّبْحَ. فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ عِنْدِي عَنَاقٌ جَذَعٌ، عَنَاقُ لَبَنٍ هِيَ خَيْرٌ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ. فَكَانَ ابْنُ عَوْنٍ يَقِفُ فِي هَذَا الْمَكَانِ عَنْ حَدِيثِ الشَّعْبِيِّ، وَيُحَدِّثُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ بِمِثْلِ هَذَا الْحَدِيثِ، وَيَقِفُ فِي هَذَا الْمَكَانِ وَيَقُولُ لاَ أَدْرِي أَبَلَغَتِ الرُّخْصَةُ غَيْرَهُ أَمْ لاَ[2]. رَوَاهُ أَيُّوبُ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[3].

**٦٦٧٣-ئیبنو عەون لە شەعبیەوە دەگێڕێتەوە وتی: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ وتی: ئەوان میوانێکیان هەبوو، بۆیە فەرمانی کرد بەماڵەومیان کە ئاژەڵ سەر ببڕن پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی میوانەکەیان لێی بخوات، بۆیە پێش نوێژی جەژن ئاژەڵەکەیان سەر بڕی، ئینجا ئەومیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمانی کرد دووبارە ئاژەڵێك سەر ببڕنەوە، ئەویش[4] وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من چتیرێکم هەیە پێ لە سێیە چتیرێکی شیرایە[5] کە لە دوو**

(١) پابەند نەبوونی موسا ﷺ بە مەرجەکەوە.
(٢) بڕوانە: ٩٥١.
(٣) بڕوانە: ٩٨٤.
(٤) ئەبو بوردە یان بەڕاء.
(٥) واتە: بەچکەی هەبوو شیری هەبوو.

مەڕی گۆشت چاکترە، جا ئیبنو عەون ئالێرەدا دەوەستا لە گێڕانەوەی فەرموودەکەی شەعبیدا، ئیتر لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە بەهەمان شێوەی ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە، وە لەم شوێنەدا دەوەستا و دەیوت: نازانم ئەو ڕووخسەتە[1] بۆ غەیری بەڕائیش بووە یان نا.

-ئەیوب (هەمان فەرموودەی گێڕاوەتەوە) لە ئیبنو سیرینەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

٦٦٧٤- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ سَمِعْتُ جُنْدَباً قَالَ شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ عِيدٍ ثُمَّ خَطَبَ ثُمَّ قَالَ «مَنْ ذَبَحَ فَلْيُبَدِّلْ مَكَانَهَا، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ ذَبَحَ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللَّهِ»[2].

**٦٦٧٤- جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی نوێژی جەژنی (قوربانی) کرد، پاشان وتاریدا و پاشان فەرمووی: ((هەر کەس قوربانی سەربڕیوە (پێش نوێژی جەژن)، ئەوە با قوربانیەکی تر لە شوێنیدا سەرببڕێ، هەر کەسیش قوربانی سەرنەبڕیوە ئەوە با بەناوی خواوە سەری ببڕێت)).**

## ١٦- بابُ اليَمِينِ الْغَمُوسِ

﴿ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٩٤﴾ ﴾ النحل، ﴿ دَخَلَۢا ﴿٩٤﴾ ﴾ النحل: مَكْرًا وَخِيَانَةً.

---

(١) سەربڕینی چتێر لە جیاتی مەڕ و بزن.

(٢) بڕوانە: ٩٨٥.

## ١٦- باسی (حوکمی) سوێندی درۆ و هەڵبەستراو

**(وە سوێند و پەیمانتان مەکەن بەهۆی غەدر و ناپاکی لە نێوانتاندا، تا پێ لەپاش جێگیر بوونی (لەسەر باوەڕ) هەڵنەخلیسکێ و سزای نارەحەتی نەچەژن بەهۆی بەرهەڵەستی کردنتان لە ڕێی خوا ئەوسا سزای زۆر گەورەتان دەبێت)،**

﴿ دَخَلًا ﴿٩٤﴾ ﴾ النحل: **فێڵ و ناپاکی.**

٦٦٧٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَخْبَرَنَا النَّضْرُ أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ حَدَّثَنَا فِرَاسٌ قَالَ سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «الْكَبَائِرُ الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ»[1].

**٦٦٧٥-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((گوناهە گەورەکان ئەمانەن: هاوبەش دانان بۆ خوا و سەرپێچی و ئازاردانی دایك و باوك و کوشتنی مرۆڤ[2]، وە سوێند خواردنی درۆ و هەڵبەستراو)).**

(١) بڕوانە: ٦٨٧٠، ٦٩٢٠.

(٢) بەناهەق و ناڕەوا.

**١٧- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ **آل عمران. وَقَوْلِهِ اللَّهِ تعالى:** ﴿ وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾ ﴾ **البقرة. وَقَوْلِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ:** ﴿ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾ **النحل. وقوله:** ﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ ﴿٩١﴾ ﴾ **النحل**

١٧- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (( بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن، ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا بێ بەشن (لە بەهرەی خوا)، وە خوا قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات، وە لە گوناهیان خۆش نابێت، وە بۆ ئەوان هەیە سزای بە ئازار). وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (سوێند بە خوا مەکەن بە بەرهەڵەستی ئەو شتانەی سوێندتان لەسەری خواردووە کە چاکی و پارێزگاری و چاککردنەوەی نێوان خەڵکییە، وە خوا بیسەر و زانایە). وە ئەم فەرمایشتەی خوای ناوهێنانی گەورە (وە بەڵێن و پەیمانی خوا بەنرخێکی کەم مەگۆڕنەوە، بەڕاستی ئەوەی کە لای خوا هەیە چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن)، وە

## ئەم فەرمایشتە:(وە بەڵێنی خوا بەجێ بێنن کاتێ کە بەڵێن دەدەن، وە پەیمانەکانتان مەشکێنن لە پاش بەهێز کردنیان لە کاتێکدا خواتان کردوە بە شایەت و چاودێر بەسە خۆتانوە ).

٦٦٧٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيل، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَقِيَ اللَّهَ وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَصْدِيقَ ذَلِكَ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران. إِلَى آخِرِ الآيَةِ[١].

**٦٦٧٦- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس لەسەر سوێندێکی زۆرلێکران سوێند بخوات بۆ ئەوەی ماڵ و سامانی کەسێکی مسوڵمانی پێ ببچڕێت (بۆ خۆی)، کە دەگات بەخوا (لە ڕۆژی دواییدا) خوا زۆر لێی توڕەیە))، ئەنجا خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند بۆ شتڕاست کردنەوەی ئەو فەرموودەیە: (بێگومان ئەوانەی پەیمانی خوا و سوێندەکانی خۆیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن....) تا کۆتایی ئایەتەکە.**

٦٦٧٧ - فَدَخَلَ الأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ فَقَالَ مَا حَدَّثَكُمْ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ فَقَالُوا كَذَا وَكَذَا. قَالَ فِيَّ أُنْزِلَتْ، كَانَتْ لِي بِئْرٌ فِي أَرْضِ ابْنِ عَمٍّ لِي فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ «بَيِّنَتُكَ أَوْ يَمِينُهُ». قُلْتُ إِذاً يَحْلِفُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينِ صَبْرٍ، وَهْوَ فِيهَا فَاجِرٌ، يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَقِيَ اللَّهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَهْوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ»[٢].

**٦٦٧٧- ئەشعەسی کوڕی قەیس هاتە ژوورەوە و وتی: ئەبو عەبدوڕەحمان[٣] چیتان بۆ باس دەکات؟ وتیان: ئەوە و ئەوە (مان بۆباس دەکات)، ئەشعەس وتی:**

---

(١) بڕوانە: ٢٣٥٦.

(٢) بڕوانە: ٢٣٥٦.

(٣) واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ﷺ .

ئەم ئایەتە دەربارەی من دابەزی، من بیرێکم هەبوو لەناو زەوی ئامۆزایەکمدا، (دانی پیادا نەدەنا بیری منە)، جا ڕۆشتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (پێم): (( (دەبێ) شایەتت هەبێ یان سوێند خواردنی ئەو))، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە سوێندی لەسەر دەخوات[1]، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس لەسەر سوێندێکی بوێرانە[2] سوێند بخوات، کە لە سوێند خواردنەکەشیدا درۆزنە، بەهۆیەوە ماڵی کەسێکی مسوڵمان بپچڕێت (بۆ خۆی)، کە بەخوا دەگات لە ڕۆژی دواییدا زۆر لێی توڕەیە)).

## ١٨- بابُ الْيَمِينِ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ، وَفِى الْمَعْصِيَةِ، وَفِى الْغَضَبِ

٦٦٧٨- حَدَّثَنِى مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلاَءِ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ عَنْ بُرَيْدٍ عَنْ أَبِى بُرْدَةَ عَنْ أَبِى مُوسَى قَالَ أَرْسَلَنِى أَصْحَابِى إِلَى النَّبِىِّ ﷺ أَسْأَلُهُ الْحُمْلاَنَ فَقَالَ «وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ عَلَى شَىْءٍ». وَوَافَقْتُهُ وَهْوَ غَضْبَانُ فَلَمَّا أَتَيْتُهُ قَالَ «انْطَلِقْ إِلَى أَصْحَابِكَ فَقُلْ إِنَّ اللَّهَ - أَوْ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ - يَحْمِلُكُمْ»[3].

## ١٨- باسی (حوكمی) سوێند خواردن لەسەر شتێک هی سوێند خۆرەکە نەبێت. وە سوێند خواردن لەسەر تاوان و سوێند خواردن لە کاتی توڕەبووندا

٦٦٧٨- ئەبو مووسا ﷺ دەڵێ: هاوڕێکانم منیان نارد بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای وڵاخی سواری[4] لێ بکەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: سوێند بەخوا هیچ شتێکتان پێنادەم سواری بن))، لەو کاتەدا ڕۆشتمە خزمەتی زۆر توڕە بوو، ئینجا

---

(١) گرنگ نییە بەلایەوە و بیرەکەم دەبات.

(٢) پێشتر بە سوێندێکی زۆرلێکران مانامان کرد، لێرەدا بە سوێندێک بوێرانە مانامان کرد، چونکە بە هەردوو شێوەکە مانا کراوە. (إرشاد الساري:١٠/٩٤).

(٣) بڕوانە: ٣١٣٣.

(٤) بۆ ئەوەی بەشداری بکەین لە غەزای تەبووکدا.

**کە جارێکی تر ڕۆشتمەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: ((بڕۆرەوە بۆ لای هاوڕێکانت و بڵێ: بێگومان خوا-یان بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ وڵاخی سواریتان دەداتێ)).**

٦٦٧٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ، عَنْ صَالِحٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ح. وَحَدَّثَنَا الحَجَّاجُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ النُّمَيْرِيُّ، حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ يَزِيدَ الأَيْلِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَعَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ وَعُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا فَبَرَّأَهَا اللَّهُ مِمَّا قَالُوا، كُلٌّ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنَ الحَدِيثِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ ﴿١١﴾ ﴾ النور، العَشْرَ الآيَاتِ كُلَّهَا فِي بَرَاءَتِي. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ -وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ -: وَاللَّهِ لاَ أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا أَبَدًا، بَعْدَ الَّذِي قَالَ لِعَائِشَةَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴿٢٢﴾ ﴾ النور، الآية. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلَى وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِي. فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتِي كَانَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ وَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ أَنْزِعُهَا عَنْهُ أَبَدًا[1].

**٦٦٧٩-زوهری دەڵێ: لە هەریەك لە عورووەی کوڕی زوبەر و سەعیدی کوڕی موسەییەب و عەلقەمەی کوڕی وەققاص و عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلام بیست، دەربارەی بەسەرهاتەکەی عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ بوختان چییەکان ئەو بوختانەی بۆیان هەڵبەست و دایانە پاڵی، ئینجا خوا پاکێتی عائیشەی دەرخست لەو تاوانەی بوختان چیەکان وتیان، (زوهری دەڵێ:)**

---

(١) بروانە: ٢٥٩٣.

هەریەکێك لەو کەسانە[1] بەشێکی فەرمووده و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕاومەتەوە، (عائیشه رضي الله عنها دەڵێ:) ئیتر خواش ئەم دە ئایەتەی هەمووی دەربارەی پاکێتی من دابەزاند: (بێگومان کەسانێ کە ئەو بوختانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەڵبەست) تاکۆتایی دە ئایەتەکە[2]، ئینجا ئەبو بەکری ڕاستگۆ وتی: کە پێشتر خەرجی میستەحی دەکێشا و یارمەتی دەدا - وتی سوێند بەخوا ئیتر هیچ هاوکاری ناکەم هەتا ماوە دوای ئەو بوهتانەی کردی بۆ عائیشه، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (با ئەوانەی خاوەنی چاکە و سەروەت و سامانن سوێند نەخۆن کە یارمەتی نەدەن بە خزمانیان)، ئەبو بەکریش رضي الله عنه وتی: بەڵێ سوێند بەخوا پێم خۆشە خوا لێم خۆش بێ، ئیتر هاوکاری کردنی میستەحی دەست پێکردەوە بەو جۆرەی کە پێشتر دەیکرد، وە وتی: وەڵڵاهی هەرگیز دەستی لێ هەڵناگرم (هەر پێی دەدەم).

٦٦٨٠- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ عَنِ الْقَاسِمِ عَنْ زَهْدَمٍ قَالَ كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ، فَوَافَقْتُهُ وَهْوَ غَضْبَانُ فَاسْتَحْمَلْنَاهُ، فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَحْمِلَنَا ثُمَّ قَالَ «وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ وَتَحَلَّلْتُهَا»[3].

٦٦٨٠-زەهدەم دەڵێ: لای ئەبو موسای ئەشعەریدا رضي الله عنه بووین وتی: لەگەڵ چەند کەسێکی ئەشعەریدا چووینە خزمەتی پێغەمبەری ﷺ، لەو کاتەدا چوومە خزمەتی زۆر توڕە بوو، ئێمە داوامان لێ کرد وڵاخمان بداتێ (سواری بین بۆ غەزای تەبووك)، ئەویش سوێندی خوارد کە وڵاخی سواریمان نەداتێ، لە پاشان

---

(١) کە پێشتر ناوی هێنان عوروە و...
(٢) لە ئایەتی: ١٠ بۆ ٢٠سورەتی نوور.
(٣) بڕوانە: ٣١٣٣.

فەرمووی: ((وڵڵاهی- ئەگەر خوا بیەوێ - سوێند ناخۆم لەسەر هیچ شتێك و دەبینم غەیر سوێند لەسەر خوراوەكە چاكترە، ئیللا ئەوە دەكەم كە چاكترە و (بە كەفارەت دانی سوێند)، سوێند لەسەر خوراوەكە حەڵاڵ دەكەم))[1].

## ١٩- بابٌ: إِذَا قَالَ وَاللَّهِ لاَ أَتَكَلَّمُ الْيَوْمَ. فَصَلَّى أَوْ قَرَأَ أَوْ سَبَّحَ أَوْ كَبَّرَ أَوْ حَمِدَ أَوْ هَلَّلَ، فَهْوَ عَلَى نِيَّتِهِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «أَفْضَلُ الْكَلاَمِ أَرْبَعٌ سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ». قَالَ أَبُو سُفْيَانَ كَتَبَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم إِلَى هِرَقْلَ «تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ». وَقَالَ مُجَاهِدٌ كَلِمَةُ التَّقْوَى لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ.

## ١٩- باسێک: ئەگەر کەسێک وتی سوێند بەخوا ئەمڕۆ قسە ناکەم، ئینجا نوێژی کرد یان قورئانی خوێند، یان (سُبْحَانَ اللَّهِ)ـی کرد، یان (اللَّهُ أَكْبَرُ)ـی کرد، یان (الْحَمْدُ للَّهِ) کرد، یان (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)ـی کرد، ئەوە بە گوێرەی نیاز و نیەتەکەیەتی[2].

-پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((گەورەترین وتەكان: (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ)ـە واتە: پاكو بێگەردی بۆ خوا و سوپاس و ستایش بۆ خوا و هیچ پەرەستراوێكی ڕاست نییە جگە لە خوا، وە خودا لە هەموو شت گەورە ترە.

-ئەبو سوفیان دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوسی بۆ هیرەقل: (ئەی خاوەن نامەكان وەرن بۆ لای وتەیەكی ڕاست لە نێوان ئێمە و ئێوەدا). -موجاهید دەڵێ (كَلِمَةُ التَّقْوَى) مەبەست پێی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) یە.

---

(١) دەکرێ بەم جۆرەش مانا بکرێ: کەفارەتی سوێندەکە دەدەم.

(٢) ئەگەر مەبەستی قسەکردنی ئاسایی بوو ئەوە سوێندەکەی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر مەبەستی قسە کردن بوو بە گشتی، ئەوە سوێندەکەی دەکەوێت.

٦٦٨١- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ كَلِمَةً. أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ»[1].

**٦٦٨١- سەعیدی کوڕی موسەییەب لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێ کە ئەبو تاڵیب لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت بۆ لای و فەرمووی: ((بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ئەمە وشەیەکە شایەتی پێ دەدەم بۆت لای خوا)).**

٦٦٨٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ حَدَّثَنَا عُمَارَةُ بْنُ الْقَعْقَاعِ عَنْ أَبِي زُرْعَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ»[2].

**٦٦٨٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دوو وشە لەسەر زمان سوکن (بوترێن) لە ترازووەدا قورسن، ئەو دوو وشە خۆشەویستن لای خوای بە بەرزەیی (کە بریتین لە): (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ)).**

٦٦٨٣- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ عَنْ شَقِيقٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَةً وَقُلْتُ أُخْرَى: «مَنْ مَاتَ يَجْعَلُ لِلَّهِ نِدًّا أُدْخِلَ النَّارَ». وَقُلْتُ أُخْرَى مَنْ مَاتَ لاَ يَجْعَلُ لِلَّهِ نِدًّا أُدْخِلَ الْجَنَّةَ[3].

**٦٦٨٣- عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتەیەکی فەرموو منیش وتەیەکی ترم وت: ((هەر کەس بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا دانابێت دەخرێتە دۆزەخەوە))، منیش وتم: هەر کەس بمرێ هاوبەش بۆ خوا دانەنێت دەخرێتە بەهەشتەوە.**

---

(١) بڕوانە: ١٣٦٠.

(٢) بڕوانە: ٦٤٠٦.

(٣) بڕوانە: ١٢٣٨.

## ٢٠- بَابُ مَنْ حَلَفَ أَنْ لاَ يَدْخُلَ عَلَى أَهْلِهِ شَهْراً، وَكَانَ الشَّهْرُ تِسْعاً وَعِشْرِينَ

٦٦٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ عَنْ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ قَالَ آلَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ نِسَائِهِ، وَكَانَتِ انْفَكَّتْ رِجْلُهُ، فَأَقَامَ فِي مَشْرُبَةٍ تِسْعاً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ نَزَلَ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ آلَيْتَ شَهْراً. فَقَالَ «إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعاً وَعِشْرِينَ»[1].

## ٢٠- باسی (حوکمی) کەسێک سوێند بخوات یەک مانگ سەرجێی لەگەڵ خێزانیدا ناکات، وە مانگەکەش بیست و نۆ ڕۆژ بوو

**٦٦٨٤- ئەنەس ﷺ دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد نەچێتە لای خێزانەکانی (مانگێك)، پێیەکی لە جێ چوو، بۆیە لە ژوورێکدا بیست و نۆ ڕۆژ مایەوە، پاشان هاتە خوارەوە (چووە لای عائیشە)، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ سوێندت خوارد یەك مانگ نەچیتە لای خێزانەکانت! فەرمووی: ((بێگومان (زۆر جار) مانگ بیست ونۆ ڕۆژە)).**

## ٢١- بَابٌ: إِنْ حَلَفَ أَنْ لاَ يَشْرَبَ نَبِيذاً فَشَرِبَ طِلاَءً أَوْ سَكَراً أَوْ عَصِيراً، لَمْ يَحْنَثْ فِي قَوْلِ بَعْضِ النَّاسِ، وَلَيْسَتْ هَذِهِ بِأَنْبِذَةٍ عِنْدَهُ

## ٢١- باسێک: ئەگەر کەسێک سوێندی خوارد خۆشاو[1] نەخواتەوە، ئینجا شەربەتی ترێی کوڵێنراو یان عارەقی ترێ یان شەربەتی ترێ بخواتەوە بەلای هەندێ کەسەوە[2] سوێندەکەی ناکەوێت، چونکە ئەمانە[3] بەلایەوە خۆشاو نین

٦٦٨٥- حَدَّثَنِي عَلِيٌّ سَمِعَ عَبْدَ الْعَزِيزِ بْنَ أَبِي حَازِمٍ أَخْبَرَنِي أَبِي عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ أَبَا أُسَيْدٍ صَاحِبَ النَّبِيِّ ﷺ أَعْرَسَ فَدَعَا النَّبِيَّ ﷺ لِعُرْسِهِ، فَكَانَتِ الْعَرُوسُ خَادِمَهُمْ. فَقَالَ

(١) بڕوانە: ٣٧٨.

سَهْلٌ لِلْقَوْمِ هَلْ تَدْرُونَ مَا سَقَتْهُ قَالَ أَنْقَعَتْ لَهُ تَمْراً فِي تَوْرٍ مِنَ اللَّيْلِ، حَتَّى أَصْبَحَ عَلَيْهِ فَسَقَتْهُ إِيَّاهُ(٤).

**٦٦٨٥- عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو حازیم دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ دەڵێ: ئەبو ئوسەیدی ﷺ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ ژنی گواستەوە، پێغەمبەریشی ﷺ بانگ کرد بۆشاییەکەی، ئینجا بوکەکە خزمەتکاریان بوو (خزمەتی دەکردن)، سەهل وتی: بە خەڵکەکە دەزانن ئەو بووکە چی دایە پێغەمبەری خوا ﷺ بیخواتەوە؟ سەهل وتی: بەشەو هەندێ خورمای بۆ کردبوویە ناو ئاوەوە لە دەفرێکی زەرددا هەتا ڕۆژی بەسەردا هات، ئەوسا دایە پێغەمبەر و ﷺ خواردیەوە.**

٦٦٨٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ عَنِ الشَّعْبِيِّ عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنْ سَوْدَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ مَاتَتْ لَنَا شَاةٌ فَدَبَغْنَا مَسْكَهَا ثُمَّ مَا زِلْنَا نَنْبِذُ فِيهِ حَتَّى صَارَتْ شَنًّا.

**٦٦٨٦- سەودەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: مەڕێکمان مردار بوویەوە، پێستەکەیمان خۆشە کرد، پاشان بەردەوام خۆشاومان تێدا دەکرد هەتابوویە مەشکەیەکی کۆن.**

---

(١) خۆشاو: خورما یان مێوژ و شتی وا بکرێتە ئاوەوە، شەو تا بەیانی دابنرێت ببێتە شەربەت و بخورێتەوە.
(٢) کە ئەبو حەنیفە و هاوەڵەکانیەتی لە مەزهەبی حەنەفی.
(٣) شەربەتی ترێی کوڵێنراو یان عارەقی ترێ یان شەربەتی ترێ خۆشاو نین، بەڵکو هەر یەکەیان ناوێکی تایبەت بە خۆی هەیە.
(٤) بڕوانە: ٥١٧٦.

## ٢٢- بَابٌ: إِذَا حَلَفَ أَنْ لاَ يَأْتَدِمَ، فَأَكَلَ تَمْراً بِخُبْزٍ، وَمَا يَكُونُ مِنَ الأُدْمِ

٦٦٨٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنْ خُبْزِ بُرٍّ مَأْدُومٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ[1].
وَقَالَ ابْنُ كَثِيرٍ أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ لِعَائِشَةَ بِهَذَا

## ٢٢- باسێک: ئەگەر کەسێک سوێندی خوارد پێخۆر بەنانەوە نەخوات، ئینجا خورمای بەنانەوە خوارد، وە باسی چی دەبێت بە پێخۆر

**٦٦٨٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: خێزانی موحەممەد ﷺ سێ ڕۆژ تێر نەبوون لە نانی گەنم و پێخۆر، هەتا گەیشتە خزمەتی خوای گەورە (وەفاتی کرد).**
**وە ئیبنو کەسیر دەڵێ: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدوڕەحمان بۆی گێڕاینەوە لە باوکیەوە کە وتی: بە عائیشە ﵂ ئیتر فەرموودەکە دەگێڕێتەوە[2].**

٦٦٨٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ عَنْ مَالِكٍ عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ قَالَ أَبُو طَلْحَةَ لأُمِّ سُلَيْمٍ لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ضَعِيفاً أَعْرِفُ فِيهِ الْجُوعَ، فَهَلْ عِنْدَكِ مِنْ شَيْءٍ فَقَالَتْ نَعَمْ. فَأَخْرَجَتْ أَقْرَاصاً مِنْ شَعِيرٍ، ثُمَّ أَخَذَتْ خِمَاراً لَهَا، فَلَفَّتِ الْخُبْزَ بِبَعْضِهِ، ثُمَّ أَرْسَلَتْنِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَهَبْتُ فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ وَمَعَهُ النَّاسُ، فَقُمْتُ عَلَيْهِمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَرْسَلَكَ أَبُو طَلْحَةَ». فَقُلْتُ

---

(١) بروانە: ٥٤٢٣.
(٢) چونکە سەرەتا عابس باوکی عەبدوڕەحمان پرسیار لە عائیشە دەکات، لە وەڵامی ئەو دا عائیشە ئەوە باس دەکات وەک لە فەرموودەی ژمارە (٥٤٢٣٩)ـدا بەڕوونی دیارە، وە لێرەشدا ئیمامی بوخاری بۆیە هێناویەتی کە عابیسی بوکی عەبدوڕەحمان بە عائیشە ﵂ گەشتووە و پرسیاری لە عائیشە کردوە. إرشاد الساري:١٤/٩٨.

نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِمَنْ مَعَهُ «قُومُوا». فَانْطَلَقُوا، وَانْطَلَقْتُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ حَتَّى جِئْتُ أَبَا طَلْحَةَ فَأَخْبَرْتُهُ. فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ قَدْ جَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَلَيْسَ عِنْدَنَا مِنَ الطَّعَامِ مَا نُطْعِمُهُمْ. فَقَالَتِ اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. فَانْطَلَقَ أَبُو طَلْحَةَ حَتَّى لَقِيَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَبُو طَلْحَةَ حَتَّى دَخَلَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ «هَلُمِّي يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا عِنْدَكِ». فَأَتَتْ بِذَلِكَ الْخُبْزِ - قَالَ - فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِذَلِكَ الْخُبْزِ فَفُتَّ، وَعَصَرَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ عُكَّةً لَهَا فَأَدَمَتْهُ، ثُمَّ قَالَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ قَالَ «ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ». فَأَذِنَ لَهُمْ فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ خَرَجُوا، ثُمَّ قَالَ «ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ». فَأَذِنَ لَهُمْ، فَأَكَلَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ وَشَبِعُوا، وَالْقَوْمُ سَبْعُونَ أَوْ ثَمَانُونَ رَجُلًا[1].

**٦٦٨٨- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەبو تەڵحە ﷺ بە ئوممو سولەیمی وت: بەڕاستی گوێم لە دەنگی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو نزم و هێواش بوو، هەستم بە برسی بوونی کرد، جا ئایا هیچ شتێکت لایە؟ ئوممو سولەیمیش ﷺ وتی: بەڵێ: ئەنجا چەند کولێرەیەکی جۆی دەرهێنا، پاشان سەرپۆشێکی خۆی هێنا و کولێرەکانی پێچا بەبەشێکیەوە، پاشان (ئوممو سولەیم) ناردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش ڕۆشتم لە مزگەوت پێغەمبەری خوام ﷺ بینی و چەند کەسێکیشی لەگەڵدا بوو، منیش لایاندا وەستام، پێغەمبەری خوا ﷺ بەمنی فەرموو: ((ئەبو تەڵحە ناردویتی؟)) وتم: بەڵێ، ئەنجا فەرمووی بەوانەی لەگەڵیدا بوون: ((هەستن)) جا هاتن منیش لە پێشیانەوە بەپەلە هاتم هەتا گەشتمە لای ئەبو تەڵحە ﷺ و هەواڵەکەم پێدا، ئەبو تەڵحەش وتی: ئەی ئوممو سولەیم بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هات (لەگەڵ خەڵکەکەی) ئێمەش خواردنمان نییە پێیان بدەین، ئەویش وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی چاکتری لێ دەزانن، ئەنجا ئەبو تەڵحە دەرچوو هەتا بەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەشت، ئەوسا پێغەمبەری خوا و ﷺ ئەبو تەڵحە پێکەوە هاتن هەتا ڕۆشتنە ژوورەوە، ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئادەی ئوممو سولەیم چیت هەیە بیهێنە)) ، ئوممو**

(١) بروانە: ٤٢٢.

**سولەیمیش ئەو کولێرە جۆیانەی هێنا-دەڵێ: -ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد ئەو کولێرانە ورد کران، ئوممو سولەیمیش هیزەیەکی هەبوو (کە ڕۆنی تێدابوو)، گوشی تێکەڵی وردە نانەکەی کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی خوا ویستی بیفەرمووی (فەرمووی لە** بسم الله الرحمن الرحيم **و دوعای فەڕ و بەرەکەت)، پاشان فەرمووی: ((مۆڵەت بە دە کەس بدە بێنە ژوورەوە))، ئەویش مۆڵەتی دان، ئەنجا نانیان خوارد تا تێر بوون، پاشان ڕۆشتنە دەرەوە، پاشان فەرمووی: ((مۆڵەت بە دە کەس بدە)) ئەویش مۆڵەتی دان، ئیتر خەڵکەکە هەموویان نانیان خوارد و تێربوون، وە خەڵکەکەش حەفتا یان هەشتا پیاو بوون.**

## ٢٣- بابُ النِّيَّةِ فِي الأَيْمَانِ

٦٦٨٩- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ قَالَ سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ يَقُولُ أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ أَنَّهُ سَمِعَ عَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيَّ يَقُولُ سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[1].

## ٢٣- باسی نیەت لە سوێند خواردندا

**٦٦٨٩- عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((بێگومان هەموو کردەوەکان (ڕاستی و دروستییان) بە نیاز و نیەتەوە پەیوەستە، وە بێگومان مرۆڤ هەر نیەتێکی هەبێ ئەوەی بۆ دەنووسرێ، جا کەواتە هەر کەس کۆچکردنەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بێت، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، هەر کەسیش**

(١) بڕوانە: ١.

کۆچکردنەکەی بۆ بەدەستهێنانی دونیا بێت، یا بۆ مارە کردنی ئافرەتێك بێت، ئەوا کۆچکردنەکەی تەنها بۆ ئەوەیە کە لە پێناویدا کۆچی کردوە[1])).

## ٢٤- بابٌ: إِذَا أَهْدَى مَالَهُ عَلَى وَجْهِ النَّذْرِ وَالتَّوْبَةِ

٦٦٩٠- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ أَخْبَرَنِي يُونُسُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ وَكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِيَ - قَالَ سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ فِي حَدِيثِهِ ( وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا ) فَقَالَ فِي آخِرِ حَدِيثِهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنِّي أَنْخَلِعُ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهْوَ خَيْرٌ لَكَ»[2].

## ٢٤- باسێک: ئەگەر کەسێک ماڵەکەی بەخشی لە ڕووی نەزر و تەوبە کردنەوە[3]

٦٦٩٠- عەبدوڕەحمان لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە گێڕایەوە - کە چاوساغی کەعب بوو لە کوڕەکانیدا کاتێ کوێر بوو بوو - وتی: لە کەعبی کوڕی مالیکم ﷺ بیست دەربارەی بەسەرهاتەکەی خۆی (وە (خوا تەوبەی گیراکرد) لەو سێ کەسەش کە دواخران)[4]، لەکۆتایی باسەکەدا وتی: بەڕاستی من لە تەوبە کردنەکەمدا (دەمەوێت) هەموو سامانەکەم بکەم بەخێر لە ڕێی خوا و پێغەمبەرەکەیدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بەشێك لە ماڵەکەت بهێڵەرەوە بۆ خۆت، ئەوە بۆ تۆ باشترە)).

---

(١) واتە: کۆچ کردنەکە هیچ پاداشتێکی لای خوای گەورە نییە، چونکە بەمەبەستی تر کۆچی کردوە.
(٢) بڕوانە: ٢٧٥٧.
(٣) واتە: نەزری کردبوو ئەگەر خوا تەوبەی لێ قەبوڵ بکات ماڵ و سامانەکەی بکات بەخێر.
(٤) کە خوای گەورە دەربارەیان بڕیاری نەدابوو.

**٢٥- بابٌ: إِذَا حَرَّمَ طَعَامَهُ. وَقَوْلُهُ تَعَالَى:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ ٢ ﴾ التحريم.

**وَقَوْلُهُ:** ﴿ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ ٨٧ ﴾ المائدة

## ٢٥- باسێک: ئەگەر کەسێک خۆراکێک لەسەرخۆی حەرام بکات. وە ئەم فەمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت، تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ لە کاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە، بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان). وە ئەم فەرمایشتەیشی (ئەو شتانەی کە پاک و خۆشن و خوا حەڵاڵی کردوە بۆتان یاساغی مەکەن لە خۆتان)

٦٦٩١- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا الْحَجَّاجُ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: زَعَمَ عَطَاءٌ أَنَّهُ سَمِعَ عُبَيْدَ بْنَ عُمَيْرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَزْعُمُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ أَنَّ أَيَّتَنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتْ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ: «لاَ، بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَلَنْ أَعُودَ لَهُ». فَنَزَلَتْ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ ١ ﴾ التحريم. ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ٤ ﴾ التحريم، لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ، ﴿ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا ٣ ﴾ التحريم. لِقَوْلِهِ: «بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً»[1]. وَقَالَ لِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى: عَنْ هِشَامٍ: «وَلَنْ أَعُودَ لَهُ، وَقَدْ حَلَفْتُ، فَلاَ تُخْبِرِي بِذَلِكَ أَحَدًا».

---

(١) بڕوانە: ٤٩١٢.

**٦٦٩١- عوبەیدی کوڕی عومەیر دەڵێ: لە عائیشەم ﷺ بیست دەیوت کە پێغەمبەری خوا ﷺ لای زەینەبی کچی جەحش دەمایەوە لای ئەو شەربەتی هەنگوینی دەخواردەوە، بۆیە من و حەفصە ڕێککەوتین کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای هەرکاممان پێی بڵێ: بەراستی من بۆنی مەغافیر[1] لە تۆ هەست پێ دەکەم، مەغافیرت خواردووە؟ ئینجا پێغەمبەر ﷺ چووە لای یەکێکیان ئەویش ئەو قسەی پێ وت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نەم خواردووە، لای زینەبی کچی جەحش شەربەتی هەنگوینم خواردۆتەوە، ئیتر بۆی ناگەڕێمەوە (نایخۆمەوە) ))، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت)، تا ئەو جێگایە کە دەفەرمووی: (ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا (جێی خۆیەتی) )، بەعائیشە و حەفصە دەفەرمووێ: (وە کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی لای هەندێ لە ژنەکانی قسەیەکی درکاند) مەبەستی ئەم فەرموودەی بوو:((بەڵکو شەربەتی هەنگوینم خواردووە)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئیبراهیمی کوڕی موسا پێی وتم: لە هیشامەوە (هەمان فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە بەم زیادەیەوە) فەرمووی: ((جارێکی تر ناگەڕێمەوە بۆ خواردنی (هەنگوین)، بێگومان سوێندم خواردووە کەواتە ئەم هەواڵە بە کەس مەڵێ)).**

---

(١) مەغافیر: کە تیرەیە یان جەوییەکی شیرینە و بۆن ناخۆشە. (فتح الباري: ٤٧٢/١٢). جەویەکە لە درەختی عورفوت دێتە دەر و دەخورێ، یان دەکرێتە ناو تورەکە و قوماشەوە لەگەڵ ئاو دەهەژێندرێ و دەخورێتەوە. قاموسی ڕستە: ١٨٧٨/١.

## ٢٦- بابُ الوَفَاءِ بِالنَّذْرِ وَقَوْلِه ﷻ: ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ ﴿٧﴾ ﴾ الإنسان

٦٦٩٢- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بْنُ سُلَيْمَانَ حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الْحَارِثِ أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ أَوَلَمْ يُنْهَوْا عَنِ النَّذْرِ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ «إِنَّ النَّذْرَ لاَ يُقَدِّمُ شَيْئاً، وَلاَ يُؤَخِّرُ، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِالنَّذْرِ مِنَ الْبَخِيلِ»[١].

## ٢٦- باسی (حوکمی) بەجێهێنانی نەزر، وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: ((بەندەکانی خوا) وەفا بە نەزر دەکەن)

**٦٦٩٢- سەعیدی کوڕی حاریس دەڵێ: لە ئیبنو عومەری رضي الله عنهما بیست دەیوت: ئایا ئەوان ڕێگری نەکران لە نەزرکردن؟ بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دڵنیابن نەزرکردن هیچ شتێك نەپێش دەخات و نەدوا دەخات، تەنها ئەوەندەیە بەنەزرکردن هەندێ شت لە ڕەزیل و ڕژدە دەسێنرێت)).**

٦٦٩٣- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ مَنْصُورٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُرَّةَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ «إِنَّهُ لاَ يَرُدُّ شَيْئاً، وَلَكِنَّهُ يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ»[٢].

**٦٦٩٣- عەبدوڵلای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەزرکردنی قەدەغە کرد و فەرمووی: ((بێگومان نەزرکردن هیچ شتێك (ی بڕیاردراو) ناگێڕێتەوە، بەڵکو بە هۆیەوە ماڵی پێ دەردەهێنرێت لە کەسی ڕەزیل و ڕژدە))** [٣].

٦٦٩٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ

---

(١) بڕوانە: ٦٦٠٨.

(٢) بڕوانە: ٦٦٠٨.

(٣) تەنها ڕژدە بەو هۆیە پارە دەکات بەخێر، ئەگەر ئەوە نەبێت هەرگیز خێر ناکات.

قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لاَ يَأْتِي ابْنَ آدَمَ النَّذْرُ بِشَيْءٍ لَمْ يَكُنْ قُدِّرَ لَهُ، وَلَكِنْ يُلْقِيهِ النَّذْرُ إِلَى الْقَدَرِ قَدْ قُدِّرَ لَهُ، فَيَسْتَخْرِجُ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ، فَيُؤْتِيني [1] عَلَيْهِ مَا لَمْ يَكُنْ يُؤْتِي عَلَيْهِ مِنْ قَبْلُ»[2].

**٦٦٩٤-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((نەزرکردن هیچ شتێك بۆ ئادەمیزاد پێش ناهێنێ کە پێشتر بۆی نەنوسرابێ، بەڵام (هەندێ جار) نەزرکردن دەیبات بەرەو ئەو قەدەرەی کە بۆی بڕیار دراوە، جا بە هۆیەوە خوا هەندێ شت لە ڕژدە و ڕەزیل دەسەنێت، جا لەسەر ئەو کارە[3] شتێك بەمن دەبەخشێت کە پێشتر (ئەگەر ئەو کارە نەبوایە) نەیدەبەخشی)).**

## ٢٧- بابُ إِثْمِ مَنْ لاَ يَفِي بِالنَّذْرِ

٦٦٩٥- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ عَنْ يَحْيَى عَنْ شُعْبَةَ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو جَمْرَةَ حَدَّثَنَا زَهْدَمُ بْنُ مُضَرِّبٍ قَالَ سَمِعْتُ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ - قَالَ عِمْرَانُ لاَ أَدْرِي ذَكَرَ ثِنْتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً بَعْدَ قَرْنِهِ - ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ يَنْذُرُونَ وَلاَ يَفُونَ، وَيَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ»[4].

## ٢٧- باسی تاوانی ئەو کەسەی نەزرەکە بەجێ نەهێنێ

**٦٦٩٥- زەهدەمی کوڕی موزەڕیب وتی: لە عیمرانی کوڕی حوصەینم ﷺ بیست لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوەکە فەرموویەتی: ((چاکترینتان (خەڵکی)**

(١) لە هەندی ڕیوایەتی ئیمامی بوخاریدا بە (فَيُؤْتِي عَلَيْهِ مَا لَمْ يَكُنْ يُؤْتِي عَلَيْهِ مِنْ قَبْلُ) گێردراوەتەوە، کە ماناکەی بەم جۆرەی لێدێت: شتێک دەبەخشێت لەسەر ئەو کارەی نەزری بۆ کردوە، کە پێشتر ئەوەی نەدەبەخشی (ئەگەر ئەو کارە نەبوایە).

(٢) بڕوانە: ٦٦٠٩.

(٣) کە بەهۆیەوە نەزرەکەی کردوە وەک چاکبوونەوەی نەخۆش.

(٤) بڕوانە: ٢٦٥١.

چەرخی منە، پاشان ئەوانەی دوا ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوا ئەوان دێن))، عیمران دەڵێ: نازانم ئایا پێغەمبەر ﷺ دوا چەرخی خۆی دوو یان سێ چەرخی فەرمووو: ((پاشان کەسانێك دێن نەزر دەکەن و نایبەنە سەر، وە خیانەت دەکەن و ئەمانەت ناپارێزن، وە شایەتی دەدەن کە داوای شایەتیدانیان لێ نەکراوە، وە لەناویاندا قەڵەوی پەیدا دەبێت و دەردەکەوێت)).

## ٢٨- بابُ النَّذْرِ فِي الطَّاعَةِ

﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ ﴾ البقرة

٦٦٩٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا مَالِكٌ عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ الْمَلِكِ عَنِ الْقَاسِمِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ»[1].

## ٢٨- باسی (حوکمی) نەزرکردن لە فەرمانبەرداری خوادا

## (ئەوەی بەخشتان کرد بێ لە چاکە یا نەزرێکتان بڕیار دابێ، ئەوە بێگومان خوا ئاگای لێیە، وە هیچ یارمەتیدەرێک نییە بۆ ستەمکاران)

٦٦٩٦- عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس نەزری کرد فەرمانبەرداری خودا بێت، ئەوە بافەرمانبەرداری بکات، هەر کەسیش نەزری کرد سەرپێچی خودا بکات، ئەوە با سەرپێچی نەکات)).

---

(١) بروانە: ٦٧٠٠.

## ٢٩- بابٌ: إِذَا نَذَرَ أَوْ حَلَفَ أَنْ لاَ يُكَلِّمَ إِنْسَاناً فِي الْجَاهِلِيَّةِ ثُمَّ أَسْلَمَ

٦٦٩٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ. قَالَ «أَوْفِ بِنَذْرِكَ»[١].

## ٢٩- باسێک: ئەگەر کەسێک لە نەفامیدا نەزری کردبوو یان سوێندی خوارد بوو کە قسە لەگەڵ کەسێکدا نەکات لە پاش نەزرەکە مسوڵمان بوو[٢]

**٦٦٩٧- عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە سەردەمی نەفامیدا نەزرم کرد شەوێك لە مەسجیدو لحەرام (کەعبە)دا ئیعتیکاف بکەم؟ فەرمووی: ((دەی نەزرەکەت جێبەجێ بکە)).**

## ٣٠- بابُ مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ نَذْرٌ

وَأَمَرَ ابْنُ عُمَرَ امْرَأَةً جَعَلَتْ أُمُّهَا عَلَى نَفْسِهَا صَلاَةً بِقُبَاءٍ فَقَالَ صَلِّي عَنْهَا. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ نَحْوَهُ.

## ٣٠- باسی (حوکمی) کەسێک بمرێت و نەزرێک قەرزار بێت[٣]

**ئیبنو عومەر ﷺ فەرمانی کرد بەژنێك کە دایکی کردنی نوێژێکی لە مزگەوتی قوبا لەسەر خۆی نەزر کردبوو، پێی وت: لە جیاتی دایکت نوێژەکە بکە.ئیبنو عەبباسیش ﷺ هاوشێوەی ئەو وتەی ئیبنو عومەر هەیە.**

(١) بڕوانە: ٢٠٣٢.

(٢) ئایا پێویستە لەسەر نەزرەکەی یا سوێندەکەی بەجێ بێنێ.

(٣) بۆ قەزا دەکرێتەوە یانا؟

٦٦٩٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ الأَنْصَارِيَّ اسْتَفْتَى النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ. فَأَفْتَاهُ أَنْ يَقْضِيَهُ عَنْهَا، فَكَانَتْ سُنَّةً بَعْدُ[1].

**٦٦٩٨-عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاری ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی نەزرێك کە لەسەر دایکی بوو، ئینجا دایکی مرد پێش ئەوەی نەزرەکەی جێ بەجێ بکات، پێغەمبەریش ﷺ فەتوای بۆدا کە لە جیاتی دایکی بۆی بگێڕێتەوە، ئیتر ئەوە دواتر بویە سوننەت[2].**

٦٦٩٩- حَدَّثَنَا آدَمُ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي بِشْرٍ قَالَ سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ لَهُ إِنَّ أُخْتِي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ وَإِنَّهَا مَاتَتْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «لَوْ كَانَ عَلَيْهَا دَيْنٌ أَكُنْتَ قَاضِيَهُ». قَالَ نَعَمْ. قَالَ «فَاقْضِ اللَّهَ، فَهْوَ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ»[3].

**٦٦٩٩-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ عەرزی کرد: بێگومان خوشکەکەم نەزری کرد حەج بکات و مرد (و نەزرەکەی بەجێ نەهێنا)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر خوشکەکەت قەرزار بوایە ئایا قەرزەکەت دەدایەوە؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((دەی قەرزەکەی خواش بدەرەوە، چونکە قەرزی خوا لە پێشترە کە بدرێتەوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٦١.

(٢) هەر کەس مرد و نەزر قەرزار بوو کەس و کارەکەی بۆی بکەن و قەزای کەنەوە بۆی.

(٣) بڕوانە: ١٨٥٢.

## ٣١- بابُ النَّذْرِ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ وَفِى مَعْصِيَةٍ

٦٧٠٠- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ عَنْ مَالِكٍ عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ الْمَلِكِ عَنِ الْقَاسِمِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ قَالَ النَّبِىُّ ﷺ «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ»[١].

## ٣١- باسی (حوکمی) نەزرکردن دەربارەی شتێک کەسەکە نەیبێت، وە نەزرکردن لە شێتکدا کە تاوان و گوناهە

**٦٧٠٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هەر کەس نەزری کرد فەرمانبەرداری خودا بێت، ئەوا با فەرمان بەرداری بکات، هەر کەسیش نەزری کرد سەرپێچی خودا بکات، ئەوا با سەرپێچی نەکات))**

.٦٧٠١- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ حُمَيْدٍ عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِىِّ ﷺ قَالَ «إِنَّ اللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ». وَرَآهُ يَمْشِى بَيْنَ ابْنَيْهِ[٢]. وَقَالَ الْفَزَارِىُّ عَنْ حُمَيْدٍ حَدَّثَنِى ثَابِتٌ عَنْ أَنَسٍ.

**٦٧٠١-ئەنەس ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: ((بەڕاستی خوا پێویستی بەوە نییە کە ئەمە ئازاری خۆی بدات))، لە کاتێکدا بینی لە نێوانی دوو کوڕەکەیدا دەڕۆشت بەڕێگادا (خۆی دابوو بەسەر شانی هەردووکیاندا)[٣].**

**-فەزاریی لە حومەیدەوە گێڕایەوە وتی: سابیت بۆی گێڕامەوە لە ئەنەسەوە ﵁.**

---

(١) بڕوانە: ٦٦٩٦.

(٢) بڕوانە: ١٨٦٥.

(٣) مەبەست ئەوەیە ئەو پیاوە نەزری کردبوو کە بەپێ بڕوات بۆ حەج.

٦٧٠٢- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ عَنْ سُلَيْمَانَ الأَحْوَلِ عَنْ طَاوُسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِىَّ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِزِمَامٍ أَوْ غَيْرِهِ، فَقَطَعَهُ[1].

**٦٧٠٢- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی تەواف دەکرد بەدەوری کەعبەدا، (کەسێکی تر) بە ڕەشۆیەك یا شتێکی تر (ڕادەکێشا)، پێغەمبەریش ﷺ پچڕاندی.**

٦٧٠٣- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى أَخْبَرَنَا هِشَامٌ أَنَّ ابْنَ جُرَيْجٍ أَخْبَرَهُمْ قَالَ أَخْبَرَنِى سُلَيْمَانُ الأَحْوَلُ أَنَّ طَاوُساً أَخْبَرَهُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِىَّ ﷺ مَرَّ وَهْوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِإِنْسَانٍ يَقُودُ إِنْسَاناً بِخِزَامَةٍ فِى أَنْفِهِ، فَقَطَعَهَا النَّبِىُّ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَقُودَهُ بِيَدِهِ[2].

**٦٧٠٣- سولەیمانی ئەحوەل دەگێڕێتەوە کە تاووس لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ بۆی گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ تەواف دەکرد بەدەوری کەعبەدا، بەلای کەسێکدا تێپەڕی کەسێکی تری ڕادەکێشا بەپەتێك کردبوویە لوتیەوە[3]، پێغەمبەریش بەدەستی پەتەکەی پچڕاند، لە پاشان فەرمانی پێ کرد کە بەدەستی ڕایکێشێت.**

٦٧٠٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ بَيْنَا النَّبِىُّ ﷺ يَخْطُبُ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَائِمٍ فَسَأَلَ عَنْهُ فَقَالُوا أَبُو إِسْرَائِيلَ نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلاَ يَقْعُدَ وَلاَ يَسْتَظِلَّ وَلاَ يَتَكَلَّمَ وَيَصُومَ. فَقَالَ النَّبِىُّ ﷺ «مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ». قَالَ عَبْدُ الْوَهَّابِ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ النَّبِىِّ ﷺ.

---

(١) بڕوانە: ١٦٢٠.

(٢) بڕوانە: ١٦٢٠.

(٣) وەک لووتەوانە کردبوویە لوتیەوە بۆ ئەوەی ئاسان ڕایکێشێت.

**٦٧٠٤-ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا پیاوێکی بینی ڕاوەستابوو، ئەویش لە بارەیەوە پرسیاری کرد، ئەوانیش وتیان: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە نەزری کردوە کە هەر بە پێوەبێت و دانەنیشێت، نەڕواتە سێبەر و قسە نەکات ، وە بەڕۆژووش بێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((فەرمانی پێ بکە (بەناوی منەوە) با قسە بکات و بڕواتە سێبەر و دانیشێت، با ڕۆژووەکەی تەواو بکات)). عبدولوەهاب دەڵێ: ئەیوب بۆی گێڕاینەوە لە عیکریمەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**

## ٣٢- بابُ مَنْ نَذَرَ أَنْ يَصُومَ أَيَّامًا فَوَافَقَ النَّحْرَ أَوِ الفِطْرَ

٦٧٠٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ الْمُقَدَّمِيُّ حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ حَدَّثَنَا حَكِيمُ بْنُ أَبِي حُرَّةَ الأَسْلَمِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ نَذَرَ أَنْ لاَ يَأْتِيَ عَلَيْهِ يَوْمٌ إِلاَّ صَامَ، فَوَافَقَ يَوْمَ أَضْحًى أَوْ فِطْرٍ. فَقَالَ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ، لَمْ يَكُنْ يَصُومُ يَوْمَ الأَضْحَى وَالْفِطْرِ، وَلاَ يَرَى صِيَامَهُمَا[1].

## ٣٢- باسی (حوکمی ) کەسێک نەزر بکات چەند ڕۆژێک بەڕۆژوو بێت، جا ڕۆژەکان کەوتە جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزانەوە[2]

**٦٧٠٥-حەکیمی کوڕی ئەبی حوڕەی ئەسلەمی دەگێڕێتەوە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ﵄ بیست، پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێك نەزری کردبێ کە**

---

(١) بڕوانە: ١٩٩٤.

(٢) ئایا بەڕۆژوو بێت یان بیگۆڕێ بەچەند ڕۆژێکی تر یان کەفارەتی بدات.

هەر ڕۆژێکی بەسەردا بێت بەڕۆژوو بێت، جا ئەو ڕۆژە کەوتە جەژنی قوربان یان جەژنی ڕەمەزانەوە، عەبدوڵڵاش وتی: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا ﷺ جوانترین سەرمەشقی بۆ ئێوە هەیە، کە خۆی ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان بەڕۆژوو نەدەبوو، وە ڕازیش نەبوو لە بەڕۆژوو بوونیان.

٦٧٠٦- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ عَنْ يُونُسَ عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ فَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ نَذَرْتُ أَنْ أَصُومَ كُلَّ يَوْمِ ثَلاَثَاءَ أَوْ أَرْبِعَاءَ مَا عِشْتُ، فَوَافَقْتُ هَذَا الْيَوْمَ يَوْمَ النَّحْرِ. فَقَالَ أَمَرَ اللَّهُ بِوَفَاءِ النَّذْرِ، وَنُهِينَا أَنْ نَصُومَ يَوْمَ النَّحْرِ. فَأَعَادَ عَلَيْهِ فَقَالَ مِثْلَهُ، لاَ يَزِيدُ عَلَيْهِ[1].

٦٧٠٦-زیادی کوڕی جوبەیر دەڵێ: من لەگەڵ ئیبنو عومەردا ﷺ بووم، پیاوێك پرسیاری لێ کرد و وتی: نەزرم کردوە هەتا لە ژیاندابم کە هەموو ڕۆژێکی سێ شەممە یان چوارشەممە بەڕۆژوو بم، ئینجا ئەو ڕۆژە کەوتە ڕۆژی جەژنی قوربانەوە، ئەویش وتی: خوا فەرمانی کردوە نەزر جێبەجێ بکرێ، لە هەمان کاتدا ڕێگریمان لێ کراوە ڕۆژی جەژنی قوربان بەڕۆژوو بین، پیاوەکە پرسیارەکەی دووبار لێ کردەوە عەبدوڵڵاش هەر وەڵامەکەی پێشووی دایەوە هیچ لێ زیاد نەکرد.

## ٣٣- بابٌ: هَلْ يَدْخُلُ فِي الأَيْمَانِ وَالنُّذُورِ الأَرْضُ وَالْغَنَمُ وَالزُّرُوعُ وَالأَمْتِعَةُ؟

- وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ قَالَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَصَبْتُ أَرْضاً لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ أَنْفَسَ مِنْهُ. قَالَ «إِنْ شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا»[2].

-وَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَحَبُّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرُحَاءَ. لِحَائِطٍ لَهُ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ.

---

(١) بڕوانە: ١٩٩٤.

(٢) بڕوانە: ٢٧٣٧.

## ٣٣- باسێک: ئایا سوێند و نەزرکردن دەربارەی زەوی و مەڕ و ماڵات و کشتوکاڵ و کەل و پەل دروستە؟

-ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: عومەر ﵁ عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد زەوییەکم بەرکەوتووە هەرگیز ماڵی وا بەنرخم دەست نەکەوتووە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر حەز دەکەیت و بتەوێ خودی زەویەکە دەکەیتە وەقف و بەر و بوومەکەی دەکەیت بەخێر)).

-وە ئەبو تەڵحە ﵁ عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: خۆشەویستری ماڵم بەلامەوە بەیروحایە. بە باخێکی خۆی دەڵێ بەرانبەری مزگەوت بوو (لە مەدینە).

٦٧٠٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ عَنْ أَبِي الْغَيْثِ مَوْلَى ابْنِ مُطِيعٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَباً وَلاَ فِضَّةً إِلاَّ الأَمْوَالَ وَالثِّيَابَ وَالْمَتَاعَ، فَأَهْدَى رَجُلٌ مِنْ بَنِي الضُّبَيْبِ يُقَالُ لَهُ رِفَاعَةُ بْنُ زَيْدٍ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُلاَماً يُقَالُ لَهُ مِدْعَمٌ، فَوَجَّهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى وَادِي الْقُرَى حَتَّى إِذَا كَانَ بِوَادِي الْقُرَى بَيْنَمَا مِدْعَمٌ يَحُطُّ رَحْلاً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَهْمٌ عَائِرٌ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ النَّاسُ هَنِيئاً لَهُ الْجَنَّةُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «كَلاَّ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ الشَّمْلَةَ الَّتِي أَخَذَهَا يَوْمَ خَيْبَرَ مِنَ الْمَغَانِمِ، لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ، لَتَشْتَعِلُ عَلَيْهِ نَاراً». فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ النَّاسُ جَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أَوْ شِرَاكَيْنِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ «شِرَاكٌ مِنْ نَارٍ - أَوْ - شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ»[1].

٦٧٠٧- ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا لە ڕۆژی (غەزای) خەیبەردا ڕۆشتین[2]، نە ئاڵتوون نەزیومان دەستکەوت نەبوو[3]، بەڵکو ماڵ[1] و

---

(١) بڕوانە: ٤٢٣٤.

(٢) خەیبەرمان ئازاد کرد.

(٣) بەغەنیمەت نەمان گرت.

کاڵا و کەل و پەلمان بە غەنیمەت گرت، ئینجا پیاوێکی بەنی زوبەیب کە پێ دەوترا: ڕیفاعەی کوڕی زەید کۆیلەیەکی کە پێ دەوترا میدعەم بە دیاری دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو وادی لقورا[٢] ڕۆشت، هەتا کاتێ لە وادی لقورادا بوو، لە کاتێکدا میدعەم باری وڵاخێکی پێغەمبەری خوای ﷺ دادەگرت، لە ناکاو تیرێکی وێڵ هات و کوشتی، ئینجا خەڵکەکە وتیان: بەهەشتی لێ پیرۆز بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((نەخێر (وانییە)، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، بەڵکو ئەو شاڵەی لە ڕۆژی (غەزای) خەیبەردا لە دەست کەوتەکان بردبووی کە هێشتا دابەش نەکرابوو بۆتە ئاگر و دەیسوتێنێت))، جا کاتێ خەڵکێك ئەم فەرموودەی گوێ لێ بوو پیاوێك چەرمێك یان دوو چەرمی سەری پێڵاوی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ((چەرمێکی سەری پێڵاو لە ئاگر))، یان ((دوو چەرمی سەری پێڵاو لە ئاگر)).

---

(١) دەگونجێ مەبەستی بە ماڵ باخ و زەوی و شتی لەو جۆرە بێت، یان مەبەستی بە ماڵ ئەو شتانە بێت، دوا ماڵ کە هێناویەتی کاڵا و وشتر و کەلو پەل...

(٢) وادی لقورا: جێگایەکە نزیک مەدینە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٨٤- كِتَابُ كفارات الأيمان

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## ٨٤- پەڕاوی کەفارەت و بریتی سوێندەکان

### ١- باب كفارات الأيمان

**وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى** ﴿فَكَفَّـٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَـٰكِينَ ﴿٨٩﴾﴾ **المائدة. وَمَا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ نَزَلَتْ** ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴿١٩٦﴾﴾ **البقرة**

وَيُذْكَرُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ وَعَطَاءٍ وَعِكْرِمَةَ: مَا كَانَ فِي الْقُرْآنِ: أَوْ أَوْ، فَصَاحِبُهُ بِالْخِيَارِ، وَقَدْ خَيَّرَ النَّبِيُّ ﷺ كَعْبًا فِي الْفِدْيَةِ[1].

### ١- باسی کەفارەتی سوێندەکان

وە ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (جا کەفارەتی (سڕینەوەی شکاندنی) ئەو سوێندانە: خۆراک دانی دە هەژارە )، وە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ( ئەوە با بریتی یەک بدات (سێ ڕۆژ) ڕۆژوو بێ، یان خێرێک بێ، یان قوربانیەک بێ)

(١) بڕوانە: ٦٧٠٨.

-وە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ و عەتا و عیکریمەوە گێڕدراوەتەوە: ئەوەی لە قورئاندا، بە (أَوْ أَوْ) واتە: (یان یان)[1] ئەوە خاوەنەکەی سەرپشکە (کامیان بکات). وە پێغەمبەریش ﷺ کەعبی ﷺ سەرپشك کرد لە کەفارەت دانەکەیدا[2].

٦٧٠٨- حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ حَدَّثَنَا أَبُو شِهَابٍ عَنِ ابْنِ عَوْنٍ عَنْ مُجَاهِدٍ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ أَتَيْتُهُ يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «ادْنُ». فَدَنَوْتُ فَقَالَ «أَيُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ». قُلْتُ نَعَمْ. قَالَ «فِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ». وَأَخْبَرَنِي ابْنُ عَوْنٍ عَنْ أَيُّوبَ قَالَ صِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، وَالنُّسُكُ شَاةٌ، وَالْمَسَاكِينُ سِتَّةٌ[3].

٦٧٠٨-عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا لە کەعبی کوڕی عوجرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: چوومە خزمەتی - واتە پێغەمبەر ﷺ - فەرمووی: ((نزیك بەرەوە)) منیش نزیك بوومەوە، فەرمووی: ((ئایا ئەو جانەورانە بەسەرتەوەیە ئازارت دەدەن؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((دەی بریتییەك بدە کە ڕۆژوو (ی سێ ڕۆژە)، یاخێرێك بکە، یان قوربانیەك بکە)).

(ئیبنو شیهاب دەڵێ) ئیبنو عەون بۆی گێڕامەوە لە ئەییوبەوە وتی: ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژە، وە سەربڕینی مەڕێکە و، (خواردنی) شەش هەژارە.

## ٢- بابُ قَوْلِهِ تَعَالَى ﷻ

﴿ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَـٰنِكُمْ ۚ وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾ التحريم، مَتَى تَجِبُ الْكَفَّارَةُ عَلَى الْغَنِيِّ وَالْفَقِيرِ؟

---

(١) وەک ئەوەی لە ئایەتەکەدا هاتووە دەربارەی کەفارەتی سوێند.

(٢) لە فەرموودەکەی پاش خۆیدا هاتووە بە ژمارە (٦٧٠٨).

(٣) بڕوانە: ١٨١٤.

٦٧٠٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ سَمِعْتُهُ مِنْ فِيهِ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ هَلَكْتُ. قَالَ «مَا شَأْنُكَ». قَالَ وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ «تَسْتَطِيعُ تُعْتِقُ رَقَبَةً». قَالَ لاَ. قَالَ «فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ». قَالَ لاَ. قَالَ: «فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِيناً». قَالَ لاَ. قَالَ «اجْلِسْ». فَجَلَسَ فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ - وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ الضَّخْمُ - قَالَ «خُذْ هَذَا، فَتَصَدَّقْ بِهِ». قَالَ أَعَلَى أَفْقَرَ مِنَّا، فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ قَالَ: «أَطْعِمْهُ عِيَالَكَ»[1].

## ٢- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ

## (بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتان، خوا پشتیوان و دۆستی ئێوەیە، وە ئەو زانای کار دروستە))، وە کەی کەفارەت لەسەر دەوڵەمەند و هەژار واجب دەبێت؟

**٦٧٠٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: تیاچووم، فەرمووی: ((چیتە؟)) وتی: لەگەڵ هاوسەرەکەمدا لە ڕەمەزاندا سەر جێیم کردوە، فەرمووی: ((دەتوانیت بەندەیەك ئازادی بکەیت؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی دەتوانیت دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بیت؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی دەتوانی خواردنی شەست هەژار بدەیت؟)) وتی: نەخێر. فەرمووی: ((دانیشە))، پیاوەکە دانیشت، ئینجا زەمیلەیەکی گەورە هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ خورمای تێدا بوو - الْعَرَقُ: واتە زەمیلەیەکی گەورە - فەرمووی: ((ئەمە بکە بەخێر)) وتی: بیدەم بە لە خۆمان هەژارتر، پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی هەتا ددانە خرێکانی دەرکەوتن، فەرمووی: ((بیدە بە ماڵ و منداڵەکانت بیخۆن)).**

---

(١) بڕوانە: ١٩٣٦.

## ٣- بابُ مَنْ أعَانَ الْمُعْسِرَ فِي الكَفَّارَةِ

٦٧١٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مَحْبُوبٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِىِّ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ هَلَكْتُ. فَقَالَ «وَمَا ذَاكَ». قَالَ وَقَعْتُ بِأَهْلِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ: «تَجِدُ رَقَبَةً». قَالَ لاَ. قَالَ «هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ». قَالَ لاَ. قَالَ «فَتَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِيناً». قَالَ لاَ. قَالَ فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ بِعَرَقٍ - وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ فِيهِ تَمْرٌ - فَقَالَ «اذْهَبْ بِهَذَا، فَتَصَدَّقْ بِهِ». قَالَ عَلَى أَحْوَجَ مِنَّا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ مِنَّا. ثُمَّ قَالَ «اذْهَبْ، فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ»[1].

## ٣- باسی کەسێک یارمەتی نەبوویەک بدات لە کەفارەت دانەکەیدا

**٦٧١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: تیاچووم، فەرمووی: ((چی بووە؟)) وتی: لەگەڵ هاوسەرەکەمدا لە ڕەمەزاندا سەر جێیم کردوە، فەرمووی: ((بەندەیەکت هەیە (ئازادی کەیت)؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی دەتوانیت دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بیت؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی دەتوانی خواردنی شەست هەژار بدەیت؟)) وتی: نەخێر، ئینجا پیاوێکی ئەنصاری زەمیلەیەکی گەورەی هێنا - الْعَرَقُ: واتە: زەمیلەیەکی گەورە - خورمای تێدا بوو، ئینجا فەرمووی: ((برۆ ئەمە بەرەو بیکە بەخێر))، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیدەم بە لە خۆمان هەژارتر؟ سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق ناردووە لە نێوان دوو بەردەلانە ڕەشەکەیدا لە ئێمە هەژارتری تێدا نییە، پاشان فەرمووی: ((برۆ بیدە بە ماڵ و منداڵەکانت بیخۆن)).**

---

(١) بڕوانە: ١٩٣٦.

## ٤- بابٌ: يُعْطِي فِي الْكَفَّارَةِ عَشَرَةَ مَسَاكِينَ، قَرِيبًا كَانَ أَوْ بَعِيدًا

٦٧١١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ حُمَيْدٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ هَلَكْتُ. قَالَ «وَمَا شَأْنُكَ». قَالَ وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ «هَلْ تَجِدُ مَا تُعْتِقُ رَقَبَةً». قَالَ لاَ. قَالَ «فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ». قَالَ لاَ. قَالَ «فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِيناً». قَالَ لاَ أَجِدُ. فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ فَقَالَ: «خُذْ هَذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ». فَقَالَ أَعَلَى أَفْقَرَ مِنَّا؟ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَفْقَرُ مِنَّا. ثُمَّ قَالَ «خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ»[1].

## ٤- باسێک: لە کەفارەتدا (ئەوەی کەفارەتەکەی لەسەرە) خۆراک دەدات بە دە هەژار نزیک بن یان دوور[2]

**٦٧١١- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: تیاچووم، فەرمووی: ((چیتە؟)) وتی: لەگەڵ هاوسەرەکەمدا لە ڕەمەزاندا سەر جێیم کردوە، فەرمووی: ((ئایا هەتە بەندەیەك ئازادی بکەیت؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی دەتوانیت دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بیت؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئەی دەتوانی خواردنی شەست هەژار بدەیت؟)) ووتی: نەخێر. ئینجا زەمیلەیەکی گەورەی هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ خورمای تێدا بوو، ئینجا فەرمووی: ((ئەمە بەرەو بیکە بەخێر)) ، وتی: بیدەم بە لەخۆمان هەژارتر؟ لە نێوان دوو بەردەڵانە ڕەشەکەیدا لە ئێمە هەژارتری تێدا نییە. پاشان فەرمووی: ((بیبە بیدە بە ماڵ و منداڵەکانت بیخۆن)).**

(١) بڕوانە: ١٩٣٦.

(٢) واتە: خزم بن، هەژارەکان یان بێگانەبن دروستە خۆراکەکەیان پێ بدات.

## ٥- بابُ صَاعِ الْمَدِينَةِ وَمُدِّ النَّبِيِّ ﷺ وَبَرَكَتِهِ وَمَا تَوَارَثَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذَلِكَ قَرْناً بَعْدَ قَرْنٍ

٦٧١٢- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ بْنُ مَالِكٍ الْمُزَنِيُّ حَدَّثَنَا الْجُعَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ كَانَ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ مُدًّا وَثُلُثاً بِمُدِّكُمُ الْيَوْمَ فَزِيدَ فِيهِ فِي زَمَنِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ[1].

## ٥- باسی (ڕوونکردنەوەی) ڕەبەی [2] مەدینە و مشتی پێغەمبەر ﷺ وە دوعای بەرەکەتی پێغەمبەر ﷺ بۆیان، وە باسی ئەوەی کە خەڵکی مەدینە پشتا و پشت نەوە لە دوای نەوە ئەو ڕەبەیان بۆ ماوەتەوە

**٦٧١٢-سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: ڕەبە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مشتێك و یەك لەسەر سێی مشتێك بوو بەم مشتەی ئەمڕۆی ئێوە، ئینجا لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا لێی زیاد کرا.**

٦٧١٣- حَدَّثَنَا مُنْذِرُ بْنُ الْوَلِيدِ الْجَارُودِيُّ حَدَّثَنَا أَبُو قُتَيْبَةَ - وَهْوَ سَلْمٌ- حَدَّثَنَا مَالِكٌ عَنْ نَافِعٍ قَالَ كَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي زَكَاةَ رَمَضَانَ بِمُدِّ النَّبِيِّ ﷺ الْمُدِّ الأَوَّلِ، وَفِي كَفَّارَةِ الْيَمِينِ بِمُدِّ النَّبِيِّ ﷺ. قَالَ أَبُو قُتَيْبَةَ قَالَ لَنَا مَالِكٌ مُدُّنَا أَعْظَمُ مِنْ مُدِّكُمْ وَلاَ نَرَى الْفَضْلَ إِلاَّ فِي مُدِّ النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ لِي مَالِكٌ لَوْ جَاءَكُمْ أَمِيرٌ فَضَرَبَ مُدًّا أَصْغَرَ مِنْ مُدِّ النَّبِيِّ ﷺ بِأَيِّ شَيْءٍ كُنْتُمْ تُعْطُونَ قُلْتُ كُنَّا نُعْطِي بِمُدِّ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ أَفَلاَ تَرَى أَنَّ الأَمْرَ إِنَّمَا يَعُودُ إِلَى مُدِّ النَّبِيِّ ﷺ.

**٦٧١٣-ئەبو قوتەیبە - کە ناوی سەلمە - دەڵێ: مالیك بۆی گێڕاینەوە لە نافیعەوە دەڵێ: ئیبنو عومەر ﵄ سەرفیترەی ڕەمەزانی بە (ئەندازەی) مشتی پێغەمبەر ﷺ**

---

(١) بڕوانە: ١٨٥٩.

(٢) ڕەبەیەک: شەش مشت دانەوێڵەیە. بڕوانە: فەرهەنگۆکی ئەحمە، دانراوی: مامۆستا شێخ مەعروفی نۆدێ. چاپی سێیەم. ل ٤٣، ئەلمونجد بەکوردی:١٠٨/٣.

دەدا، كە مشتی یەکەم جارە [١]، وە بۆ کەفارەت دانی سوێندیش هەر بەمشتی پێغەمبەر ﷺ دەیدا. ئەبو قوتەیبە دەڵێ: مالیك پێی وتین: مشتی ئێمە [٢] گەورەترە لە مشتی ئێوە [٣]، وە فەزڵ و گەورەیی هەر لە مشتی پێغەمبەر دایە ﷺ. (قوتەیبە) وتی: مالیك پێی وتم:ئەگەر لێپرسراوێك بێت و مشتێ دیاری بکات بچووکتر لە مشتی پێغەمبەر ﷺ، ئێوە بە پێوانەی چی (سەرفیترە و کەفارەت) دەدەن؟ وتم: ئێمە بە (ئەندازەی) مشتی پێغەمبەر ﷺ دەیدەین، وتی: دەی تۆ وا نازانیت کە بێگومان بڕیار و کارەکە بە دڵنیاییەوە دەگەڕێتەوە بۆ (ئەندازەی) مشتی پێغەمبەر ﷺ.

٦٧١٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مِكْيَالِهِمْ وَصَاعِهِمْ وَمُدِّهِمْ»[٤].

**٦٧١٤-ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خوایە بەرەکەت بخەیتە پێوانە و مەن و مشتیانەوە)).**

## ٦- بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴿٨٩﴾﴾ المائدة، وَأَيُّ الرِّقَابِ أَزْكَى؟

٦٧١٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحِيمِ حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ رُشَيْدٍ حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ عَنْ أَبِي غَسَّانَ مُحَمَّدِ بْنِ مُطَرِّفٍ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ عَنْ سَعِيدِ ابْنِ مَرْجَانَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً، أَعْتَقَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْواً مِنَ النَّارِ، حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ»[٥].

---

(١) واتە: مشتی پێغەمبەر ﷺ سەردەمی ئەو نەک مشتی هیشام، کە دواتر دانرابوو کە زیاتر و گەورەتر بوو لە مشتی یەکەم جار.
(٢) کە مشتی مەدینەیە و مشتی پێغەمبەرە ﷺ.
(٣) کە مشتی شام و هیشامە.
(٤) بڕوانە: ٢١٣٠.
(٥) بڕوانە: ٢٥١٧.

## ٦- باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ[1]: (یان ئازاد کردنی بەندەیەک) وە (ئازادکردنی) کام بەندە چاکتر و گەورەترە؟

**٦٧١٥-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەر کەس کۆیلەیەکی مسوڵمان ئازاد بکات، خوا بەهەر ئەندامێکی ئەو کۆیلەیە ئەندامێکی ئەو کەسە [2] لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەکات، هەتا دامێنی بەدامێنی ئازاد دەکات)).**

## ٧- بابُ عِتْقِ الْمُدَبَّرِ وَأُمِّ الْوَلَدِ وَالْمُكَاتَبِ فِى الْكَفَّارَةِ، وَعِتْقِ وَلَدِ الزِّنَا

وَقَالَ: طَاوُسٌ يُجْزِئُ الْمُدَبَّرُ وَأُمُّ الْوَلَدِ.

٦٧١٦- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ أَخْبَرَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ عَمْرٍو عَنْ جَابِرٍ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ دَبَّرَ مَمْلُوكاً لَهُ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ فَبَلَغَ النَّبِىَّ ﷺ فَقَالَ «مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّى». فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ النَّحَّامِ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَسَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ عَبْداً قِبْطِيًّا مَاتَ عَامَ أَوَّلَ[3].

## ٧- باسی (حوکمی) ئازادکردنی کۆیلەی چاوەڕوان کراو، وە دایکی منداڵ و نوسراو لەگەڵ کراو لە کەفارەتدا، وە (حوکمی) منداڵی زینا[4]

**-تاووس دەڵێ: کۆیلەی چاوەڕوان کراو[5] و دایکی منداڵ (کە جاریە بێت) دروستە لە کەفارەتدا بدرێت.**

---

(١) کە دەربارەی کەفارەتی سوێندە.

(٢) ئازادکەری کۆیلەکە.

(٣) بڕوانە: ٢١٤١.

(٤) واتە: منداڵێ هی ژن و پیاوێک بێت زینایان لەگەڵ یەکتری کردبێت، ئەو منداڵە لەو ژنە بووێت.

(٥) کۆیلەیەک دوای مردنی خاوەنەکەی ئازاد بێت.

٦٧١٦-جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی ئەنصاری کۆیلەیەکی خۆیی ئازاد کرد پاش مردنی خۆی، جگە لەو کۆیلەیەش هیچ ماڵ و سامانێکی نەبوو، جا ئەو هەواڵە گەشت بە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کێ ئەم (کۆیلەیەم) لێ دەکڕێت؟)). ئینجا نوعەیمی کوڕی نەححام بە هەشت سەد درهەم لێی کڕی، (عەمر دەڵێ) جا لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵام بیست دەیوت: (کۆیلە چاوەڕوان کراوەکە) کۆیلەیەکی قیبطی بوو، هەر لە یەکەم ساڵدا مرد.

## ٨- بابٌ: إِذَا أَعْتَقَ فِي الْكَفَّارَةِ لِمَنْ يَكُونُ وَلاَؤُهُ؟

٦٧١٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنِ الْحَكَمِ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنِ الأَسْوَدِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ فَاشْتَرَطُوا عَلَيْهَا الْوَلاَءَ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ «اشْتَرِيهَا إِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ»[1].

## ٨- باسێک: ئەگەر کەسێک لە کەفارەتدا کۆیلەیەکی ئازاد کرد، ئایا سەرپەرەشتیاری (کۆیلەکە) بۆ کێ دەبێت؟

٦٧١٧- ئەسوەد لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە عائیشە ویستی بەریرە بکڕێت، جا خاوەنەکانی بەمەرجیان لەسەری (عائیشە) دانا کە وەلائی [2] بۆ ئەوان بێت، عائیشەش ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی (بەعائیشە): ((بیکڕە بێگومان سەرپەرشتیاری و وەلائی بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە)).

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

(٢) (ولاء) مافێکی مەعنەوییە لە پاش مردنی کۆیلە یان کەنیزەک، ئەگەر کەسیان نەبوو میراتەکەی بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە.

## ٩- بَابُ الِاسْتِثْنَاءِ فِي الأَيْمَانِ

٦٧١٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ جَرِيرٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ أَسْتَحْمِلُهُ فَقَالَ «وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ، مَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ». ثُمَّ لَبِثْنَا مَا شَاءَ اللَّهُ، فَأُتِيَ بِإِبِلٍ فَأَمَرَ لَنَا بِثَلاَثَةِ ذَوْدٍ، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا قَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ لاَ يُبَارِكُ اللَّهُ لَنَا، أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَسْتَحْمِلُهُ فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَحْمِلَنَا فَحَمَلَنَا. فَقَالَ أَبُو مُوسَى فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ «مَا أَنَا حَمَلْتُكُمْ بَلِ اللَّهُ حَمَلَكُمْ، إِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، إِلاَّ كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي، وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ»[1].

## ٩- باسی (حوکمەکانی) هەڵاواردن[2] لە سوێندەکاندا

**٦٧١٨-ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسا لە ئەبی موسای ئەشعەرەییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەگەڵ چەند کەسێکی ئەشعەریدا چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای وڵاخی سواریمان کرد[3]، پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەخوا وڵاخی سواریتان پێ نادەم، وە هیچ وڵاخێکی سواریم لا نییە))، پاشان ئەوەندەی خوا حەز بکات ماینەوە، جا چەند وشترێك هێنرا (بۆ پێغەمبەر ﷺ)، ئینجا فەرمانیدا بۆمان بە سێ وشتر، ئینجا کە دەرچووین هەندێکمان بەهەندێکمان وت: خوا فەڕ و بەرەکەیتی تێ ناخات بۆمان، ڕۆشتینە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای وڵاخمان لێ کرد، سوێندی خوارد وڵاخی سواریمان پێ نەدات بەڵام پێی داین، جا ئەبو موسا وتی: ڕۆشتینە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەمان بۆ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((من وڵاخی سواریم پێ نەدان، بەڵکو خوا وڵاخی**

---

(١) بڕوانە: ٣١٣٣.

(٢) هەڵاواردن: جیاکردنەوە، فەرهەنگ خاڵ: ٦٣٤.

(٣) بۆ ئەوەی بەشداری غەزای تەبووک بکەین.

**سواری پێدان، وەڵڵاهی من -ئەگەر خوا بیەوێت- سوێند لەسەر هیچ شتێك ناخۆم و بزانم غەیری سوێند لەسەر خوراوەکە چاکترە لەوەی سوێندی لەسەر خوراوە، ئیللا کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم و ئەوەی کە چاکترە ئەنجامی دەدەم)).**

٦٧١٩- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ وَقَالَ: «إِلاَّ كَفَّرْتُ يَمِينِى، وَأَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ». أَوْ «أَتَيْتُ الَّذِى هُوَ خَيْرٌ، وَكَفَّرْتُ»[1].

**٦٧١٩-ئەبونوعمان بۆی گێڕاینەوە وتی: حەمماد بۆی گێڕاینەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مەگەر کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم، ئەوە دەکەم کە چاکترە ))، یان((ئەوە دەکەم کە چاکترە و کەفارەتی (سوێندەکەم ) دەدەم)).**

٦٧٢٠- حَدَّثَنَا عَلِىُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ هِشَامِ بْنِ حُجَيْرٍ عَنْ طَاوُسٍ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ سُلَيْمَانُ لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى تِسْعِينَ امْرَأَةً، كُلٌّ تَلِدُ غُلاَماً يُقَاتِلُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ. فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ - قَالَ سُفْيَانُ يَعْنِى الْمَلَكَ - قُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ. فَنَسِىَ، فَطَافَ بِهِنَّ، فَلَمْ تَأْتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ بِوَلَدٍ، إِلاَّ وَاحِدَةٌ بِشِقِّ غُلاَمٍ. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَرْوِيهِ قَالَ «لَوْ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، لَمْ يَحْنَثْ وَكَانَ دَرَكاً فِى حَاجَتِهِ». وَقَالَ مَرَّةً قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَوِ اسْتَثْنَى». وَحَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِى هُرَيْرَةَ[2].

**٦٧٢٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سولەیمانی کوڕی داوود ﷺ فەرمووی: سوێند بێ ئەمشەو بەدڵنیاییەوە دەسوڕێمەوە بەسەر نەوەد ژندا (سەرجێییان لەگەڵ دەکەم)، هەر یەکەیان کوڕێکی ببێت لە ڕێی خوادا بجەنگێت، هاوڕێ (فریشتە) کەی فەرمووی پێی: - سوفیان وتی: مەبەستی بە هاوڕێکەی فریشتەیە- بڵێ:**

---

(١) بڕوانە: ٣١٣٣.

(٢) بڕوانە: ٢٨١٩.

ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو، بەڵام ئەو لەبیری چوو، ئینجا بەسەر هەموویاندا سوڕایەوە (سەرجێیی لەگەڵ کردن)، بەڵام هیچ ژنێکیان منداڵی نەبوو، جگە لە ژنێکیان لەتە کوڕێکی بوو.

جا ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ و دەیگێڕێتەوە فەرمووی: ((ئەگەر بیوتایە (إن شاء الله) ئەگەر خوا بیەوێ سوێندەکەی نەدەکەوت، زۆرتر جێی ئومێد بوو بۆ پێویستیەکەی)) [1].

وە ئەبو هورەیرە ﷺ جارێکیان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر هەڵاواردنی بکردایە))، (ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەبو زیناد لە ئەعرەجەوە وێنەی فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەی بۆ گێڕاینەوە.

## ١٠- بابُ الكَفَّارَةِ قَبْلَ الحِنْثِ وَبَعْدَهُ

٦٧٢١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ الْقَاسِمِ التَّمِيمِيِّ، عَنْ زَهْدَمٍ الْجَرْمِيِّ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى، وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ هَذَا الْحَيِّ مِنْ جَرْمٍ إِخَاءٌ وَمَعْرُوفٌ. قَالَ: فَقُدِّمَ طَعَامٌ. قَالَ: وَقُدِّمَ فِي طَعَامِهِ لَحْمُ دَجَاجٍ. قَالَ: وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ أَحْمَرُ كَأَنَّهُ مَوْلًى. قَالَ: فَلَمْ يَدْنُ، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: ادْنُ، فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ مِنْهُ. قَالَ إِنِّي رَأَيْتُهُ يَأْكُلُ شَيْئًا قَذِرْتُهُ، فَحَلَفْتُ أَنْ لاَ أَطْعَمَهُ أَبَدًا. فَقَالَ: ادْنُ أُخْبِرْكَ عَنْ ذَلِكَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ أَسْتَحْمِلُهُ، وَهْوَ يُقْسِمُ نَعَمًا مِنْ نَعَمِ الصَّدَقَةِ -قَالَ أَيُّوبُ: أَحْسِبُهُ قَالَ: وَهْوَ غَضْبَانُ- قَالَ: «وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ، وَمَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ».

قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِنَهْبِ إِبِلٍ، فَقِيلَ: "أَيْنَ هَؤُلاَءِ الأَشْعَرِيُّونَ": فَأَتَيْنَا، فَأَمَرَ لَنَا بِخَمْسِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى. قَالَ: فَانْدَفَعْنَا، فَقُلْتُ لأَصْحَابِي: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَسْتَحْمِلُهُ،

---

(١) كە بێتە جێ و خوا بۆی بکردایە.

فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَحْمِلَنَا، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْنَا فَحَمَلَنَا، نَسِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمِينَهُ، وَاللَّهِ لَئِنْ تَغَفَّلْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمِينَهُ لاَ نُفْلِحُ أَبَدًا، ارْجِعُوا بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلْنُذَكِّرْهُ يَمِينَهُ. فَرَجَعْنَا فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَيْنَاكَ نَسْتَحْمِلُكَ، فَحَلَفْتَ أَنْ لاَ تَحْمِلَنَا ثُمَّ حَمَلْتَنَا فَظَنَنَّا -أَوْ فَعَرَفْنَا- أَنَّكَ نَسِيتَ يَمِينَكَ. قَالَ: «انْطَلِقُوا، فَإِنَّمَا حَمَلَكُمُ اللَّهُ، إِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ وَتَحَلَّلْتُهَا»[1]. تَابَعَهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ وَالْقَاسِمِ بْنِ عَاصِمٍ الْكُلَيْبِيِّ.

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ وَالْقَاسِمِ التَّمِيمِيِّ، عَنْ زَهْدَمٍ بهذا.

حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنِ القَاسِمِ، عَنْ زَهْدَمٍ بهذا.

## ١٠- باسی کەفارەت دان پێش کەوتنی سوێندەکە و پاش کەوتنیشی (دروستە)

**٦٧٢١- زەهدەمی جەهمی دەڵێ: ئێمە لای ئەبو موسا ﷺ بووین، لە ڕابردوودا لە نێوان ئێمە و ئەم هۆزی جەرمدا برایەتی و چاکە کردن هەبوو، دەڵێ: ئینجا خواردنێك هێنرا، وە وتی: وە لە خواردنەکەیدا گۆشتی مریشك هێنرا، وە وتی: لە ناو خەڵکەکەشدا پیاوێکی تیابوو لە نەوەی بەنی تەیمی خوا بوو، کەسێکی سورکار بوو، دەتوت غەیرە عەرەبە، دەڵێ: نزیك نەبوویەوە، ئەبو موساش ﷺ پێی وت: نزیك بەرەوە، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە لێی خواردوە، پیاوەکە وتی: من ئەو مریشکەم دیوە شتێکی دەخوارد، ئیتر قێزم لێی هاتەوە و سوێندم خوارد کە هەرگیز نەیخۆم، ئەبو موساش وتی: وەرە نزیك بەرەوە لەو بارەیەوە هەواڵت بدەمێ، لە گەڵ چەند کەسێکی ئەشعەری ڕۆشتینە خزمەتی پێغەمبەری خوا و ﷺ داوای وڵاغی سواریمان لێ کرد، لەو کاتە ماڵات و**

(١) بروانە: ٣١٢٣.

وشتری زەکاتی دابەش دەکرد - ئەیوب وتی: وابزانم وتی: لەو کاتەدا زۆر تورە بوو - دەڵێ: فەرمووی: ((وەڵڵاهی ولاغی سواریتان پێنادەم، وە ولاغی سواریم لانییە پێتان بدەم)).

دەڵێ: ئینجا ڕۆشتین جا چەند وشتری تالانی هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە وترا: کەسە ئەشعەرییەکان کوان؟ ئێمەش ڕۆشتین و فەرمانیدا بۆمان پێنج وشتری چوار پەل سپی کۆپارە بەرزی پێداین، دەڵێ: ئینجا کە گەڕاینەوە، وتم بە هاوڕێکانم ڕۆشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ولاغی سواریمان لێ کرد، ئەویش سوێندی خوارد کە ولاغی سواریمان پێنەدا، پاشان ناردی بەدواماندا و ولاغی سواری پێداین، پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندەکەی لە بیر چوو با سوێندەکەی بیر بخەینەوە، ئیتر گەڕاینەوە و وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هاتینە خزمەتت داوای ولاغی سواریمان لە تۆ کرد، تۆش سوێندت خوارد کە ولاخی سواریمانمان پێنەدەیت، پاشان ولاخی سواریت پێداین، بۆیە گومانمان وابوو- یان دڵنیابووین- کە جەنابت سوێندەکەت لە بیر چووەتەوە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بڕۆن سا دڵنیابن خوا ولاغی سواری پێدان، بێگومان وەڵڵاهی من- ئەگەر خوا بیەوێ- هیچ سوێندێك ناخۆم، ئینجا غەیر ئەو شتەی سوێندم لەسەری خواردووە چاکتر بێت لەوەی سوێندم لەسەر خواردووە، ئیللا ئەویان دەکەم چاکترە، وە کەفارەتی سوێندەکەم ئەدەم)).

-حەممادی کوڕی زەید لە ئەیوبەوە گێڕاویەتیەوە ئەویش لە ئەبی قیلابە و قاسیمی کوڕی عاصیمی کولەیبەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کردوە.

(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) قوتەیبە بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدولوەهاب بۆی گێڕاینەوە لە ئەییوبەوە لە ئەبی قیلابە و قاسیمی تەمیمیەوە لە زەهدەم ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) ئەبو مەعمەر بۆی گێڕاینەوە وتی: عەبدولواریس بۆی گێڕاینەوە وتی: ئەییوب بۆی گێڕاینەوە لە قاسیمەوە لە زەهدەمەوە ئەم فەرموودەی گێڕایەوە.

٦٧٢٢- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ بْنِ فَارِسٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ عَوْنٍ، عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ»[1]. تَابَعَهُ أَشْهَلُ عَنِ ابْنِ عَوْنٍ. وَتَابَعَهُ يُونُسُ وَسِمَاكُ بْنُ عَطِيَّةَ وَسِمَاكُ بْنُ حَرْبٍ وَحُمَيْدٌ وَقَتَادَةُ وَمَنْصُورٌ وَهِشَامٌ وَالرَّبِيعُ.

**٦٧٢٢- عەبدوڕەحمانی كوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((داوای بەرپرسیاری مەكە، چونكە بەڕاستی ئەگەر بێ داواكردن بەرپرسیاریت پێ بدرێ پشتیوانی دەكرێیت لەسەری، بەڵام ئەگەر بەداواكردن پێت بدرێ بە خۆت دەسپێردرێت، وە ئەگەر سوێندت لەسەر شتێك خوارد ئینجا زانیت غەیری سوێند لەسەر خوراوەكە چاكترە لەو، ئەوەیان بكە كە چاكترەوە، وە كەفارەتی سوێندەكەت بدە)).**

**-ئەشهەل لە ئیبنو عەونەوە گێڕاویەتیەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی عوسمانی كوڕی عومەر دەكات.**

**-یونس و سیماكی كوڕی عەتییە و سیماكی كوڕی حەرب و حومەید و قەتادە و مەنصور و هیشام و ڕەبیع گێراویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەكەی عەبدوڵلای كوڕی عەون دەكەن.**

(١) بڕوانە: ٦٦٢٢.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# ٨٥- كِتَابُ الفَرَائِضِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨٥- پەڕاوی میرات دابەش کردن

١- بابُ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ النساء.

٦٧٢٣- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما يَقُولُ: مَرِضْتُ فَعَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ وَهُمَا مَاشِيَانِ، فَأَتَانِي وَقَدْ أُغْمِيَ

عَلَيَّ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَبَّ عَلَيَّ وَضُوءَهُ فَأَفَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي؟ كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي؟ فَلَمْ يُجِبْنِي بِشَيْءٍ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمَوَارِيثِ[1].

**١- وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (خوا ئامۆژگاریتان دەكات دەربارەی (میراتی) ڕۆڵەكانتان (لە میرات) بۆ نێرێک بە وێنەی بەشی دوو مێ هەیە، خۆ ئەگەر (منداڵەكاناتان) تەنها ئافرەت بوون (دووان و) زیاد لە دووان ئەوا دوو بەش لە سێ بەشیان بۆ هەیە، لەوەی مردووەكە بەجێی هێشتووە، بەڵام ئەگەر یەكێک ئافرەت بوو، ئەوە نیوەی (میراتەكەی) هی ئەوە، وە بۆ هەر كام لە دایک و باوكی مردووەكە شەش یەک هەیە لەوەی كە بەجێی هێشتووە، ئەگەر مردووەكە منداڵی هەبوو، بەڵام ئەگەر مردووەكە منداڵی نەبوو و دایک و باوكی میراتگری بوون، ئەوە سێ یەک بۆ دایكەكەیتی لە پاش دەركردنی وەسیەتێک وەسێتی پێ كرابێ (لە لایەن مردووەكەوە)، یان دانەوەی قەرزێک (كە لەسەری بێت)، باوكەكانتان و كوڕەكانتان نازانن كامەیان بە سوودترن بۆتان، ئەو دابەش كردنە لە لایەن خواوە پێویست كراوە، بەڕاستی خوا هەمیشە زانای دانایە، وە نیوەی ئەو (میراتەی) كە ژنەكانتان بەجێیان هێشتووە بۆ ئێوە، ئەگەر ئەو ژنانە منداڵیان نەبوو، بەڵام ئەگەر منداڵیان هەبوو، ئەوە چوار یەک لەوەی (ژنەكانتان) بەجێ یان هێشتووە بۆ ئێوە، لە پاش (دەركردنی)**

---

(١) بڕوانە: ١٩٤.

**وەسیەتێک کە کردبێتیان یان قەرزێک (کە لەسەریان بێت)، وە چواریەکی ئەوەی بەجێتان هێشتووە بۆ ژنەکانتانە، ئەگەر ئێوە منداڵتان نەبوو، بەڵام ئەگەر منداڵتان هەبوو ئەوە هەشت یەک بۆ ئەوانە لەوەی بەجێتان هێشتووە، لە پاش (دەرکردنی) وەسیەتێک کە کردبێتیان، یان دانەوەی قەرزێک (کە لەسەرتان بێت)، وە ئەگەر پیاوێک یان ئافرەتێک کە میراتی لێ ئەگیرا (مردبوو) نەباوانی هەبوو نە منداڵ، وە تەنها برایەک یان خوشکێکی (لە دایکەوە) هەبوو، ئەو بۆ هەریەک لەو دووانە شەش یەک هەیە، بەڵام ئەگەر ئەوان زیاتر بوون لە برایەک یان خوشکێکی (دایکی) ئەو کاتە ئەوانە هەموویان هاوبەشن لە سێیەک (ی میراتەکە)دا لە پاش (دەرکردنی) وەسیەتێک کە کرابێت، یان قەرزێک کە[1] بێ زیان بێت، ئەمە بڕیارە لە لایەن خواوە، خواش زانای لەسەرخۆیە))**

**٦٧٢٣- جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: نەخۆش کەوتم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر ﵁ هەردووکیان بەپیادە هاتن بۆ لام سەردانیان کردم، جا هەردووکیان هاتن بۆ لام لەو کاتەدا من لەهۆش خۆم چووبومەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت و ئاوی دەست نوێژەکەی ڕشت بەسەرمدا، منیش هۆشم کردەوە و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بکەم دەربارەی ماڵ و سامانەکەم؟ چۆن بڕیار بدەم لە سامانەکەمدا؟ پێغەمبەر ﷺ هیچ وەڵامێکی نەدامەوە هەتا ئایەتی میرات دابەزی.**

---

(١) وەسیەتەکە یان قەرزەکە زیانی نەبێ بۆ میراتگران.

## ٢- بَابُ تَعْلِيمِ الفَرَائِضِ

وَقَالَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ: تَعَلَّمُوا قَبْلَ الظَّانِّينَ، يَعْنِي الَّذِينَ يَتَكَلَّمُونَ بِالظَّنِّ.

٦٧٢٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا»[1].

## ٢- باسی فێربوونی میرات دابەش کردن

**-عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: فێرببن پێش ئەوەی (پچنە ڕیزی) گومان بەران، واتە: ئەو کەسانەی بە گومان قسە دەکەن لە شتەکان.**

**٦٧٢٤-ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((لە گومانی خراپ دوور بکەونەوە، چونکە دڵنیابن گومانی خراپ درۆترین قسەیە، بەشوێن عەیب و نەنگی خەڵکدا مەگەڕێن[2] و سیخوڕی مەکەن ، وە یەکتری مەبوغزێنن و (ڕقتان لەیەکتری نەبێت و) پشت لە یەکتری مەکەن، وە بەندی خوابن و برای یەکتربن)).**

## ٣- بَابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ»

٦٧٢٥- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ فَاطِمَةَ وَالْعَبَّاسَ ﷺ أَتَيَا أَبَا بَكْرٍ يَلْتَمِسَانِ مِيرَاثَهُمَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُمَا حِينَئِذٍ يَطْلُبَانِ أَرْضَيْهِمَا مِنْ فَدَكَ وَسَهْمَهُمَا مِنْ خَيْبَرَ[3].

---

(١) بروانە: ٥١٤٣.

(٢) (ولا تحسسوا ولا تجسسوا): ئەم دوو فیعلە زانایان دەڵێن یەک مانایان هەیە کە نووسیومانە، بۆچوونی کەش هەیە لە ماناياندا: دەڵێن:یەکەمیان گوێگرتنە لە قسەی خەڵک، دووەمیان گەڕانە بە شوێن عەیب و عاری خەڵکدا، یان یەکەمیان زانینی هەواڵێک یان شتێکە بەهۆ یەک لە هەستەوەرەکان چاو گوێ....بەڵام دووەمیان زانینی هەواڵێکە زۆر بەوریایی و نهێنی بێت، جاسوسیش لەوەوە هاتووە. بروانە: المنهاج شرح مسلم بن الحجاج للنووي:١٧٣/٨ وإرشاد الساري:١٤١/١٤.

(٣) بروانە: ٣٠٩٢.

## ٣- باسی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (( میراتمان لێ نابرێ ئەوەی بەجێی دێلین خێرە (بۆ مسوڵمانان) ))

٦٧٢٥- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە فاتیمە و عەبباس ﵄ هەردووکیان هاتنە لای ئەبو بەکر ﵁ داوای میراتی هەردووکیانیان دەکرد کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ (بەریان دەکەوێت) هەردووکیانیان لەو ڕۆژەدا داوای زەوییەکانیان دەکرد لە فەدەك و پشکی هەردووکیانیان لە خەیبەر.

٦٧٢٦- فَقَالَ لَهُمَا أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ، إِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ مِنْ هَذَا الْمَالِ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ لاَ أَدَعُ أَمْرًا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُهُ فِيهِ إِلاَّ صَنَعْتُهُ. قَالَ: فَهَجَرَتْهُ فَاطِمَةُ، فَلَمْ تُكَلِّمْهُ حَتَّى مَاتَتْ[١].

٦٧٢٦-ئینجا ئەبو بەکر ﵁ بەهەردووکیانی وت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((ئێمە میراتمان لێ نابردرێت، ئەوەی بەجێمان هێشت خێر و صەدەقەیە بێگومان ئالی موحەممەد تەنها مافی خواردنیان هەیە لەو ماڵ و سامانە))، ئەبو بەکر ﵁ وتی: سوێند بەخوا هەر کار و بڕیارێکم دیبێ پێغەمبەری خوا ﷺ کردبێتی لە بارەیەوە، منیش[٢] دەیکەم و وازی لێ ناهێنم، دەڵێ: بەو هۆیەوە فاتیمە ﵂ دەنگی لە ئەبو بەکر ﵁ دابڕی و قسە لەگەڵی نەکرد تا مرد[٣].

٦٧٢٧- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبَانَ، أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ»[٤].

---

(١) بڕوانە: ٣٠٩٣.

(٢) ئەو زەوی و سامانەی لە پێغەمبەر ﷺ بەجێ ماوە پاش مردنی.

(٣) تا فاتیمە مرد قسەی لەگەڵ ئەبو بەکر ﵁ نەکرد.

(٤) بڕوانە: ٤٠٣٤.

**٦٧٢٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئێمە میراتمان لێ نابردرێت، ئەوە بەجێی دێڵین خێرە (بۆ مسوڵمانان) )).**

٦٧٢٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَالِكُ بْنُ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ -وَكَانَ مُحَمَّدُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ذَكَرَ لِي مِنْ حَدِيثِهِ ذَلِكَ، فَانْطَلَقْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَيْهِ فَسَأَلْتُهُ- فَقَالَ: انْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى عُمَرَ، فَأَتَاهُ حَاجِبُهُ يَرْفَأُ فَقَالَ: هَلْ لَكَ فِي عُثْمَانَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ وَالزُّبَيْرِ وَسَعْدٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَذِنَ لَهُمْ، ثُمَّ قَالَ: هَلْ لَكَ فِي عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ عَبَّاسٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا. قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ». يُرِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَفْسَهُ. فَقَالَ الرَّهْطُ: قَدْ قَالَ ذَلِكَ. فَأَقْبَلَ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: هَلْ تَعْلَمَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ ذَلِكَ؟ قَالاَ: قَدْ قَالَ ذَلِكَ. قَالَ عُمَرُ: فَإِنِّي أُحَدِّثُكُمْ عَنْ هَذَا الأَمْرِ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ كَانَ خَصَّ رَسُولَهُ ﷺ فِي هَذَا الْفَيْءِ بِشَيْءٍ لَمْ يُعْطِهِ أَحَدًا غَيْرَهُ، فَقَالَ ﷻ: ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ ﴾ الحشر. فَكَانَتْ خَالِصَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاللَّهِ مَا احْتَازَهَا دُونَكُمْ، وَلاَ اسْتَأْثَرَ بِهَا عَلَيْكُمْ، لَقَدْ أَعْطَاكُمُوهُ وَبَثَّهَا فِيكُمْ، حَتَّى بَقِيَ مِنْهَا هَذَا الْمَالُ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ مِنْ هَذَا الْمَالِ نَفَقَةَ سَنَتِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُ مَا بَقِيَ فَيَجْعَلُهُ مَجْعَلَ مَالِ اللَّهِ، فَعَمِلَ بِذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَيَاتَهُ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ لِعَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَانِ ذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ. فَتَوَفَّى اللَّهُ نَبِيَّهُ ﷺ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَبَضَهَا فَعَمِلَ بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ أَبَا بَكْرٍ، فَقُلْتُ: أَنَا وَلِيُّ وَلِيِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَبَضْتُهَا سَنَتَيْنِ أَعْمَلُ فِيهَا مَا عَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ جِئْتُمَانِي وَكَلِمَتُكُمَا

وَاحِدَةٌ، وَأَمْرُكُمَا جَمِيعٌ، جِئْتَنِي تَسْأَلُنِي نَصِيبَكَ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ، وَأَتَانِي هَذَا يَسْأَلُنِي نَصِيبَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتُمَا دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا بِذَلِكَ، فَتَلْتَمِسَانِ مِنِّي قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ، فَوَاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، لاَ أَقْضِي فِيهَا قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا فَادْفَعَاهَا إِلَيَّ، فَأَنَا أَكْفِيكُمَاهَا»[1].

**٦٧٢٨-ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە لە مالیكی كوڕی ئەوسی كوڕی حەدەسانەوە- وە پێشتر موحەممەدی كوڕی جوبەیر باسێكی ئەو فەرموودەی (مالیكی) بۆ كردم، منیش ڕۆشتم هەتا ڕۆشتمە لای (مالیك) و پرسیاری ئەو فەرموودەیەم لێ كرد- مالیكیش وتی: منیش ڕۆشتم چوومە ژوورەوە بۆ لای عومەر، جا یەرفەئی دەرگاوانی هات بۆلای وتی: پێت خۆشە عوسمان و عەبدوڕەحمان و زوبەیر و سەعد ﷺ بێنە ژوورەوە بۆ لات؟ عومەر وتی: بەڵێ (با بێنە ژوورەوە)، ئەویش مۆڵەتی دان و هاتنە ژوورەوە، پاشان وتی: پێت خۆشە عەلی و عەبباس ﷺ بێنە ژوورەوە بۆ لات؟ وتی: بەڵێ (با بێنە ژوورەوە)، عەبباس وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران لە نێوان من و ئەمەدا بڕیار بدە. عەلی و عەبباس كێشەیان بوو دەربارەی ئەو دەستكەوتەی كە خوا دەستی پێغەمبەرەكەی ﷺ خست لە (سەروەت و سامانی) بەنی نەزیر، جا كۆمەڵەكەش عوسمان و هاوڕێكانی وتیان: ئەی پێشەوای باوەڕداران بڕیار بدە لە نێوانیاندا لە دەستی یەكتری ڕزگاریان بكە، عومەر وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی كە بەفەرمانی ئەو زەوی و ئاسمان ڕاوەستاوە، ئایا دەزانن كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ئێمە كەلەپورمان لێ ناگیرێ، ئەوەی لێمان بەجێما خێرە[2]))، پێغەمبەری خوا مەبەستی خۆی بوو، ئینجا كۆمەڵەكە وتیان: بێگومان ئەوەی فەرمووە، ئەوسا**

---

(١) بڕوانە: ٢٩٠٤.

(٢) بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان خەرج دەكرێ.

عومەر ڕووی کردە عەلی و عەبباس ﷺ وتی: ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرمووە؟ هەردووکیان وتیان: بێگومان ئەوەی فەرمووە. عومەر وتی: ئینجا دەربارەی ئەو کارە قسەتان بۆ بکەم، بەڕاستی خوا هەندێ لەم دەستکەوتەی تایبەت کردوە بە پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، کە بەکەسی تری جگەلە ئەو نەداوە، جا خوا ﷻ فەرمووی: (ئەو (دەستکەوتانەی) کە خوا سەندیەوە بۆ پێغەمبەرەکەی لە ماڵی (بەنی نەزیر) ئێوە بۆ بەدەست هێنانی هیچ ئەسپ و وشترێکتان تاو نەداوە، بەڵکو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەکات بەسەر هەر کەسێکدا کە بیەوێت، وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵاتە). دەی ئەمە تایبەت بوو بە پێغەمبەری خواوە ﷺ، سوێند بەخوا کۆی نەکردۆتەوە بۆ خۆی و ئێوەی لێ بێبەش بکات، وە تایبەتی نەکردوە بەخۆی جگەلە ئێوە، بێگومان داوێتی بەئێوەش و دابەشی کردوە بەسەرتاندا، هەتا ئەم سامانەی لێ ماوەتەوە، جا پێغەمبەری خوا خەرجی و بژێوی ساڵێکی خاو خێزانی لەمە بوو، پاشان ئەوەشی دەمایەوە هەڵیدەگرت بەماڵ و سامانی خوای دادەنا (لە بەرژەوەندی گشتیدا خەرجی دەکرد)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەم جۆرەی دەکرد تا لە ژیاندابوو، سوێندتان دەدەم بەخوا ئەمە دەزانن؟ وتیان: بەڵێ (دەیزانین)، پاشان بەعەلی و عەبباسی وت: سوێندتان دەدەم بەخوا ئێوەش هەردووکتان ئەمە دەزانن؟ هەردووکیان وتیان: بەڵێ، پاشان خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ بردەوە بۆ لای خۆی، جا ئەبو بەکر وتی: من میراتگری پێغەمبەری خوام ﷺ، ئیتر ئەبو بەکر ئەو ماڵی (فەیئەی) وەرگرت و بەو جۆرەی لێ کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەکرد (لە ژیانیدا)، پاشان ئەبو بەکریش کۆچی دوایی کرد، منیش وتم: من میراتگری میراتگری پێغەمبەری خوام ﷺ و دوو ساڵ ئەو ماڵی (فەیئەم) وەرگرت و بەو جۆرەم لێ کرد کە هەریەك لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر کردیان، پاشان هەردووکتان هاتوون بۆ لام قسەم لەگەڵدا دەکەن، وە قسەی

**هەردووكتان یەكە، كارەكەشتان یەك كارە، (عەبباس) تۆ هاتووی بۆ لام داوای بەشەكەت لە برازاكەت دەكەیت، ئەمەش (عەلی)، هاتووە بۆ لام داوای بەشی هاوسەرەكەی لە باوكی دەكات، منیش وتم: ئەگەر دەتانەوێ بەو جۆرە دەیدەم بەهەردووكتان، دەی ئایا جگەلە ئەمە داوای بڕیارێكم لێ دەكەن، سا سوێند بەو زاتەی ئاسمان و زەوی بە فەرمانی ئەو ڕاوەستاوە، هەتا قیامەت دەبێت جگە لەو بڕیارە هیچ بڕیارێكی تری دەربارەی نادەم، ئنجا ئەگەر نەتان توانی (بەو جۆرەی لێ بكەن)، ئەوسا بیگێڕنەوە بۆ لای خۆم، بێگومان خۆم لە جیاتی هەردووكتان ئەو كارە دەكەم.**

٦٧٢٩- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «لاَ يَقْتَسِمُ وَرَثَتِي دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمُؤْنَةِ عَامِلِي فَهْوَ صَدَقَةٌ»[1].

**٦٧٢٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((میراتگرانم دینارێك دابەش نەكەن، لە پاش خەرجی خێزانەكانم و خەرجی سەركارەكەم، ئەوەی لێم بەجێما ئەوە خێرە لە ڕێی خوادا) )).**

٦٧٣٠- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَرَدْنَ أَنْ يَبْعَثْنَ عُثْمَانَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ يَسْأَلْنَهُ مِيرَاثَهُنَّ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَلَيْسَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ؟»[2].

**٦٧٣٠- عورەوە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێ:خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد، ویستیان عوسمان ﷺ بنێرن بۆ لای ئەبو بەكر ﷺ**

---

(١) بڕوانە: ٢٧٧٦.

(٢) بڕوانە: ٤٠٣٤.

داوای میراتەکانیان بکەن، عائیشە ﵂ وتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو: ((ئێمە میراتمان لێ نابردرێت، هەرچیمان لێ بەجێما خێرە (بۆ مسوڵمانان) )).

## ٤- بابُ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ»

٦٧٣١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، وَلَمْ يَتْرُكْ وَفَاءً، فَعَلَيْنَا قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ»[1].

## ٤- باسی ئەم فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ: (( هەر کەس لە پاش (مردنی) خۆی ماڵ و سامانی بەجێ هێشت، ئەوە بۆ کەس و کارەکەیەتی))

٦٧٣١-ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (من لە پێشترم بە باوەڕداران لە خودی خۆیان، جا هەرکەس مرد و قەرزار بوو هیچی بەجێ نەهێشت قەرزەکەی پێ بدرێتەوە، ئەو بژاردنەکەی لەسەر ئێمەیە، هەرکەسیش (مرد و) ماڵ و سامانی بەجێ هێشت ئەوە بۆ میراتگرەکانێتی)).

## ٥- بابُ مِيرَاثِ الوَلَدِ مِنْ أَبِيهِ وَأُمِّهِ

وَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﵁ إِذَا تَرَكَ رَجُلٌ أَوِ امْرَأَةٌ بِنْتًا فَلَهَا النِّصْفُ، وَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ أَوْ أَكْثَرَ فَلَهُنَّ الثُّلُثَانِ، وَإِنْ كَانَ مَعَهُنَّ ذَكَرٌ بُدِئَ بِمَنْ شَرِكَهُمْ، فَيُؤْتَى فَرِيضَتَهُ، فَمَا بَقِيَ فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ.

---

(١) بڕوانە: ٢٢٩٨.

## ٥- باسی میراتگرتنی منداڵ لە باوکی و دایکی

-زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: ئەگەر پیاوێك یان ژنێك (لە پاش مردنی) کچێکی بەجێ هێشت ئەو نیوەی میراتەکەی بۆ ئەو کچەیە، وە ئەگەر دوو کچ یان زیاتر بوون ئەو دوو بەش لە سێ بەشیان دەکەوێت، بەڵام ئەگەر کوڕیان لەگەڵ بوو، بەو کەسە دەست پێدەکرێ کە بۆتە هاوبەشیان[١] بەشەکەی پێدەدرێ، ئینجا ئەوەی مایەوە، ئەوە هەر نێرینەیەك بە ئەندازەی دوو مێینە بەردەکەوێت[٢].

٦٧٣٢- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلْحِقُوا الفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ»[٣].

٦٧٣٢-ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((میرات بدەن بە میراتگرەکان، ئینجا ئەوی مایەوە بۆ نزیکترین کەسی نێرینەیە)).

## ٦- بابُ مِيرَاثِ البَنَاتِ

٦٧٣٣- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَامِرُ بْنُ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: مَرِضْتُ بِمَكَّةَ مَرَضًا فَأَشْفَيْتُ مِنْهُ عَلَى المَوْتِ، فَأَتَانِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي مَالاً كَثِيرًا، وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَتِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لاَ». قَالَ: قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: «لاَ». قُلْتُ: الثُّلُثُ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ كَبِيرٌ، إِنَّكَ إِنْ

---

(١) واتە: میراتگرێک جگەلە کچ و کوڕی مردووەکە، کە بەشی دیاری کراوی هەیە.
(٢) واتە: هەر کوڕێ بەقەد دوو کچ دەبات.
(٣) بڕوانە: ٦٧٣٥، ٦٧٤٦.

تَرَكْتَ وَلَدَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً إِلاَّ أُجِرْتَ عَلَيْهَا، حَتَّى اللُّقْمَةَ تَرْفَعُهَا إِلَى فِي امْرَأَتِكَ». فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَأُخَلَّفُ عَنْ هِجْرَتِي؟ فَقَالَ: «لَنْ تُخَلَّفَ بَعْدِي فَتَعْمَلَ عَمَلاً تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ اللهِ، إِلاَّ ازْدَدْتَ بِهِ رِفْعَةً وَدَرَجَةً، وَلَعَلَّ أَنْ تُخَلَّفَ بَعْدِي حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ". يَرْثِي لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ مَاتَ بِمَكَّةَ. قَالَ سُفْيَانُ: وَسَعْدُ بْنُ خَوْلَةَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ[1].

## ٦- باسی میراتگرتنی کچان

**٦٧٣٣- عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە مەککە نەخۆش کەوتنێك نەخۆش کەوتم خەریك بوو بمرم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ سەردانی کردم، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان من ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە کەسیش میراتم لێ نابات جگەلە کچەکەم، دە ئایا دوو سێیەکی ماڵەکەم بکەم بەخێر؟ فەرمووی: ((نەخێر))، دەڵێ وتم: ئەی نیوەی بکەم بەخێر؟ فەرمووی: ((نەخێر))، وتم: سێ یەکی بکەم بەخێر؟ فەرمووی: سێ یەکیشی زۆرە، بێگومان ئەگەر تۆ منداڵەکانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بێڵی، باشترە لەوەی (بەهەژاری) بەجێیان بێڵی، وە دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە، وە بێگومان تۆ هەر خەرجیەك بکەیت پاداشتت دەدرێیتەوە لەسەری، تەنانەت ئەو پاروەش بەرزی دەکەیتەوە کە دەیکەیت بەدەمی هاوسەرەکەتەوە))، ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا من (لە مەککە) لەپاش کۆچ کردنم بەجێ دەهێڵرێم؟ فەرمووی: ((دڵنیابە ئەگەر پاش من بەجێ هێڵرایت، جا هەر کارێك ئەنجام بدەیت و مەبەستت ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوا پلە و پایەت بەرز دەبێتەوە پێی، وە لەوانەیە لە پاش من بەجێ**

(١) بڕوانە: ٥٦.

**بهێڵرێیت تا کەسانێك سوودت لێ ببینن، وە کەسانێك تریش بەهۆی تۆوە زیانیان پێ بگات، بەڵام داماو سەعدی کوڕی خەولەیە))، پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی تەنگی خۆی بۆ دەربڕی لەبەر ئەوەی لە مەککە مرد و وەفاتی کرد. سوفیان وتی: سەعدی کوڕی خەولە پیاوێك بوو لە بەنی عامیری کوڕی لوئەی.**

٦٧٣٤- حَدَّثَنِي مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا أَبُو النَّضْرِ، حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ شَيْبَانُ، عَنْ أَشْعَثَ، عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَتَانَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِالْيَمَنِ مُعَلِّمًا وَأَمِيرًا، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ رَجُلٍ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ ابْنَتَهُ وَأُخْتَهُ، فَأَعْطَى الابْنَةَ النِّصْفَ وَالأُخْتَ النِّصْفَ[1].

**٦٧٣٤-ئەشعەس لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە دەگێڕێتەوە کە وتی: موعازی کوڕی جەبەل هات بۆ ناومان لە یەمەن بە مامۆستا و لێپرسراو، ئێمەش پرسیارمان لێ کرد دەربارەی پیاوێك مرد و کچێك و خوشکێکی لێ بەجێماوە، موعازیش نیوەی (میراتەکەی)ـدا بەکچەکە و نیوەیشیدا بە خوشکەکە.**

## ٧- باب مِيرَاثِ ابْنِ الابْنِ، إِذَا لَمْ يَكُنِ لَه ابْنٌ

وَقَالَ زَيْدٌ ﷺ : وَكَذَا وَلَدُ الأَبْنَاءِ بِمَنْزِلَةِ الوَلَدِ إِذَا لَمْ يَكُنْ دُونَهُمْ وَلَدٌ، ذَكَرُهُمْ كَذَكَرِهِمْ وَأُنْثَاهُمْ كَأُنْثَاهُمْ، يَرِثُونَ كَمَا يَرِثُونَ، وَيَحْجُبُونَ كَمَا يَحْجُبُونَ، وَلاَ يَرِثُ وَلَدُ الابْنِ مَعَ الابْنِ.

٦٧٣٥- حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثَنَا ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهْوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ»[2].

---

(١) بروانە: ٦٧٤١.

(٢) بروانە: ٦٧٣٢.

## ٧- باسی میراتگرتنی کوڕی کوڕی ئەگەر (مردووەکە) کوڕی نەبوو

-زەید دەڵێ: منداڵی کوڕەکان لە پلەی منداڵی خۆیدا ئەگەر منداڵی لەوان نزیکتر (بەمردووەکە نەبوو کوڕ یان وەك کوڕ (ی مردووەکە) وایە، کچیان وەك کچی (مردووەکە) وایە میرات دەبەن، وەك منداڵی (مردووەکە) میرات دەبەن، وە (ئەوانەی باسکران) بێبەش دەبن وەك ئەوان چۆن بێبەش دەبن، وەکو کوڕی کوڕی میرات نابات لەگەڵ بوونی کوڕدا.

٦٧٣٥- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((میرات بدەن بە میراتگرەکان، ئینجا ئەوی مایەوە بۆ نزیکترین کەسی نێرینەیە)).

## ٨- بابُ مِيرَاثِ ابْنَةِ ابْنٍ مَعَ ابْنَةٍ

٦٧٣٦- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو قَيْسٍ: سَمِعْتُ هُزَيْلَ بْنَ شُرَحْبِيلَ قَالَ: سُئِلَ أَبُو مُوسَى عَنِ ابْنَةٍ وَابْنَةِ ابْنٍ وَأُخْتٍ، فَقَالَ لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَلِلأُخْتِ النِّصْفُ، وَأْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَيُتَابِعُنِي. فَسُئِلَ ابْنُ مَسْعُودٍ وَأُخْبِرَ بِقَوْلِ أَبِي مُوسَى، فَقَالَ: لَقَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ، أَقْضِي فِيهَا بِمَا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ «لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَلابْنَةِ ابْنٍ السُّدُسُ تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ». فَأَتَيْنَا أَبَا مُوسَى فَأَخْبَرْنَاهُ بِقَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: لاَ تَسْأَلُونِي مَا دَامَ هَذَا الْحَبْرُ فِيكُمْ[1].

## ٨- باسی میراتگرتنی کچی کوڕ (ی مردوو) لەگەڵ کچ (ی مردوو).

٦٧٣٦-هوزەیلی کوڕی سورەحبیل دەڵێ: پرسیار لە ئەبو موسا ﷺ کرا دەربارەی (میراتی) کچ و کچی کوڕ و خوشکێك، (ئەبو موسا) وتی: نیوەی بۆ کچەکەیە،

(١) بڕوانە: ٦٧٤٢.

**نیوەشی بۆ خوشکەکە، بڕۆ بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیش ﷺ ، بێگومان ئەویش شوێن وتەکەی من دەکەوێ و پشت ڕاستی دەکاتەوە، ئینجا پرسیار لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود کرا وتەکەی ئەبو موساشی پێ وترا، ئەویش وتی: سوێند بەخوا بەڕاستی من گومڕابووم، وە من لە ڕێنوێنی کراوان نیم[1]، بەو جۆرە بڕیاری تیا دەدەم کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری تیا داوە: نیوەی بۆ کچەکەیەتی، کچی کوڕەکەش شەش یەکی دەکەوێ کە دوو بەش لە سێ بەشی پێ تەواو دەکرێ، ئەوەشی مایەوە بۆ خوشکەکەیە، ئەوسا هاتینەوە بۆ لای ئەبو موسا وتەکەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودمان بۆ گێڕایەوە، ئەبو موساش وتی: پرسیار لە من مەکەن هەتا ئەو زانا گەورەیەتان لە ناودا بێت.**

## ٩- بَابُ مِيرَاثِ الجَدِّ مَعَ الأَبِ وَالإِخْوَةِ

وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَابْنُ عَبَّاسٍ وَابْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ الْجَدُّ أَبٌ.وَقَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٢٦﴾ ﴾ الأعراف، ﴿ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ ﴿٣٨﴾ ﴾ يوسف. وَلَمْ يُذْكَرْ أَنَّ أَحَدًا خَالَفَ أَبَا بَكْرٍ ﷺ فِي زَمَانِهِ وَأَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ مُتَوَافِرُونَ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَرِثُنِي ابْنُ ابْنِي دُونَ إِخْوَتِي، وَلاَ أَرِثُ أَنَا ابْنَ ابْنِي؟!. وَيُذْكَرُ عَنْ عُمَرَ وَعَلِيٍّ وَابْنِ مَسْعُودٍ وَزَيْدٍ أَقَاوِيلُ مُخْتَلِفَةٌ.

## ٩- باسی (حوکمی) میراتگرتنی باپیرە[2] لەگەڵ باوک و برا (ی مردووەکە)دا

**-ئەبو بەکر و ئیبنو عەبباس و ئیبنو زوبەیر ﷺ دەڵێن: باپیرە (حوکمی وەك باوکە.**

---

(١) ئەگەر بڕیار بدەم بە بێبەش کردنی کچ و کوڕی مردووەکە.

(٢) واتە: باوکی باوک

-ئیبنو عەبباس ﷺ ئەم ئایەتەی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٢٦﴾ ﴾ الأعراف: (ئەی نەوەی ئادەم) خوێندەوە[1] ﴿ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ ﴿٣٨﴾ ﴾ یوسف[2]، واتە: (وە من شوێنی ئاینی باو و باپیرانم کەوتووم کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبن). وە باس نەکراوە کەس پێچەوانەی ئەبو بەکری ﷺ کردبێ لە سەردەمی خۆیدا، لە کاتێکدا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ زۆر بوون [3].

-وە ئیبنو عەبباس ﷺ کوڕی کوڕم میرات لە من دەبات براکانم نایبەن، ئەی بۆچی من لە کوڕی کوڕم میرات نەبەم؟!

-وە لە هەریەك لە عومەر و عەلی و ئیبنو مەسعوود و زەیدەوە ﷺ چەند وتەی جیاواز گێڕدراوەتەوە.

٦٧٣٧- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلْحِقُوا الفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا فَمَا بَقِيَ فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ»[4].

**٦٧٣٧- ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((میرات بدەن بە میراتگرەکان، ئینجا ئەوی مایەوە بۆ نزیکترین کەسی نێرینەیە)).**

٦٧٣٨- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَمَّا الَّذِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُهُ، وَلَكِنْ خُلَّةُ الإِسْلاَمِ أَفْضَلُ». أَوْ قَالَ: «خَيْرٌ». فَإِنَّهُ أَنْزَلَهُ أَبًا. أَوْ قَالَ: قَضَاهُ أَبًا[1].

---

(١) واتە ئادەم ﷺ باوکی ئێمەیە لە کاتێکدا چەند پشت پێش ئێمە بووە و ژیاوە.

(٢) بەباوک ناوی ئەو سێ پێغەمبەرەی بردووە، لە کاتێکدا چەند سەدە لە نێوانیاندا.

(٣) کاتێ ئەبو بەکر ﷺ ئەم قسەی کردوە.

(٤) بڕوانە: ٦٧٣٢.

**٦٧٣٨-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە فەرمووی: ((ئەگەر من لەم ئوممەتەدا کەسێکم بکردایە بەدۆستی گیانی بەگیانی[٢]، ئەبو بەکرم هەڵدەبژارد، بەڵام برایەتی وخۆشەویستی لەبەر ئیسلام گەورەتر و پیرۆزترە)) یان فەرمووی ((چاکترە))، جابێگومان ئەو کەسە (ئەبو بەکر) باپیرەی لە پلەی باوکدا داناوە (لە میراتدا)، یان وەك باوك بڕیاری بۆ داوە.**

## ١٠- بَابُ مِيرَاثِ الزَّوْجِ مَعَ الوَلَدِ وَغَيْرِهِ

٦٧٣٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ وَرْقَاءَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ الْمَالُ لِلْوَلَدِ، وَكَانَتِ الوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ، فَنَسَخَ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ مَا أَحَبَّ، فَجَعَلَ لِلذَّكَرِ مِثْلَ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ، وَجَعَلَ لِلْمَرْأَةِ الثُّمُنَ وَالرُّبُعَ، وَلِلزَّوْجِ الشَّطْرَ وَالرُّبُعَ[٣].

## ١٠- باسی میراتگرتنی مێرد لەگەڵ منداڵ و کەسانی تر

**٦٧٣٩-عەتا لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ڕابردوودا سامان وماڵ بۆ منداڵ (ی مردوو) دەبوو، وەسێتیش بۆ دایك و باوك دەبوو، ئینجا خوا ئەوەی خۆی پێی خۆش بوو لەو شێوەیە سڕییەوە، ئینجا بۆ نێر کردی بەدوو ئەوەندەی مێیەك، وە بۆ دایك و باوك بۆ هەر یەکەیان شەش یەکی دانا، بۆ هاوسەری ژن هەشت یەك و چواریەکی دانا [٤]، مێردیش نیوە و چواریەکی بۆ داناوە [١].**

(١) بڕوانە: ٤٦٧.

(٢) لە هەموو پێویستیەکدا بۆی بگەڕێمەوە و لە کارە گرنگەکاندا پشتی پێ ببەستم.

(٣) بڕوانە: ٢٧٤٧.

(٤) هەشت یەک ئەگەر پیاوەکەی منداڵی هەبوو، چوار یەک ئەگەر پیاوەکەی منداڵی نەبوو.

## ١١- بابُ مِيرَاثِ الْمَرْأَةِ وَالزَّوْجِ مَعَ الْوَلَدِ وَغَيْرِهِ

٦٧٤٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي جَنِينِ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي لَحْيَانَ سَقَطَ مَيِّتًا بِغُرَّةٍ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ، ثُمَّ إِنَّ الْمَرْأَةَ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا بِالْغُرَّةِ تُوُفِّيَتْ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَنَّ مِيرَاثَهَا لِبَنِيهَا وَزَوْجِهَا، وَأَنَّ الْعَقْلَ عَلَى عَصَبَتِهَا[٢].

## ١١- باسی (حوکمی) میراتگرتنی ژن و مێرد لەگەڵ منداڵ و کەسانی تردا

**٦٧٤٠-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کۆرپەڵەی ژنێکی بەنی لەحیان کە بەمردووی لە باری چووە، بڕیاریدا بە (دانی) خوێنێك کۆیلەیەك یان کەنیزەکێك بێت، پاشان ئەو ژنەی کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا لەسەری کە خوێنێك بدات مرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا کە میراتەکەی بۆ منداڵەکانی و مێردەکەیەتی و خوێنەکەش لەسەر باوانی ژنەکەیە[٣].**

## ١٢- بابُ مِيرَاثِ الأَخَوَاتِ مَعَ الْبَنَاتِ عَصَبَةً

٦٧٤١- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: قَضَى فِينَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ النِّصْفُ لِلابْنَةِ وَالنِّصْفُ لِلأُخْتِ. ثُمَّ قَالَ سُلَيْمَانُ قَضَى فِينَا. وَلَمْ يَذْكُرْ: عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٤].

---

(١) نیوە بۆ مێردە ئەگەر ژنەکەی مرد و منداڵی نەبوو، بەڵام ئەگەر ژنەکە منداڵی هەبوو چواریەکی دەدرێتێ.
(٢) بڕوانە: ٥٧٥٨.
(٣) عصبة: بەکەس و کاری نێرینەی مرۆڤ دەوترێت لە سەری باوکیەوە وەک مام و باپیر و ئامۆزا...هتد وە عەسەبە کەسێکە میراتی دیاریکراوی نییە ئەوەی لە خاوەن بەشە دیاریەکان مایەوە دەیبات.
(٤) بڕوانە: ٦٧٣٤.

## ١٢- باسی: میراتگرتنی خوشکان لە گەڵ کچاندا عەسەبە دەبن[١]

٦٧٤١- ئەسوەد دەڵێ: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بڕیاریدا لە ناو ئێمەدا بەنیوە بۆ کچ و نیوەش بۆ خوشك، لە پاشان سولەیمان وتی: لە ناو ئێمەدا بڕیاریدا باسی سەردەمی پێغەمبەری ﷺ نەکرد.

٦٧٤٢- حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَبَّاسٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ، عَنْ هُزَيْلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لأَقْضِيَنَّ فِيهَا بِقَضَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: "لِلاِبْنَةِ النِّصْفُ، وَلاِبْنَةِ الاِبْنِ السُّدُسُ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ"[٢].

٦٧٤٢-هوزەیل دەڵێ: عەبدوڵڵای وتی: بێگومان بڕیاری تیا دەدەم بە بڕیاری پێغەمبەر ﷺ، کچەکە نیوەو بۆ کچی کوڕەکەش شەش یەك، ئەوەشی مایەوە بۆ خوشکەکە.

## ١٣- بابُ مِيرَاثِ الإِخْوَةِ وَالأَخَوَاتِ

٦٧٤٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُثْمَانَ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرًا قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ وَأَنَا مَرِيضٌ، فَدَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ نَضَحَ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ، فَأَفَقْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا لِي أَخَوَاتٌ. فَنَزَلَتْ آيَةُ الْفَرَائِضِ[٣].

## ١٣- باسی میراتگرتنی خوشکان و بارایان

٦٧٤٣-موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: لە جابیرم ﷺ بیست دەیوت: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام و من نەخۆش بووم، ئینجا داوای ئاوی دەستنوێژی

---

(١) واتە: خوشکی مردووەکە ئەگەر مردووەکە کە برایەتی کچی لێ بەجێمابوو، ئەوە خوشکی مردووەکە ئەوەی مایەوە لە کچی مردووەکە دەیبات، چونکە لەو کاتەدا خوشکەکە عەسەبە دەبێت.

(٢) بڕوانە: ٦٧٣٦.

(٣) بڕوانە: ١٩٤.

کرد و دەستنوێژی گرت، لە پاشان لە ئاوی دەستنوێژەکەی پرژاند پیامدا، منیش هۆشم کردەوە و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان من چەند خوشکێکم هەیە بەو هۆیەوە ئایەتی میرات دابەزی.

١٤- **بابٌ**: ﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَـٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾ ﴾ **النساء**

٦٧٤٤- حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ خَاتِمَةُ سُورَةِ النِّسَاءِ ﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَـٰلَةِ ۚ ﴿١٧٦﴾ ﴾ النساء[١].

## ١٤- باسێک: ( (ئەی موحەممەد ﷺ) داوای فەتوات لێ دەکەن بڵێ خوا فەتواتان بۆ دەدات دەربارەی کەلالە[٢]، ئەگەر پیاوێک مردوو منداڵی نەبوو تەنها خوشکێکی هەبوو، ئەوە نیوەی میراتی برا مردووەکەی دەکەوێ، وە براکەی میراتی خوشکەکەی هەموو دەبات[٣] ئەگەر خوشکەکەی منداڵی نەبوو، بەڵام ئەگەر دوو خوشک

(١) بڕوانە: ٤٣٦٤.
(٢) کەلالە: کەسێکە نەوە و کوڕ و باوک باپیرەی نەبێت.
(٣) ئەگەر ئافەرەتێ بمرێ تەنها برایەکی هەبێ.

بوون[١] ئەوا دوو سێیەکی میراتی براکەیان دەبەن، وە ئەگەر میراتگرەکان چەند خوشک و برایەک بوون پیاوان و ئافرەتان، ئەوە بۆ هەر نێرینەیەک ئەندازەی بەشی دوو مێینە هەیە، خوا بۆتان ڕوون دەکاتەوە تا گومڕانەبن، وە خوا بەهەموو شتێک زانایە)

**٦٧٤٤-بەڕا ﷺ دەڵێ: کۆتا ئایەتێك دابەزی کۆتایی سورەتی نیسائە:** ﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ﴿١٧٦﴾ ﴾ النساء، واته: **( (ئەی موحەممەد ﷺ) داوای فەتوات لێ دەکەن، بڵێ خوا فەتواتان بۆ دەدات دەربارەی کەلالە).**

## ١٥- بابُ في ابْنَيْ عَمٍّ: أَحَدُهُمَا أَخٌ لِلأُمِّ، وَالآخَرُ زَوْجٌ

وَقَالَ عَلِيٌّ ﷺ : لِلزَّوْجِ النِّصْفُ، وَلِلأَخِ مِنَ الأُمِّ السُّدُسُ، وَمَا بَقِيَ بَيْنَهُمَا نِصْفَانِ.

٦٧٤٥- حَدَّثَنَا مَحْمُودٌ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللهِ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي حَصِينٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً فَمَالُهُ لِمَوَالِي الْعَصَبَةِ، وَمَنْ تَرَكَ كَلاًّ أَوْ ضَيَاعًا فَأَنَا وَلِيُّهُ فَلأُدْعَى لَهُ»[٢].

---

(١) لە برا مردووەکەیان بەجێ مابوون.

(٢) بڕوانە: ٢٢٩٨.

## ١٥- باسی (حوکمی ئافرەتێک بمرێت) دوو کوڕە مامی هەبێت، یەکێکیان برایەتی لە دایکیەوە ئەوەی تریان مێردی بێت[١]

**- عەلی ﷺ دەڵێ: (کوڕە مامەکەی کە) مێردێتی نیوەی دەکەوێ، برا دایکیەکەشی شەش یەکی دەکەوێ، ئەوەش مایەوە یەکی نیوەیان بەردەکەوێ.**

**٦٧٤٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من بۆ باوەڕداران لە خۆشیان لە پێشترم بۆیان، ئینجا هەرکەس ماڵ و سامانی بەجێ هێشت بۆ خزمەکانێتی کە باوانی ئەون، هەر کەسیش قەرز و ئەرك و ماڵ و منداڵی بەجێ هێشت، ئەوە من سەرپەرەشتیاری ئەوم، با بانگ بکرێم بۆی (سەرپەرەشتی بکەم و قەرزەکەی بدەمەوە) )).**

٦٧٤٦- حَدَّثَنَا أُمَيَّةُ بْنُ بِسْطَامٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، عَنْ رَوْحٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلْحِقُوا الفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا تَرَكَتِ الْفَرَائِضُ فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ»[٢].

**٦٧٤٦-ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((میرات بدەن بە میراتگرەکان، ئینجا ئەوی مایەوە بۆ نزیکترین کەسی نێرینەیە)).**

---

(١) بەم جۆرەیە: پیاوێک ژنێک دەهێنێ و کوڕێکی لێ دەبێ، پاشان ژنی دووهەم دەهێنێ و لەویش کوڕێکی دەبێت، ژنی دووەم تەڵاق دەدات برایەکی پیاوە تەڵاق دەرەکە مارەی دەکات و کچێکی لێ دەبێت، ئەم کچە خوشکی دایکی کوڕی ژنی دووەمی پیاوی یەکەمە، لە هەمان کاتدا کچی مامیەتی لە باوکیەوە، ئەم کچە شوو دەکات بە کوڕی یەکەمی ژنی پیاوی یەکەم کە کوڕی مامیەتی، پاشان دەمرێ دوو کوڕی مامی لێ بەجێ دەمێنێ، یەکێکیان برایەتی لە دایکیەوە ئەوەی کەیان مێردێتی و کوڕی مامیەتی. إرشاد الساري: ١٦١/١٤.

(٢) بڕوانە: ٦٧٣٢.

## ١٦- بابُ ذَوِي الْأَرْحَامِ

٦٧٤٧- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي أُسَامَةَ: حَدَّثَكُمْ إِدْرِيسُ: حَدَّثَنَا طَلْحَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء، ﴿ وَالَّذِينَ عَاقَدَتْ[1] أَيْمَانُكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء. قَالَ: كَانَ الْمُهَاجِرُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَرِثُ الأَنْصَارِيُّ الْمُهَاجِرِيَّ دُونَ ذَوِي رَحِمِهِ؛ لِلأُخُوَّةِ الَّتِي آخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمْ، فَلَمَّا نَزَلَتْ ﴿ جَعَلْنَا مَوَالِيَ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء. قَالَ: نَسَخَتْهَا: ﴿ وَالَّذِينَ عَاقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء[2].

## ١٦- باسی ذَوِي الأَرْحَامِ[3] (میرات دەبەن یا ن نا؟)

**٦٧٤٧- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ (دەربارەی ئەم ئایەتانە) دەڵێ:** ﴿ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء،[4] ﴿ وَالَّذِينَ عَاقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء،[5] **دەڵێ: کاتێ کۆچەریەکان هاتن بۆ مەدینە ئەنصاری میراتی لە کۆچەری دەبرد نەك خزمەکانی خۆی (لە نەسەبەوە)، بەهۆی ئەو برایەتیەی پێغەمبەر ﷺ خستبویە نێوانیانەوە، ئەنجا کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿ جَعَلْنَا مَوَالِيَ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء، **ئیبنو عەبباس دەڵێ: (ئەم ئایەتە)** ﴿ وَالَّذِينَ عَاقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾ النساء، **ئەوی سڕیەوە. (یان میرات بردنەی ئەنصاری لە کۆچەری سڕییەوە[6]).**

---

(١) نافیع و ئیبنو کەسیر و ئەبی عەمر و ئیبنو عامیر و ئەبی جەعفەر و یەعقوب بە (عَاقَدَتْ) خوێندویانەتەوە، بەڵام عاصیم و حەمزە و کیسائی خەلەف بە (عَقَدَتْ) خوێندویانەتەوە. بڕوانە: الجدول المفصل في القراءات العشر المتواترة: ٢٢٧/١.

(٢) بڕوانە: ٢٢٩٢.

(٣) ئەو کەسانەن کە بەشی دیاریان نییە عەسەبەش نین، کە دە جۆر کەسن، کە ئەمانەن: خاڵ و پور (خوشکی دایک) و نەنک (دایکی دایک) و کوڕی کچ و کوڕی خوشک و کچی برا و کچی مام کچی پور (خوشکی دایک) و مام لە دایکەوە کوڕی برایەک لە دایکە و برای بێت و هەر کەسێکیش لە ڕێگەی ئەمانەوە بگات بە مردووەکە. بڕوانە: إرشاد الساري:١٦٣/١٤.

(٤) واتە: بۆ هەموو (مردوویەک یا میراتیک) چەند میراتگرێکمان داناوە.

(٥) واتە: وە ئەوانەی پەیمانتان لەگەڵ گرێداون.

(٦) سەیری (إرشاد الساري) بکە: ١٦٤/١٤.

## ١٧- بابُ مِيرَاثِ الْمُلَاعَنَةِ

٦٧٤٨- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَجُلاً لاَعَنَ امْرَأَتَهُ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا، فَفَرَّقَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ[1].

## ١٧- باسی میراتگرتنی ئافرەتی نەفرین لەگەڵ کراو

**٦٧٤٨- ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کەپیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەفرین کردنی لە گەڵ ژنەکەیدا ئەنجامدا، پیاوەکە حاشای کرد لە منداڵی ژنەکە، پێغەمبەریش ﷺ لە یەکتری جیا کردنەوە، کوڕەکەشی دا بە ژنەکە.**

## ١٨- بابٌ: الوَلَدُ لِلْفِرَاشِ حُرَّةً كَانَتْ أَوْ أَمَةً

٦٧٤٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ عُتْبَةُ عَهِدَ إِلَى أَخِيهِ سَعْدٍ أَنَّ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ مِنِّي، فَاقْبِضْهُ إِلَيْكَ. فَلَمَّا كَانَ عَامَ الْفَتْحِ أَخَذَهُ سَعْدٌ فَقَالَ: ابْنُ أَخِي، عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ. فَقَامَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: فَقَالَ: أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ. فَتَسَاوَقَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْنُ أَخِي قَدْ كَانَ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ. فَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ». ثُمَّ قَالَ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ: «احْتَجِبِي مِنْهُ». لِمَا رَأَى مِنْ شَبَهِهِ بِعُتْبَةَ، فَمَا رَآهَا حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ[2].

(١) بڕوانە: ٤٧٤٨.
(٢) بڕوانە: ٢٠٥٣.

# ١٨- باسێک: منداڵ هی ئەو پیاوەیە خاوەنی ژنەکەیە، ژنەکە ئازاد بێ یان کەنیزەک

**٦٧٤٩- عائیشە ﵂ دەڵێ: عوتبە وەسێتی بۆ سەعدی برای کرد: کە (عەبدوڕەحمانی) کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعە لە منە، (لێی) وەرگرەوە و بیهێنە لای خۆت، ئەنجا ئەو ساڵەی مەککە ئازاد کرا سەعد ئەو کوڕەی گرتە لای خۆی وتی: برازامە براکەم وەسێتی بۆ کردووم دەربارەی، عەبدی کوڕی زەمعەش هەستا وتی: ئەمە برامە کوڕی کەنیزەکی باوکمە، کاتێ لە دایك بوو لەژێر دەسەڵاتی باوکمدا بووە[1]، جا هەردووکیان یەکتریان بە پاڵنان برد بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ سەعدیش وتی: ئەمە برازامە براکەم وەسێتی بۆ کردووم دەربارەی، عەبدی کوڕی زەمعەش وتی: ئەمە برامە کوڕی کەنیزەکی باوکمە، ئەو کەنیزەکە هی باوکم بووە کاتێ ئەم کوڕی بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەی عەبدی کوڕی زەمعە ئەم کوڕە هی تۆیە، منداڵ هی ئەو کەسەیە خاوەنی ژنەکە بێت، ئەوەش زینای لەگەڵا کردوە بێ بەشی بۆ هەیە))، پاشان بە سەودەی کچی زەمعەی[2] فەرموو: ((خۆتی لێ داپۆشە و با نەتبینێ))، کاتێ بینی عەبدوڕەحمان لە عوتبە دەچێ، ئیتر عەبدوڕەحمان سەودەی نەبینی تا مرد.**

٦٧٥٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ عَنْ يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْوَلَدُ لِصَاحِبِ الْفِرَاشِ»[3].

**٦٧٥٠-ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((منداڵ بۆ خاوەنی ژنەکەیە)).**

---

(١) واتە: ئەو کەنیزەکە کاتێ منداڵەکەی بووە کە ناوی عەبدوڕەحمانە ئەبی زەمعە خاوەن و گەورەی بووە..

(٢) کە خێزانی پێغەمبەر بوو ﷺ.

(٣) بڕوانە: ٦٨١٨.

## ١٩- بابٌ: الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَمِيرَاثُ اللَّقِيطِ

وَقَالَ عُمَرُ ﷺ : اللَّقِيطُ حُرٌّ.

٦٧٥١- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتِ: اشْتَرَيْتُ بَرِيرَةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اشْتَرِيهَا، فَإِنَّ الْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ». وَأُهْدِيَ لَهَا شَاةٌ، فَقَالَ: «هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ». قَالَ الْحَكَمُ وَكَانَ زَوْجُهَا حُرًّا، وَقَوْلُ الْحَكَمِ مُرْسَلٌ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: رَأَيْتُهُ عَبْدًا[١].

## ١٩- باسێک: سەرپەرەشتیاری بۆ ئەو کەسەیە کۆیلەکەی ئازاد کردوە، وە باسی میراتی منداڵی فڕێدراو دۆزراوە

**-عومەر ﷺ دەڵێ: منداڵی فڕێدراو ئازادە.**

**٦٧٥١- ئەسوەد دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﷺ وتی: بەریرەم کڕی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیکڕە چونکە بێگومان سەرپەرشتیاریی (وەلائی[٢]) ئازادکراو بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە))، وە مەڕێك بە دیاری هێنرا بۆ بەریرە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((ئەو گۆشتە بۆ ئەو زەکاتە، بەڵام بۆ ئێمە دیارییە)).**

**-حەکەم دەڵێ: مێردەکەی بەریرە کەسێکی ئازاد بوو، ئەم وتەی حەکەم مورسەلە[٣]. وە ئیبنو عەبباس دەڵێ: من مێردەکەی بەریرەم بینی کۆیلە بوو.**

٦٧٥٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ»[١].

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

(٢) وەلاء: واتە دوای مردنی کەنیزەکەکە ماڵەکەی بۆ ئەوان بێت، ئەگەر خۆی کەس و کاری نەبوو.

(٣) واتە: ڕشتەکەی تا دەگەتاوە عائیشە پەیوەست نییە. بڕوانە: إرشاد الساري: ١٦٨/١٤.

**٦٧٥٢-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: ((بێگومان سەرپەرشتیاریی (وەلائی) بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی کردوە)).**

## ٢٠- بابُ مِيرَاثِ السَّائِبَةِ

٦٧٥٣- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بْنُ عُقْبَةَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ، عَنْ هُزَيْلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الإِسْلاَمِ لا يُسَيِّبُونَ، وَإِنَّ أَهْلَ الْجَاهِلِيَّةِ كَانُوا يُسَيِّبُونَ.

## ٢٠- باسی میراتگرتنی کۆیلەی بەرەڵاکراو [٢]

**٦٧٥٣ -عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: بێگومان خەڵکی مسوڵمان کۆیلە هەروا بەرەڵا ناکەن، وە بەڕاستی خەڵکی سەردەمی نەفامی کۆیلەیان واز لێ دەهێنا و بەرەڵایان دەکرد.**

٦٧٥٤- حَدَّثَنَا مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ اشْتَرَتْ بَرِيرَةَ لِتُعْتِقَهَا، وَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا وَلاَءَهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي اشْتَرَيْتُ بَرِيرَةَ لأُعْتِقَهَا، وَإِنَّ أَهْلَهَا يَشْتَرِطُونَ وَلاَءَهَا. فَقَالَ: «أَعْتِقِيهَا، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ». أَوْ قَالَ: «أَعْطَى الثَّمَنَ». قَالَ: فَاشْتَرَتْهَا فَأَعْتَقَتْهَا. قَالَ: وَخُيِّرَتْ فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا وَقَالَتْ: لَوْ أُعْطِيتُ كَذَا وَكَذَا مَا كُنْتُ مَعَهُ. قَالَ الأَسْوَدُ: وَكَانَ زَوْجُهَا حُرًّا. قَوْلُ الأَسْوَدِ مُنْقَطِعٌ، وَقَوْلُ ابْنِ عَبَّاسٍ: رَأَيْتُهُ عَبْدًا. أَصَحُّ[٣].

**٦٧٥٤- ئەسوەد دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ بەریرەی کڕی بۆ ئەوەی ئازادی بکات، بەڵام خاوەنەکەی بەمەرجی گرت کە هەقداری (وەلائی) بەریرە بۆ ئەو**

---

(١) بڕوانە: ٢١٥٦.

(٢) ئەو کۆیلەیە خاوەنی پێی دەڵێ کەس سەرپەرشتیار نییە بەسەرتەوە، یان تۆ ئازاد کراوی واز لێهێنراوی. بڕوانە: إرشاد الساري:١٤/١٦٩.

(٣) بڕوانە: ٤٥٦.

**بێت، عائیشەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من بەریرەم کڕی بۆ ئەوەی ئازادی بکەم، دیارە خاوەنەکانی مەرجیان داناوە کە هەقداریەکەی بۆ ئەوان بێت، ئەویش فەرمووی: ((ئازادی بکە چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە))، یان فەرمووی: ((نرخەکەی داوە))، ئەسوەد وتی: ئەویش کڕی و ئازادی کرد، دەڵێ: بەریرە سەرپشك کرا ئیتر خۆی هەڵبژارد (بەسەر مانەوە لای مێردەکەیدا)، وە وتی: ئەگەر ئەوە و ئەوەشم پێ بدرایە لای نەدەمامەوە.**

**-ئەسوەد دەڵێ: مێردی بەریرە کەسێکی ئازادبوو، ئەم وتەی ئەسوەد ڕشتەکەی بچڕاوە و پەیوەست نییە.**

**-وە ئەم وتەی ئیبنو عەبباس ﷺ کەدەڵێ: بینیم کۆیلە بوو ڕاسترە.**

## ٢١- بابُ إِثْمِ مَنْ تَبَرَّأَ مِنْ مَوَالِيهِ

٦٧٥٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ قَالَ عَلِيٌّ ﷺ : مَا عِنْدَنَا كِتَابٌ نَقْرَؤُهُ إِلاَّ كِتَابُ اللهِ، غَيْرَ هَذِهِ الصَّحِيفَةِ. قَالَ فَأَخْرَجَهَا فَإِذَا فِيهَا أَشْيَاءُ مِنَ الجِرَاحَاتِ وَأَسْنَانِ الإِبِلِ. قَالَ: وَفِيهَا: "الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا، أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ، وَمَنْ وَالَى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ، وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ. يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ"[١].

---

(١) بروانە: ١١١.

## ٢١- باسی تاوانی ئەو (كۆیلە)ی خۆی بێبەری بكات لە گەورە و خاوەنەكانی

**٦٧٥٥- ئیبراهیمی تەیمی دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە دەڵێ: عەلی ﷺ وتی: هیچ كتێبێكمان لا نییە بیخوێنینەوە جگەلە قورئانەكەی خوا و ئەم پەڕەیە [١] نەبێت. ئینجا پەڕەكەی دەرهێنا و شتانێكی تێدا بوو لە (حوكمی) برینەكان و تەمەنی وشتر (ی لەخوێندا دراو) وتی: ئەمەشی تێدا بوو((مەدینە ڕێزدار و قەدەغەیە[٢] لە نێوانی عەیرەوە بۆ سەور، جا هەر كەسێ خراپەیەكی تێدا بكات یا خراپەكارێك پەنا بدات و بگرێتە خۆ، ئەوە نەفرەینی خوا و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لەسەر بێت، لە ڕۆژی دواییدا هیچ فەرز و سوننەتێكی لێ وەرناگیرێ، وە هەر كەس جگە لە هۆزەی خۆی پاڵ بدات بە هۆزێكی ترەوە، ئەوە نەفرەینی خوا و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لەسەر بێت، لە ڕۆژی دواییدا هیچ فەرزو سوننەتێكی لێ وەرناگیرێ [٣]، گەردن و پەنای مسوڵمانان وەك یەك وایە (لەو پەنادانە) نزمترینیان دەگرێتەوە، هەركەس پەنادانی مسوڵمانێك هەڵبوەشێنێتەوە، ئەوە نەفرینی خوا و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لەسەر بێت، لە ڕۆژی دواییدا هیچ فەرز و سوننەتێكی لێ وەرناگیرێ )).**

٦٧٥٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ وَعَنْ هِبَتِهِ[٤].

**٦٧٥٦-ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری كرد لە فرۆشتنی هەقداری و ڕێگریشی كرد لە بەخشینی.**

---

(١) ئەو پەڕەیە كە چەند فەرموودەیەكی تیا نوسرابوو ئەو فەرموودەی سەرەوە یەكێک بوو لە فەرموودەكان.
(٢) جەنگ و ئاژاوە تێیدا یاساغ و قەدەغەیە.
(٣) هەندێ لە زانایان (صرف و عدل) یان بە پەشیمان بوونەوە و فیدیە مانایان كردوە.
(٤) بڕوانە: ٢٥٣٥.

## ٢٢- بَابٌ: إِذَا أَسْلَمَ عَلَى يَدَيْهِ رَجُلٌ

وَكَانَ الْحَسَنُ لاَ يَرَى لَهُ وِلاَيَةً. وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ». وَيُذْكَرُ عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ رَفَعَهُ قَالَ: «هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاهُ وَمَمَاتِهِ»، وَاخْتَلَفُوا فِي صِحَّةِ هَذَا الخَبَرِ

٦٧٥٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ جَارِيَةً تُعْتِقُهَا، فَقَالَ أَهْلُهَا: نَبِيعُكِهَا عَلَى أَنَّ وَلاَءَهَا لَنَا. فَذَكَرَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «لاَ يَمْنَعُكِ ذَلِكِ، فَإِنَّمَا الوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ»[1].

## ٢٢- باسێک: ئەگەر پیاوێک لەسەر دەستی (کەسێکدا) مسوڵمان بوو

**-حەسەن بۆچوونی وایە ئەو کەسەی مسوڵمانی کردوە مافی سەرپەرشتیاری (وەلائی) نییە بەسەریەوە[2].**

**-وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((سەرپەرەشتیاری بۆ ئەو کەسەیە کۆیلەکەی ئازاد کردوە)).-وە لە تەمیم داریەوە دەگێڕدرێتەوە و داوێتیە پاڵ پێغەمبەر ﷺ: ((ئەو کەسە لە هەموو کەس لە پێشتر (بەکەسە ئازاد کراوەکە) لە ژیانیدا و (لە پاش) مردنیشی)). وە زانایان ڕاجیان دەربارەی ڕاست و دروستی ئەم فەرموودەیە.**

**٦٧٥٧- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە کە عائیشەی دایکی باوەڕداران ﷺ ویستی کەنیزەکێك بکڕێت و ئازادی بکات، ئەنجا خاوەنەکەی وتی: پێت دەفرۆشین بە مەرجێ سەرپەرەشتیاریەکەی بۆ ئێمە بێت، منیش ئەم قسەیەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەو قسەیان ڕێگرت نەبێ، چونکە بەڕاستی سەرپەرەشتیاری بۆ ئەو کەسەیە (کۆیلە یا کەنیزەکەکەی) ئازاد کردوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٢١٥٦.

(٢) بەسەر ئەو کەسەی مسوڵمان بووە.

٦٧٥٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ، أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتِ: اشْتَرَيْتُ بَرِيرَةَ فَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا وَلاَءَهَا، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «أَعْتِقِيهَا فَإِنَّ الْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْطَى الوَرِقَ». قَالَتْ: فَأَعْتَقْتُهَا. قَالَتْ: فَدَعَاهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَخَيَّرَهَا مِنْ زَوْجِهَا فَقَالَتْ: لَوْ أَعْطَانِي كَذَا وَكَذَا مَا بِتُّ عِنْدَهُ. فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا[١].

**٦٧٥٨- عائیشه ﷺ دەڵێ: بەریرەم کڕی، جا خاوەنەکانی بەمەرجیان گرت کە هەقداریەکەی بۆ ئەوان بێت، منیش ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ((ئازادی کە چونکە بێگومان هەقداری بۆ ئەو کەسەیە زیو (پارە)ی داوە))، دەڵێ: منیش ئازادم کرد، دەڵێ: ئەنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەریرەی بانگ کرد و سەرپشکی کرد لە (مانەوە لای) مێردەکەی، بەریرەش وتی: ئەگەر ئەوە و ئەوەشم پێبدات شەوێك لای نامێنمەوە، ئیتر جیابوونەوەی خۆی هەڵبژارد.**

## ٢٣- بَابُ مَا يَرِثُ النِّسَاءُ مِنَ الوَلاَءِ

٦٧٥٩- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَرَادَتْ عَائِشَةُ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ فَقَالَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّهُمْ يَشْتَرِطُونَ الْوَلاَءَ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اشْتَرِيهَا، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ»[٢].

## ٢٣- باسی ئەوەی بە میراتی بۆ ژنان دەبێت لەسەر پەرەشتیاری

**٦٧٥٩- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: عائیشە ﷺ ویستی بەریرە بکڕێ، ئینجا عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: بێگومان خاوەنەکانی مەرجی هەقداری دادەنێن[١]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بیکڕە چونکە بێگومان هەقداری ئازادکراو بۆ ئەو کەسەیە ئازادی کردوە)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٥٦.

(٢) بڕوانە: ٢١٥٦.

٦٧٦٠- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْطَى الوَرِقَ وَوَلِيَ النِّعْمَةَ»[٢].

**٦٧٦٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سەرپەرەشتیاری بۆ ئەو كەسەیە پارە (ی ئازادكردنە) كەی بدات و ببێتە خاوەنی چاكە (ی ئازاد كردنەكەی)).**

## ٢٤- بَابٌ: مَوْلَى القَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، وَابْنُ الأُخْتِ مِنْهُمْ

٦٧٦١- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ وَقَتَادَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ». أَوْ كَمَا قَالَ[٣].

## ٢٤- باسێك: ئازادكراوی كەسانێك لە خۆیانە، هەروەها كوڕی خوشكیش لەوانە

**٦٧٦١-ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((ئازاد كراوی خەڵكانێك لە خۆیانە)) یان وەكو ئەوەی كە فەرمووی.**

٦٧٦٢- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ». أَوْ: «مِنْ أَنْفُسِهِمْ»[٤].

**٦٧٦٢- ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((كوڕی كچی كەسانێك لەوانە)) یان((لە خۆیانە)).**

---

(١) الْوَلاَءُ: واتە دوای مردنی كەنیزەكەكە ماڵەكەی بۆ ئەوان بێت.

(٢) بڕوانە: ٤٥٦.

(٣) بڕوانە: ٣١٤٦.

(٤) بڕوانە: ٣١٤٦.

## ٢٥- بابُ مِيرَاثِ الأَسِيرِ

## قَالَ: وَكَانَ شُرَيْحٌ يُوَرِّثُ الأَسِيرَ فِي أَيْدِي العَدُوِّ وَيَقُولُ: هُوَ أَحْوَجُ إِلَيْهِ. وَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ:

أَجِيز وَصِيَّةَ الأَسِيرِ وَعَتَاقَهُ، وَمَا صَنَعَ فِي مَالِهِ، مَا لَمْ يَتَغَيَّرْ عَنْ دِينِهِ، فَإِنَّمَا هُوَ مَالُهُ يَصْنَعُ فِيهِ مَا يَشَاءُ.

## ٢٥- باسی (حوکمی) میراتی دیل

**- (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: شورەیح میراتی دەدا بە دیلێك لای دوژمن دیل بوو، وە دەیوت: ئەو دیلە زیاتر پێویستی بەو میراتە هەیە.**

**-وە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ: وەسێت و ئازاد کردنی کۆیلەی دیل بەڕەوا دەزانم، هەر کارێکیش لە سامانەکەیدا بکات، بەمەرجێ لە ئایینەکەی نەگۆڕێ، چونکە لە ڕاستیدا ماڵ و سامانی خۆیەتی ئەوەی بیەوێ دەتوانێ تیایدا بکات.**

٦٧٦٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ، وَمَنْ تَرَكَ كَلاًّ فَإِلَيْنَا».

**٦٧٦٣- ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکەس (مرد و) سامانی بەجێ هێشت ئەوە بۆ میراتگرانێتی، هەر کەسێکیش (مرد و) قەرز یا منداڵ و خێزانی بەجێ هێشت ئەوە ڕووی لە ئێمەیە و لەسەر ئێمەیە)).**

## ٢٦- بابٌ: لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الكَافِرَ وَلاَ الكَافِرُ المُسْلِمَ، وَإِذَا أَسْلَمَ قَبْلَ أَنْ يُقْسَمَ المِيرَاثُ فَلاَ مِيرَاثَ لَهُ

٦٧٦٤- حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الكَافِرَ، وَلاَ الكَافِرُ المُسْلِمَ»(١).

## ٢٦- باسێک: مسوڵمان میرات لە کافر نابات، کافریش میرات لە مسوڵمان نابات، وە ئەگەر کافر مسوڵمان بوو پێش ئەوەی میراتەکە دابەش کرێت، ئەو میراتی بۆ نییە(٢)

**٦٧٦٤-ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مسوڵمان میرات لە بێ باوەڕ نابات و بێ باوەڕیش میرات لە مسوڵمان نابات)).**

## ٢٧- بابُ مِيرَاثِ العَبْدِ النَّصْرَانِيِّ وَمُكَاتَبِ النَّصْرَانِيِّ وَإِثْمِ مَنِ انْتَفَى مِنْ وَلَدِهِ

## ٢٧- باسی میراتگرتنی کۆیلەی گاور و نووسراو لەگەڵ کراوی گاور، وە تاوانی ئەو کەسەی خۆی بێ بەری کات لە منداڵەکەی(٣)

(١) بڕوانە: ١٥٨٨، ٤٢٨٣.

(٢) پێی نادرێت، چونکە دەبێت لە پێش مردنی میرات لێ گیراوەکە مسوڵمان بێت، نەک کاتی دابەشکردنی.

(٣) سەرنج: ئیمامی بوخاری ویستویەتی فەرموودەیەک یان زیاتر دابنێ بۆ ئەم باسە، بەڵام فریا نەکەوتووە و تا لە ژیاندا بووە فەرموودەیەکی وای دەستنەکەوتووە لەسەر مەرجەکانی بێت بۆ ئەم باسە.

## ٢٨- بابُ مَنِ ادَّعَى أَخًا أَوِ ابْنَ أَخٍ

٦٧٦٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتِ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلَامٍ، فَقَالَ سَعْدٌ، هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، انْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ. وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ. فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى شَبَهِهِ فَرَأَى شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: «هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ». قَالَتْ: فَلَمْ يَرَ سَوْدَةَ قَطُّ[1].

## ٢٨- باسی (حوکمی) کەسێک بڵێ بەکەسێکی تر برامە[2] یان بڵێ کوڕی برامە

**٦٧٦٥- عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە کە وتی: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدی کوڕی زەمعە لەسەر مێرد منداڵێك (عەبدوڕەحمان) بوو بە كێشە و ناكۆكیان، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم كوڕە برازامە منداڵی عوتبەی كوڕی ئەبو وەققاصە، وەسیەتی بۆ كردووم كە ئەو (مێرد منداڵە) كوڕیەتی سەیری شێوەی بكە، عەبدی كوڕی زەمعەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم كوڕە برای منە لە ماڵ و جێگەی باوكمدا لە دایك بووە لە كەنیزكەكەیەتی، پێغەمبەری خواش ﷺ شێوەی كوڕەكەی كرد و بینی بەئاشكرا لە عوتبە دەچێت، ئینجا فەرمووی: ((عەبدی كوڕی زەمعە ئەم منداڵە هی تۆیە، چونكە منداڵ هی ئەو كەسەیە كە لە ماڵ و جێگەی ئەودا لە دایكدەبێت، مرۆڤی داوێن پیسیش جگە لەپەشیمانی و ڕەنج بەخەسار هیچی تری دەست ناكەوێ))، ئەنجا فەرمووی: ئەی سەودەی كچی زەمعەی: (( ئیتر با ئەم كوڕە نەتبینێ))[3] عائیشە دەڵێ: ئیتر ئەو كوڕە سەودەی هەتا هەتایە نەبینی.**

---

(١) بڕوانە: ٢٠٥٣.

(٢) بەڕاست بێ یان درۆ.

(٣) چونكە تۆ نامەحرەمی بەم كوڕە.

## ٢٩- بابُ مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ

٦٧٦٦- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ -هُوَ: ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ- حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ، وَهْوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ، فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ»[١].

## ٢٩- باسی کەسێک ڕەچەڵەکی خۆی بداتە لای غەیری باوکی

**٦٧٦٦- ئەبو عوسمان لە سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: ((هەر کەسێ خۆی بکات بەکوڕی کەسێکی تر جگە لە باوکی لە کاتێکدا دەزانێ کە باوکی نییە، ئەوە بەهەشت لەسەر ئەو کەسە حەرامە)).**

٦٧٦٧ - فَذَكَرْتُهُ لأَبِي بَكْرَةَ فَقَالَ: وَأَنَا سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٢].

**٦٧٦٧- (ئەبو عوسمانی نەهدی دەڵێ) ئینجا من ئەو فەرموودەیەم باس کرد بۆ ئەبو بەکرە ﷺ ئەویش وتی: من خۆم بەهەردوو گوێی خۆم ئەم فەرموودەیەم بیست، وە بە دڵیش وەرم گرت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.**

٦٧٦٨- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ بْنُ الفَرَجِ، حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ أَخْبَرَنِي عَمْرٌو، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ عِرَاكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَرْغَبُوا عَنْ آبَائِكُمْ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ أَبِيهِ فَهُوَ كُفْرٌ».

**٦٧٦٨-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((پشت لە باوکتان مەکەن[١]، چونکە هەر کەس پشت لە باوکی خۆی کات (خۆی بەکوڕی کەسێکی تر بزانێ)، ئەو بەڕاستی سپڵەییە)).**

---

(١) بڕوانە: ٤٣٢٦.

(٢) بڕوانە: ٤٣٢٧.

## ٣٠- بابٌ: إِذَا ادَّعَتِ الْمَرْأَةُ ابْنًا

٦٧٦٩- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «كَانَتِ امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا، جَاءَ الذِّئْبُ فَذَهَبَ بِابْنِ إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ لِصَاحِبَتِهَا إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ. وَقَالَتِ الأُخْرَى إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ. فَتَحَاكَمَتَا إِلَى دَاوُدَ ﷺ فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى، فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ ﷺ فَأَخْبَرَتَاهُ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِّينِ أَشُقُّهُ بَيْنَهُمَا. فَقَالَتِ الصُّغْرَى لاَ تَفْعَلْ يَرْحَمُكَ اللَّهُ. هُوَ ابْنُهَا. فَقَضَى بِهِ لِلصُّغْرَى».
قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللَّهِ إِنْ سَمِعْتُ بِالسِّكِّينِ قَطُّ إِلاَّ يَوْمَئِذٍ، وَمَا كُنَّا نَقُولُ إِلاَّ: الْمُدْيَةَ[٢].

## ٣٠- باسێک: ئەگەر ژنێک بڵێ ئەوە کوڕی منە[٣]

**٦٧٦٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ[٤] فەرمووی: ((دوو ئافرەت دوو کوڕی خۆیان لەگەڵیان بوون[٥]، جا گورگێك هات کوڕی ئافرەتێکیانی فڕاند، ئافرەتەکە بە ئافرەتەکەی هاوڕێ وت: بێگومان کوڕەکەی تۆی فڕاند، ئافرەتەکەی کەشیان وتی: بەدڵنیاییەوە کوڕەکەی تۆی فڕاند. جا کێشەکەیان بردە لای داوود ﷺ ئەویش بڕیاری دا ئەو (کوڕەی مابوو) بۆ ئافرەتە گەورەکەیان بێت، ئەنجا چوون بۆ لای سولەیمانی کوڕی داوود ﷺو بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، سولەیمانیش وتی: چەقۆیەکم بۆ بێنن دەیکەم بە دوو لەتەوە لە نێوانیاندا، ئافرەتە بچوکەکە وتی ئەو کارە مەکە ڕەحمەتی**

---

(١) خۆتان بە کوڕ و نەوەی کەسێکی تر بزانن جگە لە باوکی خۆتان.
(٢) بڕوانە: ٣٤٢٧.
(٣) ڕاست بکات یا درۆ بکات.
(٤) سەیری فەرموودەی: ٦٧٦٩ بکە بەڕوونی نەیوتووە پێغەمبەر فەرمووی، بەڵام فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ.
(٥) واتە: دوو ئافرەت هەر یەکەیان کوڕێکی خۆی لەگەڵدا بوو.

**خوات لێ بێ، بێگومان کوڕی ئەوە، ئەوسا سولەیمان بڕیاریدا کوڕەکە بۆ ئافرەتە بچوکەکەیان بێت))، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سوێند بەخوا ناوی (سِّكِّينِ)ـم نەبیستبوو لەو ڕۆژەدا نەبێت، وە ئێمە هەر پێمان دەوت (مُدْيَة)[1].**

## ٣١- بابُ القائف

٦٧٧٠- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيَّ مَسْرُورًا، تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ فَقَالَ: «أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزًا نَظَرَ آنِفًا إِلَى زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ»[2].

## ٣١- باسی (حوكمی) سەرناس [3]

**٦٧٧٠- عائیشە ﵂ دەڵێت جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵخۆشیەوە هاتەوە ژوورەوە بۆ لام ڕووخساری (لە خۆشیدا) شەوقی دەدایەوە و فەرمووی: ((ئایا نەتبینی موجەزیز کەمێ پێش ئێستە سەیری زەیدی کوڕی حاریسە و ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد ﵄ وتی: ئەم پێیانە لە یەك دەچن[4])).**

٦٧٧١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ وَهْوَ مَسْرُورٌ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزًا المُدْلِجِيَّ دَخَلَ فَرَأَى أُسَامَةَ وَزَيْدًا وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ، قَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ»[5].

---

(١) (سِّكِّينِ) و (مُدْيَة) هەردووكیان بە مانای چەقۆ دێن، بەڵام هەر هۆزە وشەیەكی بۆ بەكار هێناوە.

(٢) بڕوانە: ٣٥٥٥.

(٣) سەرناس: كەسێكە بە شكل و شێوە یا بەدەنگیاندا دەزانێ دوو كەس كوڕ و باوكن. بڕوانە: ئەلمونجید بە كوردی:٤/٢٢٣.

(٤) واتە: وەك یەك وان كەواتە كەسی یەكترن.

(٥) بڕوانە: ٣٥٥٥.

٦٧٧١- عائیشه رضي الله عنها دەڵێ: ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام و دڵخۆشبوو فەرمووی: ((ئەی عائیشه ئایا نەتبینی موجەزیزی مودلیجی هاتە ژوورەوەو ئوسامە و زەیدی بینی بەتانییەكی قەیفەیان پێوە بوو، هەردووكیان سەریان داپۆشیبو، قاچیان بە دەرەوە بوو، وتی: بێگومان ئەم قاچانە هەندێكیان لە هەندێكیان دەچن)).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ٨٦- كِتَابِ الحُدُودِ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# ٨٦- پەڕاوی سزای تاوانەکان[1]

## بابُ ما يحذر من الحدود

## ١- بابٌ: لا يُشْرَبُ الخَمرُ

وَقَالَ ابن عَبَّاسٍ ﷺ: يُنْزَعُ مِنْهُ نُورُ الإِيمَانِ.

٦٧٧٢- حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ وَهْوَ مُؤْمِنٌ»

وَعَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ، إِلاَّ النُّهْبَةَ[2].

## باسی سزای ئەو تاوانانەی خۆ لێ دەپارێزرێت[3]

## ١- باسێک: عارەق ناخورێتەوە

**-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: (زیناکار) نووری باوەڕی لێ دەردەهێنرێ لە کاتێ زینا کردنەکەیدا.**

(١) دروستە بوترێ سنووری تاوانەکان.

(٢) بڕوانە: ٢٤٧٥.

(٣) ئیمامی بوخاری هیچ فەرموودەیەکی لەو باسەدا نەهێناوە.

٦٧٧٢- ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((داوێن پیس داوێن پیسی ناكات لە كاتی داوێن پیسییەكەیدا باوەڕدار بێت، (عارەق خۆر) عارەق ناخواتەوە و لە كاتی عارەق خواردنەوەكەیدا باوەڕدار بێت، وە (دز) دزی ناكات و لە كاتی دزی كردنەكەیدا باوەڕدار بێت، وە (تالآنچی) هیچ تالآنێكی بەنرخ ناكات كە خەڵك بۆی بڕوانن، لە كاتی تالآنكردنەكەیدا باوەڕدار بێت)).

وە لە ئیبنو شیهابەوە گێڕدراوتەوە ئەویش لە سەعیدی كوڕی موسەییەب و ئەبو سەلەمەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وەك فەرموودەكەی پێشوو جگە لە ((النُّهْبَةَ)) كەتیایە نییە.

## ٢- بابُ مَا جَاءَ فِي ضَرْبِ شَارِبِ الخَمْرِ

٦٧٧٣- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ح.

## ٢- باسی ئەوەی دەربارەی شەلاقدانی عارەق خۆر هاتووە

٦٧٧٣-حەفصی كوڕی عومەر بۆی گێڕاینەوە وتی: هیشام بۆی گێڕاینەوە لە قەتادەوە لە ئەنەسەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی.

٦٧٧٣/م -حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ضَرَبَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ[١].

٦٧٧٣-ئادەم بۆی گێڕاینەوە وتی: شوعبە بۆی گێڕاینەوە وتی: قەتادە بۆی گێڕاینەوە لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ كە پێغەمبەر ﷺ بە پەلی دار

(١) بڕوانە: ٦٧٧٦.

خورما و نەعل و پیلاو لە عارەق خواردن دا (لە عارەق خۆری داوە)، ئەبو بەکریش ﷺ چل شەلاقی لێ داوە (لە عارەق خۆر).

## ٣- بَابُ مَنْ أَمَرَ بِضَرْبِ الْحَدِّ فِي الْبَيْتِ

٦٧٧٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: جِيءَ بِالنُّعَيْمَانِ -أَوْ بِابْنِ النُّعَيْمَانِ- شَارِبًا، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ مَنْ كَانَ بِالْبَيْتِ أَنْ يَضْرِبُوهُ، قَالَ: فَضَرَبُوهُ، فَكُنْتُ أَنَا فِيمَنْ ضَرَبَهُ بِالنِّعَالِ[1].

## ٣- باسی کەسێ فەرمانی کردبێ، بە لێدانی سزای عارەق خواردنەوە لەماڵدا

**٦٧٧٤- عوقبەی کوڕی حاریس دەڵێ: نوعەیمان یان ئیبنو نوعەیمانیان بەسەرخۆشی هێنرا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد بەو کەسانەی لە ماڵەکەدا بوون لێ بدەن، عوقبە دەڵێ: منیش لەو کەسانە بووم کە بەنەعل لێمدا.**

## ٤- بَابُ الضَّرْبِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ

٦٧٧٥- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبُ بْنُ خَالِدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ أَنَّ النَّبِيَّ أُتِيَ بِنُعَيْمَانَ -أَوْ بِابْنِ نُعَيْمَانَ- وَهْوَ سَكْرَانُ فَشَقَّ عَلَيْهِ، وَأَمَرَ مَنْ فِي الْبَيْتِ أَنْ يَضْرِبُوهُ، فَضَرَبُوهُ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ، وَكُنْتُ فِيمَنْ ضَرَبَهُ[2].

---

(١) بڕوانە: ٢٣١٦.

(٢) بڕوانە: ٢٣١٦.

## ٤- باسی لێدانی بە پەلی دار خورما و نەعل (لە عارەق خۆر)

**٦٧٧٥- عوقبەی کوڕی حاریس دەگێڕێتەوە نوعەیمان یان ئیبنو نوعەیمان بەسەرخۆشی هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، جا ئەو کارەی بەلاوە قورس و ناخۆش بوو، فەرمانی کرد بەو کەسانەی لە ماڵەکەدا بوون لێ بدەن، ئەوانیش بە پەلی دار خورما و نەعل لێیاندا، منیش لەو کەسانە بووم کە لێمدا.**

٦٧٧٦- حَدَّثَنَا مُسْلِمٌ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَلَدَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ[1].

**٦٧٧٦- قەتادە لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕایەوە وتی: پێغەمبەر ﷺ بەپەلی دار خورما و نەعل و پێڵاو لە عارەق خۆری داوە. ئەبو بەکریش ﷺ چل شەلاقی لێ داوە.**

٦٧٧٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو ضَمْرَةَ أَنَسٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ الْهَادِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ، قَالَ: «اضْرِبُوهُ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَمِنَّا الضَّارِبُ بِيَدِهِ وَالضَّارِبُ بِنَعْلِهِ، وَالضَّارِبُ بِثَوْبِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: أَخْزَاكَ اللَّهُ. قَالَ: «لاَ تَقُولُوا هَكَذَا، لاَ تُعِينُوا عَلَيْهِ الشَّيْطَانَ»[2].

**٦٧٧٧-ئەبو سەلەمە گێڕایەوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ عارەقی خواردبوویەوە، فەرمووی: ((لێیدەن))، ئەبو هورەیرە دەڵێ: جا هەمانبوو بەدەست لێی دەدا، وە هەمانبوو بە نەعل و هەمان بوو بەجل و پۆشاکەکەی لێی دەدا، ئینجا کاتێ لێدانەکەی تەواو بوو، کەسێك پێی وت: خوا ڕیسوات کات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئاوەها مەڵێ یارمەتی شەیتان مەدەن لە دژی)).**

---

(١) بروانە: ٦٧٧٣.

(٢) بروانە: ٦٧٨١.

٦٧٧٨- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الحَارِثِ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنَا أَبُو حَصِينٍ: سَمِعْتُ عُمَيْرَ بْنَ سَعِيدٍ النَّخَعِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: مَا كُنْتُ لأُقِيمَ حَدًّا عَلَى أَحَدٍ فَيَمُوتَ، فَأَجِدَ فِي نَفْسِي، إلاَّ صَاحِبَ الْخَمْرِ، فَإِنَّهُ لَوْ مَاتَ وَدَيْتُهُ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَسُنَّهُ.

**٦٧٧٨-عومەیری کوڕی سەعیدی نەخەعی دەڵێ: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبم ﷺ بیست وتی: سزایەکی شەرعی بەسەر هەر کەسێکدا جێبەجێ بکەم، ئینجا بەو سزایە بمرێ دەربەستی نیم [1] بێجگە لە عارەق خۆر، کە بەڕاستی ئەگەر مرد خوێنەکەی دەدەم، چونکە پێغەمبەر ﷺ سزایەکی دیاری کراوی بۆ دیاری نەکردوە.**

٦٧٧٩- حَدَّثَنَا مَكِّيُّ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الجُعَيْدِ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ خُصَيْفَةَ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كُنَّا نُؤْتَى بِالشَّارِبِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِمْرَةِ أَبِي بَكْرٍ وَصَدْرًا مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ، فَنَقُومُ إِلَيْهِ بِأَيْدِينَا وَنِعَالِنَا وَأَرْدِيَتِنَا حَتَّى كَانَ آخِرُ إِمْرَةِ عُمَرَ، فَجَلَدَ أَرْبَعِينَ، حَتَّى إِذَا عَتَوْا وَفَسَقُوا جَلَدَ ثَمَانِينَ

**.٦٧٧٩-سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: عارەق خۆر دەهێنرا بۆمان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ و فەرمانڕەوایەتی ئەبو بەکر ﷺ و سەرەتای جێنشینی عومەردا ﷺ ، ئینجا ئێمە دەستمان دەکرد بەلێدانی بەدەست و نەعل پۆشاك و پشتەماڵەکانمان، هەتا گەشتە کۆتایی فەرمانڕەوایەتی عومەر ﷺ ، ئەوسا عومەر چل داری لێ دەدا (بەو جۆرە بوو)، هەتا زۆر زیادەڕەویان کرد و سنووریان بەزاند هەشتا داری لێ دەدان.**

---

(١) نابێت بە گرێ لە دڵمدا و تووشی دوو دڵی و گومان نابم.

## ٥- بابُ مَا يُكْرَهُ مِنْ لَعْنِ شَارِبِ الْخَمْرِ، وَإِنَّهُ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنَ الْمِلَّةِ

٦٧٨٠- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي خَالِدُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلاَلٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَنَّ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ اسْمُهُ عَبْدَ اللَّهِ، وَكَانَ يُلَقَّبُ حِمَارًا، وَكَانَ يُضْحِكُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ جَلَدَهُ فِي الشَّرَابِ، فَأُتِيَ بِهِ يَوْمًا فَأَمَرَ بِهِ فَجُلِدَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: اللَّهُمَّ الْعَنْهُ مَا أَكْثَرَ مَا يُؤْتَى بِهِ! فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَلْعَنُوهُ، فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ أَنَّهُ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ».

## ٥- باسی ئەوەی کە ناپەسەندە کەسێک نەفرین لە عارەقخۆر بکات، وە بەدڵنیاییەوە لە ئایینی ئیسلام دەرنەچووە

**٦٧٨٠-زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاوێك هەبوو ناوی عەبدوڵڵا بووە، نازناوی (کەر)ی لێ نرابوو، زۆر جار (بەقسەی خۆش و نوکتە) پێغەمبەری خوای دەهێنایە پێکەنین، پێغەمبەر ﷺ لەسەر عارەق خواردنەوە دارکاری کردبوو، جا ڕۆژی (بەسەرخۆشی) هێنایان و جەڵدی عارەق خۆری لێ درا، پیاوێك لە ناو خەڵکەکەدا وتی: خودایە بەر نەفرینی خۆتی خەیت ئەمە چەند جارە دەیهێنن! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((نەفرینی لێ مەکەن، دەسا بەخوا من ئاگام لێیەتی کە خوا و پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت)).**

٦٧٨١- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ الْهَادِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِسَكْرَانَ، فَأَمَرَ بِضَرْبِهِ، فَمِنَّا مَنْ يَضْرِبُهُ بِيَدِهِ، وَمِنَّا مَنْ يَضْرِبُهُ بِنَعْلِهِ، وَمِنَّا مَنْ يَضْرِبُهُ بِثَوْبِهِ، فَلَمَّا

انْصَرَفَ قَالَ رَجُلٌ: مَالَهُ أَخْزَاهُ اللهُ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "لاَ تَكُونُوا عَوْنَ الشَّيْطَانِ عَلَى أَخِيكُمْ"(١).

**٦٧٨١- ئەبو سەلەمە گێڕایەوە کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێکی سەرخۆش هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی کرد بە لێدانی، جا هەمانبوو بە دەست لێی دەدا، وە هەمانبوو بە نەعل لێی دەدا، وە هەمان بوو بەجل و پۆشاکەکەی لێی دەدا، ئینجا کاتێ لێدانەکەی تەواو بوو گەڕایەوە، کەسێك پێی وت: ئەوە بۆ وا ئەکات خوا ڕیسوای کات، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ((مەبنە یارمەتیدەری شەیتان لە دژی براکەتان)).**

## ٦- بابُ السَّارِقِ حِينَ يَسْرِقُ

**٦٧٨٢-** حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دَاوُدَ، حَدَّثَنَا فُضَيْلُ بْنُ غَزْوَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ"(٢).

## ٦- باسی دز کاتێ دزی دەکات

**٦٧٨٢- ئیبنو عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((زینا کار زینا ناکات و لە کاتی زینا کردنەکەیدا باوەڕدار بێت، دز دزی ناکات و لە کاتی دزی کردنەکەیدا باوەڕداربێت)).**

(١) بڕوانە: ٦٧٧٧.
(٢) بڕوانە: ٦٨٠٩.

## ٧- بَابُ لَعْنِ السَّارِقِ إِذَا لَمْ يُسَمَّ

٦٧٨٣- حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ». قَالَ الأَعْمَشُ: كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّهُ بَيْضُ الْحَدِيدِ، وَالْحَبْلُ كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّهُ مِنْهَا مَا يَسْوَى دَرَاهِمَ[1].

## ٧- باسی (حوكمی) نەفرین كردن لە دز ئەگەر ناو نەهێنرێت

**٦٧٨٣-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((نەفرینی خوا لە دز بێت، كڵاو ئاسنێكی سەر دەدزێ و دەست دەبڕدرێت، گوریسێك دەدزێ و دەستی دەبڕدرێت)).**

**-ئەعمەش دەڵێ: ئەوانە (گێڕەرەوەكان) بەلایانەوە وابوو مەبەست بە: (الْبَيْضَةَ) كڵاوی ئاسنینی سەرە، وە (الْحَبْل)یش بەلایانەوە وابوو لەو گوریسانەیە كە نرخەكەی چەند درهەمێكە.**

## ٨- بَابٌ: الْحُدُودُ كَفَّارَةٌ

٦٧٨٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ الْخَوْلاَنِيِّ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَجْلِسٍ فَقَالَ: «بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا». -وَقَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ كُلَّهَا- "فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ بِهِ، فَهْوَ كَفَّارَتُهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ، وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ"[2].

---

(١) بڕوانە: ٦٧٩٩.

(٢) بڕوانە: ١٨.

## ٨- باسێک: سزای تاوانەکان کەفارەتن بۆ یان

٦٧٨٤- عوبـبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: ئێمە لە کۆڕێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین جا فەرمووی: (پەیمانم پێ بدەن کە هیچ شتێك نەکەن هاوبەشی خودا، وە زینا نەکەن و دزی نەکەن، وە ئەم ئایەتە هەمووی خوێندەوە [1]: جا هەر کەسێکتان پەیمانەکەی بردە سەر ئەوە پاداشتی لای خودایە، هەر کەسیش شتانێکی ئەو (تاوانانە)ی تووش بوو سزا و تۆڵەی لێ سەنرا، ئەوە گوناهەکەی سڕاوەتەوە، هەر کەسیش شتێکی لەوانەی تووش بوو خوا بۆی پۆشی، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت، وە ئەگەر ویستی سزای دەدات.

## ٩- بابٌ: ظَهْرُ الْمُؤْمِنِ حِمًى، إلاَّ فِي حَدٍّ أَوْ حَقٍّ

٦٧٨٥- حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ: عَنْ وَاقِدِ بْنِ مُحَمَّدٍ: سَمِعْتُ أَبِي، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ: «أَلاَ أَيُّ شَهْرٍ تَعْلَمُونَهُ أَعْظَمُ حُرْمَةً؟». قَالُوا أَلاَ شَهْرُنَا هَذَا؟. قَالَ: «أَلاَ أَيُّ بَلَدٍ تَعْلَمُونَهُ أَعْظَمُ حُرْمَةً؟».قَالُوا: أَلاَ بَلَدُنَا هَذَا. قَالَ: «أَلاَ أَيُّ يَوْمٍ تَعْلَمُونَهُ أَعْظَمُ حُرْمَةً؟». قَالُوا: أَلاَ يَوْمُنَا هَذَا. قَالَ: «فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ حَرَّمَ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ، إِلاَّ بِحَقِّهَا، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟». ثَلاَثًا كُلُّ ذَلِكَ يُجِيبُونَهُ: أَلاَ نَعَمْ. قَالَ: «وَيْحَكُمْ
-أَوْ وَيْلَكُمْ- لاَ تَرْجِعُنَّ بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ"[2].

---

(١) ژنانی لەگەڵدا نییە.

(٢) بڕوانە: ١٧٤٢.

## ٩- باسێک: پشتی باوەڕدار پارێزراوە مەگەر سزایەکی شەرعی (پێویست بێ لە سەری) یان مافی (کەسێکی لابێ)

٦٧٨٥-عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا فەرمووی: ((ئایا ئێوە بزانن چ مانگێك گەورەترە و ڕێز و حورمەتی زیاترە؟)) وتیان: ئایا ئەم مانگە نییە ئێستە تێیدان[١]؟ فەرمووی: ((ئایا ئێوە بزانن چ شارێك گەورەترە و ڕێز و حورمەتی زیاترە؟)) وتیان: مەگەر ئەم شارەمان نییە؟ فەرمووی: ((ئایا ئێوە بزانن چ ڕۆژێك گەورەترە و ڕێز و حورمەتی زیاترە؟)) وتیان: ئایا ئەم ڕۆژە نییە ئێستە تێیدان، فەرمووی: ((جا بێگومان خوا ﷻ خوێن و سامان و ناموستانی (لە یەکتری) حەرام کردوە، مەگەر بەهەق و مافی خۆی[٢] - وەك حەرامێتی ئەم ڕۆژەتان و لەم شارەتاندا و لەم مانگەتاندا ئایا ڕام گەیاند؟)) سێ جار ئەم وتەی دووبارەوە کردەوە لە هەموو جارێکدا وەڵامیان دەدایەوە، بە بەڵێ ڕات گەیاند، فەرمووی: ((هاوار بۆ ئێوە-یان فەرمووی تیاچوون بۆ ئێوە -لە پاش من کافر مەبنەوە هەندێکتان بدەن لە گەردنی هەندێکتان)).

## ١٠- بابُ إِقامَةِ الحُدُودِ وَالانْتِقامِ لِحُرُماتِ اللهِ

٦٧٨٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا خُيِّرَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَأْثَمْ، فَإِذَا كَانَ الإِثْمُ كَانَ أَبْعَدَهُمَا مِنْهُ، وَاللَّهِ مَا انْتَقَمَ لِنَفْسِهِ فِي شَيْءٍ يُؤْتَى إِلَيْهِ قَطُّ، حَتَّى تُنْتَهَكَ حُرُمَاتُ اللَّهِ، فَيَنْتَقِمُ لِلَّهِ[٣].

(١) واتە: مانگی (ذي الحجة)
(٢) واتە: لە کاتێکدا دروستە خوێن یان سامانی دەستیان بۆ ببرێت و شەرع ڕێگە بدات مافی خەڵکی بکەوێتە سەر.
(٣) بروانە: ٣٥٦٠.

## ١٠- باسی جێبەجێ كردنی سزا شەرعیەكان (واجبە)، وە تۆڵە سەندن ( لە بەزاندنی) سنورە شەرعیەكان [١]

٦٧٨٦- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر كات لە نێوان دوو شتدا سەرپشك كرابێت، هەمیشە ئاسانەكەیانی هەڵبژاردووە، بەمەرجی تاوان نەبووبێت، خۆ ئەگەر تاوان بووبێت ئەو دوورترین كەس بووە لێیەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ كات لەبەر خۆی تۆڵەی لە كەس نەكردۆتەوە هێنرابێت بۆ خزمەتی، هەتا ڕێز و حورمەتی (ئایینی) خوا شكێنرابێت، ئەوە لەبەر خوا و ڕێزی (ئایینەكەی) تۆڵەی ئەكردەوە.

## ١١- بابُ إِقَامَةِ الحُدُودِ عَلَى الشَّرِيفِ وَالْوَضِيعِ

٦٧٨٧- حَدَّثَنَا أَبُو الوَلِيدِ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أُسَامَةَ كَلَّمَ النَّبِيَّ ﷺ فِي امْرَأَةٍ، فَقَالَ: «إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُقِيمُونَ الحَدَّ عَلَى الْوَضِيعِ، وَيَتْرُكُونَ الشَّرِيفَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ فَاطِمَةُ فَعَلَتْ ذَلِكَ لَقَطَعْتُ يَدَهَا»[٢].

## ١١- جێ بەجێ كردنی سزا شەرعیەكان بەسەر ناودار و پایەدار و لاواز و هەژاردا (پێویستە)

٦٧٨٧- عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە كە ئوسامە ﵁ دەربارەی ئافرەتێك [٣] لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ قسەی كردبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بێگومان (بۆیە) گەلانی پێش ئێوە لە ناوچوون، لە ڕاستیدا ئەوان سزای تاوانیان بەسەر لاواز و

---

(١) بێ ڕێزی بە بەها پیرۆزیەكانی ئایین.
(٢) بڕوانە: ٢٦٤٨.
(٣) ئافرەتێكی مەخزومی كە دزی كردبوو.

هەژاردا جێبەجێ دەكرد، وازیان لە ناودار و پایەدار دەهێنا (و سزایان بەسەریاندا جێ بەجێ نەدەكرد)، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاتیمە [1] ئەو كارە (دزی) بكات، بە دڵنیاییەوە دەستی دەبڕم)).

## ١٢- بابُ كَرَاهِيَةِ الشَّفَاعَةِ فِي الحَدِّ، إِذَا رُفِعَ إِلَى السُّلْطَانِ

٦٧٨٨- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّتْهُمُ الْمَرْأَةُ المَخْزُومِيَّةُ الَّتِي سَرَقَتْ فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟. فَكَلَّمَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: «أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟!». ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا ضَلَّ مَنْ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ الضَّعِيفُ فِيهِمْ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهَا»[2].

## ١٢- باسی تكا كردن لە سزای شەرعی كە برا بۆ لای دەسەڵاتدار ناپەسەندە

٦٧٨٨- عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە دەڵێ: بێگومان قورەیشیەكان حاڵی ئەو ئافرەتە مەحزومییەی كە دزی كردبوو غەمباری كردبوون، بۆیە وتیان[3]: جا كێ قسە بكات لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ وتیان: جا كێ دەوێرێ ئەوە بكات جگە لە ئوسامە زۆر خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە ﷺ؟ ئوسامەش قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ كرد، ئەویش ﷺ فەرمووی: ((ئایا تۆ (ئوسامە) دەربارەی سنوورێك لە سنوورەكانی خوا تكا دەكەیت (جێ بەجێ نەكرێت))؟

---

(١) كچی پێغەمبەر ﷺ.
(٢) بروانە: ٢٦٤٨.
(٣) لە هەندێ گێڕانەوە دەڵێ: (وتی) بە تاك.

پاشان پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە و وتارێکیدا و فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئەوەی گەلانی پێش ئێوەی گومڕا کرد، (هۆکەی ئەوە بوو) ئەگەر ناودار و کەسایەتییەك دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، بەڵام ئەگەر لاواز (و بێ دەسەڵاتێك) دزی بکردایە لە ناویاندا سزایان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات دەستی دەبڕم)).

## ١٣- بابُ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا ﴿٣٨﴾ ﴾ المائدة وَفِي كَمْ يُقْطَعُ؟ وَقَطَعَ عَلِيٌّ مِنَ الكَفِّ، وَقَالَ قَتَادَةُ فِي امْرَأَةٍ سَرَقَتْ فَقُطِعَتْ شِمَالُهَا لَيْسَ إِلاَّ ذَلِكَ

٦٧٨٩- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تُقْطَعُ الْيَدُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا». تَابَعَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ وَابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ وَمَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ[١].

## ١٣- باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز و بڵند: (وە پیاو و ئافرەتی دز دەستیان ببڕن) وە لە دزی چەندێکدا دەست دەبڕدرێت؟ عەلی ﷺ لەپی دەستی بڕیوە[٢]

## قەتادە دەڵێ: دەربارەی ئافرەتێک دزی بکات و دەستی چەپی بڕا[٣] هەر ئەوەیە و تەواو[٤]

٦٧٨٩- عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دەست لە (دزینی) چارەکە دینارێك[١] بۆ سەرەوە دەبڕدرێت)).

---

(١) بڕوانە: ٦٧٩٠، ٦٧٩١.

(٢) واتە: لە مەچەکدا دەستی بڕیوە لەپی لێ کردۆتەوە و بڕیویەتی.

(٣) کە هەڵەیە دەبێ دەستی ڕاستی ببڕدرێت.

(٤) دەستی ڕاستی نابردرێت.

-عەبدوڕەحمانی کوڕی خالید و کوڕی برای زوهری و مەعمەر لە زوهرییەوە گێڕاویانەتەوە و پاڵپشتی گێڕانەوەکەی ئیبراهیمی کوڕی سەعد دەکەن.

٦٧٩٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي أُوَيْسٍ، عَنِ ابْنِ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ وَعَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبُعِ دِينَارٍ"[٢].

**٦٧٩٠- عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری فەرمووی: ((دەستی دز لە (دزینی) چارەکە دینارێکدا دەبڕدرێت))**

٦٧٩١- حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بْنُ مَيْسَرَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ حَدَّثَتْهُ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ حَدَّثَتْهُمْ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "يُقْطَعُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ"[٣].

**٦٧٩١-موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی ئەنصاری وتی: عەمرەی کچی عەبدوڕەحمن بۆی گێڕایەوە وتی: عائیشە ﵂ بۆی گێڕاومنەتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((لە (دزینی) چارەکە دینارێکدا دەست دەبڕدرێت)).**

٦٧٩٢- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّ يَدَ السَّارِقِ لَمْ تُقْطَعْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ إِلاَّ فِي ثَمَنِ مِجَنٍّ: حَجَفَةٍ أَوْ تُرْسٍ. حَدَّثَنَا عُثْمَانُ، حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ مِثْلَهُ[٤].

---

(١) مەبەست لە دینار دیناری ئاڵتونە.

(٢) بڕوانە: ٦٧٨٩.

(٣) بڕوانە: ٦٧٨٩.

(٤) بڕوانە: ٦٧٩٣، ٦٧٩٤.

٦٧٩٢-هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە وتی: عائیشە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە دەستی دز لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبڕدراوە، مەگەر لە (دزینی شتێکدا) نرخی بە ئەندازی قەڵغانێك: لە پێشت دروست کرابێ یان لە تەختە و پێشت دروست کرابێ [1].

(ئیمامی بوخاری دەڵێ): عوسمان بۆی گێڕاینەوە وتی: حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان بۆی گێڕاینەوە وتی: هیشام لە باوکیەوە بۆی گێڕاینەوە و ئەویش لە عائیشەوە ﷺ هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشوو دەگێڕێتەوە.

٦٧٩٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمْ تَكُنْ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي أَدْنَى مِنْ حَجَفَةٍ أَوْ تُرْسٍ، كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا ذُو ثَمَنٍ[2].

-رَوَاهُ وَكِيعٌ وَابْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ مُرْسَلاً

٦٧٩٣-هیشام لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: دەستی دز نەدەبڕدرا لە کەمتر لە (نرخی) قەڵغانێکی پێست یان قەڵغانێکی تەختەی داپۆشراو بە پێست، کە هەر یەکەیان نرخێکی هەبوو.

-وەکیع و ئیبنو ئیدریس ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لە هیشامەوە ئەویش لە باوکیەوە بە مورسەلی[3].

٦٧٩٤- حَدَّثَنِي يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ قَالَ: هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ أَخْبَرَنَا، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: لَمْ تُقْطَعْ يَدُ سَارِقٍ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فِي أَدْنَى مِنْ ثَمَنِ الْمِجَنِّ: تُرْسٍ أَوْ حَجَفَةٍ، وَكَانَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا ذَا ثَمَنٍ[1].

---

(١) لە تەختە دروست کراوە و پێست دراوە بەڕوویدا. زانایان دەڵێن: بەهەردوو شێوەکەی نرخەکەی لە چارەکە دینارێک کەمتر نییە.

(٢) بڕوانە: ٦٧٩٢.

(٣) واتە: عوروە ناوی عائیشەی ﷺ نەهێناوە، وتوویەتی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ.

**٦٧٩٤- عائیشه ﵂ دەڵێ: له سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەستی دز نەدەبڕدرا له کەمتر له نرخی قەڵغانێك: قەڵغانەکه له تەخته و داپۆشراو به پێست بوایه، یان قەڵغانێك له پێست بوایه، وه هەرکام له دوو قەڵغانه نرخیان هەبوو.**

٦٧٩٥- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنْ نَافِعٍ -مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ[٢].

**٦٧٩٥-عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوه که پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دزی بڕیوه له دزینی قەڵغانێکدا که نرخەکەی سێ درهەم بوو.**

٦٧٩٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَطَعَ النَّبِيُّ ﷺ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ[٣].

**٦٧٩٦-ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی (دزی) بڕی له (دزینی) قەڵغانێکدا که نرخەکەی سێ درهەم بوو.**

٦٧٩٧- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، قَالَ حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَطَعَ النَّبِيُّ ﷺ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ[٤].

**٦٧٩٧ -عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی (دزی) بڕی له (دزینی) قەڵغانێکدا که نرخەکەی سێ درهەم بوو.**

---

(١) بڕوانه: ٦٧٩٢.

(٢) بڕوانه: ٦٧٩٦، ٦٧٩٧، ٦٧٩٨.

(٣) بڕوانه: ٦٧٩٥.

(٤) بڕوانه: ٦٧٩٥.

٦٧٩٨- حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ، حَدَّثَنَا أَبُو ضَمْرَةَ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَطَعَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَ سَارِقٍ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلاَثَةُ دَرَاهِمَ. تَابَعَهُ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، وَقَالَ اللَّيْثُ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ: قِيمَتُهُ[1].

**٦٧٩٨- ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی دزی بڕی لە (دزینی) قەڵغانێکدا کە نرخەکەی سێ درهەم بوو.**

**-موحەممەدی کوڕی ئیسحاق پاڵپشتی گێڕانەوەکەی مووسای کوڕی عوقبەی کردوە.**

**-وە لەیس دەڵێ: نافیع بۆی گێڕامەوە وتی: بەهاکەی.**

٦٧٩٩- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: "لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ"[2].

**٦٧٩٩- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خوا نەفرین لە دز دەکات، هێلکەیەك دەدزێ و دەستی دەبڕدرێت، وە گوریسێك دەدزێ دەستی دەبڕدرێت)).**

## ١٤- بابُ تَوْبَةِ السَّارِقِ

٦٨٠٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَطَعَ يَدَ امْرَأَةٍ. قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكَانَتْ تَأْتِي بَعْدَ ذَلِكَ، فَأَرْفَعُ حَاجَتَهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَتَابَتْ وَحَسُنَتْ تَوْبَتُهَا[3].

---

(١) بڕوانە: ٦٧٩٥.

(٢) بڕوانە: ٦٧٨٣.

(٣) بڕوانە: ٢٦٤٨.

## ١٤- باسی تەوبەكردنی دز

**٦٨٠٠-عوروە لە عائیشەوە ﵂ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەستی ئافرەتێكی (دزی) بڕی، ئینجا پاش ئەو دەهات بۆلام و منیش پێویستی ئەوم دەگەیاند بە پێغەمبەر ﷺ، جا ئەو ئافرەتە تەوبەی كرد و بە چاكی تەوبەی كرد و پەشیمان بوویەوە.**

٦٨٠١- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الْجُعْفِيُّ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِدْرِيسَ، عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ قَالَ بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ، فَقَالَ: «أُبَايِعُكُمْ عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَأُخِذَ بِهِ فِي الدُّنْيَا فَهْوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَطَهُورٌ، وَمَنْ سَتَرَهُ اللَّهُ فَذَلِكَ إِلَى اللَّهِ: إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: إِذَا تَابَ السَّارِقُ بَعْدَ مَا قُطِعَ يَدُهُ، قُبِلَتْ شَهَادَتُهُ، وَكُلُّ مَحْدُودٍ كَذَلِكَ إِذَا تَابَ قُبِلَتْ شَهَادَتُهُ[1].

**٦٨٠١- عوبادەی كوڕی صامیت ﵁ دەڵێ: لە گەڵ كۆمەڵێكدا پەیمانمدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا فەرمووی: (پەیمانتان لێ وەردەگرم لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نەكەن بەهاوبەشی خودا و دزی نەكەن و منداڵەكانتان نەكوژن و هیچ جۆرە بوهتانێك هەڵنەبەستن لە نێوان دەست و پێیەكانتاندا، وە بێفەرمانیم نەكەن لە هیچ كارێكی چاكەدا، جا هەر كەسێكتان پەیمانەكەی بردە سەر، ئەوە پاداشتی لای خودایە، هەر كەسیش پێچەوانەی شتانێكی ئەو (پەیمانە)ی كرد و سزا و تۆڵەی لێ سەنرا لە دونیادا، ئەوە كەفارەت و**

(١) بروانە: ١٨.

پاكبوونەوەیە لە گوناهەكەی، هەر كەسیش خوا بۆی پۆشی ئەوە هەواڵەی لای خوا دەكرێ، ئەگەر ویستی سزای دەدات، وە ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت )).
ئەبو عەبدوڵڵا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: ئەگەر دز پاش ئەوەی دەستی بڕا تەوبەی كرد، شایەتی دانی وەردەگیرێ، وە هەموو سزا دراوێكیش هەر وایە ئەگەر تەوبەی كرد شایەتی دانی وەردەگیرێ.

## ١٥- بابُ الْمُحَارِبِينَ مِنْ أَهْلِ الْكُفْرِ وَالرِّدَّةِ

**وقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى** ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴿٣٣﴾ ﴾ المائدة.

٦٨٠٢- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو قِلاَبَةَ الْجَرْمِيُّ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ نَفَرٌ مِنْ عُكْلٍ، فَأَسْلَمُوا فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَأْتُوا إِبِلَ الصَّدَقَةِ فَيَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَفَعَلُوا فَصَحُّوا، فَارْتَدُّوا وَقَتَلُوا رُعَاتَهَا وَاسْتَاقُوا، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ، ثُمَّ لَمْ يَحْسِمْهُمْ حَتَّى مَاتُوا[١].

## ١٥- باسی ئەوانەی جەنگ و دوژمنایەتی دەكەن[٢] لە بێ باوەڕان و پاشگەز بووان، وە باسی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرو بڵند: (بەڕاستی تۆڵەی ئەوانە

(١) بڕوانە: ٢٣٣.
(٢) دوژمنایەتی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ مسوڵمانان و ئاینی ئیسلامدا دەكەن.

## كە جەنگ و دوژمنایەتی ئەكەن لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەكەیدا، وە هەوڵ ئەدەن لە زەویدا خراپە بڵاو بكەنەوە، (ئەوە تۆڵەیان) ئەوەیە بكوژرێن یان هەڵبواسرێن بە دارا یان دەست و قاچیان ببڕدرێت بە پێچەوانەوە (ڕاست و چەپ)، یان دوور بخرێنەوە لەوڵات)

٦٨٠٢- ئەنەس ﷺ دەڵێ: چەند كەسێك لە هۆزی عوكل هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمان بوون خواردن و ئاو و هەوای مەدینەیان پێنەكەوت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێكردن (بڕۆنە دەرەوەی مەدینە) بۆ ناو وشترەكانی زەكات، وە لە میز و شیریان بخۆنەوە، ئەوانیش وایان كرد و چاك بوونەوە، ئینجا پاشگەزبوونەوە و شوانەكانیان كوشت وشترەكانیان دایەبەر، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ چەند چەكدارێكی نارد بەشوێنیاندا و هێنرانەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەست و قاچیانی بڕی و بە بزماری سورۆكراو چاویانی ڕشت (یان چاوی هەڵكۆڵین)، وە پاشان داغی نەكردن (خوێنیان بوەستێتەوە) هەتا هەموویان مردن.

## ١٦- بابٌ: لَمْ يَحْسِمِ النَّبِيُّ ﷺ الْمُحَارِبِينَ مِنْ أَهْلِ الرِّدَّةِ حَتَّى هَلَكُوا

٦٨٠٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّلْتِ أَبُو يَعْلَى، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، حَدَّثَنِي الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَطَعَ الْعُرَنِيِّينَ وَلَمْ يَحْسِمْهُمْ حَتَّى مَاتُوا[١].

## ١٦- باسێك: پێغەمبەر ﷺ ئەو كەسە (دەست و قاچە بڕاو)انەی جەنگ و دوژمنایەتی كەربوون لە پاشگەزبووان، داخی نەكردن هەتا ( (بەخوێن لەبەر ڕۆشتن) مردن

(١) بڕوانە: ٢٣٣.

**٦٨٠٣-ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە کە (بەفەرمانی) پێغەمبەر ﷺ (دەست و قاچی) عورەنییەکانیان بڕی، (شوێنی بڕاوەکانی) داخ نەکردن هەتا مردن))[١].**

## ١٧- بابٌ:لَمْ يُسْقَ المُرْتَدُّونَ المُحَارِبُونَ حَتَّى مَاتُوا

٦٨٠٤- حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ وُهَيْبٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ رَهْطٌ مِنْ عُكْلٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ كَانُوا فِي الصُّفَّةِ، فَاجْتَوَوُا المَدِينَةَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَبْغِنَا رِسْلاً. فَقَالَ: «مَا أَجِدُ لَكُمْ إِلاَّ أَنْ تَلْحَقُوا بِإِبِلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ». فَأَتَوْهَا فَشَرِبُوا مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا حَتَّى صَحُّوا وَسَمِنُوا، وَقَتَلُوا الرَّاعِيَ وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ الصَّرِيخُ، فَبَعَثَ الطَّلَبَ فِي آثَارِهِمْ، فَمَا تَرَجَّلَ النَّهَارُ حَتَّى أُتِيَ بِهِمْ، فَأَمَرَ بِمَسَامِيرَ فَأُحْمِيَتْ فَكَحَلَهُمْ وَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَمَا حَسَمَهُمْ، ثُمَّ أُلْقُوا فِي الْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ، فَمَا سُقُوا حَتَّى مَاتُوا. قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: سَرَقُوا وَقَتَلُوا وَحَارَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ[٢].

## ١٧- باسێک: ئاوی خواردنەوەی بە پاشگەزبووانی جەنگ و دوژمانایەتی کەر (لە دژی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ)، نەدا هەتا مردن

**٦٨٠٤- ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ کۆمەڵێ کەس لە هۆزی عوکل هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوان لە صوفەدا دەمانەوە، ئینجا خواردن و ئاو هەوای مەدینەیان پێنەکەوت، بۆیە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا شیرمان بۆ پەیدا بکە (بیخۆینەوە)، فەرمووی: ((دەستم ناکەوێ بۆتان مەگەر بگەن بەو وشترانەی پێغەمبەری خوا ﷺ[٣])) ئەوانیش ڕۆشتن بۆ لای وشترەکان و لە میز**

---

(١) ئەوە تۆڵەی شوانەکەبوو کە ئەو عورەنیانە دەست و قاچیان بڕیبوو چاویشیان دەرهێنابوو بەزیندووی.

(٢) بڕوانە: ٢٣٣.

(٣) کە هی زەکاتن.

و شیرەکانیان خواردەوە تاچاکبوونەوە و قەڵەو بوون، وە شوانەکەیان کوشت و وشترەکانیشیان دایەبەر، ئەنجا کەسێ هانای بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، پێغەمبەریش ﷺ خەڵکی نارد بەشوێنیاندا خۆر زۆر بەرز نەبۆوە (گرتنیان) هێنران، ئەنجا فەرمانی کرد چەند بزمارێك سوورکرانەوە چاویان پێ هەڵکۆڵین و دەست و قاچیان بڕین، وە داغی نەکردن (تاخوێنیان بوەستێتەوە)، پاشان لەبەر دەلانە ڕەشەکەدا فڕێ دران، داوای ئاویان دەکرد و پێیان نەدەدرا هەتا مردن.
ئەبو قیلابە دەڵێ: دزیان کرد و خەڵکیان کوشت و جەنگ و دوژمنایەتیان لە بەرامبەر خوا و پێغەمبەرکەی کرد.

## ١٨- بابُ سَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ أَعْيُنَ الْمُحَارِبِينَ

٦٨٠٥- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ رَهْطًا مِنْ عُكْلٍ -أَوْ قَالَ: عُرَيْنَةَ. وَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ: مِنْ عُكْلٍ- قَدِمُوا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ بِلِقَاحٍ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَخْرُجُوا فَيَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَشَرِبُوا حَتَّى إِذَا بَرِئُوا قَتَلُوا الرَّاعِيَ وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ غُدْوَةً، فَبَعَثَ الطَّلَبَ فِي إِثْرِهِمْ، فَمَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ حَتَّى جِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ بِهِمْ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ، فَأُلْقُوا بِالْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ فَلاَ يُسْقَوْنَ. قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: هَؤُلاَءِ قَوْمٌ سَرَقُوا، وَقَتَلُوا، وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَحَارَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ[1].

## ١٨- باسی پێغەمبەر ﷺ بە بزماری سورۆکراو چاوی موحاریبینی[2] دەرهێنا

٦٨٠٥- ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: چەند کەسێك لە هۆزی عوکل - یان وتی: عورەینە ئەوەی من بزانم وتی: لە عوکل- هاتن بۆمەدینە (و مسوڵمان بوون)، ئینجا

(١) بروانە: ٢٣٣.

(٢) موحاریبین: ئەو کەسانەن جەنگ و دژایەتی دەکەن لە دژی خوا و پێغەمبەر ﷺ لە بن باوەڕ و پاشگەزبووان.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد چەند وشترێکی (زەکات ببەنە دەرەوەی مەدینە) بۆیان، فەرمانیشی کرد بەوان کە بڕۆنە دەرەوە لە مەدینە و لە میز و شیریان بخۆنەوە، ئەوانیش شیر و میزیانیان خواردەوە هەتا چاك بوونەوە، شوانەکەیان کوشت وشترەکانیان دایەبەر، ئەنجا لە سەرەتای ڕۆژەوە هەواڵەکە گەشتە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش چەند چەکدارێکی نارد بە شوێنیاندا، ئینجا خۆر بەرزنەبوویەوە هێنرانەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد دەست و قاچیان بڕین و بە بزماری سورۆکراو چاویان ڕشتن (یان چاویان هەڵکۆڵین)، وە تورِ درانە[1] بەردەڵانە ڕەشەکەوە، داوای ئاویان دەکرد پێیان نەدەدرا. ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەوانە کەسانێك بوون دزیان کرد و خەڵکیان کوشت و پاشگەزبوونەوە دوای باوەڕهێنانیان، دژی خوا و پێغەمبەرەکەی وەستان و جەنگیان کرد.

## ١٩- بابُ فَضْلِ مَنْ تَرَكَ الْفَوَاحِشَ

٦٨٠٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلاَمٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ خُبَيْبِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: إِمَامٌ عَادِلٌ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ فِي خَلاَءٍ فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسْجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ إِلَى نَفْسِهَا قَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ. وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا صَنَعَتْ يَمِينُهُ"[2].

---

(١) توڕیان دان: فڕێیان دان.

(٢) بڕوانە: ٦٦٠.

# ١٩- باسی فەزڵی ئەو کەسەی واز لە گوناهە زۆر ناشرینەکان (زینا) دێنێت

**٦٨٠٦-ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((حەوت جۆر کەس خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دەیان خاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نییە جگە لەسێبەری ئەو (کە ئەمانەن): پێشەوایەکی دادگەر،گەنج و لاوێك لە ناو بەندایەتی خوادا گەورە بووبێت، وە پیاوێك بە تەنها بیر و یادی خوا بکات و چاوەکانی فرمێسکیان پیا بێتە خوارەوە، وە پیاوێك دڵی پەیوەستی مزگەوت بێت، دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێ، وە پیاوێك ئافرەتێکی بەدەسەڵات و جوان داوای داوێن پیسی بکات لەگەڵیدا، پیاوەکەش بڵێ: بێگومان من لەخوا دەترسم، وە پیاوێك ماڵێ ببەخشێ و بیشارێتەوە هەتا لای چەپی نەزانێ لای ڕاستی چی بەخشیوە)).**

٦٨٠٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ. وَحَدَّثَنِي خَلِيفَةُ، حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ تَوَكَّلَ لِي مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ وَمَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، تَوَكَّلْتُ لَهُ بِالْجَنَّةِ»[١].

**٦٨٠٧-سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێ زامنی ئەوی لە نێوان هەردوو ڕانی دایە (داوێنی[٢]) و زامنی ئەوی لە نێوان هەردوو شەویلکەی دایە بۆم بکات، منیش زامنی بەهەشتی بۆ دەکەم)).**

---

(١) بڕوانە: ٦٤٧٤.

(٢) دەقی فەرموودەکە دەفەرمووێ: زامنی ئەوەی لە نێوان دوو شەویلکەی و زامنی ئەوەی لە نێوان هەردوو ڕانی دایە بیکات. کەمەبەست بە هەردووکیان زمان و داوێنە.

## ٢٠- بابُ إِثْمِ الزُّنَاةِ

وقَوْلُ اللَّهِ ﷻ: ﴿ وَلَا يَزْنُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الفرقان. ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الإسراء

٦٨٠٨ - أَخْبَرَنَا دَاوُدُ بْنُ شَبِيبٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، أَخْبَرَنَا أَنَسٌ قَالَ: لأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثًا لاَ يُحَدِّثُكُمُوهُ أَحَدٌ بَعْدِي، سَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: "لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ -وَإِمَّا قَالَ: مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ- أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ، وَيَظْهَرَ الجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا، وَيَقِلَّ الرِّجَالُ، وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِلْخَمْسِينَ امْرَأَةً القَيِّمُ الوَاحِدُ"[1].

## ٢٠- باسی تاوانی زینا کاران

**وە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ: (وە زینا و داوێن پیسی ناکەن) (وە نزیکی زینا مەکەونەوە، بەڕاستی ئەوە کردەوەیەکی زۆر ناشرین و ڕێگەیەکی پیس و خراپە).**

**٦٨٠٨- ئەنەس ﷺ دەڵێ: فەرموودەیەکتان بۆ دەگێڕمەوە کەس دوای من بۆتان ناگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ((قیامەت هەڵناسێت - یان فەرمووی: لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی ئەوەیە- کە: عیلم و زانیاری بەرز دەکرێتەوە هەڵدەگیرێت، نەزانی و بێ ئاگایی لە ئایین بڵاو دەبێتەوە، عارەق دەخورێتەوە، داوێن پیسی و زینا ئاشکرا دەبێ و پیاوان کەم دەبنەوە (بەهۆی ئاشووب و شەڕ و شۆڕەوە) ئافرەتان زۆر دەبن، هەتا وای لێدێ کە پەنجا ئافرەت یەك سەرپەرشتیاری پیاویان دەبێ!)).**

(١) بڕوانە: ٨٠.

٦٨٠٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ يُوسُفَ، أَخْبَرَنَا الْفُضَيْلُ بْنُ غَزْوَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لاَ يَزْنِي الْعَبْدُ حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَقْتُلُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ». قَالَ عِكْرِمَةُ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: كَيْفَ يُنْزَعُ الإِيمَانُ مِنْهُ؟ قَالَ هَكَذَا -وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ ثُمَّ أَخْرَجَهَا- فَإِنْ تَابَ عَادَ إِلَيْهِ هَكَذَا وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ[1].

**٦٨٠٩- ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((داوێن پیس داوێن پیسی ناكات لە كاتی داوێن پیسییەكەیدا باوەڕدار بێت، وە (دز) دزی ناكات و لە كاتی دزی كردنەكەیدا باوەڕدار بێت، وە (عارەق خۆر) عارەق ناخواتەوە و لە كاتی عارەق خواردنەوەكەیدا باوەڕدار بێت، وە كەسێك ناكوژێت لەو كاتەدا باوەڕدار بێت)).**

**عیكریمە وتی: بەئیبنو عەبباسم ﷺ وت: چۆن باوەڕی لێ دەردەهێنرێت؟ وتی: ئاوەها- پەنجەكانی كرد بەناویەكتردا پاشان دەری هێنا (لە یەكتری) - جا ئەگەر پەشیمان بوویەوە ئاوەها دەگێڕێتەوە بۆی، وە پەنجەكانی كردەوە بەناو یەكتردا.**

٦٨١٠- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَالتَّوْبَةُ مَعْرُوضَةٌ بَعْدُ»[2].

**٦٨١٠- ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((داوێن پیس داوێن پیسی ناكات لە كاتی داوێن پیسییەكەیدا باوەڕدار بێت، وە (دز) دزی**

---

(١) بڕوانە: ٦٧٨٢.

(٢) بڕوانە: ٢٤٧٥.

ناکات و لە کاتی دزی کردنەکەیدا باوەڕدار بێت، وە (عارەق خۆر) عارەق ناخواتەوە و لە کاتی عارەق خواردنەوەکەیدا باوەڕدار بێت، پاشان (دەرگای) پەشیمان بوونەوە کراوەیە)).

٦٨١١- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْصُورٌ وَسُلَيْمَانُ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهْوَ خَلَقَكَ». قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مِنْ أَجْلِ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ». قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: "أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ"[1].

قَالَ يَحْيَى: وَحَدَّثَنَا سُفْيَانُ، حَدَّثَنِي وَاصِلٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مِثْلَهُ، قَالَ عَمْرٌو: فَذَكَرْتُهُ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَكَانَ حَدَّثَنَا عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ الأَعْمَشِ وَمَنْصُورٍ وَوَاصِلٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، قَالَ: دَعْهُ دَعْهُ.

**٦٨١١- عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ وتم: ئەی پیغەمبەری خوا کام تاوانە گەورەیە؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە هاوشێوە بۆ خوا دانێیت لە کاتێکدا ئەو (خوا) تۆی دروست کردوە))، وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە منداڵەکەت بکوژی لە ترسی ئەوەی لەگەڵتدا نان بخوات))، وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەر و حەلاڵی دراوسێکەتدا)).**

**(ئیمامی بوخاری دەڵێ:) یەحیا وتی: سوفیان بۆی گێڕاینەوە وتی: واصیل بۆی گێڕامەوە لە ئەبی وائیلەوە لە عەبدوڵلاوە ﷺ دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشووی گێڕایەوە.**

**عەمر دەڵێ: ئەو فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆعەبدوڕەحمان لە کاتێکدا عەبدوڕەحمان خۆی بۆی گێڕاینەوە لە سوفیانەوە ئەویش لە ئەعمەش و**

(١) بڕوانە: ٤٤٧٧.

مەنصوور و واصیلەوە لە ئەبی وائیلەوە لە ئەبی مەیسەرەوە، (عەبدوڕەحمان) وتی: ئەو (ڕشتەیە) واز لێ بێنە، ئەو (ڕشتەیە) واز لێ بێنە.

## ٢١- بابُ رَجْمِ الْمُحْصَنِ[١]

وَقَالَ الْحَسَنُ: مَنْ زَنَى بِأُخْتِهِ حَدُّهُ حَدُّ الزَّانِي.

٦٨١٢- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ قَالَ: سَمِعْتُ الشَّعْبِيَّ يُحَدِّثُ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ حِينَ رَجَمَ الْمَرْأَةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَقَالَ: قَدْ رَجَمْتُهَا بِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

## ٢١- باسی بەرد باران كردنی پیاو و ژنی (زیناكار)

**-حەسەن دەڵێ: پیاوێ زینا بكات لەگەڵ خوشكی خۆیدا سزاكەی سزای زیناكارە.٦٨١٢-سوهەیل دەڵێ: لە شەعبیم بیست كە لە عەلییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە لە ڕۆژی هەینیدا ژنێكی بەردباران كرد و وتی: بێگومان بە گوێرەی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرد بارانم كرد.**

٦٨١٣- حَدَّثَنِي إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى: هَلْ رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: قَبْلَ سُورَةِ النُّورِ أَمْ بَعْدُ؟ قَالَ: لاَ أَدْرِي[٢].

**٦٨١٣-شەیبانی دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی ئەوفا كرد ﷺ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ كەسی بەرد باران كرد؟ وتی: بەڵێ، وتم: پێش سوڕەتی نوور یان پاشی؟ وتی نازانم.**

---

(١) المُحْصَن: پیاوێک ژنی هێنابێ و لەگەڵی جووت بووبێ، هەروەها ژنێک شووی کردبێ وسەرجێی لەگەڵا کرابێ.

(٢) بروانە: ٦٨٤٠.

٦٨١٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُقَاتِلٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَحَدَّثَهُ أَنَّهُ قَدْ زَنَى، فَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُجِمَ، وَكَانَ قَدْ أُحْصِنَ[1].

**٦٨١٤-جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم[2] هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، عەرزی کرد کە ئەو زینای کردوە، ئینجا چوار جار شایەتی لەسەر خۆیدا (کە زینای کردوە)، ئەوسا پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد بە بەردباران کردنی و بەردباران کرا، ئەو پێشتر ژنی هێنابوو.**

## ٢٢- بَابٌ: لاَ يُرْجَمُ المَجْنُونُ وَالمَجْنُونَةُ

وَقَالَ عَلِيٌّ لِعُمَرَ ﷺ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْقَلَمَ يُرْفَعَ عَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يُدْرِكَ، وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ.

٦٨١٥- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهْوَ فِي الْمَسْجِدِ فَنَادَاهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي زَنَيْتُ. فَأَعْرَضَ عَنْهُ، حَتَّى رَدَّدَ عَلَيْهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ، دَعَاهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَبِكَ جُنُونٌ؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «فَهَلْ أَحْصَنْتَ؟». قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ»[3].

---

(١) بروانە: ٥٢٧٠.

(٢) کە ناوی ماعیزی کوڕی مالیکی ئەسلەمی بوو.

(٣) بروانە: ٥٢٧١.

## ٢٢- باسێک: پیاو و ئافرەتی شێت بەردباران ناکرێن (ئەگەر زینایان کرد)

-عەلی بە عومەری وت ﷺ: ئایا نەتزانیوە قەڵەم لەسەر شێت هەڵگیراوە هەتا چاك دەبێتەوە، وە لەسەر منداڵ هەتا باڵغ دەبێت، وە لەسەر خەوتوو هەتا خەبەری دەبێتەوە.

٦٨١٥-ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا بوو پیاوێك هاتە خزمەتی و بانگی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من زینام کردوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرچەرخان هەتا چوار جار ڕەدی کردەوە، جا کە چوار جار شایەتیدا لەسەر خۆی پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد و فەرمووی: ((تۆ شێتیت؟)) وتی:نەخێر، فەرمووی: ((ئایا ژنت هێناوە؟ )) وتی: بەڵێ، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بیبەن بەرد بارانی بکەن)).

٦٨١٦ - قَالَ ابْنُ شِهَابٍ، فَأَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: فَكُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُ، فَرَجَمْنَاهُ بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ هَرَبَ، فَأَدْرَكْنَاهُ بِالْحَرَّةِ فَرَجَمْنَاهُ[1].

٦٨١٦- ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەو کەسەی لە جابیری کوڕی عەبدوڵلای ﷺ بیستووە بۆی گێڕامەوە وتی: (جابیر) دەڵێ: من لەو کەسانە بووم کە بەرد بارانی کرد، جا لە نوێژگە بەرد بارانمان کرد، ئینجا کاتێ بەردەکانی بەرکەوت (و ئازاریدا) ڕایکرد، (شوێنی کەوتین) لە بەردەڵانە ڕەشەکە (ی مەدینە) گرتمانەوە و بەردبارانمان کرد (تا مرد).

(١) بڕوانە: ٥٢٧٠.

## ٢٣- بابٌ: لِلْعَاهِرِ الحَجَرُ

٦٨١٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتِ: اخْتَصَمَ سَعْدٌ وَابْنُ زَمْعَةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ ابْنَ زَمْعَةَ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ[١]، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ». زَادَ لَنَا قُتَيْبَةُ، عَنِ اللَّيْثِ: «وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ»[٢].

## ٢٣- باسێک: زیناكاریش بێبەشی بۆ هەیە

**٦٨١٧- عائیشە ﵂ دەڵێ: سەعد و ئیبنو زەمعە بوویە مشت و مڕیان، ئینجا پێغەمبەریش فەرمووی: ((عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە ئەم (منداڵ)ـە هی تۆیە، منداڵ بۆ ئەو كەسەیە كە لە ماڵ و جێگەی ئەودا بێت، وە سەودە تۆش خۆتی پیشان مەدە و بانەتبینێ)).**

**قوتەیبە لە لەیسەوە ئەمەی لە فەرموودەكە زیاد كردوە: ((زیناكاریش بێ بەشی بۆ هەیە)).**

٦٨١٨- حَدَّثَنَا آدَمُ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ»[٣].

**٦٨١٨-ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((منداڵ بۆ خاوەنی ژنەكەیە، زیناكاریش بێ بەشی بۆ هەیە)).**

## ٢٤- بابُ الرَّجْمِ فِي البَلَاطِ

٦٨١٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ مَخْلَدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ، حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَهُودِيٍّ وَيَهُودِيَّةٍ قَدْ أَحْدَثَا جَمِيعًا، فَقَالَ لَهُمْ:

(١) واتە: منداڵ بۆ خاوەنی ژنەكەیە كە دەبێتە دایكی منداڵە و ژنی كابرا، لە زمانی عەرەبیدا بە ژن و هاوسەر دەوترێت: (الفراش).

(٢) بڕوانە: ٢٠٥٣.

(٣) بڕوانە: ٦٧٥٠.

«مَا تَجِدُونَ فِي كِتَابِكُمْ؟». قَالُوا: إِنَّ أَحْبَارَنَا أَحْدَثُوا تَحْمِيمَ الْوَجْهِ وَالتَّجْبِيَةَ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: ادْعُهُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ بِالتَّوْرَاةِ. فَأُتِيَ بِهَا فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، وَجَعَلَ يَقْرَأُ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا، فَقَالَ لَهُ ابْنُ سَلَامٍ: ارْفَعْ يَدَكَ. فَإِذَا آيَةُ الرَّجْمِ، تَحْتَ يَدِهِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُجِمَا. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَرُجِمَا عِنْدَ الْبَلَاطِ، فَرَأَيْتُ الْيَهُودِيَّ أَجْنَأَ عَلَيْهَا[1].

## ٢٤- باسی بەردباران كردنی (زیناكار) لە بەردەڕێكراوەكە (ی بەردەمی مزگەوتدا)

**٦٨١٩-عەبدوڵڵای كوڕی دینار گێڕایەوە كە ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پیاو و ژنێكی جوولەكە هێنران بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، كە بێگومان زینایان لەگەڵ یەك كردبوو، پێغەمبەریش فەرمووی پێیان: ((لە كتێبەكەتاندا (تەورات) چیتان هەیە (بۆیان)؟)) وتیان: بێگومان زاناكانمان دەمو و چا و بەخەڵوز ڕەشكردن و سواری كەر كردنیان بە پێچەوانەوە [2] داهێناوە (بۆیان)، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بانگیان بكە با تەوراتەكە بێنن، ئینجا تەوراتەكەیان هێنا و كەسێكیان دەستی خستە سەر ئایەتی ڕەجمەكە و دەستی كرد بەخوێندنەوەی پێش و پاشی، عەبدوڵڵای كوڕی سەلامیش وتی: دەستی بەرزكەرەوە (دەستی بەرزكردەوە)، جادەبینن ئایەتی ڕەجمەكە لە ژێر دەستی دایە، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەركرد بۆ هەردووكیان و بەردباران كران.**

**ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: هەردووكیان لای بەردرێژەكە (ی نێوان بازاڕ و مزگەوت) بەردباران كران، وە بینیم پیاوە جووەكە خۆی دابوو بەسەریدا (لە بەردەكان دەیپاراست).**

---

(١) بڕوانە: ١٣٢٩.

(٢) واتە: ڕووی لە دواوە بێت و پشتی ڕوو لە پێشەوە بێت.

## ٢٥- بابُ الرَّجْمِ بِالْمُصَلَّى

٦٨٢٠- حَدَّثَنِي مَحْمُودٌ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ جَاءَ النَّبِيَّ ﷺ فَاعْتَرَفَ بِالزِّنَا، فَأَعْرَضَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَبِكَ جُنُونٌ؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «آحْصَنْتَ؟». قَالَ: نَعَمْ. فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الحِجَارَةُ فَرَّ، فَأُدْرِكَ فَرُجِمَ حَتَّى مَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ خَيْرًا وَصَلَّى عَلَيْهِ. لَمْ يَقُلْ يُونُسُ وَابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: فَصَلَّى عَلَيْهِ[1].

## ٢٥- باسی بەردباران كردن لە نوێژگە [2]

**٦٨٢٠- ئەبی سەلەمە لە جابیرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كەپیاوێك لە هۆزی ئەسلەم هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و دانی نا بە زیناكردنی خۆیدا، بەڵام پێغەمبەر ڕووی لێ وەرچەرخان هەتا چوار جار شایەتیدا لەسەر خۆی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێی: ((تۆ شێتیت؟)) وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ئایا ژنت هێناوە؟)) وتی: بەڵێ، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بۆ دا و لە نوێژگە بەردباران كرا. ئینجا كاتێ بەردەكانی بەركەوت (و ئازاریدا) ڕایكرد، ئینجا گەشتن پێی و بەردباران كرا هەتا مرد.**

**ئینجا پێغەمبەر ﷺ وتەیەكی باشی فەرموو (لە بارەیەوە) نوێژیشی لەسەر كرد.**

**-یونس و ئیبنو جورەیج لە زوهریەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە ئەم بڕگەی: (نوێژیشی لە سەر كرد) نەهێناوە لە گێڕانەوەكەیدا.**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٧٠.

(٢) (مُصلی) نوێژگە: ئەو جێگایە بوو لە جەژنەكاندا پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی تیا دەكرد، وە نوێژی لەسەر مردووان دەكرد كە لە لای بەقیعەوە بوو.

## ٢٦- بابُ مَنْ أَصَابَ ذَنْبًا دُونَ الحَدِّ فَأَخْبَرَ الإِمَامَ فَلاَ عُقُوبَةَ عَلَيْهِ بَعْدَ التَّوْبَةِ إِذَا جَاءَ مُسْتَفْتِيًا

قَالَ عَطَاءٌ: لَمْ يُعَاقِبْهُ النَّبِيُّ ﷺ. وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: وَلَمْ يُعَاقِبِ الَّذِي جَامَعَ فِي رَمَضَانَ، وَلَمْ يُعَاقِبْ عُمَرُ صَاحِبَ الظَّبْيِ، وَفِيهِ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٦٨٢١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَجُلاً وَقَعَ بِامْرَأَتِهِ فِي رَمَضَانَ، فَاسْتَفْتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: «هَلْ تَسْتَطِيعُ صِيَامَ شَهْرَيْنِ؟». قَالَ: لاَ. قَالَ: "فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا"[١].

## ٢٦- باسی ئەگەر کەسێک تاوانێکی توش بوبێت کەمتر لەوەی سزای شەرعی بدرێت ئەو تاوانەی بە ئیمامی مسوڵمانان ڕاگەیاندبێت، ئەوە پاش تەوبەکردن سزای لەسەر نیە ئەگەر وەک پرسیار کردن هاتبێت (بۆلای ئیمام موسڵمانان)

-عەتا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سزای نەدا[٢].

-ئیبنو جورەیج دەڵێ پێغەمبەر ﷺ سزای ئەو کەسەی نەدا کە لە ڕۆژی ڕەمەزاندا سەرجێی لەگەڵ خێزانیدا کردبوو.

-وە عومەر ﷺ ئەو پیاوەی (لە ئیحرام دابوو ڕاوی) ئاسکێکی کردبوو سزای نەدا[٣].

---

(١) بروانە: ١٩٣٦.

(٢) هەتا نوێژی کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پاشان فەرمووی پێی کە نوێژەکەی بوەتە کەفارەتی گوناهەکەی.

(٣) بەڵکو داوای لێ کرد فیدیە بدات.

**-وە دەربارەی ئەم باسە فەرموودەیەك هاتووە ئەبی عوسمان لە ئیبنو مەسعوودەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە[1].**

**٦٨٢١-ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە ڕەمەزاندا لەگەڵ خێزانیدا سەرجێی کردبوو، جا پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ((کۆیلەیەکت هەیە؟)) وتی نەخێر، فەرمووی: ((دەتوانی دوو مانگ بەڕۆژوو بیت؟)) وتی نەخێر، فەرمووی: ((دەی خۆراکی شەست هەژار بدە)).**

٦٨٢٢ - وَقَالَ اللَّيْثُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جَعْفَرِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ: أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ قَالَ: احْتَرَقْتُ. قَالَ: «مِمَّ ذَاكَ؟». قَالَ: وَقَعْتُ بِامْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ لَهُ: «تَصَدَّقْ». قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ. فَجَلَسَ وَأَتَاهُ إِنْسَانٌ يَسُوقُ حِمَارًا وَمَعَهُ طَعَامٌ -قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: مَا أَدْرِي مَا هُوَ- إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «أَيْنَ الْمُحْتَرِقُ؟». فَقَالَ: هَا أَنَا ذَا. قَالَ: «خُذْ هَذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ». قَالَ: عَلَى أَحْوَجَ مِنِّي؟ مَا لأَهْلِي طَعَامٌ قَالَ: «فَكُلُوهُ»[2]. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: الحَدِيثُ الأَوَّلُ أَبْيَنُ، قَوْلُهُ: «أَطْعِمْ أَهْلَكَ».

**٦٨٢٢- عائیشە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا وتی: سووتاوم[3]، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((بۆچی هۆی چییە؟)) وتی: لە ڕەمەزانداسەرجێیم لەگەڵ خێزانمدا کردوە، فەرموی پێی: ((ماڵ ببەخشە)) [4] وتی: هیچم نییە، ئینجا پیاوەکە دانیشت پیاوێك گوێدرێژێکی لێ دەخوڕی، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ خۆراکی پێ بوو- عەبدوڕەحمان دەڵێ: نازانم**

(١) کە ئیمامی بوخاری بە ژمارە (٥٢٦) هێناویەتی لە صەحیحەکەیدا.

(٢) بڕوانە: ١٩٣٥.

(٣) چونکە بڕوا وابووە تاوانێکی کردوە بەهۆیەوە بە ئاگری دۆزەخ دەسوتێت.

(٤) مەبەستی خۆراک دانە بە شەست هەژار.

خۆراكەكە چی بوو- بۆ پێغەمبەری ﷺ هێنابوو جا فەرمووی: ((كوا سووتاوەكە؟)) وتی: ئائەمەتام، فەرمووی: ((ئەمە خۆراكە بگرە و بیكە بەخێر))، وتی: بیدەم بەلەخۆم هەژارتر؟ خێزانەكەم خۆراكیان نییە، فەرمووی: ((خۆتان بیخۆن)).

ئەبو عەبدوللا (ئیمامی بوخاری) دەڵێ: فەرموودەی یەكەم ڕوون ترە كە دەفەرموێ: ((دەرخواردی خێزانەكەتی بدە)).

## ٢٧- بابٌ: إِذَا أَقَرَّ بِالْحَدِّ وَلَمْ يُبَيِّنْ، هَلْ لِلإِمَامِ أَنْ يَسْتُرَ عَلَيْهِ؟

٦٨٢٣- حَدَّثَنِي عَبْدُ الْقُدُّوسِ بْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَاصِمٍ الكِلاَبِيُّ، حَدَّثَنَا هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك ﷺ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ. قَالَ: وَلَمْ يَسْأَلْهُ عَنْهُ. قَالَ: وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ الصَّلاَةَ قَامَ إِلَيْهِ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْ فِيَّ كِتَابَ اللَّهِ. قَالَ: «أَلَيْسَ قَدْ صَلَّيْتَ مَعَنَا؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: «فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ ذَنْبَكَ». أَوْ قَالَ: «حَدَّكَ».

## ٢٧- باسێك: ئەگەر كەسێك دانی نا بەسزایەكدا (كەوتۆتە سەری) و ڕوونی نەكردەوە [١]، ئایا پێشەوا دەتوانێ بۆی بپۆشێت؟

٦٨٢٣-ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووم پیاوێك هاتە خزمەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من سزای خوایم كەوتۆتە سەر، دەی جێبەجێی بكە بەسەرمدا، دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) پرسیاری لێ نەكرد

(١) سزای چ تاوانێكە.

دەربارەی تاوانەكە، دەڵێ جا كاتی نوێژ هاتە پێشەوە و پیاوەكە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی كرد، جا كە پێغەمبەر ﷺ نوێژەكەی تەواو كرد، پیاوەكە هەستا و هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من سزایەكی خوایم كەوتۆتە سەر دەی (بڕیاری) كتێبەكەی خوا جێبەجێ بەكە لەسەرم، فەرمووی: ((ئایا تۆ نوێژت نەكرد لەگەڵماندا؟)) وتی:بەڵێ، فەرمووی: ((دەی بەدڵنیاییەوە خودا لە تاوانەكەت خۆش بووە))، یان فەرمووی: ((سزاكەت)) [١].

## ٢٨- بابٌ: هَلْ يَقُولُ الإِمَامُ لِلْمُقِرِّ: لَعَلَّكَ لَمَسْتَ أَوْ غَمَزْتَ؟

٦٨٢٤- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ الجُعْفِيُّ، حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ سَمِعْتُ يَعْلَى بْنَ حَكِيمٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا أَتَى مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ، النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: «لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ أَوْ غَمَزْتَ أَوْ نَظَرْتَ؟». قَالَ: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «أَنِكْتَهَا؟». لاَ يَكْنِي. قَالَ: فَعِنْدَ ذَلِكَ أَمَرَ بِرَجْمِهِ.

## ٢٨- باسێك: ئایا پێشەوا بەكەسێك دان بنێت (بە زیناكەیدا) بڵێت: لەوانەیە دەستت لێ دابێت یان بە چاو ئاماژەت بۆ كردوە یا بەدەست؟

٦٨٢٤-ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: كاتی ماعیزی كوڕی مالیك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: ((لەوانەیە ماچت كردبێت، یان دەستت تێ كوتابێت یان سەیرت كردبێت؟)) وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((سواری بوویت؟)) بەناڕاستەوخۆ نەیفەرموو، وتی: جا لەو كاتەدا فەرمانی كرد بە بەردباران كردنی.

---

(١) واتە: خوا لە سزاكەت خۆش بووە.

## ٢٩- بَابُ سُؤَالِ الإِمَامِ المُقِرَّ: هَلْ أَحْصَنْتَ؟

٦٨٢٥- حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي سَلَمَةَ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ رَجُلٌ مِنَ النَّاسِ وَهْوَ فِي المَسْجِدِ فَنَادَاهُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي زَنَيْتُ. -يُرِيدُ نَفْسَهُ- فَأَعْرَضَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَتَنَحَّى لِشِقِّ وَجْهِهِ الَّذِي أَعْرَضَ قِبَلَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي زَنَيْتُ. فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَجَاءَ لِشِقِّ وَجْهِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِي أَعْرَضَ عَنْهُ، فَلَمَّا شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ دَعَاهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَبِكَ جُنُونٌ؟». قَالَ: لاَ يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَالَ: «أَحْصَنْتَ؟». قَالَ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: «اذْهَبُوا فَارْجُمُوهُ»[1].

## ٢٩- باسی پرسیار کردنی پێشەوا لەو کەسەی دانی ناوە بە زیناکەیدا: ئایا ژنت هێناوە؟

**٦٨٢٥- ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پیاوێك لە خەڵکی (ئاسایی) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا لە مزگەوتدا بوو، جا بانگی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری ﷺ من زینام کردوە - مەبەستی خۆی بوو- بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا، ئینجا پیاوەکە ڕۆشتە بەرانبەری لەو لایەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕابوو، ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من زینام کردوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا، ئینجا پیاوەکە ڕۆشتە (بەرانبەری) لەو لایەوەی کە ڕووی لێ وەرگێڕابوو، جا کاتێ چوار جار شایەتیدا لەسەر خۆی (کە زینای کردوە)، پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد و فەرمووی: ((ئایا تۆ شێتیت؟)) وتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((ژنت هێناوە؟)) وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((بیبەن بەرد بارانی کەن)) .**

---

(١) بڕوانە: ٥٢٧٠.

